


# پوختەی
# شەریعەت
## لەسایەی قورئان و سوننەت


دانانی

دکتور / عبدالعظيم بدوي


پێشەکی نووسینی ڕێزداران

شيخ احمد صفوت نورالدين — شيخ احمد صفوت الشوادفي

شيخ احمد إبراهيم شقرة


یەکەم چاپ

هەولێر 2011

وەرگێڕانی / محمد حسن سەرگەینێلی

پێداچوونەوەی / زیوەر ئەنوەر

# ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب :** الوجيــز في فقــه السـنة والكـتاب العــزيز

پوختەی شەریعەت لەسایەی قورئانو سوننەت

**بابەت :** ئاینی

**نووسینی :** د. عبدالعظيم البدوي

**وەرگێڕان :** محمد حسن سەرگەینێڵی

**پێداچوونەوە:** زیوەر ئەنوەر

**چاپ:** یەکەم /هەولێر۲۰۱۱

**بۆ کارە هونەرییەکان و چاپکردن ( ۰۷۵۰ ۱۱۸۱۹۱۹ )**

**بۆ بڵاوکردنەوەو دابەشکردن ( ۰۷۵۰ ٤٦۷۱۳۹٤ )**

**شوێنی بڵاوکردنەوە:** ((کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی)) هەولێر

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٦١٥ )ی ساڵی ( ۲۰۱۱ )ی پێدراوە**

---



---

# الوجيز
# في فقه السنة والكتاب العزيز

# پوختەی شەریعەت
## لەسایەی قورئان و سوننەت


نووسینی

**د. عبدالعظیم البدوي**

ئەوانەی پێشەکییان بۆ نووسیوە

**الشیخ محمد صفوت نورالدین ، الشیخ محمد صفوت الشوادفي ، الشیخ محمد ابراهیم شقرة**

وەرگێڕانی

**محمد حسن سەرگەینێلی**

پێداچوونەوە

**زیــــوەر ئەنــــوەر**



یەکەم چاپ

٢٠١١ م ١٤٣٢ هـ

# پێشەکی وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُّوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ ﴾ (النحل: ٤٣).

واتە: گەر مەسەلەیەکتان نەزانی لە ئەهلی زیکر پرسیار بکەن.

بێگومان فیقهی ئیسلامی بریتییە لەو لێ حاڵیبوونەوەی فەقیهەکان دوای خۆماندووکردن و سوراغ بەدەستیان هێناوە. لە دەقە قورئانیەکان و دەقە سوننەتەکان، بۆیە ئیسلام و فیکرەی ئیسلامی و ئیسلام و فیقهی ئیسلامی لێك جودان، ئیسلام ئاینی خوایە، بیر و فیقهی ئیسلامی دەرەنجامی لێ حاڵبوونەکانی بیری ئەو زانایانەیە لەو دەقانەی ئاماژەیان بە فیقهی ئیسلامی کردووە لە قورئان و سوننەتدا، بۆیەش دەیان و سەدان مەزهەب و بیر و بۆچوون سەریان هەڵداوە، وەکو چوار مەزهەبەکانی سوننی و شیعی و زەیدی.

گەر سەیرێکی کتێبی (بدایة المجتهد ونهایة المقتصد، إبن رشد) و ( مذاهب الأربعة، عبدالرحمن الجزیري) و (الفقه الإسلامي وأدلته، د. وهبة الزحیلي) و (مذاهب الخمسة، محمد جواد مغنیة) بکەین دەبینین هەموو ئەو مەزهەبانە راکانی خۆیان لە قورئان و سوننەت وەرگرتووە، کەچی ئیجماعی ئوممەت زۆر کەمە لەسەر خاڵە فیقهییەکان و (إبن منذر) لە (الإجماع) دا (٧٥٠) مەسەلەی باس کردووە.

**هۆکارەکانی ئەم جیاوازییانەش زۆرە وەکو:**

١- هەندێ لەو زانایانە نەگەیشتوونە ئاستی موجتەهید.

٢- هەندێ وشەی ئایەتی و فەرموودەیی چەند مانای هەڵدەگرن، وەکو (اللمس) کە مانای دەست لێدان و هەم جووت دەگەیێنێ، بۆیە شافعی و ئەبو حەنیفە ناکۆکییەکان بۆ پەیدا بووە ئایا ژن دەبێت دەستنوێژ دەشکێنێ یان نەء.

٣- پلەی فەرموودە کە چەندە، ئایا راستە یان ناڕاستە.

بۆ نموونە: سەردانی گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ)وەکو (من حج ولم يزريني فقد جفاني) لای (السكبى) لە (شفاء السقام)دا و دەیان زانای تر راستن، کەچی لای هەندێ زانای تر وەکو (إبن تيميه) راست نین.

٣- یان هەندێ جار فەرموودەکان راستن بەڵام لەلێکدانەوەییان جیاوازی دروست دەبێت، بۆ نموونە: (التوسل) و (الإستغاثة) و (التبرك)....هتد.

بۆ نموونە (السكبى) دەڵێ: (التوسل) بە پێغەمبەر(ﷺ)دروستە لە حاڵەتی ژیان و حاڵەتی بەرزەخ و حاڵەتی مەحشەردا وە دەیان ئایەت و فەرموودە بۆ ئەمە دەێنیتەوە وەکو: ﴿وَابْتَغُواْ إِلَيهِ الْوسيلَةَ﴾ (المائده: ٣٥).

کەچی لای (إبن تيميه) بە کرداری باش دروستە نەك بە زات، بەڵام (أحمد) بەزاتیش کردوویەتی چونکە زات کاری باشەکەیەتی، یا (تەبەڕوك) لە (صحيحين) دا زۆر فەرموودە هەیە کە سەحابە لە حاڵەتی ژیانی دا لەسەر مووتف و بەڵغەم و کەل و پەلەکانی بەشەر هاتوون و دوای ژیانیش بەکارییان هێناوە، کەچی لای هەندێ زانای تر ئەم کارانە بڤەن، چونکە سەردەکێشن بۆ شیرك، واتە (سد الذرائع)ە، وەکو نووسەری ئەم کتێبە ئەم بیرورایەی هەڵبژاردووە.٤- جار هەی دیار نییە لە نێوان دوو فەرموودەن راستی دژ بە بەیەك کامیان (ناسخ)ە و کامیان (منسوخ)ە،وەکو مەسەلەی (قنوت) خوێندن لە بەیانیاندا، راستر وایە قنوت هەیە.

٥- جار هەیە بابای زانا لەناو چەند فەرموودە و رایەکدا یەکێکیان لە پێشتر دادەنێ بەرای خۆی ئەوەی پێ جوانترە.

٦- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (فدن الله حق أن يقضي)

کەچی هەندێك زانا دەڵێن: قەزای نوێژ نییە، کەچی ئەم فەرموودەیە گشت لا گرەوەیە، کەچی هەندێ زانا وەکو ئەم نووسەرە بۆ ئەم مەبەستە ئاوڕی لێ نادەنەوە، بەڵام لای زانایانی شافعی قەزای نوێژ هەیە و پێغەمبەر (ﷺ) کردوویەتی، دەیەها مەسەلەی تر هەیە.

منیش کاتێ هەڵسام بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە مەرج نییە تێبینیم نەبێ لەسەر زۆرێ لە

خاڵەکانی و هەمووی قبوڵم بێ، بەڵکو مەبەستم روونکردنەوەی تەنیا رای یەکێ لەو زانا تازەکانە بەناوی (عبدالعظیم البدوي) کە زۆربەی راکانی لە (الألباني) وەرگرتووە، بۆیە داهاتووش نووسینم دەبێ لەسەر مەزهەبەکانی تریش بۆ رۆشنبیری موسڵمانان لە راست فراوانی فیقهی ئیسلامیدا.

بۆیە دەبێ مرۆڤی موسڵمان وریا بێ مەرج نییە هەرچی لە کتێبە فیقهییەکاندا هاتبێ قابیلی هەڵە نەبێ و راستییەکانی پێکا بێت.

بۆیە ئەبێ لە مەسەلە کێشە گەورەکاندا تەماشای کتێبە فیقهییەکانی تریش بکات و پرسیار لە مەلا و فەقیهەکان بکات بۆیان، تا لێی حاڵی ببێ و نەکەوێتە سەرگەردانیەوە، وەکو مەزهەبی شافیعی کە زۆربەی خەڵکی خۆمان لەسەریەتی. ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾

٧- زۆر شت لە مەسەلە فیقهییەکان نامۆن و هەندێ لە فتوادەرانی نوێ دەیانەوێ نوێی بکەنەوە، کەچی دژ بە زۆر دەقی راستە و لەگەڵ لۆژێك ژێریدا نایێتەوە، بۆ نموونە: لە (التحيات)دا هاتووە، کە فەرموودەیێکی (صحيحه): (السلام عليك أيها النبّي). لێرەدا بە (ك)ی (المخاطب) هاتووە کەچی بە نامۆ هاتووە دەبێ (ك) بگۆڕێ بە (غائب) چونکە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کردووە دەبێ راناوی نادیاری (الغائب) بۆ بەکاربێت، کە چی بە دەقی قورئان ژیانی بەرزەخ بەردەوامە و مرد و گوێیان لە قسە و سەلامە، نەخوازە لا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وەکو: ﴿بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ (ال عمران: ١٩٦) ﴿وَاسْأَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَا﴾ (الزخرف: ٤٥) یان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ما من أحد يسلم علي إلا رد الله إلي حتى ارد عليه السلام) رواه أبو داود.

پاشان چۆن فەرموودە بە دەق نەبێ نەسخ دەبێتەوە؟ کەچی نووسەری ئەم کتێبە شوێن ئەم رایە نامۆیە و دەیان رای تری نامۆکە و تۆوە. ئەم خاڵانە و دەیان خاڵی تر هەیە بوونەتە هۆکاری پەیدابوونی ئەم را جیاوازانە، لە هەمووش گەورەتر لای خوا یەك ریزی موسڵمانانە ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ﴾ کە دەبێ کاری بۆ بکرێت.

**وەرگێڕ ٢٠٠٨/١٠/٢**

# پێشەکی (ڕێزدار شێخ محمد ابراهیم شقره)

بسم الله الرحمن الرحيم

**بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

ڕۆڵەی خۆشەویستمان شێخ عبدالعظیم (خودا بتپارێزێت) وخواڕێنومای چاکەی بکات.

(السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) .

داوا لەخوا دەکەم بەهرەی خۆت لەسەر بەردەوام بکات و سەرکەوتووت بکات و کارەکانت بۆ ئاسان بکات.

زۆر بەختەوەر بووم بەوەرگرتنی نوسراوە بەپێزەکەت(الوجيز) و لێم ڕووانی، بینیم ناوەڕۆکی باشەو خواپاداشتی زانستەکەت بداتەوەو قوتابیانی بەهەمان شێوە. من دەست پێکەکەت بۆڕەوانە دەکەم :

- ئەوەی من دەزانم ڕاستەو حەقە لەکتێبەکەتدا بلاوت کردۆتەوە، خوابیکات بەڕوناکی و بەزەخیرە بۆ داهاتوو پەسلاێن.

- کوڕی بەڕێزو چاکە خوازمان (عبدالعظیم) خوا بتپارێزیو هەڵەکانت بۆ ڕاست بکاتەوە. کاتێ(الوجيز) مان پێ گەیشت کە کتێبی تۆیە لە کاتی نیوەڕۆدا بەوپەڕی شەرمەوەو بەو پەڕی ستایشەوەو بەوپەڕی دلسۆزییەوە کە داوای دەکرد پێشەکی بنوسم، گەر هی تۆنەبوایە پێم خۆش نەدەبوو. بەلاّم مادام لەتۆوەیە کە پیاوێکی باشی، دەزانم نیازت خاوێنەو، سۆزت ڕاستەو هاوڕێی باشی، بۆیە تا ئەو پەڕی لەدلّمدا بەرز دەبێت.

- خوالێت ڕازی بێت ئەی کوڕی خۆم(عبدالعظيم)، ڕۆژێك داوای ئامۆژگاریت لێ کردم، داوای ئامۆژگاریت لە کەسێ کردووە، کە ئامۆژگاری باشی براکانی و ڕۆڵەکانی دەکاتو خێرو چاکەی بۆ دەوێنو لەکاتی تەنگانەدایارمەتی دەردەبێو لەسەر بەلاّ خۆڕاگردەبێو لە یارمەتی دان ناوەستێو لەبەلاّدا سستی ناکات، تەنیا لەشەیتانو فریودانەکانی نەبێ شتێ لەدلّی دانابینێ، ئەوەی لەدلّی دا هەلّی دەگرێ خۆشەویستی یە بۆ براکانی، یان هەڵگرتنی کزەی ئازارە لە ڕاست ئەو کەسانە کە ئەیەوێ ئازاریان بدات، یان هەڵگرتنی بەختەوەری یە لەبەرامبەر هەر

خۆشی یەك ڕوویان تێ دەكات، پاشان ئـەو نایـەوێ خراپەیـەك دەرحـەق بـە ئـەوان بكـات بـەو ئەندازەیە نەبێ كە باوك لەدڵی دا بۆ ڕۆڵەكانی دەبینێ، گەر كوڕەكانیشی خراپەی دەرحەق بكـەن هیچ بەسەر لێ بوردندا هەڵنا بژێرێت.

- خودا پاداشتت بداتەوە كە جوان گوێت بۆمان شل كرد، كە نـەیاران ئیرەیـت پـێ ببـەنو دۆستو خۆشەویستان خۆزگەی بۆ بخوازن، وە خوا بەهرەوەرت بكات، بەو بەهرانـە، كـە شـایانی پێیان، تۆ بكاتە ڕێگایەكی بەخشندە بۆ چاكەكاری لەگەڵ كەسانی شایان بەمەو ئەوانـەی شـایان بەمە نین، گەر كەسانی شایان بەو بەهرانەت پێكا ئەوە شایان بەوەن، گەر نا تۆ لـەو كەسـانەیت تۆهیچت لە دەستانییە.

ئەی ڕۆڵە لەوەتەی هەین ئەمە دروشمان بووە، قەد ڕژدیم لەگـەڵ كەسـێكدا نـەكردووە كـە خێرم بەناوچاوانەوە بینیوە، قەد ڕژد نەبووم یەك سات لەڕاست چاكەدا لەگەڵ كەسـێكدا كـە لـە حاڵی خۆیدا نەزان بووە، قـەت لـەحاڵی كەسـێكم نەپرسـیوە كـە گومڕابـووە هـاتووە پرسـیاری كردووە.

من تەنیا وای دادەنێم خوای بێ گەرد قەڵەمی پـێ داوی كـە ئـەم زانـستە بەنرخـە كورتـە بنوسی، بە زمانێ كـە چـەند سـاڵێك بەبانگـەوازی بـۆ قورئـانی پـیرۆز گرفتـارت كـردووە، وە بەڕەوشتەكی بەرز، كە هیچ پاساوێكی بۆ ئەو كەسە نەهێـشتۆتەوە كـە پـەنای بردۆتـە بـەر واق وڕمان كلۆڵی.

ئەمەش كۆی سیفەتی ئەو كەسەیە بانگەشـە بـەرەو خوادەكـات لەسـەر زانـین، گەرخامـە بەهەڵەی ببات دێتە سەر بەیانكردنی زمان، گەرنا خەڵكی بانگەشە دەكـات بەبەڵگـەهێناوە بـە سەرمەشق، كە خەڵكی ئەمەی تێدا دەبینن ئەوە پایەی بەرزدەبێتەوە.

ئەمەش لەكەسێكدا هەیە كە ئەو لەسەر لەسەریەتی، بەڕاسـتی ئەمـە بۆبانگەوازیكـەرانی ئیمڕۆ شكۆدارە.

هەرچەندە ئەی (عبدالعظیم) تۆلەو گروپەكەمانەی كە ڕوویان لە ئیشە سەختەكان كـردووەو لەسەری ئارام گرو خۆڕاگربوونو ئازاریان لەسەر ڕێگادا كێشاوە، تا ئارام گـرتن داینیـشتاندوونو وازیان لەشەڕ هێناوەو ئەنجا دەرەنجامـەكانیان بـۆ ئاسـان بـووە، ئـەوە (الـوجیز) ی تـۆ لـەكاتی

کارەساتدا بۆ من دڵخۆشکەرەو خەندەیەکەو تروسکەیەکە لە شەوە زەنگدا، بینیم ئەو کەسەی وەفای بۆمن هەبوو خامەکەی بەچەند خاڵێکی ڕوناکی لە قورئانو سوننەتدا کەوتە نوسینو ١٤ چەند پەڕاوەکی پاك خۆیانی بۆ ڕاخستو چەند مەسەلەیەکی فیقهی گران بەهای لێ دروست کردن، کە دڵانی باش خۆی پێ دەڕازێننەوەو هزردارەکان بەسەرنج ڕاکێشەکەی چریکە دەکەنو دڵە پاکژەکان بەکارپێ کردنی ڕێنومادەبن.

ئەی(عبدالعظیم) خوا پایەدارت بکات لەئاستی تۆ حاڵی بوومو سنووری خۆت ڕاگرت لای من شکۆت هەیەو لای هەموو کەسێکی تریش کە بتناسێت.

بێگومان بەڵێنی خۆتهێنایەدیو ئەوەی ئەو کەسانەی نەیان توانی بە هەوڵی سەرگەردانیان بیهێننە دیو لێ ی ترسانو ڕاستی یان نەپێکاو دوایی سەریان نایەوە پەرچت داوەتەوە.

بەلاّم تۆ بۆمەبەستێ ڕۆیشتوویت بەڕاوێژی کەسانێ ڕێنوێنی بوویت کە خۆشت دەوێنو ئەوانیش خۆشیان دەوێی، ڕژدیان پێت نەبردووە، دیسان کەسێك ڕژدی نەبردووە کەتۆ ئەیانناسیتو ڕۆژی لەڕۆژان ڕاوێژیان پێ دەکرێت.

بەشتەکی تریش شادمان بووم کەسەفەرەکەت بوو، کەبەوهەوالانە شادی کردم کەپڕلە بۆنی سروشتو زانست، کە زمانی پاراوت لە مزگەوتەکانو هۆڵەکانی وانەو هۆڵی شارەکاندا ڕایدەگەیاند، کەدڵانی پێوەی نیشتنو دەرونەکانی لەسەر کۆبونەوەو دڵەبەگومانەکان دڵنیابوون، تامن گەیشتمە ئەو بڕوایە خەڵکی پێویستی یان بەکتێبێ هەیە مەسەلە فیقهی یەکان لە چەند باسو بەندێکدا لە خۆبگرێو پێویستی بەوەنەبێ بچێتە سەر کتێبە درێژەکان، تۆش لەو پوختە پیرۆزەدا بۆت داناون[1].

---

(١) بەلاّم بێگومان زۆرێك لەو لەپێشتر دانانە (الترجیحات) ناتوانی بلێی هەموویان لەجێی خۆیانن، چونکە زۆر مەسەلە هەیە زانای تری گەورە قسەی لەسەر کردووەو بەڵگەی بەهێزتری هەیەو قسەکانی ئەو لەپێشترە، کێ هەیە خۆی لەقەرەی سەر مەزهەبەکان بدات؟! ئێمە زۆرێ لە خاڵە جیاوازەکانمان وەکو تێبینی زانایان باسکردووە! بەڵگە نەویستە (وفوق کل ذي علم علیم) وە بەپێی ڕۆژگارو سەردەم فتواکانو لەپێشتردانانەکان دەگۆڕێنو نوێ کردنەوەی دین هەموو سەد ساڵێ روودەداتەوە (ان الله تعالی یبعث لهذه الأمة علی رأس کل مأة سنة من یجدد لها دینها) رواه ابو داود صحیح. مەبەستمان لەمەش کەمکردنەوەی ڕێزی ئەم کتێبە نییە، بەڵکو مەبەستمان فراوانی فیقهو گۆڕانی خاڵەناجێگیرەکانیەتی بە پێی سەردەمو بەپێی هاتنی نوێ کەرەوەکان!

سەیری باسەکان‌و بەندەکانی کتێبەکەم بەخێرایی کرد، لەسەر ئەوە هەڵوەستەم کرد کەسەرنجی ڕاکێشام، کەڕاستی قسەی برای بەڕێزمان (محمد صفوت نورالدین) ی تێدا بۆمن دەرکەوت (کورترین ڕێگای گرتۆتە خۆی بۆ هێنانەدی شوێن کەوتنی پێغەمبەر (ﷺ)لە خواپەرستی‌و کڕین‌و فرۆشتن مامەڵەو تەواوی باسە فیقهی یەکاندا).

وە ڕاستی قسەی هاوڕێ ی بەڕێزمان(صفوة الشوادفي) مان بۆ دەرکەوت کە دەڵێ: (ئەم کتێبەی لەبەردەم خوێنەرانی بەڕێزە خوا نوسەرەکەی سەربخات‌و خێروبێری زۆری لەدەست هەڵوەڕێنێ، ئەمەش لەڕێگای ئەو ڕێڕەوە ڕونەدا کە ئاسان‌و گشت لاگرەو ئاشکرایە، خوا پاداشتی بە چاکەیان بداتەوە کەستایشی ئەم کتێبەو نوسەرەکەی کردووە بەئاشکرایی.

ستایشی ئەو دووانە کیفایەتە، هەموو ئەوەی منیش لەم نوسینەدا ووتومە تەنیا فەیزێکی دەرونی یە کە ئازارو خەم باری قورسی کردبوو، تەنیا وەکو نامەیەك وایە کەبۆ خۆشەویسترین ڕۆڵەکانی دەنوسم، کەشتێکی تێدابێ دڵنەوازی پێ بکەم، بەویستی خوا منیش دەیدۆزمەوە، هەندێ لەو شتانەی لە دڵی خۆمدا پێی دەڕەوێنمەوە کە توشی هاتووە لە ئەنجامی نۆشینی جامی دان پیادانەهێناندا بەدەستی ئەو کەسانەی پەتی وەفادارییان پچڕاندووە بەچەقۆی لەیادکردن.

- ئەی ڕۆڵەمان، خودا لەو کارەدا پاداشتی خێرت بداتەوەو فەڕ بخاتە سەر تۆو خێزانت. خوا پاداشتی بەخێری دنیاو قیامەت بداتە ئێمەو یارانمان لەپێڕی موستەفادا(ﷺ) کۆمان بکاتەوەو بەدەستی ئەو لە ئاوی کەوسەر بنۆشین‌و دوای ئەوە تینونەبینەوە.

لەسەرەتاوە تا کۆتایی سوپاس بۆ خواو درودو سەلام بۆ سەر پێغەمبەری ڕەحمەت‌و ڕێنومایی کە بۆ تەواوی خەڵکی نێردراوە، وە لەسەر ئال و بەیت‌و خێزان‌و یارانی‌و شوێنکەوتوانی بەچاکە.

عەممان

٢٠/جماد الاول/١٤١٦

١٣/تشرين الاول/١٩٩٥

**محمد ئیبراهیم شەقرە**

## پێشەکی (ڕێزدار شێخ: محمد صفوت نورالدين)

### سەرۆکی گشتی کۆمەڵەی یاریدەدەرانی سوننە لە میسردا.

بسم الله والحمدلله والصلاة والسلام علی رسول الله.

لە فەرمودە داهاتووە: (من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين) متفق عليه.

لە فەرمودەدا هاتووە: (نموونەی من کە خوا بەڕێنوماو زانستەوەی ناردووم وەکو نموونەی بارانەکی بەرێژنەیە بەرزەوییەك دەکەوێ، ئەو زەوییەی پاکە ئاوەکە وەردەگرێ، ڕووەك و گژوگیای زۆری لێ دەڕوێنێ، هەیە زەوییەکی ووشکە ڕووەك ناهێنێ بەلاّم ئاو وەردەگرێ‌و خەڵکی لە ئاوەکە دەخۆنەوەو ئاودێری پێ دەکەن‌و کشتوکاڵی پێ دەکەن، زەوی هەیە دەشتایی یەو لوسە ئاو هەڵناگرێ‌و ڕووەك‌و گیا ناڕوێنێ، ئەمە نموونەی کەسێکە لە دینی خوادا شارەزادەبێ‌و ئەوزانستەی خوا بەمنی دا ڕەوانەکردووە لێی سودمەند دەبێ‌و فێری دەبێ‌و خەڵکی لێی فێردەبێ، بەلاّم نموونەی زەوی سێ یەم ئەو کەسەیە سەری بۆ بەرزناکاتەوەو ئەو ڕێنوێنییە خوایی یە پەسەند ناکات کەبەمندا نێردراوە)[1].

ئەی خوێنەر پێغەمبەر(ﷺ) وەکو عائیشە وەسفی کردووە (ڕەوشتی ئەو قورئان بووە) .(رواه البخاري)[2].

واتە : ئەو جێبەجێکەری کرداری سروش بووە. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بەخەڵکی دەفەرمووێ: (وەکو من کەبینیتان دەست نوێژ هەڵگرن)[3].

لەڕاست حەج دەفەرمووێ : (ڕێبازی حەج لەمن وەربگرن)[4].

لە ڕاست دەست نوێژ دەفەرمووێ (ﷺ) : (کەسێ ئاوەها وەکو من دەست نوێژبگرێ...)[5].

---

(١) متفق عليه (ص.ج ٥٨٥٥).

(٢) صحيح (ص.ج ٤٨١١)

(٣) صحيح الارواء ٢٦٢.

(٤) صحيح الارواء ١٠٧٤.

(٥) صحيح (ص.ج ٦١٧٥.

غەیری ئەمەش دەفەرموێ (أومالك في اسوة) [1].

ئایا لەمەدا سەرمەشقی من بۆتۆنییە. خوا دەفەرمووێ : ﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ الأحزاب/٢١: بۆیە پێویستە موسڵمان لە خواپەرستیو مامەڵەدا چاو لەپێغەمبەر (ﷺ)بکات، تا نوێنەری ئەو بکات چونکە ئەوە دینی ئیسلامە. ئەم پوختەی لەبەردەستت دایە کورتترین ڕێگات پێ دەڵێ لە ڕاست شوێن کەوتنی پێغەمبەری بەڕێز(ﷺ) لەخواپەرستیو مامەڵەداو تەواوی باسە فیقهی یەکاندا تاخوێنەر دڵنیابێ کار بەجوانترین ووتە بکات بەبەڵگەوە، وە جەنابی شێخ لەسەر ئەوە سوربووە دەستی بەو فەرموودانەوە بگرێ کە ئەهلی فەرموودە لایان پەسەندە بۆیە (صحیح) ە کانی هێناوەو ئەوانەی لەو نزیکن، بەڵام ئەوانەی مشتومڕیان لەسەرە گوێ ی پێ نەداون، بۆیە لەدینی خوادا گێڕانەوەی وا هەیە بێ نیاز نییە لە لابردنیان. شێخ(عبدالعظیم بدوی) هەم بەکورتیو هەم بەبەڵگەوە قسەی کردووە تا خوێندکاران دڵنیا بکات، ئەم کتێبە لەگەڵ بچووکی قەبارەی دا فیقهوو فەرموودەی پێکەوە کۆکردۆتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ)ئەنجامی داوە ئەمەش چاکەیەکی گەورەیە.

ئەم کتێبە بۆ مرۆڤی پەیوەست بە خواوە کیفایەتەو خوێندکاری موجتەهید ڕازی دەکات. بۆیە کتێبەکە خەڵکی پێویستی پێ دەبێو هیواداریین خوێنەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی بیان خوێنیتەوەو کاریان پێ بکات.

کتێبەکەم لەسەرەتاوە تا باسی حەجم خوێندۆتەوە بینیم سادەو ئاسانەو ناکۆکی مەزهەبی باسنەکراوە، تا بۆئەو کەسانە ئاسان بێ کەدەیەوێ بەکاری باش رزگاری ببێ بە زانستی بە سوود ئاشنابێ. داواکارین لە خوا ئەم شێخە بەڕێز، باڵ بەتەمەنیە وە بگرێ بۆ زیادکردنی ئەم بەرهەمە باشەو سوود لە زانیاریەکانی وەربگیرێو سەری بخات، وە هەر کەس ئەمە بخوێنێتەوە سەرکەوتووی بکات بۆ کارکردن، وە دڵسۆزیمان پێ بدات لە قسەو کرداراو دڵسۆزی لە پەنهانیو ئاشکرایی دا، خواش بەمەبەست ئاگادارە.

(محمد صفوت نورالدین) کە پێویستی بە لێ بوردنو رازی بوونی خوایە.

---

(١) صحیح مختصر ٢(٢٢٩).

# پێشەکی ڕێزدار شێخ صفوت الشوادفی

## سەر نووسەری گۆڤاری یەکتاپەرستی (التوحید).

**(الحمد لله والصلاه والسلام علی عبده ومصطفاه محمد رسول الله واله وصحبه ومن والاه.....):**

زانستی فیقهی وەکو (ابن نجیم) -ر-وتویەتی : لە هەموو زانستەکان بەڕێزترەو پاداشتی زۆرترەو سودی زیاترەو پلەدارترەو شایستەترە،چاوان پڕ لەتریفە دەکاتو دڵان ئاسودە دەکاتو سینگان گوشاد دەکاتو کارەکانیان فراوان دەکات، چونکە خاسو عام دەخاتە سەر یاسای سیستەمو لەسەر ڕاستەهێڵی کۆبونەوە دەوامیان پێ دەدات، ئەمەش بە زانینی حەڵاڵو حەرامو جیاکردنەوەی چاكو خراپ لەڕووی ئەحکامەکاندا، دەریای فیقهی قوڵەو باخچەکەی گەشاوەیەو ئەستێرەکانی پڕشنگدارەو بنەماکانی دامەزراوەو لقەکانی چەقاوەو بەزۆر بەخشین لە بن نایەو بەدرێژایی ڕۆژگار شکۆی خۆی لەدەست نادات.

ئەهلی فیقهی کۆڵەکەی دینن‌و بەوان یەك ڕیزی دروست دەبێ‌و ئەوان پەناگەن بۆ کاروباری دونیاو قیامەتو خوێندن‌و فتواکان.

ئەم هونەرە بە خۆزگەکردن دەست ناکەوێ، بە(داهاتوو ڕەنگەو ئەگەرو کەی)!! دەست ناکەوێ، ئەو کەسە دەستی دەکەوێ کە قۆڵی بۆ هەڵدەماڵیو گۆشە گیری دەکاتو خۆی دەبەستێتەوەو دەڕواتە دەریاکانەوەو دەڕواتە ناو تەپوتۆزەوەو بەردەوام دەوران دەکاتەوە بەیانیو ئێواران‌و خۆی بۆ نوسین‌و دانان ئامادە دەکات لە سەرەتای شەوو کۆتایی شەودا، هەموو خەمەکانی چارەکردنی کێشەکانەو هەر تەنگو چەڵەمەیەکی سەختە کەسانی کەم ئاست نایوێرنێ ئەو چارەی دەکات، ئەمەش بەرهەمی دەستی مرۆڤ نییە بەڵکو زێدە چاکەی خودایە بییەوێ بیدات بەهەرکەسێ دەیداتێ...).

پیاو چاکانی پاشینە (ﷺ) بەکاملیو گشتی لە فیقهدا کارامە بوون، وەکو لە قورئاندا باسکراوە ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي

الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ التوبه ١٢٢.

فیقهی شەرعی ئەوان تەنیا زانینی ئەحکامەکان نەبووە کە پەیوەستە بە خواپەرستیو کڕینو فرۆشتن، بەڵکو هەموو زانستەکانی گرتۆتەوە، لەیەکتاپەرستیو ژیاننامەو مەسەلەی کۆییلەکانو تەفسیرو فەرمودەو.... هتد، ئەوان وەکو خوا فەرمویەتی لە دین حاڵی بوون. بەرهەمی فیقهی یان ئەوە بووە کە گەڕاونەوە ناگەلەکەیان پێیان ڕاگەیاندوون تا وشیار ببنەوە !

ئەم کتێبەی لەبەر دەستی خوێنەرانی بەڕێزدایە خوا نووسەر سەربخاتو خێری زۆری لەدەست بوەشێتەوە، ئەمەش لەڕووی ڕێگا ڕوونە ئاسانو گشت لاگرەوەیەکدا. هەڵدەستێ ئەحکامەکان لەدەقی قورئانو سوننەتی ڕاستیدا دەردێنێ زۆر ئاسانی دەکاتەوە تا خوێنەری زوو تێ بگات.

ئەو دەقەکان پێش وتەکان دەخاتو دەقی شەرعی دەکاتە پێشەوا لە هەموو مەسەلەیەکی فیقهی دا. لەمەدا نزیکی پێشەوای ئەهلی سوننە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە(ﷺ) کە لەگەڵ دەقەکان ڕۆیشتووە لە هەر کوێیەك بێت[1].

بۆ خوێنەر بە سوودە بەر لەوەی بڕواتە ناو فیقهە درێژەکان دەست بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە بکات، تا ڕێگاکانی لێ تێکەڵ نەبێو ئەوەی ڕابردووی لێ تێك نەچێت. داوا لە خوێنەرانی ئەم کتێبە دەکەم دوعا بۆ دانەرەکەیو ڕێنومایی بکەن، هەروەها ئەوانەی یارمەتی بڵاوبونەوەو چاپ کردنیان داوە بەخێر، (وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين).

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد واله وصحبه.

---

(١) بێگومان هەموو سەر مەزهەبەکان لە جەعفەری سادقو شافیعیو ئەحمەدو حەنەفیو مالکیو زەیدو تەبەریو...هتد فتوا شەرعیە کانیان لەئایەتو فەرموده وەرگرتووە، تۆ بە نمونە بڕوانە: (مغني المحتاج/للشربيني الشافعي) و(كفاية الأخيار /للدمشقي الشافعي) و(الفقه الإسلامي وادلته/د. وهبة الزحيلي). هیچیان لەخۆیانەوە بێ دەق فتوایان نەداوە!

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشـــەکی

**الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا و من سيئات اعمالنا من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له واشهد ان محمد عبده ورسوله.**

**خوا دەفەرموێ:**

**﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾آل عمران /١٠٢**

**﴿يَا أَيُّهَا النَّاس اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء /١**

**﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ الاحزاب ٧٠/٧١**

**(فان اصدق الحديث كتاب الله، و خير الهدي هدي محمد -ص- وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلاله وكل ضلالة في النار).**

**زانستی فیقهی باشترینو شکۆدارترین زانستە، بەو خواپەرستی دروست دەبێ کە خودا بوونەوەری لەبەر خاتری ئەوەدا داناوە ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنس إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات /٥٦.**

**ئەگەر بناغەو بنەمای رزگاری بەراستی یەکتاپەرستی کەدوور بێ لە بت پەرستی نەبەتەدی، ئەوە ئەو رزگارییە بەراستی خواپەرستی نەبێ تەواو نابێ، کە دوور بێ لەزیادەکاری، پێغەمبەر(ﷺ) فیقهی بەندەی کردۆتە ناوونیشانی ئەوە: ﴿من يرد الله به خيرا يفقه في الدين﴾ متفق عليه.**

**مەزنیو شکۆی ئەو زانستە لەوەسفو زانینی گەورەترە، چونکە ئەو حوکمانە موسڵمان هەڵدەسوڕێننو بەهەموو ڕێڕەوەکانی ژیانیەوە پەیوەست دەکەن، کە لەنێوان خۆیو پەروەردگاری دا هەیە.**

لەنێوان ئەوو بەندەی دا: بەوە پەیوەندی نێوان خوداو بەندە لە ئاشکرایی‌و پەنهانی داو لە پاکژی‌و نوێژو زەکات‌و حەج‌و مەناسیکەکاندا بەهێز دەبێ، بەمە ئالآی ئیسلام بلآودەبێتەوەو دروشمی قورئان بەرز دەبێتەوە، ئەمەش لە فیقهی سەربازی‌و خەبات‌و ئەمان‌و پەیماندا ... بەو ڕۆژی ڕەوا داوادەکرێ‌و خۆ لە جێگای تاوان‌و گوناه دوور دەخرێتەوە، ئەمەش لە فیقهی کڕین‌و فرۆشتن‌و سەوداو پەشیمان بونەوەو سودو بانك‌و گۆڕینەوەدا ... هەروەها لەو شتانەی پەیوەندیان بەڕەفتاری مامەڵەوە هەیە لەگەڵ یەکتری دا، بەمەش سامانەکان لە پیشەی شەرعی بەڕێوە دەچێ لەوەقف‌و وەسیەت‌و شتی تردا لە هەڵس‌و کەوتی دارایی دا.

بەو فیقهە لەسەر فیقهی میرات هەڵوێستە دەکات‌و بەنیوەی زانست ڕازی دەبێ‌و سامان لەدەستی خاوەکانیاندا بە دادوەرترین سیستەم جێگیر دەبێ‌و بەو فیقهەیە ژیانی خێزانی شەرعی کامەران دەبێ، ئینجا بەئەحکامەکانی دوای ئەودا کەپەیوەستن پێ یەوە.

ئیسلام پێویستی یەکانی ژیانی گرتۆتە بازنەی خۆیەوە، کە ئەوانە دەگرێتەوە: (تاوانەکان‌و تۆڵەکان‌و حدودەکان‌و تەمبێ کردنەکان - التعزیزات)و بە ئاسایش‌و بێ باکی‌و ئارامیەوە ژیان دەباتە سەر.

ئینجا لە حوکمەکانی خواردن‌و سەربڕین‌و نەزرو سوێندو باسەکانی ناوبژیکاری‌و بنەماو ڕێگاو حوکمەکانی: جێگای هێنانەدی دادوەری‌و حوکم کردنی نێوان سکاڵاکاران‌و، حەق دەگەڕێتەوە جێگای خۆی‌و تۆڵەی ستەمەکان تەسلیم بە خاوەنەکانیان دەکرێنەوە)[1].

لەبەر ئەوەو شتی تریش گوتراوە :

| | |
|---|---|
| اذا ما اعتز ذو علم بعلم | فاهل الفقه اولى باعتزار |
| فكم طيب يفوح و لاكمسك | وكم طير يطير ولا كباز |

مادام شەریعەت گشتی بۆ یەك ووتە دەگەڕێتەوە بە لقەکانیەوە لەگەڵ بوونی جیاوازیشدا، لە ئوصول‌و بنەڕەتیشدا هەروەها، لەمە زیاتر هەڵناگرێ، بەبەڵگەی (١) بەڵگەی قورئانی : ﴿وَلوكَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا﴾ النساء /٨٢ .

واتە: گەر قورئان لە غەیری خواوە هاتبایە جیاوازی زۆرییان تێدا دەبینی.

(١) پێشەکی شێخ بەکر ئەبو زێد بۆکتێبی (التقريب لفقه ابن القيم الجوزية) ١/٦،٧

﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ﴾ . النساء /٥٩.

واتە : گەر لەشتێ دا کەوتنە کێشە بگەڕێنەوە بۆ خوداو پێغەمبەر.

ئەم ئایەتنە بێ پێچو پەنانە بۆ لابردنی کێشەو ناکۆکیەکان، کە گێڕانەوەی خاوەن کێشەکانە بۆ شەریعەت، ئەمەش بۆ لابردنی ناکۆکی یە، ئەم ناکۆکیەش بەوەلا دەچێ گەر بۆ یەك شت بگەڕێنەوە. گەر جیاوازی تێدا بوایە، لەگەڕانەوەدا بۆی جیاوازیەکان چارە نەدەکرانو ئەمە شتەکی ناڕاستە.

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ . ال عمران/١٠٥ .

واتە: وەکو ئەوانە مەبن کە پەرتەوازە بوونو ناکۆکی یان لێ پەیدا بوو دوای ئەوەی بەڵگە ئاشما نیەکانیان بۆ هات.

بەڵگەکان شەریعەتە گەروانەبوایە جیاوازی پەسەند نەبێ نەیدەفەرمو دوای ئەمەو ئەوەو لەمەدا پاساویان دەبوو، ئەمەش دروست نییە، شەریعەت جیاوازی تێدا نییە.

ئەو ئایەتانەی سەرکۆنەی ناکۆکی دەکەنو دوای گەڕانەوە باوەڕ شەریعەت دەکەن زۆرن، هەموو ئەوانەیە کالاکەرەوەن کەناکۆکی یان تێدانییە، بەڵکو لە سەریەك چاوگو یەك فەرمایشتە .{المزنی} هاوڕێ ی شافیعی (ﷺ) ووتویەتی : {سەرکۆنەی خودا لەناکۆکی یە فەرمان لای ئەو گەڕانەوەیە بۆ قورئاو سوننەت} .

<u>دووەم:</u>

زۆربەی ئەهلی سوننە (الناسخ) و(المنسوخ) یان لە قورئانو سوننەتدا سەلماندووەو ووشیارییان داوە لەنەزانینو هەڵەکردن لە ڕاستیدا، ئاشکرایە کە (الناسخ) و (المنسوخ) لە نێوان دوو بەڵگەدایە، کە ناکۆك بن لەگەڵ یەکتری داو پێکەوە هەڵناکەن، گەرنا یەکێ ناسیخ نەدەبوو، ئەوی تریش مەنسوخ نەدەبوو. وەفەرز پێچەوانەی ئەوەیە، گەر جیاوازی لە ئایندا هەبوایە ناسیخو مەنسوخ بێ دەقەکی یەکلاکەرەوە سەلماندنی سودەکەی نەدەبوو، وە بێ بەرهەم دەبوو، ئەو کاتە دروست دەبوو کار بەهەردووکیان بکرێ پێکەوە لەسەرەتاوەو هەمیشە، بەو پێیە کەناکۆکیو جیاوازی بنەمایەکی دینی یە، بەڵام بەکۆی دەنگەکان ئەمە بەتاڵە، ئەمەش مانای

وایە ناکۆکیو جیاوازی لە شەریعەتدا بنەمایەکی نییە، ئەم فەرمایشتەش لە هەموو بەڵگەیەکدا لەگەڵ بەرهەڵستیدا وەکو گشتی گرەکان(العموم)و تایبەتیەکان (الخصوص)و ڕەهاکان (الاطلاق) و سنووردارکردن(التقید)و شتی تر هەموو ئەوانە بنەماکان هەڵدەشێننەوە، ئەمەش پەسەند نییەو شتێ کی تر سەری بەمە بگات.

**سێ یەم:**

گەر لە شەریعەتدا ئاسانکارییەك هەبوایە سەری دەکێشا بۆ ئەرکەکی وا لە توانا بەدەربێت. چونکە ئەگەر دووبەڵگە نەیارییان بکەینو هەردوولا ئەگەر بکەین بۆ شەرع دانەرمەبەستن: یان دەبێ بابای بەرپرسیار (موکەللەف) داوای لێ کرابێ هەردوولایان بکات، یان داوای لێ کراوە یەکێ لەوانە ئەنجام بدات، ئەمەش هیچی ڕاست نییە.

ئەوەی یەکەمیان ئەوە دەخوازێ: (وا بکە)و (وامەکە)و بۆ بابای بەرپرسیار وەکو یەکەلەیەك ڕووەوەو خودی ئەرکەکەیە، کە لە تواناداا نییە.

دووەمیان بەتاڵە چونکە پێچەوانەی وادانانە (الفرض)، سێ یەمیش هەروەها، ئەگەر وادأنانو ئەگەرەکە داوابکات کارییان بە هەردووکیان بکرێ، بۆیە تەنیا یەکەمیان دەمێنێتەوە کە دەبێ کاری پێ بکرێت.

**چوارەم:**

زانایانی ئوسولێ لەسەر سەلماندنی لە پێشتردانان (الترجیح) لەسەر بەڵگەنا چونیەکەکان کۆکن، گەر نەتوانراپێکەوەیان کۆبکەنەوە، ناکرێ یەکێ لەو دووبەڵگە دژ بەیەکانە بخرێتە کارەوە لە خۆوە بەبێ ئەوەی یەکێکیان لە پێشتر ئەویترە وە دابنرێت. گەر بوترێ جیاوازی لە شەریعەتدا هەیە دەرگای لە پێشتر دانان بەتەواوی هەڵدەگرێتەوە، چونکە بێ سودەو پێویستی پێ نابێ، مادام جیاوازی بکرێتە بنەمایە شەرعی بۆ دروستی بوونی ناکۆکی لە شەریعەتدا، ئەمەش نێگەتیڤەو خراپەو هەر شتەکی تریش وەکو ئەو سەر بۆ ئەوە بکێشێت[1].

من دەڵێم: گەر شەریعەت هەر هەمووی بۆ یەك فەرمایشت بگەڕێتەوە لە لقو پۆپەکانی دا گەر جیاوازیش زۆر بێ، دیسان لە ئوسولو بنچینەشدا هەروایە، ویستم کتێبێ لەفیقهدا بنووسم،

(١) الموافقات للشاطبي: (١٢٢/١١٨:) بە کورتی.

کە نەسەر یەك قسە لە پێشتری تێدابێو بەڵگەی ڕاست بە ڕاستی دانابێ، لەمەشدا ڕێگای خەڵکی موجتەهیدو لێکۆڵەرو بیرتیژم گرتووە، کە ئەوانەن ڕاستیەکانیان لێ کۆڵیوەتەوە، کەلەگەڵ سوننەتەکاندا بڕۆن بۆ هەر کوێ بچن، بەمەش زانستەکی زۆریان بۆ خەڵکی کۆکردۆتەوە، هەروەها بیرەکی بە پیتو بەرەکەت کەلەسەر ڕاسترین ڕێسا بڕوات.

ئەم جۆرە فیقهە لە بنەڕەت دا بەرهەمی یارانی پێغەمبەر(ﷺ) بووە بەتەواوی داویانە تابعینەکانیان ئەوانەی شوێن ئەوان کەوتونو بوون بەفەقیهو لەسەر ئەم شێوازە بەڕێزە نوسیویانەوە).

**ئەم کتێبەم ناونا بە(الوجیز فی فقه السنة والکتاب العزیز).**

ئەم کتێبەم ئاوا دارشتووە:{باسی پاکژی /باسی نوێژ/باسی ڕۆژو/باسی زەکات/باسی حەج/باسی مارەکردن/باسی کڕین و فرۆشتن/باسی سوێند/باسی خواردنەکان/باسی ڕاسپاردەکانو باسی میرات/باسی حەددەکان/باسی تاوانەکان/باسی دادگایی/باسی خەباتو سەربازی/باسی ئازادی کۆیلەیە.

نهێنی ئەو ڕێزبەندییە ئەوەیە : خوای گەورە مرۆڤی بۆ پەرستن دروست کردووە، کەتەنیا بیپەرستن، نوێژیش بناغەی خواپەرستی یەو کۆڵەکەی ئاینە بۆیە بەئەو دەستم پێ کردووە، باسی پاکژیم پێش ئەو خستووە، چونکە مەرجێکی دروستی نوێژەو مەرجیش پێش بەمەرج کراو دەکەوێت.

مادام ڕۆژو بۆ خوایەو ئەو پاداشتی دەداتەوە وەکو لەفەرمووده داهاتووە هاتووم بە نوێژەوەم لکاندووەو پێش زەکاتم خستووە، وە خواپەرستی جەستەییم پێش خواپەرستی دارایی خستووە کەزەکاتەو خواپەرستی جەستەیی حەجە.

مادام هاوسەرگیری هۆی بوونی بەندەکانە هاتووم دوای خواپەرستیەکان خستومە سەرەتای بەسەکان، دوای ئەوە کڕینو فرۆشتنو مامەڵەم هێناوە، چونکە ئەو بەندانەی لەو هاوسەرگیرییە پەیدا دەبن بەردەوام مامەڵە دەکەن.

نەریت وایە خەڵکی زۆر سوێند لەسەر مامەڵە دەخۆن، بۆیە باسی سوێندم بەدوای کڕینو

فرۆشتندا هێناوه، تابزانرێ کام سوێند ڕاستەو کام ڕاست نییە.

پاشان باسی خواردەمەنیو ڕاسپاردەو میرات دەکەم، پاشان حدودەکانو تاوانەکان. چونکە بەزۆری کێشەکانی میراتو بە هەمیشەیی کێشەکانی حدودو تاوانەکان لە دادگام هەڵدەبڕێنەوه، چونکە تەنیا ڕێگا بەدادوەر دەدرێ حدودەکان ئەنجام بدات پاشان بە جێگرەکەی، بۆیە باسی دادگا بەدوای ئەوەدا هێنا.

کاتێ موسڵمانان دوای پیادەکردنی دینی خودا بەرپرسن لەناو خۆیاندا بەرپرسیشن کەلەزەوی خوادا بەرپای بکەنو خەڵکی بۆ پەرستنی خودا بانگێشە بکەن، بەردەوام لەهەموو کاتو شوێنێ دا کەسانێ هەبوون ببنە پەرچ لەبەردەم بڵاوکردنەوەی دا بۆیە باسی خەباتو باسی سەربازیم کردووه.

لەئاکامی ئەو جەنگو خەباتانە هەندێ جار کۆیلە دەکەوێتەوه کە دیلی جەنگنو لەبێ بڕواو بت پەرستان، بۆیە باسی کۆیلە کراوه، چونکە ئیسلام خوازیاری ئازادکردنیان دەکاتو دەیەوێ ئازادی بداتە دیلەکانی جەنگ.

بۆیەش دواباسم بەباسکردنی ئازاد کردن (العتق)هێناوه داواکارم خودای گەورە گەردنم لەئاگر ئازاد بکات. تکام وایە ڕاستیم پێکابێو پاداشتم بداتەوەو لەهەڵەکانم ببوورێتو موسڵمانان لێ ی سودمەند بن.

**( عبدالعظيم بن بدوي الخلفي )**
**١٩٩٣/١/١٤ز**
**١٤١٣/٧/٢١ك**
**(الشين / مركز القطور/ الغربيه)**
**مصر**

## ئەم هێمایانەی لەم کتێبەدا بەکارهاتوون:

خ: صحيح البخارى

م: صحيح مسلم

ت: سنن الترمذي

نس: سنن النسائي

جه: سنن ابن ماجه

د: سنن أبي داود (عون المعبود)

ما: موطأ مالك

فع: الشافعي (الأم)

أ: احمد/الفتح الرباني

هق: البيهقي

قط: الدار قطني

حب: صحيح ابن حبان

خذ: صحيح إبن خزيمة

كم: مستدرك الحاكم

مي: سنن الدارمي

طب: الطبراني في الكبير

ش: ابن شيبة /مصنف

بز: مسند البزار

سط: الطبراني في الاوسط

طغ: الطبراني في الصغير

مختصر. خ: مختصر صحيح البخارى

مختصر.م: مختصر صحيح مسلم

ص.ت: صحيح سنن الترمذي

ص. نس: صحيح سنن ابن ماجه

ص. د: صحيح سنن ابى داود

ص.ج: صحيح الجامع الصغير

الارواء/ارواء الغليل

الجنائز/احكام الجنائز

الزفاف/اداب الزفاف

صفة الصلاة/ صفة صلاة النبـي (ﷺ)

تمام المنة/تمام المنة في التعليق على فقه السنة

# باسی : پاكژی (كتاب الطهارة)

پاكژی (الطهارة) : لەزماندا واتە پاكو خاوێنی لە پیسی یەكان، لەزاراوەدا واتـە : لابردنـی بێ دەست نوێژیو لەش پیسیو لابردنی پیسی یەكان[1].

## (١) : باسی ئاوەكان :

هەر ئاوێ لەئاسمانەوە بباریو لەزەوی یەوە هەڵبقوڵێ پاكژە، وەكو خوا دەفەرمووێ ﴿أَنزَلْنَـا مِنَ السَّمَاء مَاء طَهُورًا﴾[2].

واتە : ئاوەكی پاكژمان لە ئاسمانەوە بۆ باراندوون.

پێغەمبەر (ﷺ)لەڕاست دەریادا دەفەرمووێ: (هو طهور ماؤه ، الحل ميتته)[3].

واتە : ئاو پاكژەو مردارەكانی حەڵاڵن.

لەڕاست ئاوی بیردا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (ان الماء طهور لا ينجسه شيء)[4].

واتە : ئاو خاوێنە هیچ شتێ پیسی ناكات.[5]

---

(١) المجموع /شرح المهذب/١/٧٩.

(٢) الفرقان/٤٨.

(٣) صحيح ابن ماجة ٣٠٩(د.٦٦، ٦٧/١٢٦ ـ ١٢٦) (ت ٦٩/٤٧/١)،(جه/١٣٦/١/٣٨٦). نس(١/١٧٦).

(٤) صحيح الأرواء/١٤. رواه الترمذي والنسائي.

مباركفوري لە(تحفة الأحوذي) دا (١/٢٠٤)دا لە(الطيبي) دەگێڕێتەوە (ڕەنگە بیرەكە لەهەندێ دۆڵەوە بۆی هـاتبێو خەڵكی لادێ یی هاتبنە سەری زبڵو زەمەندو زاڵی ماڵەوەیان تێ كردبێت، ئەو ئاوە هـەڵی گـرتبێو خـستبیە نـاو بیرەكەوە. هەندێ كەس وادەزانن خەڵكی لەبەر كەم دینی ئاوایان كرد بێ،ـ ئەمەش هیچ موسڵمانێ بە دروستی نازانێ، چۆن گومانی خراپ بەوانە دەبرێ كە لەباشترین سەدە ژیاون. (ئەمە زانای تریش باسـیان كـردووەو ئەمـەش قـسەی ئاشكراو دیارە. (كۆتایی).

(٥) متفق عليه (خ/١٢٥٣/١٢٥/٣). م(٩٣٩/٦٤٦/٢).

## ٢- باسی پیسی یەکان(النجاسات):

(النجاسات) کۆی (النجاسیة). واتە پیسی، کە هەموو ئەو شتەپیسانە دەگرێتەوە دڵی ساغی مرۆڤ بێزی لێ بکاتەوەو خۆی لێ دەپارێزێو جلو بەرگی لێ دەشواتەوە وەکو پاشەڕۆکی مرۆڤ و میز[١].

بنەچەی شتەکان پاکژیو ڕەوایی یە، گەر کەسێك شتێ بەپیس دابنێ دەبێ بەڵگە بێنێتەوە، گەر بەڵگەی نەبوو خۆی لێ دوور بگرێت[٢]. چونکە حوکم دان بەسەر پیسی دا گرفتاریو دژواری تێدا گشتی گیر دەبێ، بۆیە بە بەڵگە نەبێ حەڵاڵ نابێت[٣]. ئەو پیسیانەی بەڵگەیان لەسەرە ئەمانەن :

### (١-٢) : میزو پیسایی ئادەمیزاد (البول-الغائط):

لەڕاست پیسایی فەرمودە هاتووە: (اذا وطيء احدكم بنعله الاذى فان التراب له طهور)[٤].
واتە:گەر پێڵاوی ئێوە پیسایی پێوە نوسا خۆڵ و خاك پاکژی دەکاتەوە.

مەبەست (الاذى) پیسایی‌و بەردو دڕكو داڵو شتی ترە کە ئازارت دەدا[٥].

بەڵام میز، ئەنەس گێڕایەوە(عەرەبێ لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) میزی کرد، هەندێ خەڵك لێی هەڵسان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دعوه لاتزموه).لێ ی گەڕێن با میزی خۆی تەواو بکات. وتی : کاتێ میزی کرد داوای سەتڵە ئاوێکی کردو ڕشتی بەسەری دا[٦].

### (٣)(٤) : مەزی و وەدی :

مەزی (المذي) : ئاوەکی سپی لینجە لە کاتی ئارەزوودا دێتە دەر، بەشەهوەتەوەو بەفیچق (الدفق) نایێتەدەرو چووك خاو ناکاتەوەو هەر هەست بەدەرچوو نیشی ناکات، ئەمەش پیاوو

---

(١) الروضة الندية(١/١٢).
(٢) السيل الجرار(١/٣١).
(٣) صحيح (ص.د.٨٣٤). الروضة الندية (١/١٠)
(٤) صحيح (ص.د.٨٣٤). (د١٢/٤٧/٣٨١).
(٥) عون المعبود/٢/٤٤.
(٦) متفق عليه. (م/١/١٢٣/٢٨٤). خ(١٠/٤٤٩/٦٠٢٥).

ئافرەت تێ یدا بەشدارە. پێ ی دەڵێن زەوقاو.

ئەمە پیسە بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانی شوشتنەوەی چوکی (الذكر) لێ داوە[١].

لە عەلی (س) گەڕاوەتەوە (من پیاوێ بووم مەزیم زۆر بوو، چونکە کچی پێغەمبەرم (ﷺ)لابوو لە بەر ڕێزی ئەوە شەرمم دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) بپرسم، بۆیە داوام لە (میقدادی کوڕی ئەسوەد)کرد بۆم بپرسێ، فەرمووی (ﷺ) : (يغسل ذكره ويتوضأ)[٢].واتە : چوکی دەشوات دەست نوێژ دەگرێت. بەڵام وەدی ئاوەکی سپی خەستە دوای میز دێتو بەپاشە میز ناسراوە[٣].

(ابن عباس)-ر- دەڵێ: (مەنیو وەدیو مەزی. مەنی-تۆواو-غوسلی لێ دەکرێ، وەدیو مەزی چوکی لێ بشۆوە دەست نوێژی لێ بگرەوە) [٤].

## ٥- پیسایی ئەو گیاندارانەی گۆشتیان ناخۆرێت :

(عبدالله) گێڕایەوە، پێغەمبەر (ﷺ)ویستی تارەت بکات، فەرمووی : سێ بەردم بۆ بێنە، منیش دوو بەردم بۆ دۆزییەوە لەگەڵ تەرسەقولەکی کەر، دووبەردەکانی تاودایەو تەرسەکەی فڕێداو فەرمووی : (هي نجس) [٥]. واتە ئەوە پیسە.

## ٦- خوێنی مەهك ( حەیز-بێ نوێژی ) :

ژنێ هاتە خزمەت پێغەمبە(ﷺ) وتی : هەیە خوێنی بێ نوێژی بەرپۆشاکی دەکەوێ چی لێ بکات ؟ فەرمووی(ﷺ): (تحته ثم تقرصه بالماء، ثم تنضحه، ثم تصلي فيه) [٦].

واتە:دەیکرێنێو دەیگوشێ بە ئاوو پاشان ئاوی پێ دادەکاو دەیشوات، دواتر نوێژی پێوە دەکات.

---

(١) شرح مسلم للنووي (٢١ ـ٣).

(٢) متفق عليه (م.٣٠٣/٢٤٧/١)، خ(١٣٢/٢٣٠/١) بە کورتی.

(٣) فقه السنة.

(٤) صحيح (ص. د /١٩٠)، (هق/١١٥/١).

(٥) صحيح. (ص. جه /٢٥٣). (خز ٧/٣٩ـ١) لای ئەوانی تر وشەی کەر (الحمار) نەهاتووە. (رواه البخاري) ١٠٦/٢٥٦/١)و (نس ٣٩/١). ت(١٣/١٧/١). (جه (٣١٤/١١٤/١).

(٦) متفق عليه (م٢٩١/٢٤٠/١) (خ٣٠٧/٤١٠/١).

**٧-لیکی سەگ:**

(طهور اناء احدكم اذا ولغ فيه الكلب ان يغسله سبع مرات اولاهن بالتراب) [(١)].

واتە: گەر قاپو دەفرێکی ئێوە سەگ دەمی تێ نا دەبێ حەوت جار بیشواتەوە، یەك جار بەخۆڵو گڵ.

**٨- مردار (الميتة):**

ئەو گیاندارانەن بەسەربڕینی شەرعی نەکوژراونەوە. وەکو لە فەرمودەداهاتووە: (اذا دبغ الاهاب فقد طهر) [(٢)].واتە: گەر پێستی مرداره وەبۆ خۆش کرا ئەوە پاکژ دەبێتەوە. ئەمانە جیادەکرێنەوە:

١- ماسی و کوللەی مردوو: لەعەبدوڵڵا کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (احلت لناميتتان ودمان: اما الميتتان فالحوتء الجراد، واما الدمان فالكبد والطحال)[(٣)]. واتە: دوو مردارتانو دوو خوێنتان بۆ حەڵاڵ کراوە : مردارەکان ماسیو کوللەیە، دوو خوێنەکان جگەرو سپڵ(فاته ڕەشە) ە.

٢- ئەو مردارانەی خوێنو شلەیان نییە وەکو مێشو مێرولەو مێش هەنگو هی تر. (اذا وقع الذباب في اناء احدكم فليغمسه كله ثم ليطرحه فان في احدى جناحيه داء و في الاخر شفاء)[(٤)]. واتە گەر مێشێ کەوتە ناو قاپەکی ئێوە، بانقومی بکات بەتەواوی پاشان فرێی بدات، لەبابەتێکیدا نەخۆشی تێدایەو لەئەو یتری شیفای تێدایە.

٣- ئێسقانو قۆچو سمو تووکو پەڕی گیاندارانی مردار : (عظم الميتة، قرنه، وظفره، وشعرها، وريشها):

---

(١) صحيح (ص.ج ٣٩٣٣). م(٢٧٩/٩١-١/٢٣٤).

(٢) صحيح (ص.ج/٥١١)، م(١/٢٧٧/٣٦٦)، (د: ٤١٠٥/١١/١٨١).

تێبینی: لەمەزهەبی شافیعی دا پێستی سەگو بەرازو نەژادیان خاوێن نابێتەوە (مغني المحتاج للشربيني/ج١) سەیر بکە. (وەرگێڕ).

(٣) صحيح(ص.ج ٢١٠) أ(٩٦/١/٢٥٥) هق(١/٢٥٤).

(٤) صحيح. (ص.ج ٨٣٧) خ(٨٢/٥٧/٢٥٠/١٠) جه (٣٥٠٥/١١٥٩/٢).

ئەوانە پاكن، چونكە بنەچە پاكی یە، بوخاری بـە(معلـق)گێڕاویـەوە[١]. (زەهـری لەڕاسـت ئێسقانی مردار وەكو فیلو شتی تر وتویەتی : چاوم بەزۆرێ لەزانایانی پێشوو كـەوتووە سـەریان پێ داهێناوەو قژیان پێ چەوركردووەو بـەخراپیان نـەزانیوە .(حمـاد) دەڵـێ: پەڕەموچـەی مـردار قەیدی نییە.

## چۆنیەتی پاكژكردنەوەی پیسی (النجاسة):

بزانە ئەو شەرع دانەرەی ئاشنای كردین ئەو سەرچاوەیە پیسە یـان پـیس بـووە، ئاشناشـی كردووین چۆن خاوێنی بكەینەوە، پێویستە شوێن فەرمانو سوودەكانی بكەوین، هەیـە شوشـتنی لەڕاستەوە هاتووە تا ڕەنگو بۆنو تامەكەی بزر دەكات، ئەوە پاككردنەوەیەتی، هەیە ئاو پـژانو گوشینو یان ڕۆیشتن بە زەوی دا، یان هەر ڕۆیشتنەكی ئاسایی بە زەوی لە خاكەكی خاوێنـداپاكی دەكاتەوە. بزانە ئاو بنەڕەتە لە خاوێن كردنەوەی پیسی یەكاندا وەكو لە فەرمودەدا هاتووە: (خلق الله الماء طهورا) [٢] واتە : خوا ئاوی بە پاكژی دروست كردووە، هیچ شتێ شوێنی ئاو ناگرێتەوە، مەگەر شتێ لە شەرعدانەرەوە هاتبێ، چونكە لە شتەكی پاكـژەوە لادەدات بۆشـتێ كـە نـازانی پاكژە، ئەمەش دەرچونە لە یاسای شەرعی[٣].

گەر ئەوەت زانی فەرموو ئەوەی شەرع هێناویەتی لە ڕاسـت سـیفەتی پاكژكردنـەوەی ئـەو شتانەی پیس یان پیس بوون:

١ - پاكژكردنەوەی پێستی مردار بە خۆش كردن(الدباغ):

(عن ابن عباس) –ر- سمعت رسول الله (ﷺ): (ایما اهاب دبغ فقد طهر) [٤].(ماناكراوە).

٢- پاكژكردنەوەی قاپو دەفر كاتێ سەگ دەمـی تێنـا: (طهـور انـاء احـدكم اذا ولـغ فیـە

---

(١) (١/٣٤١).

(٢) السیل الجرار (٤٢، ٤٨/!) بە دەستكارییەوە. بزانە (خلق الله الماء طهـورا) (الحـافظ) لـە (تلخـیص)دا (١/١٤) دەڵێ: فەرمودەكە ئاوا هاتووە : (ان الماء طهور لا ینجسە شيء).

(٣) هە مان سەرچاوەی پێشوو.

(٤) صحیح: (ص.جە ٢٩٠٧) أ(٤٩/١/٢٣٠). ت(٣/١٣٥/١٧٨٢).

الكلب ان يغسله سبع مرات اولاهن بالتراب) [١].(ماناكراوه).

٣- پاكژكردنەوەی پۆشـاك گـەر خـوێنی حـەیزی بەركـەوت: (جـاء امـرأة الى الـنبي-ص- فقالت: احدانا يصيب ثوبها من دم الحيضة كيف تصنع؟فقال: (تحته ثم تقرصه بالماء ، ثم تنضحه، ثم تصلى فيه) [٢].ماناكراوه.

گەر دوای ئەوە شوێنەواریشی ما قەیدی نییە، (خولة بنت يسار) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خوا (ﷺ)یەك قات جلم هەیە، تێ ی دا دەكەومە بێ نوێژی؟ فەرمووی: (فاذا طهرت فاغـسلي موضع الدم، ثم صلي فيه=گەر پاكژبویەوە شوێنی خوێنەكە بشۆوەو پاشـان نوێـژی تێـدا بكـە). وتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) گـەر شـوێنەواری مایـەوە؟ فـەرموی(ﷺ): (يكفيـك الماء ولايضرك اثره) [٣]. واتە: ئاوەكە بەسیەتی‌و ئاسەوار قەیدی نییە.

٤- پاكژكردنەوەی قولینچك‌و كلكەی پۆشاكی ئافرەت (ذيل الثوب) :

كەنیزەكی(ام ولد) كە لە(ابراهيم بن عبـدالرحمن بـن عـوف) بـوو لـە(ام سـلمة) ی دایكـی موسلمانان (رضي الله عنها) پرسی: من ئافرەتێكم كلكەو قولینچكی جلەكانم درێژە، بە شـوێنی پیس دا دەڕۆم؟ (ام سلمة) فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: (يطهـر مـا بعـده) [٤] واتـە: دواوەی خۆی پاكی دەكاتەوە.

٥- پاكژكردنەوەی پۆشاك لە میزی مندالّ:

(يغسل من بول الجارية ويرش من بول الغلام) [٥].

واتە: پۆشاك لە میزی كچ دەشۆردرێتەوەو لە میزی كوڕ ئاوی بەسەردا دەپرژێنرێت.

٦-پاكژكردنەوەی پۆشاك لە مەزی:

(سهل بن حنيف) وتویەتی : (من بەهۆی زۆری مەزی مانـدویی زۆرم دەكێـشا زۆرم خـۆلێ

---

(١) رابردو باسكرا.

(٢) رابردو باسكرا.

(٣) صحيح. (ص.د٣٥١). د(٢/٢٦/٣٦١).، (هق ٢/٤٠٨).

(٤) صحيح: (ص. جه ٤٣٠) ما(٢٧/٤٤) د(٢/٤٤/٣٧٩)، (ت ١/٩٥/١٤٣).

(٥) صحيح (ص. نس ٢٩٣) د(٢/٣٦/٣٧٢) نس(١/١٥٨).

دەشوشتەوە، ئەمەم لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسکرد، فەرمووی: (انما يجزيك من ذلك الوضوء). واتە: بۆئەوە دەست نوێژ بەسە.وتم: ئەی گەر پۆشاکم پیس بکات؟ فەرمووی: (يكفيك ان تأخذ كفا من ماء فتنضح به ثوبك، حيث ترى انه اصاب منه) واتە: بیشۆ [1]

٧-پاکژبوونەوەی ژێرپێڵاو:

(اذا جاء احدكم المسجد فليقلب نعليه ولينظر فيهما، فان رأى خبثا فليمسحه بالارض ثم ليصل فيهما) [2]

واتە :گەر کەسێ لەئێوە هاتە مزگەوت باسەیری ژێرەوەی پێڵاوەکانی بکات، گەر بینی پیس بوون، بەخاکی زەوی خاوێنی بکاتەوە، پاشان نوێژیان پێوە بکات.

٨-پاکژکردنەوەی زەوی:

(عەرەبێ هەڵسا میزی لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)کرد، خەڵکی کەوتنە قسە پێ گۆتنی، فەرموی (ﷺ): وازی لێ بینن: (ستڵە ئاوێ بێنن بیکەن بەسەردا...) [3]

لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە فەرمانیدا چونکە حەوشەی مزگەوت لم بوو، ئاوەکەش دەیباتە خوارەوە تازوو پاکتر بێتەوە، گەر نا گەرلێ ی گەڕابایە تازەوی وشك دەبۆوەو شوێنەواری نەدەما، (ابن عمر) گێڕایەوە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)سەگ دەهاتن‌و دەچوون بەمزگەوتدا میزیان دەکردو ئاویان نەدەپرژاند بەسەریدا[4]

سوننەتەکانی سروشتی(سنن الفطرة): لەفەرمودە داهاتووە:

(خمس من الفطرة: الاستحداد، والختان، وقص الشارب، ونتف الابط، وتقليم الاظافر) [5]

واتە: پێنج شت سروشتین: کردنی مووی بانەگا (العانة)و سوننەت کردن(خەتەنە)و سمێڵ

---

(١) حسن (ص.جه ٤٠٩) د(١/٣٥٨/٢٠٧) (ت١١٥/٧٦/١).

(٢) صحيح (ص.د : ٦٠٥)، د(٢/٣٥٣/٦٣٦).

(٣) متفق عله (الارواء ١٧١) خ(٣٢٣/٢٢٠)، نس(٤٩،٤/١).

(٤) صحيح (ص.د ٣٦٨)، خ تعليقا (١٧٤/٢٧٨/١)، د(٢/٤٢/٣٧٨).

تێبینی: (ئەو کاتە مزگەوت راخراونەبووەو خۆڵ بووە، ئاو کەم بووە...). (وەرگێڕ).

(٥) متفق عليه (خ ٥٨٨٩/٣٣٤/١) م(١/٢٢١/٢٥٧).

کورت کردنەوەو کردنی بن هەنگڵ‌و، نینۆك کردن.

(عشر من الفطرة: قص الشارب ، واعفاء اللحية، والسواك، واستنشاق الماء، وقص الأظفار، وغسل البراجم، ونتف الابط، وحلق العانة وانتقاص الماء، ونسيت العاشرة الا تكون المضمضة)[1].

واتە: دە شت سروشتین : سمێڵ کورت کردنەوە، ڕیش هێشتنەوە، سیواك، ئاو لە لوت وەرکردن، نینۆك کورت کردن، شوشتنی گرێ‌و جومگەی قامکەکان، کردنی بن هەنگڵ، لابردنی موی بانە گا، دەست بەئاو گەیاندن، ئاو لەدەم وەرکردن).

## سوننەت کردن ( خەتەنەکردن ) :

خەتەنە بۆ پیاوو ژن واجبە، چونکە دروشمەکی ئیسلامە، پێغەمبەر (ﷺ)لە ڕاست پیاوێك کەموسڵمان بوو فەرموی: (الق عنك شعر الكفر واختتن)[2]. واتە: مووی سەردەمی بێ بڕوایی لاببەو خۆت سوننەت بکە.

سوننەتی ئیبراهیم بووە، لە فەرمودەداهاتووە: (اختتن ابراهيم خليل بعد ما اتت عليه ثمانون سنة)[3].

واتە: ئیبراهیم دوای (٨٠) ساڵ سوننەتی کردووە، خوا بە پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ: (ثم اوحينا اليك ان اتبع ملة ابراهيم حنيفا)[4].

سوننەتە خەتەنە لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی منداڵدابێ (پێغەمبەر (ﷺ)مەڕە منداڵی (العقيقة) بۆ حەسەن‌و حسێن کردووە حەوتەم ڕۆژ سوننەتی کردن[5].

(ابن عباس) گێڕایەوە (٧) شت لەمنداڵدا سوننەتن (ڕۆژی حەوتە) ناودەنرێ‌و سوننەت

---

(١) حسن (مختصر م١٨٢) م(١/٢٢٣/٢٦١) (د٥٢/١/٧٩).
(٢) حسن (ص.ج ١٢٥١) د(٢/٢٠/٣٥٢) هق (١/١٧٢).
(٣) متفق عليه (خ ١١/٨٨/٦٢٩٨) م(٤/١٨٣٩/٣٧٠).
(٤) النحل/١٢٣.
(٥) تمام المنة/٦٨.

دەکرێ)[١]. ئەم دوو فەرمودەیە هەرچەندە زوعفیان تێدایە بەڵام بەرێگای جیا هاتونو یەکتر بەهێز دەکەنو پیاوی تاوانبارکراوی یان تێدا نییە[٢].

## هێشتنەوەی ڕیش ( اعفاء اللحية ) :

هێشتنەوەی ڕیش واجبەو کورت کردنەوەی حەرامە، چونکە سروشتی خوا دەگۆڕیۆ ئەمە کارێکی شەیتانە ﴿ولآ مرنهم فليغيرن خلق الله﴾ [٣].

تاشینی مرۆڤ بە ئافرەتان دەچوێنێ، ئەمەش حەرامە(لعن رسول الله —ص- المتشبهين من الرجال بالنساء)[٤]. واتە: پێغەمبەر —دخ-نەفرینی لەو پیاوانە کردووە خۆیان بە ئافرەت دەچوێنن. پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانی کردووە بهێڵرێتەوە فەرمانەکەش واجبە، وەکو زانراوە(جزو الشوارب و ارخوا اللحي، خالفوا المجوس)[٥]. واتە : سمێڵ کورت بکەنەوەو ڕیش بهێڵنەوەو، وەکو مەجوسەکان مەکەن. (خالفوا المشركين ، وفروا اللحى، واحفوا الشوارب)[٦]. واتە: وەکو بت پەرستان مەکەن،ڕیش بێڵنەوەو سمێڵ کورت بکەنەوە.

## ( سيواك ) کردن :.

**سیواك لەهەموو دۆخێكدا سوننەتەو ئەوەی دڵنیامان دەکاتەوە لە سوننەتەکەیدا:**

(١) لەکاتی دەستنوێژدا: (لولا ان اشق على امتي لأمرتهم بالسواك مع الوضوء)[٧]. واتە: گەر بارگرانی نەبوایە لەسەر خەڵکی، فەرمانم پێ دەکردن لە هەموو دەست نوێژێکدا سیواك بکەن.

---

(١) طس (٥٦٢/٣٣٤/١) تمام المنة (٦٨).

(٢) تمام المنة/٦٨.

(٣) النساء/١١٩.

(٤) صحيح (ص.ج ٥١٠٠) (خ٥٨٨٥/٣٣٢) (ت٢٩٣٥/١٩٤/٤).

(٥) (صحيح مختصر مسلم/١٨١)، (م٢٦٠/٢٢٢/١).

(٦)م تفق عليه (خ٥٨٩٢/٣٤٩/١٠) (م٢٥٩/٥٤ـ٢٣٣/١).

(٧) صحيح (ص.ج ٥٣١٦) أ(١٧١/٢٩٤/١).

(٢) لەکاتی نوێژدا: (لو لا ان اشق على امتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة) [١].واتە: گەر بار قورسی نەبوایە بەسەر میللەتەوە، فەرمانم پێ دەکردن لە کاتی هەر نوێژێکدا سیواك بکەن.

(٣) لە کاتی خوێندنی قورئان: (ان العبد اذا قام يصلي اتاه ملك فقام خلفه يستمع القران ويدنو، فلا يزال يستمع ويدنو حتى يضع فاه على فيه، فلا يقرء اية الا كانت في جوف الملك) [٢]. واتە: کاتێ بەندە نوێژ دەکات فریشتەیێ دێ لە دواوە گوێ ی بۆ قورئان دەگرێو نزیك دەبێتەوە، بەردەوام لێ ی نزیك دەبێتەوە تا دەمی دەخاتە سەردەمی، هەموو ئایەتێ لەناو فریشتەکەدا دەلێتەوە.

(٤) کاتی چوونە ژووری ماڵ: (عن عائشة قلت باي شيء كان يبدء النبي(ﷺ) اذا دخل بيته ؟ قالت بالسواك) [٣]. واتە: لەعائیشەم پرسی پێغەمبەر (ﷺ)گە دەهاتە ژووری ماڵ دەستی بە چی دەکرد ؟ ووتی: بەسیواك.

(٥) لەکاتی شەو نوێژدا : (عن حذيفة قال (كان رسول الله -ﷺ- اذا قام ليجتهد يشوص فاه بالسواك)[٤]. واتە: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ)بۆ شەو نوێژان لەخەوهەڵدەستا وە سیواکی دەکرد.

## مەکروهی مووی سپی هەڵکێشان ( نتف الشيب ):

(لاتنتفوا الشيب، مامن مسلم يشيب شيبة في الاسلام الا كانت له نورا يوم القيامة) [٥]. واتە : موی سپی دەرمەهێنن، هەر موسڵمانێ مویەکی سپی دەبێ دوا ڕۆژ بۆی دەبێتە ڕووناکی یەك.

(١) متفق عليه : (م ٢٥٢/٢٢٠/١) خ(٢/٣٧٤/٨٨٧) ت(١/١٨/٢٢).

(٢) صحيح لغيره (الصحيحة ١٢١٣) هق (١/٣٨).

(٣) صحيح (ص.جه ٢٣٥) م(١/٢٢٠/٢٥٣) د(١/٨٦/٥٨) جه(١/١٠٦/٢٩٠).

(٤) متفق عليه (م ١/٢٢٠/٢٥٥) (خ ٢٤٥/ ١/٣٥٦) (د ١/٨٣/٥٤) (نس/ ١/٨).

(٥) صحيح (ص.ج ١٥٤٦) د(١١/٢٥٩/٤١٨٧) (ت ١٨٠٦/١٤٥/٣) (جه ٢/٣٦٣٢).

## گۆڕینی مووی سپی بەخەنەو کەتمو شتی ترو حەرامی ڕەش:

(ان احسن ماغيرتم به الشيب الحناء والكتم) [١]. واتە: باشترین هۆ بۆ گۆڕینی موی سپی خەنـەو کەتمە.

(ان اليهود والنصارى لايصبغون فخالفوهم) [٢].

واتە:جولەکەو مەسیحی ڕەنگ کردن ناکەن ئێوە وەکو وان مەکەن.

(ئەبوقوحافە ڕۆژی ڕزگاری مەککە هێنرایەلای پێغەمبەر (ﷺ) سەرو ڕیشی سپی دەچـوو پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: (غيروا هذا الشيب واجتنبوا السواد) [٣]. واتە: ئەو سپی یـە بەشـتێ بگۆڕن بەڵام بەڕەش نەبێت.

(يكون قوم يخضبون في اخر الزمان بالسواد كحواصل الحمام لا يريحون رائحة الجنة) [٤]. واتە: گەلێ لە ئاخر زەماندا خۆ ڕەش دەکەنەوە وەکو سـیکڵدا نۆچـکەی کـۆتر وایـە، بـۆنی بەهەشـت ناکەن.

---

(١) متفق عليه : خ(٥٨٩٩/٣٥٤/١٠) (م ٢١٠٣/١٦٦٣/٣) د(٤١٨٥/٢٥٧/١١).

(٢) متفق عليه: خ(٥٨٩٩/٣٥٤/١٠) م(٢١٠٣/١٦٦٣/٣) (د: ٤١٨٥/٢٥٧/١١؟).

(٣) صحيح: (ص.ج ٤١٧٠) م(٢١٠٢ ـ ٦٩ ـ ١٦٦٣/١) د(٤١٨٦/٢٥٨/١١).

(٤) صحيح (ص.ج ٨١٥٣) (د: ٤١٩٤/٢٦٦/١١) (نس ١٣٨/١).

# نەریتی سەر ئاوکردن ( اداب الخلاء )

١- سوننەتە ئەو کەسەی دەڕواتە ئاو دەست لـە پێـشدا بڵـێ: (اللـهم انـي اعوذبـك مـن الخبـث والخبائث). واتە: خوایە من خۆم دەپارێزم لە (الخبث)و(الخبائث).

واتە: پیسیو پیسی یەکان، پێشەوا عەلی (س) لە پێغەمبەر (ﷺ)گێڕایەوە (گەر کەسێ چـووە ئاودەستو-بسم الله-ی کرد ئەوە دەبێتە بەربەست لە نێوان جنۆکەو شـەرمگەی مرۆڤـدا)[١].

دیسان لە فەرمودە داهاتووە: (کان رسول الله-ص- اذا دخل الخلاء قال : اللهم اني اعـوذ بـك من الخبث و الخبائث) [٢].

٢- سوننەتە گەر کەسێ لە ئاودەست چووە دەر بڵێ: (غفرانك) واتـە: خوایـە لـێم خـۆش بیـت. کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشاو دەهاتە دەر دەیفەرموو: (غفرانك) [٣].

٣- سوننەتە لە چوونە ناو ئاودەستدا پێ ی چەپ پێش بخاتولە هاتنەدەردا پـێ ی ڕاسـت پـێش بخات، چونکە قاچی ڕاست پێش خستن پیرۆزەو قاچی چەپ پێش خستن پیرۆز نییە، فـەرموودە لە ڕاست ئەوەدا هاتووە[٤].

٤- گەر مرۆڤ لە دەشتایی دا پێـشئاو بکـات وا چـاکە ئەوەنـدە دوور بکـەوێ، کـە نـەبینرێت: جابر(ﷺ) دەفەرمووێ: (لە سەفەرێکدا لەگەل پێغەمبەر(ﷺ) بووین، گەر پێغەمبـەر(ﷺ) دەچوە سەر پێشئاو لە دەشتدا لێمان دوور دەکەوتەوە تا لەبەر چاو نەدەبینرا) [٥].

٥-سوننەتە تا کۆمی لە زەوی نزیك دەبێتەوە پۆشاكو بەرگی خۆی لا نەدات: (پێغەمبـەر(ﷺ)

---

(١) صحيح: (ص.ج ٨١٥٣ (ت٦٠٣/٥٩/٢) (جه ٢٩٧/١٠٩/١) لاي نه و له جياتي (الخلاء)دا (الكنيف) هاتووه.

(٢) متفق عليه: (خ ١٤٢/٢٤٢/١)، (م ٣٧٥/٢٨٣/١)، (د ٤/٢١/١).

(٣) صحيح (ص.ج ٤٧١٤)و (د: ٣٠/٥٢/١)، (ت: ٧/٧/١) (جه : ٣٠٠/١١٠/١)

(٤) السيل الجرار ٦٤/١.

(٥) صحيح: (ص. جه ٢٦٨)، جه (٣٣٠/١٢١/١) د(٢/١٩/١).

کاتێ دەچووە پێشاو تا لە زەوی نزیك نەبایەوە پۆشاکی خۆی هەڵنەدەدایەوە)[١].

٦- نە لەدەشتو نە لە ناو بینـادا دروسـت نییـە ڕوو یـان پـشت لـە ڕووگـە (قیبلـە) بکرێـت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (اذا اتیتم الغائط فـلا تـستقبلوا القبلـة ولا تـستدبروها ولکـن شرقوا وغربوا) [٢]. واتە: گەر چوونە سەر پێشاو ڕوو لە ڕووگە مەکەنو پـشتی تـێ مەکـەن، بەڵکو ڕوو لە خۆرهەڵات یان خۆرئاوا بکەن.

(ئەبو ئەییوب-ر- دەفەرموێ: چوینە شام ئـاو دەسـتمان بیـنین بـە ئاراسـتەی کەعبـە دروست کرابوون، ئێمەش خۆمان خواردەکردەوەو(استغفر الله)مان دەکرد) [٣].

٧- حەرامە میزو پیسایی کردن لە ڕێگاو بـانی خەڵکـداو لـە ژێـر سـێبەرەکانیدا : پێغەمبـەر (ﷺ)فەرمویەتی: (اتقوا الملاعنين، قالوا ومـا الـلا عنـان یـا رسـول الله (ﷺ)؟ قـال: الـذي یتخلی في طریق الناس او في ظلهم) [٤].

واتە: خۆتان لەو دوو شتە نەفرین لێ کراوە بپارێزن، وتیان: ئەو دوو شتە نەفرین لێ کـراوە چـین؟ فەرمووی (ﷺ): ئەو کەسەیە لەسەرڕێگای خەڵكو سێبەری ئەوان میزو پیسایی دەکات.

٨- مەکروهە میز لە گەرماو دابکات:

(نهي رسول الله (ﷺ) ان یتمشط کل یوم ، او یبول في مغتسله)[٥].

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەی کردووە هەموو ڕۆژێ سەرشانە بکرێ، یـان میـز لـە گـەرماودا بکات.

٩- میز کردن لە ئاوی مەندا حەرام کراوە:

(انه نهی ان یبال في الماء الراکد) [٦]. واتە: ئەو میزکردنی لە ئاوی وەستاودا قەدەغەکردووە.

١٠- دروستە میزکردن بە وەستاوی، بەڵام بەدانیشتنەوە باشترە:

---

(١) صحیح: (ص.جە ٤٦٥٢) د(١/٣١/١٤) (ت ١/١١/١٤) ئەنەس گێڕاویەوە.

(٢) صحیح (مختصر مسلم ١٠٩) (ص.د ٧).

(٣) متفق علیه: خ(١/٤٩٨/٣٩٤)، م(١/٢٢٤/٢٦٤) (ت١/٨/٨).

(٤) صحیح: (ص.ج ١١٠) د(١/٤٧/٢٥) (م ٢٦٩ ١/٢٢٦). قسە ي نە و (اللعانن، قالوا وما اللعانان)؟

(٥) صحیح: (ص.نس ٢٣٢) نس(١/١٣٠) د(١/٥٠/٢٨).

(٦) صحیح (ص.ج ٦٨١٤) م(١/٢٣٥/٢٨١) نس(١/٣٤).

(ان النبي (ﷺ) انتهى الى سباطة قوم فبال قائما، فتنحيت فقال ادنه، فدنوت حتى قمت عند عقبيه، فتوضأ ومسح على خفيه)(١).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) چوو ڕۆیشت تا گەیشتە سەرانوێلکی (السباطة) هۆزێك بە وەستاوی میزی کرد، خۆم لاداو فەرمووی نزیك بکەوە، منیش نزیك بوومەوە هەتا لەلای پاژنەی پێیەکانی وەستاوم ئینجا، هەڵسا دەست نوێژی گرتو پێڵاوەکەی مەسح کرد. بۆیە دەڵێن: دانیشتن باشترە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ)بە زۆری دانیشتووە، تا عائیشە لە ڕاست ئەوە گوتویەتی: (گەر کەسێك وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە پێوە میزی کردووە بڕوای پێ مەکەن، ئەو تەنیا بە دانیشتنەوە میزی دەکرد)(٢).

قسەی عائیشە پێچەوانەی قسەی حوزەیفە نییە، چونکە ئەوەی دیویانە ئەوە یان گێڕاوەتەوە، زانراویشە ئەریّ پێش نەریّ کەوتووە، چونکە زانیاری زیاتر هەڵدەگرێت.

١١-خۆ پاراستن لە میز بەرکەوتن (الاستنزاه من البول) پێویستە:

ئیبنو عەبباس (ﷺ) گێڕاویەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بە لای گۆڕدا ڕەتبوو، فەرمووی: (انهما ليعذبان، وما يعذبان في كبير، اما احدهما فكان لا يستنزه من بوله واما الاخر فكان يمشي بين الناس بالنميمة)(٣).

واتە: ئەو دوانە سزا دەدرێن، ئەوان بە گوناهی گەورە سزا نادرێن، یەکێکیان خۆی لە میزی خۆی نەپاراستووە، ئەوەی تریان قسەی لە نێوان خەڵکی هێناونو بردوون.

١٢-لە کاتی میز کردن چوکی بەدەستی ڕاستی نەگرتووەو دەستی پێ بەئاو نەگەیاندووە:

(اذا بال احدكم فلا يمس ذكره بيمينه، ولا يستنج بيمينه)(٤).

واتە: گەر یەکێ لە ئێوە میزی کرد با دەستی ڕاست لە چوکی نەداو بە دەستی ڕاستی تارەت نەکات.

(١) متفق عليه (م ١/٢٢٨/٢٧٣) خ(١/٣٢٩/٢٢٥) نس(١/١٩) جه(١/١١١/٣٠٥).

(٢) صحيح (ص.نس ٢٩) (نس ١/٢٦) ت(١/١٠/١٢) تاوا هاتووە (الا قاعدا).

(٣) متفق عليه (ص.جه ٢٥٠) جه(١/١١٣/٣١٠) خ(١/٢٥٤/١٥٤) م(٢٦٧/١/٢٢٥).

(٤) صحيح: (ص.ج ٢٥٠)، جه(١/١١٣/٣١٠)، (خ١/٢٥٤/١٤٥) م(٢٦٧/١/٢٢٥).

١٣- تارەت بە بەردو ئاو دروستە بەڵام بە ئاو باشترە:

(انس)-ر- وتویەتی: (پێغەمبەر (ﷺ)دەچووە پێشاو (الخلاء) مـنو خزمـەتکارێ کـە لەگـەڵم دابوو دۆڵکە ئاوەکم هەڵدەگرت لەگەڵ نەقیزەیەك، ئەو تارەتی بـە ئاوەکـە دەکـرد) [(١)]. عائیـشە (رضي الله عنها) لە پێغەمبەر (ﷺ)ی گێڕاوەتەوە: (اذا ذهب احدكم الى الغائط فليـذهب معـه بثلاثة احجار فليستطب بها فإنها تجزيء عنه) [(٢)].

واتە: گەر کەسێ لە ئێوە چووە سەر پێشاو باسێ بەرد بەری خۆی پێ پاکـژ بکاتـەوە، ئەوەنـدەی بەسە.

١٤- لەسێ بەرد کەمتر دروست نییە تارەتی پێ بکرێت:

سەلمانی فارسی (ﷺ) فەرمویەتی: (پێغەمبەرەکەتان (ﷺ)هەموو شتێکی فێرکردوون، تـافێری کردوون چۆن سەر ئاوبکەن، بەڵێ: قەدەغەی کردووین بۆ میزو پیسایی ڕوو لە ڕووگە بکەین، یان تارەت بە دەستی ڕاست بکەین، یان تارەت بەکەمتر لەسێ بەرد بکەین، یـان بـە تەرسـە قولـەو ئێسقان تارەت بکەین) [(٣)].

١٥- دروست نییە تارەت بە ئێسقانو تەرس بکەین: (نهي النبـي(ﷺ)ان يتمسح بعظم او ببعر)[(٤)].

واتە: پێغەمبەر (ﷺ)قەدەغەی کردووە تارەت بە ئێسقانو (قشپل) تەرس بکرێت.

---

(١) متفق عليه (خ(١/٢٥٢/١٥٢) م(١/٢٢٧/٢٧١) نس(١/٤٢) (عنزة)ي باس نە کردووە.

(٢) صحيح (ص.نس ٤٣) نس(١/٤٢) (د:١/٦١/٤٠).

(٣) صحيح (ص. جه ٢٥٥) م(١/٢٢٣/٢٦٢) ت(١/١٣/١٦) د(١/٢٤/٧).

(٤) صحيح (ص.ج ٦٨٢٧) م(١/٢٢٤/٢٦٣) د(١/٦٠/٣٨).

# باسی قاپ و قاچاغ (الانية)

هەموو جۆرە قاپو دەفرێ دروستە بەکاربێنرێ، تەنیا قاپو دەفری زێڕو زیو نەبێ، حەڕامە بۆ خواردنو خواردنەوە بەکاربێنرێن بە تایبەتیو بۆ هەموو بەکارهێنانەکانی تریش. لەفەرمودەدا هاتووە:

(لاتشربوا في انية الذهب والفضة ، ولا تلبسوا الحرير والديباج، فانها لهم ولكم في الاخرة) [1].

واتە: لەقاپی زێڕو زیودا مەخۆنەوە، ئاوریشم لەبەر مەکەن، لەدونیادا بۆ ئەوانەو لەپەسلاندا بۆ ئێوەیە).

(الذي يشرب في اناء الفضة انما يجرجر في بطنه نارجهنم) متفق عليه[2].

واتە: ئەو کەسەی لەقاپی زیودا دەخواتەوە ئەوە ئاگری دۆزەخ شۆڕەی دێت بەناوسکی دا.

(الجرجرة =شۆڕەی ئاو).

لە (صحيح مسلم) دا باسی خواردنیش کراوە: (ان يأكل او يشرب في آنية الفضة والذهب ....).

(مسلم) دەڵێ: (تەنیا لەفەرمودەی (ابن مسهر) داباسی خواردنو زێڕکراوە).

(ئەلبانی) دەڵێ: ئەو زیادەیە لەڕووی گێڕانەوە دەگمەنە، هەرچەندە لە مانادا لەڕووی زانینەوە ڕاستە، چونکە خواردنو زێڕ گوناهی پترە لە زیوو خواردنەوە وەکو لە ڕواتدا دیارە) .

---

(١) متفق عليه (خ ١٠/٩٦/٥٦٣٣) (م٣/١٦٣٧/٢٠٦٧) ت(٣/١٩٩/١٩٣٩).

(٢) متفق عليه: خ(١٠/٩٦/٥٦٣٤) م(٣/١٦٣٤/٢٠٦٥) جه (٢/١١٣٠/٣٤١٣)..

## پاکی بۆ نوێژ (الطهارة للصلاة):

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی: (تقبل الصلاة بغير طهور).
واتە: نوێژ بەبێ پاکی قبوڵ نابێت. پاکژی دووجۆرە:
پاکژی بە ئاوو پاکژی بەخۆڵو خاکی زەمینی (الصعيد).
یەکەم: پاکژی بەئاو: دەست نوێژو خۆشوشتنەوە(غوسل).

## دەستنوێژ (الوضوء)

### سیفەتی دەستنوێژ:

(عوسمان کوڕی عەففان-ر- داوای ئاوی کردو دەستنوێژی گرت: سێ جار دەستی شوشتو، پاشام ئاوی لە دەمو کەپوی وەرکرد، پاشان سێ جار روخسار شوشت، پاشان دەستی ڕاستی تا ئانیشکەکەی سێ جار شوشت، پاشان دەستی چەپ بەهەمان شێوە، پاشان سەری تەڕکردو مەسحی کرد، پاشان پێ ی ڕاستی شوشت تا گۆزنگان سێ جاران، پاشان پێ ی چەپ بەهەمان شێوە، پاشان وتی، پێغەمبەرم (ﷺ)بینیوە ئاوادەستنوێژی گرتووەو پاشان ووتی پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی : (من توضأ نحو وضوئي ثم قام فركع ركعتين لايحدث فيهما نفسه، غفر له ما تقدم من ذنبه). واتە:کێ ئاوا دەست نوێژ بگرێ، پاشان دوو ڕکەعەتی کردو داڵغەی تێدا لێ نەدرا، لەگوناهی ڕابردووی دەبورێت. (ابن شهاب) دەڵێ: زاناکانی خۆمان دەڵێن: ئەم دەستنوێژە تەواوترین دەست نوێژە، کەیەکێ لە ئێمە بۆ دەستنوێژی دەگرێت) [1].

### مەرجەکانی دروست بوونی(شروط صحته):

(١) نیاز (نییەت): وەکو (ﷺ) فەرمویەتی(انما الأعمال بالنيات) [2].
واتە: کارەکان بەنییەتو مەبەست دادەمەزرێت.

---

(١) متفق عليه: م(١/٢٢٤/٢٢٦) خ(١/٢٢٦/١٦٤) د(١/١٨٠/١٠٦) نس(١/٦٤).
(٢) متفق عليه: (البخاري ١/٩/١) مسلم(١/١٥١٥/١٩٠٧).

بەزمان وتنی نیەت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)نەسەلماوە.

(٢) (بسم الله الرحمن الرحيم) کردن: لەفەرمودەداهاتووە:(لا صلاة لمن لا وضوء لە ولا وضوء لمن لم يذكر اسم الله عليه)[١]. واتە : نوێژی کەسێ گیرا نابێ دەستنوێژی نەگرتبێ، دەست نوێژی کەسێ گیرا نابێ ناوی خوای لەسەر نەهێنابێت.

(٣) بەدوای یەکتر داهێنان(الموالات): (پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێکی بینی نوێژی دەکردو بە ئەندازەی درهەمێ پشتی پێ ی تەڕنەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کرد دەست نوێژو نوێژەکەش بگێڕێتەوە)[٢].

## فەرزەکانی دەستنوێژ (فرائضه):

(١)و(٢): شوشتنی دەمو چاوو ئاو لەدەمو کەپو وەرکردن.

(٣) شوشتنی دەست تا ئانیشکەکان[٣].

(٤ ـ ٥) مەسحی تەواوی سەرو دوو گوێچکەکان بەشێکن لەسەر.

(٦) شوشتنی پێ یەکان تا هەردوو گۆزینگەکان.

خودا لەم بارەوە دەفەرموێ :﴿يا ايهاالذين آمنوا اذا قمتم الى الصلاة فاغسلوا وجوهكم وايديكم الى المرافق وامسحوا برؤسكم وارجلكم الى الكعبين....﴾[٤].

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە گەر هەڵسان بۆ نوێژ، دەمو چاوو دەستتان بشۆن تا(لەگەڵ) ئانیشکانو سەرتان مەسح بکەن، وە پێ یەکانتان تا هەردوو گوێزنگان.

ئاو لەلەدەمو کەپو وەرکردن(المضمضة و الاستنشاق) کە بەشێکە لە دەم وچاو، لەبەر ئەوەیە خوا لە قورئاندا فەرمانی کردووە بە شوشتنی دەمو چاوو پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوامی لەسەر کردووەو ئەوانەی باسی دەست نوێژی ئەویان گێڕاوەتەوەو سیفەتی دەست نوێژی ئەویان(ﷺ) بەیان کردووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنی ئاو لە لوتو دەم وەرکردن بەشێکی شوشتنی روخسار، کە

---

(١) صحيح (ص.د ١٦١).

(٢) حسن (ص.جه ٣٢٠) د(١/١٧٤/١٠١) جه(١/١٤٠/٣٩٩).

(٣) صحيح/ ص.د ١٦١ (د: ١/٢٩٦/١٧٣).

(٤) المائدة/٦.

لە قورئاندا هاتووە[١].

دەربارەی ئاو لەدەمو لووت وەرکردن هاتووە: (اذا توضـأ احـدكم فليجعـل في انفـه مـاء اثـم ليستنثر)[٢]. واتە: گەر یەکێ لەئێوە دەست نوێژی گرت با ئاو بخاتە لووتو تێ ی وەربکات.

پێغەمبەر فەرمویەتی(ﷺ): (وبالغ في الاستنشاق الا ان تكون صائما)[٣].

واتە: زۆری ئاو لەدەم وەرکە، مەگەر بەڕۆژو بیت.

لەفەرمودەدا هاتووە: (اذا توضأت فمضمض)[٤].

واتە: گەر دەستنوێژت هەڵگرت ئاوی لەدەم وەرکە.

بەڵام مەسح کردنـی هـەموو سـەر، چـونکە مەسـحی هـەموو سـەر لەقورئانـدا هـاتووە، روونکردنەوەکەشـی بـۆ سـوننەت دەگەڕێتـەوە، لـە(صـحیحین)و غـەیری ئەوانـدا هـاتووە، کـە پێغەمبەر(ﷺ) مەسحی هەموو سەری کردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر واجبی مەسـح کردنـی تەواوی سەر. گەر بوترێ پێغەمبـەر(ﷺ) مەسـحی سـەرو مێزەرەکـەی کـردووە ؟ وەڵام: بۆیـە مەسحی هەندێ سەری کردووە باقی سەری لەسەر مێزەکەی کردووە، ئەمەش بەڵگە نییە لەسـەر ئەوەی، کە پێغەمبەر(ﷺ)مەسحی هەندێ سەری کردووە بەبێ تەواوکردنی لەسەر مێزەر[٥].

سەرەنجام پێویستە سەر مەسح بکرێ، مەسحکەر دەتوانێ تەواوی سەری مەسح بکـات یـان هەر مێزەر مەسح بکات، یان سەرو مێزەر یان کـڵاوو جەمـەدانی هـەردووکیان مەسـح بکـات، هەموو ڕێگاکان دروستن.

دانانی دوو گوێچکەکان بەسەرو واجب بوونی مەسـحیان بـۆ ئـەو فەرمودەیـە دەگەڕێتـەوە (الأذنان من الرأس). واتە: دوو گوێچکەکان بەشێکن لەسەر[٦].

(٧) دەست بردن بەناو ڕیشدا(التخليل): (ان النبـي (ﷺ) كان اذا توضأ اخذ كفا من المـاء

(١) السيل الجرار.

(٢) صحيح (ص.ج ٤٤٣). (نس ١/٦٦).

(٣) صحيح د(١٢٩).

(٤) صحيح د(١٣١).

(٥) تفسير ابن كثير/ به ده ستكارييه وه (٢/٢٤).

(٦) صحيح (ص.جه ٣.٥٧) (جه ٣٥٧) (جه ١/١٥٢/٤٤٣).

فادخله تحت حنكه فخلل به لحيته). واته: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) دەستنوێژی دەگرت مشته ئاوەکی هەڵدەگرت ژێر چەناگەی پێ تەڕدەکردو دەستی دەبردە تاناوڕیشەوە تەڕی دەکرد. دەیفەرموو (هذا ما أمرني ربي عز وجل) [١]. واته : خوای شکۆدارم فەرمانی ئاوا پێ کردووم.

(٨) دەست وەردان لەنێوان پەنجەکانی دەستو پێیەکان (تخليل الاصابع اليدين والرجلين):

لەفەرمودە داهاتووە: (اسبغ الوضوء، وخلل بين الاصابع، وبالغ في الاستنشاق الا ان تكون صائما) [٢]. واته: دەستنوێژ تەواو بکەو نێوان قامکەکان قامك پێداببەو زۆر ئاو لەدەم وەربکە، مەگەر بەڕۆژوبیت.

## سوننەتەکانی دەست نوێژ:

١- سیواك کردن، وەکو پێغەمبەر دەفەرمووێ: (لولا ان اشق على امتي امرتهم بالسواك مع كل وضوء) [٣].

٢- شوشتنی دەست سەرەتای دەست نوێژ، وەکو لە عوسمان گەڕاوەتەوە پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار دەستی شوشتن [٤].

٣- ئاو لە کەپوو دەم وەرکردن بەیەك جار: (انه(ﷺ) تمضمض واستنشق من كف واحدة ففعل ذلك ثلاثا) [٥]. واته: پێغەمبەر (ﷺ) بەیەك مشته ئاو سێ جاری لە دەمو لوت وەرکرد.

٤- زۆر ئاو لە لوتو دەم وەرکردن بۆ غەیری ڕۆژوەوان: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (وبالغ في الاستنشاق الا ان تكون صائما) [٦]. ماناکراوە.

٥- پێش خستنی لای ڕاست بەسەر لای چەپدا:

---

(١) الارواء/٢٩. (د:١٤٥/٢٤٢/١). (هق ٥٤/١).

(٢) رابردوو باسکرا.

(٣) رابردوو باسکرا.

(٤) رابردوو باسکرا

(٥) صحيح (مختصر م ١٢٥) م(٢٣٥/٢١٠/١).

(٦) رابردوو باسکرا.

(كان رسول الله(ﷺ)يحب التيامن في تنعله وترجله وطهوره وفي شأنه كله) [١]. واتە: پێغەمبەر(ﷺ) لای ڕاستی لە پێلاو لە پێ کردنو سەرشانەکردنو هەموو شتەکدا پێی خۆش بووە بەسەر لای چەپی داپێش بخات.

وەلە فەرمودەی عوسماندا هاتووە،کە پێغەمبەر(ﷺ) لای ڕاستی شوشت ئەنجا چەپە.

٦- گوشینو دەست پێداهێنان(الدلك) : (پێغەمبەر(ﷺ)٣/٢ی مشتە ئاوەکی هێنا دەست نوێژی گرتو باسکی پێ گوشی) [٢].

٧- سێ جار شوشتن(التثليث): لەفەرمودەی عوسماندا بینیمان، کە پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار ئەندامانی شوشتووە، ئەم فەرمودەیەش هەر ڕاستە، کە ئاماژە بەدووجار دەکات لە دەست نوێژشوشتنی دا[٣].

مەسحی سەر سێ جار سوننەتە، وەکو لەگێڕانەوەی عوسماندا(ﷺ)دا هاتووە: (فمسح رأسه ثلاثا...) [٤].

٨- ڕیزبەندی(الترتيب):

چونکە لە زۆربەی ڕیوایەتەکانی دەست نوێژدا هاتووە، لە فەرمودەی(صحیح)داهاتووە لە(مقدم بن معديكرب) : (پێغەمبەر(ﷺ)دەست نوێژی گرت، سێ جار دەستی شوشت، سێ جار روخساری شوشت، سێ جار باسکی شوشت، سێ جار ئاوی لەدەمو لوت وەرکرد، پاشان سەریو گوێچکەی مەسح کردن....)[٥].

٩- پاڕانەوە دوای دەست نوێژ: لەفەرمودە داهاتووە: (هەرکەسێ دەست نوێژەکە تەواو بگرێو پاشان بڵێ: (اشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله) ئەوە هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەخرێتە سەرپشت لەکامیان بیەوێ دەڕواتە ژوور) [٦].

(١) متفق عليه (خ ١/٢٦٩/١٨) م(١/٢٢٦/٢٦٨)
(٢) اسناده صحيح (ص. خز ١/٦٢/١١٨).
(٣) حسن صحيح (ص د ١٢٤) خ(١/١٥٨/١٥٨)
(٤) حسن صحيح (ص د ١٠١) (د ١/١٨٨/١١٠).
(٥) صحيح (ص.د ١١٢) (د ١/٢١١/١٢١).
(٦) صحيح (مختصر مسلم ١٤٣) م(١/٢٠٩/٢٣٤).

(الترمذی)ئەمەشی زیادکردووە: (اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المطهرين) [١].
واتە: خوایە بمکەیە کەسێ لەتۆبەکارانو بمکەیە کەسێ لەپاکژان.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (کێ دەست نوێژی گرتو وتی: (سبحانك اللهم بحمدك، اشهد ان لااله الا انت، استغفرك واتوب اليك) ئەوە لە لاپەڕەیەکی سپی(رق)نوسراوە، پاشان مۆرکراوە تا قیامەت ناشکێت) [٢].

١٠- کردنی نوێژەکی دوو ڕکەعەتی دوای دەست نوێژ: (من توضأ نحو وضوئي هذا، ثم قام فركع ركعتين لايحدث فيهما نفسه غفر له ماتقدم من ذنبه[٣]. ماناکراوە .

پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی نوێژی بەیانی دا بەبیلالی(رضي الله عنه)فەرموو: (ئەی بیلال باشترین کار کردوتە لە ئیسلامدا کامیانە، من گوێم لەتەپەی پێ یەکانت بوو لەبەهەشتدا؟ من هیچ کارەکی ئەوەندە باشو گەورەم نەکردووە، بەڵام من هەرکاتێ لە ڕۆژو لەشەودا دەست نوێژێ بگرم بەو دەست نوێژە ئەو بڕە نوێژانە دەکەم کەبۆم بڕیاردراوە بیانکەم) [٤].

## ئەو هۆیانەی دەست نوێژ دەشکێنن (نواقضه):

**(١) هەرشتێ لەپێشو پاش بێتەدەر لە میزو پیسایيو هەوا:** وەکو خوا دەفەرمووێ: ﴿أوجاء احد منكم من الغائط﴾ [٥]. واتە: یان گەریەکێ لەئێوە لە پێشاوکردن بێتەوە.

لەفەرمودە داهاتووە : (لايقبل الله صلاة احدكم اذا احدث حتى يتوضأ، فقال رجل من حضرموت: ماالحدث يا اباهريرة؟ قال: فساء او ضراط) [٦].

واتە: خوا نوێژی هیچ کامێ لەئێوە قبوڵ ناکات گەر بێ دەست نوێژبوو، تا دەست نوێژ نەگرێتەوە، پیاوێ لەحەزرەمەوت ووتی: بێ دەست نوێژ بوون چییە؟فەرموی بالێ بەربوون.

---

(١) صحيح (ص.ت ٤٨) (ت ١/٣٨/٥٥)
(٢) صحيح (الترغيب: ٢٢٠)
(٣) باسكراوە.
(٤) متفق عليه (خ٣/٣٤/١١٤٩) م(٤/١٩١٠/٢٤٥٨).
(٥) المائدة/٦.
(٦) متفق عليه خ(١/٢٣٤/١٣٥) م(١/٢٠٤/٢٢٥).

دیسان دەرچوونی مەزیو وەزی دەستنوێژ دەشکێنێ: (عن ابن عباس-ر-: المني والودي والمذي،اماالمني فهو الذي منه الغسل، واما الودي والمذي فقال: اغسل ذكرك او مذاكيرك وتوضأ وضوءك للصلاة) [١]. (تۆمارکراوە) .

**(٢) خەوی قووڵ (النوم المستغرق):** ئەو خەوەی مرۆڤ تیایدا بێ ئاگا دەبێ، چ جای ئەوەی بە دانیشتنەوە بێو خۆی دامەزراندبێ (النوم المتمكن) لەزەوی دا، یان نەء، (صفوان بن عسال) گێڕاوەتەوە:دەڵێ (پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەردا فەرمانی پێ دەکردین کەلەسەفەردا بووین خوفەکانمان لەپێدانەکەنین تا سێ ڕۆژووشەوان، مەگەر لەبەر لەش گرانی، بەڵام لەپیسایی‌و میزو نوستن نە﴾ [٢].

عەلی(س) لە پێغەمبەری(ﷺ)گێڕاوەتەوە: (العين وكاء السه، فمن نام فليتوضأ) [٣]. واتە: چاوەدەمەوانەی کۆمە، کێ خەوت بادەست نوێژبگرێتەوە. واتە: گەر مرۆڤ بێداربوو ئاگای لەخۆیەتی، هەرچی لێ ی بێتەدەر پێ ی دەزانێ، گەر نوست ئاگای لێ نامێنێت[٤].

**(٣) لەهۆش خۆچوون** بەسەر خۆش کەرەکان یان بە نەخۆشی، چونکە لەخەو لەپێشترە.

**(٤) دەست دان لە شەرمگە بەبێ پەردە بەئارەزوو هەوەسەوە:** (من مس ذكره فليتوضأ)[٥].

واتە: کێ دەستی لەچوکی دا بادەست نوێژبگرێتەوە.

بەڵام فەرمودەی (هل هو الابضعة منك) [٦].واتە: ئەی چووك ئەندامێکی خۆت نییە؟. ئەمە لەکاتێ دایە کەدەست لێدانەکە بەهەوەسەوە نەبێ، چونکە ئەوکاتە دەست لێدانی چووك وەکو دەست دانە لەهەر ئەندامێکی تری لەش، بەڵام گەر بەئارەزووەوە بوو ئەوکاتە وەکو دەست دان لەئەندامەکانی تر نییە، چونکە بەزۆری بەئارەزوو شەهوەت پەیوەست ناکرێ، ئەمەش وەکو

---

(١) باسکراوە.

(٢) حس: (ص.نس ١٢٣) ت(١/٦٥/٦٩) نس(١/٨٤).

(٣) حسن (ص.جه ٣٨٦) جة(١/١٦١/٤٧٧) (د: ٢٠٠/١/٣٤٧).

(٤) نيل الأوطار للشوكاني/١/٢٤٢.

(٥) صحيح: (ص.جه ١/١٦١/٤٧٧) (د ١/٣٠٧/١٧٩).

(٦) صحيح: ص. جه ٣٩٢) د(١/٣١٢/١٨٠) نس(١/١٠١) (ت ١/٥٦/٨٠).

دیارە ئاشکرایە[١].

**(٥) دەست نوێژگرتنەوە لەگۆشتی وشتر:**

(توضئوا من لحوم الإبل ولا توضئوا من لحوم الغنم)[٢].

واتە: دەستنوێژ دوای خواردنی گۆشتی وشتر هەڵبگرنەوە، بەڵام لەگۆشتی مەڕو بزن هەڵمەگرنەوە. پیاوێ لە پێغەمبەر(ﷺ)ی پرسی: (ئایا لەگۆشتی مەڕو بزن دەست نوێژ بگرینەوە؟ فەرموی: (ان شئت توضأ، وان شئت لا تتوضأ . قال: انتوضأ من لحوم الابل؟ قال نعم توضأ من لحوم الابل)[٣]. واتە: گەر مەبەستتە دەست نوێژ بگرە، گەرنا مەیگرەوە، ئەنجا وتی: ئایا لەگۆشتی وشتر دەست نوێژ بگرمەوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ لەگۆشتی وشتر دەست نوێژ بگرەوە.

**ئەو شتانەی پێویستە دەستنوێژیان بۆ بگیرێ (ئەو شتانەی لەسەر بابای بێ دەست نوێژ حەرامن):**

(١) نوێژ: خوادەفەرمووێ:﴿اذا قمتم الى الصلاة فاغسلوا وجوهكم...﴾ . المائدة/٦ . واتە: گەر چوون بۆ نوێژ دەمو چاوتان بشۆن. پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: (لايقبل الله صلاة بغير طهور)[٤]. ماناکراوە .

(٢) سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا(تەواف):

پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: (الطواف بالبيت صلاة، الا ان الله احل فيه الكلام)[٥]. واتە: تەوافی کەعبە نوێژە، بەڵام خوا قسەکردنی تێدا ڕەواکردووە.

**ئەو شتانەی سوننەتە دەستنوێژی بۆ هەڵبگیرێت :**

(١) يادی خوای گەورە: (المهاجر بن قنفذ) سەلامی لە پێغەمبەر(ﷺ)کردووە دەست نوێژی

---

(١) تمام المنة (١٠٣).

(٢) صحيح: (ص.جة ٤٠١) (د ١/٣١٥/١٨٢) (ت١/٥٤/٨١) (جة ١/١٦٦/٤٩٤)

(٣) صحيح (مختصر م ذ٤٦) م(١/٢٧٥/٣٦٠).

(٤) رابردو باسکراوە.

(٥) صحيح (ص. جه ٣٩٥٤) (د ٢/٢١٧/٩٦٧).

دەگرت، وەلاّمی نەدایەوە تا دەست نوێژی تەواوکرد، ئەنجا وەلاّمی دایەوەو فەرموی: (انه لم يمنعني ان ارد عليك الا اني كرهت ان أذكر الله الا على طهارة) (١). واتە: من هەر لەبەر ئەوە وەلاّمی سەلامی تۆم نەداوە چونکە ویستم تەنیا بەدەست نوێژەوە ناوی خودا بهێنم.

**(٢) نوستن:** پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: (کاتێ هاتیە جێگای نووستن دەست نوێژەکی وەکو دەست نوێژی نوێژ هەلّبگرە، پاشان لەسەر لای ڕاست پالّ بکەوە، پاشان بلّێ: (اللهم اسلمت نفسي اليك، ووجهت وجهي اليك، وفوضت امري اليك، والجأت ظهري اليك، رغبة ورهبة اليك، لاملجأ ولا منجى منك الااليك، اللهم امنت بكتابك الذي انزلت، ونبيك الذي ارسلت) گەر تۆ ئەو شەوە ژیانت سپارد تۆ لەسەر (فطرة) سروشت مردوویت، ئەوانە بکە دوا وشە کە بەسەر زمانت دا دێن) (٢).

**(٣) لەش پیس (الجنب):** کاتێ ویستی بخوات یان بخواتەوە یان بخەوێ یان دووبارە کاری جووت بوون(الجماع) ئەنجام بداتەوە: عائیشە(رچى الله عنها) دەلّێ: (كان النبى (ﷺ) اذا كان جنبا فاراد ان يأكل او ينام توضأ وضوءه للصلاة)(٣).

واتە: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لەش پیس دەبوو دەیویست بخوات یان بنوێ دەستنوێژی هەلّدەگرت وەکو دەستنوێژی نوێژ عەماری کوڕ یاسر (رضي الله عنه) گێڕاویەوە(پێغەمبەر (ﷺ)ڕێگەی بە لەش پیس داوە کاتێ ویستی بخوات‌و بخواتەوەو بخەوێ کە دەستنوێژەکی وەکو دەستنوێژی نوێژ هەلّبگرێت) (٤).

دەفەرمووێ (ﷺ):( إذا اتى احدكم اهله ثم اراد ان يعود فليتوضأ) (٥).

واتە: کێ چووە لای ژن بۆ کاری جووت بوون پاشان ویستی دووبارەی بکاتەوە با دەست نوێژ بگرێتەوە.

**(٤) بەر لە خۆشوشتنەوە (غوسل) واجب بێ یان سوننەت بێت:** عائیشە دەلّێ: (کاتێ

---

(١) صحيح (ص. ٢٨٠) (د ١/٣٤/١٧) ج(١/١٢٦/٣٥٠).
(٢) متفق عليه (خ١١/١٠٩/٦٣١١) (م ٤/٢٠٨١/٢٧١٠).
(٣) صحيح/ مختصر مسلم/١٦٢) م(٢٤٨/٢٢/٣٠٥) (نس ١/١٣٨).
(٤) صحيح د (١/٣٧٥/٢٢٢).
(٥) صحيح: (ص.ج ٢٦٣) م(١/٢٤٩/٣٠٨)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی لە لەش پیسی دەشوشتەوە لە پێشدا دەستەکانی دەشوشتن، پاشان بەدەستی ڕاستی ئاوی دەکرد بە دەستی چەپی داو شەرمگەی دەشوشتن، پاشان دەست نوێژی دەگرت وەکو بۆ نوێژ بیگرێت)[١].

**(٥) خواردنی ئەوەی ئاگری بەرکەوتووە برژاوەو کولاوە:** (توضئوا مما مست النار). واتە: ئەوەی ئاگری بەرکەوتووە دەستنوێژی لێ بگرنەوە. ئەمەش سوننەتە، گەرنا(عمر بن امیە الضمري) دەڵێ: (لە شانی مەڕێك گۆشتی لێ دەکاتەوە ولێی دەخوات، بانگی نوێژ درا چەقۆکەی فڕێ داو نوێژی کردو دەست نوێژی نەگرتەوە)[٢].

**(٦) بۆ هەموو نوێژێك:** (بریدە) گێڕایەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژی دەگرت، لە ڕۆژی گرتنی مەککەدا دەست نوێژی گرتو مەسحی خوفی کردو پێنج نوێژەکانی بەیەك دەست نوێژ کردن، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ کارێکت کرد لە ڕابردو وات نەکردووە فەرمووی:(عمدا فعلتە یا عمر). واتە: ئەی عومەر بە ئەنقەستم وام کرد[٣].

**(٧) لە کاتی هەموو بێ دەست نوێژییەك (الحدث) دا :** (پێغەمبەر(ﷺ) بەیانی یەکی کردەوەو بانگی بیلالی کرد -ر- فەرمووی: بەچی پێش من لە بەهەشت بوویت، من ئیمشەو چوومە بەهەشت گوێم لە خشە خشی تۆ بوو لە پێش خۆمەوە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر بانگەکی داومە دوو ڕکەعەتم نوێژ کردووە، گەر بێ دەست نوێژ بووم لەو کاتەدا دەست نوێژم گرتۆتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆیە وابووە)[٤].

**(٨) لە ڕشانەوە (القيء) :** (پێغەمبەر(ﷺ) ڕشایەوە ڕۆژووی شکاندوو دەست نوێژی گرتەوە) لە مزگەوتی دیمەشق تووشی(پوبان) بووم ئەوەم باسکرد، وتی: ڕاستە، خۆم ئاوم کردە دەستی یەوە)[٥].

---

(١) صحيح (مختصر م ١٥٥)، م(١/٢٥٣/٣١٦).

(٢) صحيح (مختصر مسلم ١٤٨) م(٣٥٥ـ٩٣ـ ١/٢٧٤).

(٣) صحيح (مختصر م ١٤٢) م(١/٢٣١/٢٧٧).

(٤) صحيح (ص. ج ٧٨٩٤) ت(٥/٢٨٢/٣٧٧٢).

(٥) صحيح (تمام المنة ص١١١) ت(١/٥٨/٨٧) د(٧/٨/٢٣٦٤). (توضأ)ی تیدانییە.

**(٩) بۆ هەڵگرتنی مردوو:** (من غسل ميتا فليغتسل، ومن حمله فليتوضأ)[١].

واتە: کێ مردوویەکی شوشت با خۆی بشواتەوە، کێ مردوویەکی هەڵگرت با دەستنوێژ بگرێت.

**دەستی تەڕهێنان بەسەر خوف (المسح على الخفين):**

عەللامە(النووي –رحمه الله-) لە (شرح مسلم ٣/١٦٤دا دەڵێ:

ئەوانەی متمانەیان پێ دەکرێ کۆکن لەسەر ئەوە کە مەسح کردن لەسەر خوف (الخف) بۆ سەفەرو ماڵەوە دروستە، بۆ پێویستی بێ یان نە، تا ئەو ژنەی هەر لە ماڵەوەیە، ئەو کاتەی ناشرِوات بۆی دروستە. تەنیا شیعەو خەواریجەکان بەدروستی نازانن، قسەی ئەوانیش پەسەند ناکرێت. حەسەنی بەسری –ر- دەڵێ: (حەفتا سەحابی بۆیان گێڕاومەوە، کە پێغەمبەر(ﷺ) مەسحی خوفی کردووە). (تەواو).

باشترین گێڕانەوە، کە پشتی پێ دەبەسترێ بۆ دروستی مەسح ئەوەیانە(مسلم) لە(جەریر گێڕاویەوە:

(همام)دەڵێ:(جەریر میزی کرد، پاشان دەست نوێژی گرتو مەسحی سەر خوفەکانی کرد. نەفەرێ پێی وت: ئاوادەکەیت؟ وتی: بەڵێ، من پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی میزی کرد، ئەنجا دەست نوێژی گرتو خوفی مەسح کردن. (الاعمش) دەڵێ: ئیبراهیم وتویەتی: ئەم فەرمودەیانم زۆر بەدڵە، چونکە ئیسلام بوونی جەریر دوای دابەزینی سوڕەتی(المائدة)یە.

(النووي)دەڵێ: خوا لە سورەی (المائدة)دا دەفەرمووێ﴿فاغسلوا وجوهكم وايديكم الى المرافق وامسحوا برؤسكم وارجلكم الى الكعبين﴾ . گەر جەریر پێش دابەزینی ئەم سوڕەتە موسڵمان بووبێ، ئەوە دوور نییە ئەم فەرموودەیە نەسخی ئەم ئایەتەی کردبێ، گەر دوای هاتنی ئەم ئایەتە موسڵمان بووبێ وتەکەی کاری پێدەکرێت، ئەوە دەردەخات مەبەست لەئایەتەکە خاوەن خوفەکان ناگرێتەوەو سوننەتەکە تایبەت کراوە بۆ ئایەتەکە(خوا زاناترە).

---

(١) صحيح (الجنائز ٥٣) أ(٢/١٤٥/٤٨٦) حب(١٩١/٧٥١) هق(١/٣٠٠) ت(٩٩٨/٢/٢٣١) لەمانای رواڵەتی دا غوسلەکە واجبە، بەڵام لەبەر ئەم فەرمودەیەی (ابن عباس ـ ر ـ) وا نالێین، کە پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: (ليس عليكم في غسل ميتكم غسل اذا غسلتموه، فان ميتكم ليس بنجس، فحسبكم ان تغسلوا ايديكم) رواه كم(١/٣٨٦) (هق ٣/٣٩٨) بە هەندێ دەسکاری (احكام الجنائز للألباني/ص٥٣).

## مەرجەکانی مەسح کردن :

(مەرجە ئەوکەسەی خوف دەکاتە پێی، لەسەر دەست نوێژ بیکاتە پێیەوە: موغیرەی کوڕی شوعبە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا بووم(ﷺ)شەوێ لەکاروانێکدا، ئاوم لەدەفرێکەوە بەدەستیدا کرد، دەم و چاوو باسکی پێ شوشتن، ئەنجا مەسحی سەری کرد، پاشان خۆم داهێنایەوەخوفی لەپێیەکانی دابڕنم، فەرمووی: (دعهما فاني ادخلتهما طاهرتين) [1]. واتە: لێ یان بگەڕێ من لەسەردەست نوێژ کردومنە پێیەکانم . ئەنجا مەسحی کردن.

ماوەی مەسح: عەلی کوڕی ئەبو تالیب(ﷺ)فەرمویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) سێ ڕۆژی بەشەوەوە بۆ بابای گەشتیار داناوەو شەوو ڕۆژێکی بۆ بابای نیشتەجێ لەماڵەوە داناوە[2].

شوێنی مەسحو سیفەتەکەی: ئەو شوێنەی شەریعەت دایناوە مەسح بکرێ پشتی کاڵەیە، وەکو پێشەوا عەلی(س)فەرمویەتی: گەر بەڕەئی بوایە دەبوایە بنی خوف نەك سەرەوەی مەسح بکرێ، پێغەمبەری خوام(ﷺ)بینی سەرەوەی کاڵەی مەسح کرد[3].

## مەسحی گۆرەویو نەعل:

چۆن دروستە لەسەر کاڵە مەسح بکرێ لەسەر گۆرەویو نەعل دروستە (ان النبي-ص- توضأ ومسح على الجوربين والنعلين) [4].

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەست نوێژی گرتو سەر گۆرەویو نەعلی مەسح کرد (عبيد بن جريج) گێڕاویەوە: نەفەرێ بە (ابن عمر)ی وت: دەبینین کارێ دەکەی کەسی ترمان نەبینیوە وابکات، وتی:چی یە؟ وتیان:(دەبینین ئەو نەعلە سەبتی یانە دەکەیەپێ. وتی: خۆم پێغەمبەری خوام -دخ-بینیوە کردوویە پێو دەست نوێژی پێوەگرتووەو مەسحی لەسەر کردووە.

---

(١) متفق عليه (م ٢٧٤ ـ ١/٢٣٠/٧٩) (خ ١/٣٠٩/٢٠٦). بە کورتی

(٢).صحيح (مختصر م ١٣٩) م(٢٣٢١/٢٧٦) (نس ١/٨٤).

(٣) صحيح الاراوء (١٠١) (د ١/٢٦٩/١٥٩) ت(١/٦٧/٩٩).

(٤) حسن (الاراوء ١٠٤) ت(١/٦٥/٩٦) (نس ١/٨٤).

## ئەوەی مەسح بەتاڵ دەکاتەوە :

### مەسح بەسێ هۆ بەتاڵ دەبێتەوە:

(١) بەسەرچوونی ماوەکەیان: چونکە مەسح کاتی یە وەکو زانیتو نابێ لەوماوەیە دیاری کراوە پتر بێت.

(٢) (صفوان) دەڵێ:(پێغەمبەر(ﷺ) لەسەفەردا فەرمانی پێدەکردین کەلەسەفەردا بووین خوفەکانمان لەپێ دانەکەنین تا سێ ڕۆژو شەوان، مەگەر لەبەر لەش گرانی نەبێ، بەڵام لەپیسایی‌و میزو نوستن دا نەو[1].

(٣) داکەندنی خوف‌و و گۆرەوی لەپێیەکان: چونکە گەر دابکندرێن‌و پاشان بکرێنەوە پێیەکان واتە بەدەست نوێژو بەپاکی نەکرانەوە پێیەکانی، مانای ئەوەیە بەدەست نوێژو بەپاکی نەکرانەوە پێیەکان.

بۆ سوود لێ وەرگرتن: تەواو بوونی ماوەو لەپێدانانی ئەو شتانەی مەسحیان لەسەر کراوە بەتەنیا مەسحەکە بەتاڵ دەکەنەوە، دروست نییە تا دەست نوێژ نەگیرێ‌و پێیەکان نەشۆردرێن‌و لەپێ نەکرێن مەسح بکرێن، بەڵام ئەگەر لەکاتی داڕنینی ئەو مەسح کراوانە یان تەواو بوونی کاتیان گەر دەست نوێژی هەبێ ئەو کاتە لەسەر دەست نوێژەکەی دەمێنێتەوەو چەندی بوێ دەتوانێ نوێژبکات.

بۆ سوود لێ وەرگرتن: هەرکەس گۆرەوی لەسەر دەست نوێژبکاتە پێ، پاشان مەسحی کردن، بەشی سەرەوەی داڕنی دوای مەسح، دەتوانی ماوەکە بەمەسح کردن لەسەر بەشی خوارەوە تەواوبکات، چونکە ئەو ڕاستی یە دەردەخات کەپێیەکانی بەدەست نوێژەوە خستۆتە ناو گۆرەوییەکانیەوە، بەڵام گەر یەك گۆرەوی کردەپێ‌و مەسحی کرد پاشان گۆرەویەکی تری لەسەر کردنە پێ‌وەو ئەوە مەسحی نەکردووە، چونکە بڕوای پێناکرێ بەدەست نوێژەوە لەپێی کردبن[2].

---

(١) حسن (الارواء ١٠٤) ت(١/٦٥/٩٦) نس(١/٨٤).

(٢) عەللامە ئەلبانی وای پێ گوتم (رحمه الله).

# خۆشوشتنەوە (الغسل)

## ئەو هۆیانەی غوسل واجب دەکەن:

(١) : دەرچوونی تۆو(المنی) لەبێداری یان لەخەودا، وەکو لە فەرمودەداهاتووە:(انما الماء من الماء)[1]. واتە:ئاو تەنیا لەئاوە.

(ئوم سەلمە)ی دایکی موسڵمانان(رضي الله عنها) لە(ام سليم)-ر-دەگێڕێتەوە، کە وتی: (ئەی پێغەمبەری خودا بێگومان خوداوەند لەحەق شەرم ناکات، ئایا گەر ژن شەیتانی بوو (احتملت) غوسلی لەسەرە؟ فەرمووی: (نعم اذا رأت الماء)[2]. واتە:بەڵێ،گەر ئاوی بینی.

ئارەزوو لەبێداری دا مەرجە نەك لەخەودا، وەکو لەفەرمووده داهاتووە:(اذا حذفت الماء فاغتسل من الجنابة،فاذا لم تكن حاذفا فلا تغتسل)[3]. واتە، ئەگەر تۆواو بەفیچق بوو غوسل لەلەش پیسی بکە، گەر بەفیچق نەبو خۆت مەشۆوە. (الشوكانی)[4] وتویەتی:(الحذف)دەرپەڕینە، تەنیا لەباری ئارەزوودا ڕوودەدات، بۆیە نووسەر باسی کردووە کەئەمە ئاگاداری ئەوەیە، ئەو ئاوەی بەبێ ئارەزوو دەردەچێ لەبەرنەخۆشییە یان لەبەر ساردو سەرمایەو غوسل واجب ناکات) هەرکەسێ شەیتانی بوو ئاوی نەبینی غوسلی لەسەر نییە، بەڵام گەر کەسێ ئاوی بینیو خەونی لەیادنەمابوو غوسلی دەکەوێتە سەر، (لە پێغەمبەر(ﷺ)پرسیار کرا: لەپیاوێ ئاو دەبینێو خەونی لەیادنەماوە فەرمووی: غوسل دەکات، دەربارەی پیاوێ لێ ی پرسیار کرا کەشەیتانی دەبێو ئاونابینێ؟فەرمووی: غوسلی لەسەر نییە)[5].

(٢) کاری جووت بوونو سێکسی(الجماع) گەرئاویش نەیەتەوە: (اذا جلس بين شعبها الاربع

---

(١) مختصر مسلم (صحيح ١٥١) م(١/٢٦٩/٣٤٣).

(٢) متفق عليه: خ(١/٣٢٨/١٣٠) م(١/٢٥١/٣١٣)

(٣) اسناده حسن صحيح (الارواء ١/١٦٢/١٦٢). أ(١/٢٤٧/٨٢).

(٤) نيل الأوطار.

(٥) صحيح (ص.د ٢١٦) (ت ١١٣ ـ/١/١٧٤) د(١/٣٩٩/٢٣٣).

ثم جهدها فقد وجب الغسل وان لم ينزل)[(١)]. واتە: گەر پیاو لەنێوان چوارپەلی ژندا دانیشت‌و پاشان سەری چوکی ون کرد لەزێی ژندا، ئەوە غوسلی واجب بووە گەر ئاویش نەهاتبێتەوە.

(٣) موسڵمان بوونی کەسێکی ناموسڵمان: (قەیس بن عاصم) گێڕاویەوە: (ئەو موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی دایە، کە بە ئاوو مۆرد(السدر) خۆی بشوات[(٢)].

(٤) پاکبوونەوە لەبێنوێژی(حەیز)و زەیستانی(النفاس): پێغەمبەر(ﷺ)بەفاتیمەی کچی جەحشی فەرموو: (اذا اقبلت الحيضة فدعي الصلاة، واذا ادبرت واغتسلي وصلي)[(٣)]. واتە:گەر حەیزت هاتە پێش نوێژمەکە، گەر چاك بوویت خۆت بشۆو نوێژبکە.

(٥) ڕۆژی هەینی: (غسل الجمعه واجب على كل محتلم)[(٤)]. واتە:خۆشوشتنی ڕۆژی هەینی ئەرکەو واجبە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ و پێگەیشتوو.

## ڕوکنەکانی غوسل:

(١) نییەت و مەبەست (انما الاعمال بالنيات)[(٥)].(ماناکراوە) .

(٢) ئاو هەموو لەش بگرێتەوە .

## سوننەتەکانی غوسل:

کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) غوسلی لەش پیسی دەکرد، لەپێشدا دەستی دەشوشتن، پاشان بەدەستی ڕاستی ئاوی دەکرد بەدەستی چەپی داو شەرمگەی دەشوشت، پاشان دەست نوێژی گرت وەکو بۆنوێژ، دوایی قامکی دەبردن بەناو قژو مووەکانی دا، کاتێ غوسلی تەواو دەکرد سێ مشتە ئاوی بەسەر سەری دادەکرد، پاشان بە هەموو لەشی دا ئاوی دەڕشت، دوایی

(١) صحيح (مختصر م ١٥٢) (م ١/٢٧١/٣٤٨).

(٢) صحيح الارواء (١٢٨) نس(١/١٠٩) ت(٢/٥٨/٦٠٢).

(٣) متفق عليه (خ٣٢٠/١/٤٢٠). م(١/٢٦٢/٣٣٣) (د ١/٤٦٦/٢٧٩) ت ١/٨٢/١٢٥).

(٤) متفق عليه (خ ٣٥٧/٢/٨٧٩) (م ٢/٥٨٠/٨٤٦).

(٥) باسکراوە.

پێیەکانی شوشتن)[١].

سوودێ: لەسەر ژن واجب نییە کەزیو قژی هۆنراوەی بکاتەوە لە کاتی غوسلی لەش پیسی دا، بەلاّم لە غوسلی بێ نوێژیدا (الحیض) واجب دەبێت.

(ام سلمة) هەزار ڕەحمەتی لێ بێ فەرمویەتی: (بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)م وت: ئەی پێغەمبەری خودا من کەزیم (الضفر) کردووە، ئایا بۆ غوسلی لەش پیسی بیانکەمەوە؟ **فەرمووی:(لاانما ان تحثی علی رأسك ثلاث حثیات ثم تفیضین علیك الماء فتطهرین)**[٢]. واتە: (ئەوەندەت بەسە کە سێ مشتە ئاو بەسەر سەرتدا بکەی، پاشان ئاو بەسەر خۆتدا بکەی، ئەوە پاك بوویتەوە).

عائیشە(رضي الله عنها) گێڕایەوە ئەسماء (رضي الله عنها) لە ڕاست غوسلی حەیزی لە پێغەمبەری خودا پرسی؟ فەرمووی: (تأخذ احداکن ماءها وسدرتها، فتطهر فتحسن الطهور، ثم تصب علی رأسها فتدلکه دلکا شدیدا، حتی تبلغ شئون رأسها ثم تصب علیها الماء، ثم تأخذ فرصة ممسکة فتطهر بها). واتە: هەر کام لە ئێوە ئاوو مۆرد هەڵدەگرێ خۆی پێ پاکژ دەکاتەوە، پاشان ئاو بەسەر سەری دادەکاتو بە توندی دەیگوشێو دەستی پێدا دێنێ تا دەگاتە بن سەری، پاشان ئاوی بەسەردا دەکات، دوایی پەڕۆیەکی بە میسك کراو هەڵدەگرێ خۆی پێ پاکژ دەکاتەوە. ئەسماء وتی: چۆن خۆی پێ پاکژدەکاتەوە؟ فەرموی: (سبحان الله تطهري بها). بێ گەردی بۆ خوا، خۆی پێ پاکژدەکاتەوە. عائیشە وتی وەك ئەوە بشارێتەوە (وبەدزیەوە پی ی بڵێ): شوێنەواری خوێنەکە (لە شەرمگەکەدا) لا دەبەیت. لە ڕاست غوسلی لەش پیسی لێ ی پرسی: فەرمووی: (تأخذ ماء فتطهر فتحسن الطهور او تبلغ الطهور ثم تصب علی رأسها فتدلکه حتی تبلغ شئون رأسها ثم تفیض علیها الماء)[٣].

واتە: ئاو هەڵدەگرێو جوان پاکژی دەکاتەوە، پاشان ئاو بەسەر سەری دا دەکاتو دەیگوشیو دەستی پێدا دێنی تا دەگاتە پێستی سەری، پاشان ئاوی بەسەردا دەکات. ئەم

---

**(١) متفق علیه.**

**(٢) صحیح (الارواء ١٣٦))مسلم ١/٢٥٩/٣٣٠) (د ١/٤٢٦/٢٤٨).**

**(٣) صحیح (مختصر م ١٧٢) م(٣٣٢ ـ ٦١ ـ ١/٢٦١).**

فەرموودەیە بەڕوونی جیاوازی کردووە لە هەردوو غوسلدا، غوسلی حەیزو لەش پیسیی دا، لەسەر ژنی بێ نوێژی جەخت کردووە کە زۆر دەستی پێدا بێنێو جوان بیشوات، بەلاّم لەلەش پیسی دا وای توند باس نەکردووە، دیسان فەرموودەی(ام سلمة) بەڵگەکە لە کاتی لەش پیسی دا کردنەوەی کەزی واجب نییە[١]. کردنەوەی کەزیەکان بۆ ئەوەیە ئاوەکە بەباشی ژێرمووەکان تەڕ بکات، بەلاّم لە غوسلی لەش پیسی دا چاپۆشی کراوە، چونکە زۆر دووبارە دەبێتەوەو کردنەوەیان دژوارە، پێچەوانەی غوسلی سوڕی مانگانە ئەوە مانگی یەك جارە[٢].

سوودێ: دروستە ژنو مێرد پێکەوە لەیەك جێگادا خۆیان بشۆنو شەرمگەی یەکتر ببینن، وەکو عائیشە گێڕاویەتەوە: (منو پێغەمبەر(ﷺ)لەکاتی لەش پیسی دا لەیەك تەشتدا خۆمان دەشوشت) [٣].

## غوسلە سوننەتەکان:

**(١) غوسل لەکاتی هەر جووتبوونێکدا:** (ابي رافع) دەڵێ: (پێغەمبەر(ﷺ)شەوێ سەردانی ژنەکانی کردو لای ئەمو ئەم خۆی شوشتووە. وتم: ئەی پێغەمبەر! ئایا بۆیەك غوسل ناکەیت؟ فەرموی: (هذا ازکی واطیب واطهر) [٤]. واتە: ئەوە پاکژترو خاوێن ترە.

**(٢) غوسلی ئەو ژنەی تووشی خوێن چڕکەبووە(المستحاضة):** یان بۆ نوێژی کۆکراوەی نیوەڕۆو ئێوارە غوسلێكو بۆ شێوانو خەوتنان غوسلێكو بۆ نوێژی بەیانی غوسلێك. لەو فەرموودەی عائیشە گێڕایتیەوە، هاتووە(ام حبیبة-ر-) لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)تووشی خوێن چڕکە بوو، پێغەمبەر(ﷺ)و فەرمانی دایە بۆ هەموو نوێژێ غوسلێك بکات) [٥].

---

(١) تهذیب سنن ابي داود لابن القیم (١/١٦٧/١٦٦) بە دەستکارییە وە.

(٢) تهذیب سنن ابي داود لابن القیم (١/١٦٧/١٦٦) بە دەستکاریەوە.

(٣) متفق علیه (م ١/٢٥٦/٣٢١) (خ١/٣٧٤/٢٦٣).

(٤) حسن (ص.جە ٤٨٠/ (د: ١/٣٧٠/٢١٦) جە(١/١٩٤/٥٩٠).

(٥) صحیح (ص.د ٢٦٩) (د: ١/٤٨٣/٢٨٩).

هەروەها هاتووە: (ژنێ لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) تووشی خوێن چرکە بوو فەرمانی دایە نوێژەکان کۆبکاتەوە ئێوارە پێش بخاتو نیوەڕۆ دوابخاتو یەك غوسلیان بۆبکات، دیسان نوێژی شێوان دوابخاتو خەوتنان دوابخاتو یەك غوسلیان بۆبکات، بۆنوێژی بەیانی یەك غوسل بکات[1].

**(٣) غوسل دوای بوورانەوەو لەهۆش خۆچوون (الاغماء):** عائیشە گێڕایەوە: پێغەمبەر(ﷺ)نەخۆشیەکەی لێ گران بوو فەرمووی: ئایا خەڵکی نوێژیان کردووە؟ وتمان: نەء، ئەوان چاوەڕێی تۆن ئەی پێغەمبەری خودا، فەرموی تەشتەکم بۆ پڕ بکەن لەئاو، عائیشە دەڵێ: ئاوامان کرد، خۆی شوشت، پاشان چوو تا بەهەر چۆنێ بێ هەڵسێتە سەر پێیان، بوورایەوە، پاشان هاتەوە هۆش خۆی، فەرموی: ئایا خەڵکی نوێژیان کردووە؟ وتمان نەء، ئەوان چاوەڕێی تۆن ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ، وتی: تەشتەکی پڕلەئاوم بۆدابنێن، ئنیجا وامان، خۆی شوشت وویستی بەهەرچۆنێ بێ هەڵسێتەوە بوورایەوە، پاشان هاتەوە هۆشو فەرموی: ئایا خەڵکی نوێژی کردووە؟ گوتمان خەڵکی چاوەڕێ ی تۆن، پاشان باسی ناردنی ئەبوبەکری کرد...هتد) [2].

**(٤)خۆشوشتن لەشاردنەوەی بێ باوەڕ:** عەلی(ﷺ)گێڕایەوە ئەوهاتە لای پێغەمبەر(ﷺ)و فەرموی ئەبوو تالیب مرد. فەرمووی بچۆ بیشارەوە، کاتێ شاردمەوە گەڕامەوە لای فەرمووی: غوسلێ بکە[3].

**(٥) غوسلی هەردوو جەژنو ڕۆژی عەرەفە:** (البیهقي) لەشافیعی گێڕایەوە(ﷺ) لەزاذان(ﷺ) وتی: پیاوێ پرسیاری لە عەلی(س)کرد لەڕاست خۆشوشتن دا؟ فەرمووی: گەر مەبەستتە هەموو

---

(١) متفق عليه مسلم (١/٣١١/٤١٨) (خ: ١/١٧٢/٦٨٧).

(٢) متفق عليه (م ١/٣١١/٤١٨) خ(١/١٧٢/٦٨٧).

(٣) صحيح الإسناد (الجنائز ١٣٤) نس(١/١١٠). (د ٩/٣٢/٣١٩٨).

ڕۆژێ خۆت بشۆ، کابرا وتی: مەبەستم خۆشوشتن نییە؟ فەرموی: هەینیو عەرەفەو قوربانیو جەژنی ڕەمەزان خۆت بشۆ.

**(٦)خۆشوشتنەوە لە دوای شوشتنی مردوو:** (من غسل میتا فلیغتسل)[1] واتە: کێ مردووەکی شوشت باخۆی بشواتەوە.

**(٧)غوسلی ئیحرام بەستن بۆ حەجو عومرە:** (زید بن ثابت-ر-) گێڕاویەوە: (انه رأى النبي-ص-تجرد لاهلاله واغتسل)[2]. واتە: ئەو پێغەمبەری (ﷺ)بینی بۆ ئیحرام بەستن جلی ئاسایی دانا (وبەرگی ئیحرامی پۆشی).

**(٨)غوسلو خۆشوشتن بۆ چوونە ناو شاری مەککە:** کاتێ(ابن عمر) (رضي الله عنه) دەچووە مەککە لە(ذی طوی) دەمایەوە تابەیانیو خۆی دەشوشت دەیوت پێغەمبەرم(ﷺ)بینیوە وای کردووە[3].

(١) صحیح : (ص، جه ١١٩٥)، جه ١/١٤٦٣/١/١٤٧٠
(٢) حسن: (الارواء ١٤٩)، ت (٢/١٦٣/٨٣١).
(٣) متفق علیه: م (٢٢٧/١٢٥٩-٩١٩/٢) خ(٣/٤٣٥/١٥٧٣)

# دووەم: پاکژی بەخاکی زەوی (تەیەمموم کردن)

**رێگا پێدانی :**

خودا دەفەرمووێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مَّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم.﴾[1].

واتە: (گەر ئێوە نەخۆش بوون یان لەگەشتو سەفەربوون، یان یەکێ لەئێوە لەپێشاو هاتەوە یان دەستتان لەژناناو ئاوتان دەستگیر نەبوو، بەخاکەکی پاکژ تەیموم بکەنو دەم و چاوتانو دەستتان مەسح بکەن.....).

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی: (ان الصعيد الطيب طهور المسلم وان لم يجد الماء عشر سنين)[2].
واتە: خاکی زەوی خاوێن پاکژی مرۆڤی موسڵمانە، گەر دە ساڵانیش ئاوی دەست نەکەوێت.

**ئەو هۆیانەی رێگا بەکردنی تەیەمموم کردن بەخاکو خۆڵ دەدەن:**

لەکاتێدا تەیەمموم کردن حەڵاڵە کەنەتوانی ئاو بەکاربێنی، لەبەر نەبوونی ئاو، یان لەبەر ترسان لەوە ئاوەکە زیانت پێ دەدات بەهۆی نەخۆش بوونو سەرمای زۆر:

(عمر ابن حصين)-ر-گێراویەوە: لەسەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، نوێژی بۆخەڵکی کرد، پیاوێك لەوێ بوو خۆی دابڕی بوو، پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی ها بۆنوێژت نەکرد؟ وتی: لەشم پیس بووە ئاونەبوو. فەرموی(ﷺ): (عليك بالصعيد فانه يكفيك)[3]. واتە: بەگڵی هەڵت گرتبایە ئەوەت بەس بوو.

جابر(رضي الله عنه)فەرموویەتی: (لەسەفەرێکدا کەوتینە رێ، پیاوێ لەخۆمان بەردێکی بەسەر کەوتو شکاندی، ئەنجا شەیتانی بوو، ئەنجا پرسیاری لەهاوەڵانی کرد: ئایا رێگام پێدەدەن

---

(١) المائدة/٥.

(٢) صحيح (ص. ابو داود ٣٢٢) ت(١/٨١/١٢٤). (د: ١/٥٢٨/٣٢٩).

(٣) متفق عليه (خ ١/٤٧٧/٣٤٤) (م ١/٤٧٤/٦٨٢) (نسَ ١/١٧١).

تەیەممو بکەم؟ وتیان هیچ پاساوێ نییە ڕێگات پێ بدەین ئەوەتا ئاوهەیە، خۆی شوشتەوەو مرد، کاتێ چووینەوە لای پێغەمبەر(ﷺ)بەسەرهاتەکەمان بۆگێڕایەوە فەرمووی (ﷺ):(قتلوە قتلهم الله، الا سألوا اذ لم يعلموا، فانما شفاء العي السؤآل، انما كان يكفيه ان يتمم) [(١)]. واتە: کووشتویانە خوابیانکوژێ، ئەی بۆئەگەر نازانن ناپرسن، چونکە چارەی نەزانی پرسیارکردنە، ئەوە تەنیا ئەوەندەی بەس بوو تەیەممو بکات.

عەمری کوڕی عاس گێڕاویەوە: کاتێ بۆ غەزای (ذات السلاسل) نێردرا وتی: من لەشەوێکی سارددا شەیتانی بووم، ترسام گەر خۆم بشۆمەوە بەفەتارەت بچم، تەیەممو کرد ئەنجا پێش نوێژم بۆ برادەرانم کرد لەبەیانی دا. کاتێ گەڕاینەوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەیان گێڕایەوەو فەرمووی: ئەی عەمر تۆ بەلەش پیسی یەوە نوێژت بۆ کردن؟ منیش وتم: ئاخر لەو کاتەی دا ئەم ئایەتەم هاتەوە یاد: ﴿ولا تقتلوا انفسكم ان اللهَ كان بكم رحيما﴾. واتە:خۆتان مەکوژن خودا لەگەڵتان بەبەزەیی یە. پێغەمبەر(ﷺ)خەندەیەکی هاتێو دەنگی نەکرد) [(٢)].

## مانای وشەی ( الصعيد ) چی یە؟

لە(لسان العرب)دا هاتووە: (الصعيد) زەوی یە، هەیە وتویەتی خاکەکی پاکە، وتراویشە هەموو گڵەکی خاوێنە. لەقورئاندا هاتووە: ﴿فتيمموا صعيدا طيبا﴾ .(ابو اسحاق) دەڵێ: (الصعيد) ڕووی زەوییە، دەبێ مرۆڤ دەست لەزەوی بدات، بێ ئەوەی ڕەچاوی ئەوەبکات خۆڵی لێ یە یان لێ نییە، چونکە (صعيد)خۆڵو گڵ نییە، چونکە(صعيد)هەموو زەوی یە بەگڵو شتی ترەوە. ووتویەتی: گەر زەوی هەمووی تاوێربێو گڵی لەسەر نەبێ، بابای تەیەممو کەر دەستی لەو تاوێرەی بداتو دەمو چاوی پێ مەسح بکات ئەوە پاکژی یە. (کۆتایی) [(٣)].

(١) حسن (ص.د ٣٢٦) (د ١/٥٣٢/٣٣٢).
(٢) صحيح: (ص. د ٣٢٣) د(١/٥٣٠/٣٣٠). (أ ٢/١٩١/١٦)(كم ١/١٧١).
(٣) لسان العرب/٢/٢٥٤.

## چۆنیەتی تەیەممەموم (صفة التیمم):

عەماری کوڕی یاسر(رضي الله عنه)گێڕاویەوە: لەشم پیس بوو، ئاوم دەست نەکەوت چووم خۆم خستە ناو خاکەکی خاوێنەوەو نوێژم کرد، لای پێغەمبەری خوام (ﷺ)گێڕایەوە، ئەویش(ﷺ)فەرمووی: (انما یکفیك هکذا، وضرب النبي (ﷺ) بکفیه الأرض ونفخ فیهما، ثم مسح فیهما، وجهه وکفیه) . واتە: ئەوەندەت بەس دەبێ ئاوەها: پێغەمبەر (ﷺ) دەستی لەزەوی داو فووی بە دەستی دا کرد، پاشان دەمو چاوو دەستی پێ مەسح کرد.

سوودێ: بنەما لەتەیەممومدا ئەوەیە کە جێگای دەست نوێژ دەگرێتەوەو چی بە دەست نوێژ ڕێگا دەدرێ بەویش ڕێگا دەدرێ، بەر لەهاتنی کاتی نوێژ ڕێگا دراوە بکرێ وەکو دەست نوێژو بە ئارەزووی خۆ نوێژی پێ دەکرێت وەکو دەست نوێژ.

## ئەو شتانەی تەیەممەموم بەتاڵ دەکەنەوە:

دەست نوێژ شوشتن بەئاو بەچی بەتاڵ دەبێتەوە ئەوا تەیەممومیشیان پێ بەتاڵ دەبێتەوە، دیسان گەر ئاو دەست کەوتو گەر توانرا ئاو بەکار بێنرێ بۆ کەسێك ئاوی دەست نەکەوتووە یان نەیتوانیوە بەکاری بێنێ ئەم تەیەممومە بەتاڵ دەبێتەوە. نوێژەکانی دروست دەبنو گێڕانەوەی لەقسەی ڕاستردا لەسەر نییە بیان گێڕێتەوە.

(ابو سعید الخدري - ر -) گێڕاویەوە: دووکەس چوونە سەفەرێکی، کاتی نوێژ هاتو ئاویان پێ نەبوو، هەڵسان تەیەممومیان کردو نوێژیان کرد، پاشان هەمان کات ئاویان دەست کەوت، یەکێکیان نوێژی گێڕایەوە ئەویتریان نەیگێڕایەوە، پاشان هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) باسەکەیان گێڕایەوە، بەو کەسەی نوێژەکەی نەگێڕایەوە فەرمووی (ﷺ) : (اصبت السنة) واتە: سوننەتەکەت پێکاوەو (واجزأتك الصلاة) پاداشتی نوێژ بۆ نوسرا ، بەڵام ئەوەی تریان کە دەست نوێژی بە ئاو هەڵگرتەوەو نوێژی کردەوە فەرمووی (ﷺ): (لك الأجر مرتین) [1]. دوو خێرت گەیشتوتێ.

سوودێ: کێ دەستی بریندار بوبێو پێچابی، یان شکابێو هەڵی بەستبێتەوە شوشتنی ئەو

---

(١) صحیح: (ص. د ٣٢٧) د(١/٥٣٦/٣٣٤) نس (١/٢١٣).

شوێنەی لەسەر نییە، نە مەسح کردن، نە تەیەمموم بۆ کردنی.

وەکو خوا دەفەرمووێ : ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[1]. لەفەرمودەدا هاتووە: (اذا امرتكم بأمر فأتوا منه ما استطعتم)[2]. واتە: کاتێ فەرمانی شتەکم پێ کردن ئەوەندەی بیتوانن ئەنجامی بدەن.

بە پێی قورئانو سوننەت هەرچی لەمرۆڤ دانەبێ لەسەری لاچووە، ئەم بەخشیشە لەشەرعەودیەو شەرع بە قورئانو سوننەت نەبێ ناچەسپێت، لەقورئانو سوننەتدا نەهاتووە شوێنی برینو نەخۆشی بشۆردرێ کە مرۆڤ نە توانێ، بەمەش قسە لەم بارەوە نامێنێ[3].

## دروستی تەیەمموم کردن بە دیوارەوە[4]:

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (منو (عبدالله بن يسار) کە خزمەتکاری مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو هاتین پێکەوە چووینە لای (ابي جهيم بن حارث بن الصمة الأنصاري) ئەبو جەهیم وتی: (پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لای بیری جەمەل (لەنزیك مەدینە) پیاوێکی تووش هاتو سەلامی لێ کرد، ئەویش (ﷺ) وەڵامی نەدایەوە تا رووی لەدیوارەکە کردو دەمو چاوو دەستی مەسح کرد ئەنجا وەڵامی سەلامی دایەوە)[5].

---

(١) (البقرة: ٢٨٦).

(٢) صحيح: (مختصر مسلم) م(٢/٩٧٥/١٣/٣٧).

(٣) المحلى: ٢/٧٤.

(٤) بە قوڕ بێ یان بەرد بێ، بە زەیت چەورکرابێ، یان نەء، شێخی ئەلبانی (رحمه الله) ئەو فتوایەی دامێ وتی: (وما كان ربك نسيا).

(٥) متفق عليه: خ(١/٤٤١/٣٣٧) م(١/٢٨١/٣٦٩) معلقا.

# حوکم و یاساکانی بێ نوێژی (الحیض) و زەیستانی (النفاس)

بێ نوێژی خوێنەکی ناسراوە لای ژنان لەشەریعەتدا سنور بۆ کەم‌و زۆریەکەی نییەو ئەمە بۆ عادەت‌و نەریت دەگەڕێتەوە.

زەیستانی (النفاس) ئەو خوێنەیە بەهۆی منداڵ بوون دەردەچێ‌و زۆربەی چل رۆژە. (ام سلمه) (﵂) فەرمویەتی: (کانت النفساء تجلس علی عهد رسول الله (ﷺ) اربعین یوما)[1]. واتە: ژنانی زەیستانی لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) چل رۆژ دادەنیشتن. هەر کە ژن بەر لە(چل رۆژ) پاکژ بۆوە ئەوە خۆی دەشوات‌و پاکژ دەبێتەوە، گەر تا دوای چل رۆژ دەوامی کرد ئەوە بۆ چل رۆژە غوسلی کردووەو خاوێن بۆتەوە.

چی لەسەر بابای بێ دەست نوێژ حەڕام دەبێ: لەسەر بابای بێ نوێژو زەیستانیش حەڕام دەبێت، هەروەها جگە لەوانە ئەمانەش حەرام دەبن:

**(١) ڕۆژوو:** بەڵام گەر پاکژ بۆوە دەیانگێڕێتەوە.

(معاذة) گێڕاویەوە لەعائیشەم پرسی: (بۆچی ژنی بێ نوێژ دەبێ ڕۆژوو بگرێتەوە بەڵام نوێژ نەء؟ وتی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەوەمان تووش دەهات، بەگێڕانەوەی ڕۆژوو فەرمانمان پێ دەکرا، بەڵام بۆ نوێژ فەرمانمان پێ نەدەکرا)[2].

**(٢) چوونە لای ژن لەکاتی حەیز بۆ کرداری جووت بوون (الجماع):**

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ﴾[3]. واتە: لەراست حەیزو بێ نوێژی لێت دەپرسن؟ تۆ بڵێ ئەوە ئازارە، لەژنان دوور بکەونەوە ـ بۆ جووت بوون ـ لەکاتی حەیزدا، لێیان نزیک مەکەونەوە تا خاوێن

---

(١) حسن صحیح (ص. جه ٥٣٠) د(١/٥٠١/٣٠٧) ت(١/٩٢/١٣٩) (جه ١/٢١٣/٦٤٨).

(٢) حسن صحیح: (ص. جه ٥٣٠) د(١/٥٠١/٣٠٧) ت(١/٩٢/١٣٩).

(٣) البقرة: ٢٢٢.

دەبنەوە...لەفەرمودەدا هاتووە: (اصنعوا كل شيء الا النكاح)[1].
واتە: هەموو شتێ لەگەڵ ژندا بکەن غەیری چوونە لا نەبێ لەزێوە.

## حوکمی ئەو کەسەی لەکاتی حەیزدا دەچێتە لای ژن:

(النووي - ر - لە(شرح مسلم/٣/٢٠٤)دا دەنوسێ:
هەر کەس بە لایەوە رەوابێ کە چوونە لای ژن لەکاتی بێ نوێژی دا رەوایە ئەوە لەدین چۆتە دەر، گەر مرۆڤێ بە حەرامی ئەم کارە بکات، نەزانێ یان لەیادی نەبێ کە حەیز هەیە یان نـازانێ حەرامە، یان ناچار بکرێ ئەوە تاوانو پێبژاردن (کەفارەت)ی لەسەر نییە. بەڵام گەر بەئەنقەسـت ئەو کارە بکاتو بزانێ حەرامە، ئـەوە حەرامەکـە دیـاری کـراوەو تاوانـەکی گـەورەی کـردووەو شافیعی بە گوناهەکی گەورەی ناویردووەو بۆیە دەبێ تۆبە بکاتو لەراسـت کـەفارەت دوو قـسە هەیە. (کۆتایی).
وتم: قسەی لەپێشتر واجب بوونی کەفارەتە وەکو ابـن عبـاس (ﷺ) لەپێغەمبـەری (ﷺ) گێراوەتەوە: (گەر لەسەرەتای هاتنی خوێن جووت بوو دەبێ دینـارێ کـەفارەت بـدات، یـان نیـو دینار)[2]. بەڵام بەپێی فەرمودەی تری مەوقوفی (ابـن عبـاس): گـەر لەسـەرەتای هـاتنی خـوێن جووت بوم ئەوە دیناری کەفارەتە، گەر لەکۆتایی حەیزدا بـوو ئـەوە نیـو دینـارە) کەواتـە لێـك جیاکراونەتەوە[3].

## خوێن چڕکە (الإستحاضة):

خوێنێکە لەغەیری کاتی حەیزو زەیستانی دا یان لەگەڵ ئەواندا دێتە دەر، گـەر یەکـەمیان ئاشکرا بێ دووەمیان: گەر ژنەکە لەپێشدا حەیزی تری بینـیبێ (معتـادە) ئـەوەی لـەماوەی بـێ نوێژیەکەی تێ پەڕی کرد ئەوە خوێن چڕکەیە وەکو لەفەرمودەدا هاتووە کە(ﷺ) بە (ام حبیبـە)

---

(١) صحيح: (صحيح ابن ماجة ٥٢٧) (م/٢/٣٠٢/٢٤٦/١).
(٢) صحيح: (ص. جە ٥٢٣) د(٢٦١/٤٤٥/١) (نس ١/١٥٣) جە(٦٤٠/٢١٠/١).
(٣) صحيح موقوف: (ص. د ٢٣٨) (٢٦٢/٢٤٩/١).

دەفەرمووێ: (امكثي قدر ما كانت تحبسك حيضتك ثم اغتسلي وصلي)(١).

واتە: بە ئەندازەی حەیزەکانی رابردووت بمێنەوە، پاشان خۆ بشۆو نوێژ بکە. گەر لەنێوان دووخوێندا دیار بوو، حەیز خوێنەکی رەش‌و ناسراوە، بەلام خوێن چرکە وەکو لەفەرمودەی : (فاطمة بنت ابي حبيش) دا هاتووە: (گەر خوێنی حەیز بوو ئەوە رەش‌و ناسراوەو واز لەنوێژ بێنە، گەر خوێنی تر بوودەست نوێژ بگرە ئەوە دەمارێکە)(٢).

بەلام گەر ژنی خوێن چرکەو نەزیف گەر نەیتوانی خوێنەکە جیا بکاتەوە ئەوە بۆ نەریتی ژنەکانی خزمی دەگەرێتەوە، وەکو (ﷺ) بە (حمنه بنت جحش)ی فەرمو: (انما هي ركضة من ركضات الشيطان) واتە: (ئەمە پێ لاقەو زیانەکی شەیتانە).

پاشان فەرمووی (ﷺ) : (٦ ـ ٧) رۆژ لەزانستی خوادا دەکەویە حەیزو مەهکەوە، پاشان خۆت بشۆ، پاشان گەر زانیت پاکژ بوویتەوە (٢٤ یا ٢٣) رۆژ نوێژ بکەو بەرۆژو ببەو، ئەمە پاداشتت دەداتەوە، هەموو مانگێ ئەوە بکە، وەکو چۆن ژنان دەکەونە حەیزەوە، دیسان وەکو چۆن لەکاتی پاکژی دا لەحەیزیان پاکژ دەبنەوە)(٣).

## حوکمەکانی ژنی تووش هاتوو بە خوێن چرکە:

ئەو شتانەی لەسەر ژنی بێ نوێژ حەرامە لەسەر ژنی چرکەدار حەرام نابێ، بەلام دەبێ بۆ هەر نوێژێ دەست نوێژ بگرێت، وەکو بە فاتیمەی ئەبی حوبەیش دەفەرمووێ (ﷺ) : (ثم توضيء لكل صلاة)(٤).

واتە: بۆ هەموو نوێژێ دەست نوێژێ هەڵبدەگرێت. بەلام سوننەتە بۆ هەموو نوێژەکان خۆی بشواتەوە وەکو لەغوسلە سوننەتەکاندا باسکرا.

(١) صحيح الأرواء (٢٠٢) م(٣٣٤ـ ٦٥ ـ ٢٦٤ ـ١/).
(٢) صحيح الأرواء (٢٠٤) نس (١/١٨٥).
(٣) حسن (الأرواء: ٢٠٥) (د: ٢٨٤/١/٤٧٥) (ت:١/٨٣/١٢٨).
(٤) صحيح (ص. جه ٥٠٧) (د: ١٩٥/١/٤٩٠) (جه: ٦٢٤/١/٢٠٤).

# باسی نوێژ (كتاب الصلاة)

ئەو نوێژانەی فەرزن پێنج دانەن: نیوەڕۆ - (الظهر) - ئێوارە (العصر) - شێوان - (المغرب) - خەوتنان (العشاء) بەیانی (الفجر). (أنس بن مالك) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) میعراجی کردو شەوڕەوی کرد پەنجا نوێژی لەسەر فەرزکرا، پاشان کەمکرانەوە بوون بە پێنج دانە، پاشان بانگێش کرا: ئەی موحەممەد (ﷺ) لای من قسە ناگۆڕێ ئەو پێنجانە بە پەنجا نوێژ بۆتۆ هەیە) [١].

عەرەبێ (ئەعرابی) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) سەرلولو ئالۆز بو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێم بڵێ: خوا چەندەی نوێژ فەرز کردووە؟ فەرموی: (الصلوات الخمس الا ان تطوع شيئا) [٢].

واتە: پێنج نوێژە مەگەر هەندێ زیادە سوننەت بکەیت.

## پایەی نوێژ لەئایندا:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بني الإسلام على خمس) ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: (شەهادەی: - لا اله الا الله محمد رسول الله - نوێژو زەکات و حەجی کەعبەو ڕۆژووی رەمەزان) [٣].

## حوکمی نوێژنەکەر:

موسڵمانان کۆکن کە هەرکەسێ بڕوای بە نوێژ نەبێ حیسابی موسڵمانی بۆ ناکرێ، بەڵام لەسەر ئەوە کۆك نین کە ئەگەر کەسێ لەگەڵ بڕوا بوونی بە نوێژ نوێژ نەکات، حیسابی موسلمان

---

(١) متفق عليه (خ: ٧/٢٠١/٣٨٨٧) (م ٢٥٩/١/١٤٥) (ت: ١/١٣١/٢١٣) نە وا بە کورتی.

(٢) متفق عليه (خ: ١/١٠٦/٤٦) (م: ١/٤٠/١١).

(٣) متفق عليه (م: ١٦ـ ٢٠ - ١/٤٥) (خ: ١/٤٩/٨) (ـ: ٤/١١٩/٢٧٣٦) (نس: ٨/١٠٧).

بۆ دەكرێ یان نا هۆیەكەشی ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) لەراست تەركە نوێژ فەرمویەتی (كافرا)، كە جیاوازی كردن لەمیان ئەو كەسەی بڕوای پێ نییە یان كەمتەر خەمە تێی دا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ان بين الرجل وبين الشرك والكفر ترك الصلاة) [١]. واتە: نێوانی پیاوو هاوبەشی پەیداكردنو كوفر نوێژ نەكردنە. (العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر)[٢]. واتە: پەیمانی نێوان ئێمەو ئەوان نوێژە، ئەوەی نەیكات ئەوە كوفری كردووە.

بەڵام رای راستر لەفەرمایشتی زانایان بە (كوفر) لێرەدا كوفری بچووكە، كە لەئیسلامەتی نای باتە دەرو كافر نابێت، وەكو لەفەرمودەی تردا كە كۆیان بكەینەوە ئەوە بەدەر دەكەوێت: (خمس صلوات كتبهن الله على العباد من اتى بهن لم يضيع منهن شيئا استخفافا بحقهن كان له عند الله عهد، ان شاء عذبه وان شاء غفر له) [٣]. واتە: پێنج نوێژن خوا لەسەر بەندەكانی فەرزكردوون، هەركەسێ بیانكاتو نەیانچوێنێ كە سووكایەتی بە مافی ئەوان بكات ئەوە لای خودا پەیمانی هەیە بیخاتە بەهەشتەوە، گەر نەیان كات پەیمانێكی لای ئەو نییە، گەر بیەوێ سزای دەداتو گەر نا لێی خۆش دەبێت).

كاتێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی ئەوانی دایە ویستی خودا، زانیمان نوێژ نەكردنی ئەوان كوفرو شیرك نییە، ئەنجا خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء﴾[٤]. واتە: خوا لەكەسێ خۆش نابێ هیچ هاوبەش یەكی بۆ پەیدا بكات، لەوەی تریان ئەوەی مەبەستی بێ لێی خۆش دەبێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (یەكەم شت لەپەسڵاندا كە خودا لەبەندەی موسڵمانی دەپرسێتەوە نوێژی فەرزە، گەر تەواوی كردبون، گەر نا دەگوترێ بزانن سوننەتی هەیە، گەر سوننەتی هەبون فەرزەكانی بۆ تەواو دەكەن، پاشان لەگەڵ هەموو فەرزەكاندا ئەم كارە دەكرێت)[٥].

---

(١) صحيح (ص. ج ٢٨٤٨) (م: ١/٨٨/٨٢).
(٢) صحيح (جه ٨٨٤) (جه ١/٣٤٢/١٠٧٩) (نس ١/٢٣١) (ت: ٤/١٢٥/٢٧٥٦).
(٣) صحيح: (ص. جه ١١٥٠) (ما: ٩٠/٢٦٦) (أ: ٢/٢٣٤/٨٢) (د: ٢/٩٣/٤٢١).
(٤) النساء:٤٨.
(٥) صحيح: (ص. جه ١١٧٢) (جه: ١/٤٥٨/١٤٢٥).

وە فەرمویەتی (ﷺ): (ئیسلام شوێنی نامێنێ وەکو چۆن رەنگەکانی جلو بەرگێ دێرنامێنێ، تا نازانرێ رۆژو چییە، نوێژ چییە، حەج چییە، زەکات چییە، لەشەوێکدا قورئان هەلدەگیرێتەوە ئایەتێکی لەزەوی دا نامێنرێ، کۆمەڵە کەسانی لەخەڵکی دەمێننەوە لەپیران و بەساڵا چووان دەڵێن: ئەم وشەیەمان (لا اله الا الله) لەباب و باپیرانەوە پێمان گەیشتووەو ئێمەش دەیڵێینەوە، سیلەو پەیوەندی پێی وتن: (ئەم ـ لا اله الا الله ـ بێ سودە، ئەوان نازانن نوێژو رۆژوو حەج و زەکات چییە؟ حوزەیفە رووی لێ وەرگێڕا. پاشان سێ جار لێی دووبارە کردەوە. هەموو ئەوانە حوزەیفە رووی لێ وەرگێڕان، پاشان سێ یەم جار رووی تێ کردو وتی: ئەی سیلەو پەیوەندی لەسزای ئاگر رزگاریان بکە. سێ جار) [1].

## نوێژ لەسەر کێ واجبە؟ لەسەر هەموو موسڵمانەکی پێ گەیشتوو پێویستە:

پێشەوا عەلی (س) لەپێغەمبەر (ﷺ) گێڕاویەوە: (خامە لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: خەوتو تا بێدار دەبێتەوە، منداڵ تا پێ دەگاو باڵغ دەبێ، شێت تا عاقڵ دەبێتەوە) [2].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (مروا اولادكم بالصلاة وهم اولاد سبع سنين، واضربوا عليها وهم اولاد عشر سنين وفرقوا بينهم في المضاجع) [3]. واتە: لە(٧) ساڵی دا فەرمان بە منداڵ بکەن بە نوێژ کردن، لە(١٠) ساڵی لەسەر نوێژ نەکردن لێیان بدەن و سەرجێگایان بۆ جیابکەنەوە (با بەپێکەوە لەژێر بەتانیدا لەگەڵ منداڵی تردا نەخەون).

## کاتەکان:

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) ـ ر ـ گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) جبریلی هاتە خزمەت ـ س ـ و فەرمووی: هەڵسە نوێژ بکە، ئەویش لەکاتی لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا، پاشان ئێوارە هات و فەرمووی: هەڵسە نوێژی بکە، نوێژی ئێوارەی کرد کە سێبەری هەموو شتێ بە ئەندازەی خۆی بوو. پاشان شێوان هات، ئەنجا فەرمووی: نوێژ بکە، ئەویش لەکاتی ئاوابونی خۆردا نوێژی

---

(١) صحيح (ص.جه ٣٢٧٣) (جه ٤٠٤٩/١٣٤٤/٢).

(٢) صحيح: (ص.ج ٣٥١٣) (د: ٤٣٨٠/٧٨/١٢).

(٣) حسن (ص.ج ٥٨٦٨). (د٤٩١/١٦٢/٢) (أ: ٨٤/٢٣٧/٢).

کرد. دوایی خەوتنان هات، ئەویش فەرمووی: نوێژ بکە. ئەنجا نوێژی خەوتنانی کرد لەکاتێ دا زەردەپەڵە (الشفق) نەما. پاشان بەیانی داهات، فەرمووی: نوێژ بکە، ئەویش (ﷺ) نوێژی کرد لەکاتێ دا سپێدەی داو بەرەبەیان دەرکەوت.

دوای ئەوە بەیانی داهات بۆ نوێژی نیوەڕۆ فەرموی: هەڵسە نوێژ بکە، ئەویش لەکاتێ دا نوێژی کرد کە سێبەری هەموو شتێ بە ئەندازەی خۆی بوو، پاشان ئێوارە داهات پێی فەرموو: هەڵسە نوێژ بکە، ئەویش کاتێ نوێژی کرد کە سێبەری هەموو شتێ دوو هەندەی خۆی بو، پاشان شێوان هات لەهەمان کاتدا بوو لێی لانەدا، پاشان خەوتنان هات کە نیوەی شەو رۆیشتبو، یان سێ یەکی شەو هات نوێژی خەوتنانی کرد، دوایی کاتێ دا کە روناکی بە تەواوی دەرکەوت، فەرموی: هەڵسە نوێژ بکە، ئەویش نوێژی بەیانی کرد، پاشان فەرمووی: نێوانی ئەم دوو کاتە کاتی خۆیەتی) [١].

(الترمذي) دەڵێ: بوخاری وتویەتی: راسترین شت لەکاتەکاندا گێڕانەوەی جابرە.

**(١): نیوەڕۆ:** لەلادانی خۆرەوە لەناوجەرگەی ئاسمان تا سێبەری هەموو شتێ دوو هەندەی خۆی دەبێت.

**(٢): ئێوارە:** سێبەر بە ئەندازەی خۆی لێ دێ تا خۆرئاوا دەبێت (دوای سێبەری لادانی ئاسمان).

**(٣): شێوان:** ئەو کاتەیە خۆر ئاوا دەبێ، وەکو (ﷺ) فەرمویەتی: (وقت صلاة المغرب ما لم يغب الشفق) [٢]. واتە: تا زەردەپەڕە وون دەبێ نوێژی شێوان ماوە.

**(٤): خەوتنان:** گەر زەردەپەڕەون بوو تانیوەی شەو (وقت صلاة العشاء الى نصف الليل الأوسط) [٣]. واتە: نوێژی خەوتنان تا نیوەی شەوی ناوەڕاستە.

**(٥): نوێژی بەیانی:** لەهەڵاتنی سپێدەوەیە تا هەڵاتنی خۆر: (وقت صلاة الصبح من طلوع الفجر

---

(١) صحيح: (الارواء: ٢٥٠) (أ: احمد ٢/٢٤١/٩٠) (نس: ١/٢٦٣) (ت: ١/١١/١٥٠).

(٢) حسن (الارواء: ١/٢٦٨) (م: ١/٤٢٧/١٧٣/٦١٢) (د: ٢/٦٧/٣٩٢).

(٣) حسن (الارواء: ١/٢٦٨) (م: ١/٤٢٧/١٧٣/٦١٢) (د: ٢/٦٧/٣٩٢).

ما لم تطلع الشمس)[١]. واتە: کاتی بەیانی لەهەڵاتنی سپێدەوەیە تا خۆر هەڵدێت..

## نوێژی ناوەڕاست کامەیە؟

خوا فەرمویەتی: ﴿حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ﴾[٢]واتە: پارێزگاری لەنوێژەکان بکەن لەگەڵ نوێژی ناوەڕاست. رابوەستن بۆ خودا بە گوێڕایەڵی (قنوت)ەوە.

عەلی (س) فەرمویەتی پێغەمبەر (ﷺ) رۆژی ئەحزاب فەرموی: (شغلونا عن الصلاة الوسطى صلاة العصر، ملأ الله بيوتهم وقبورهم نارا) [٣]. واتە: ئەوان ئێمەیان لەنوێژی ناوەڕاست نوێژی ئێوارە سەرقاڵ کرد خودا خانوبەرەو گۆڕیان پڕ لەئاگر بکات.

سوننەتی پێش خستنی نیوەڕۆ لەسەرەتاوە لەرۆژانی زۆر گەرمادا نەبێت: (كان النبي (ﷺ) يصلي الظهر اذا دحضت الشمس) [٤]. واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ نوێژی نیوەڕۆی دەکردکە خۆر لەناو قەدی ئاسماندا لایدەدا.

سوننەتی خۆ فێنك کردنەوە بە نیوەڕۆ لەرۆژانی چەقەی گەرمی دا:

فەرمویەتی (ﷺ): (اذا اشتد الحر فابردوا بالصلاة، فان شدة الحر من فيح جهنم) [٥]. واتە: کاتێ گەرما توند بوو بە نوێژی ساردبکەنەوە، زۆر گەرمایی بەشێکە لەبڵێسەی دۆزەخ.

## سوننەتی زوو ئێوارەکردن:

ئەنەس دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ ئێوارەی دەکرد کە خۆر هێشتا بڵند بوو، کاتێك کەسێ دەچووە (العوالی) ـ کە ناوچەیەکە لەمەدینە دا ـ دەگەیشتە ئەوێ خۆر هەر بەرز بوو) [٦].

---

(١) حسن (الارواء: ١/٢٦٨) (م: ١/٤٢٧/١٧٣/٦١٢) (د: ٢/٦٧/٣٩٢).

(٢) البقرة: ٢٣٨.

(٣) صحيح (مختصر م ٢١٧) (م: ٦٢٧ ـ ٢٠٥ ـ ١/٤٣٧).

(٤) صحيح الارواء (٢٥٤) (م: ١/٤٣٢/٦١٨).

(٥) متفق عليه (م: ١/٤٣٠/٦١٥). (خ: ٢/١٥/٥٣٣).

(٦) متفق عليه: (خ: ٢/٢٨/٥٥٠) (م: ١/٤٣٣/٦٢١).

**ـ تاوانی ئەو کەسەی نوێژی ئێوارەی بچێت:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الذي تفوته صلاة العصر كأنما وتر اهله وماله) [١].

واتە: ئەو کەسەی نوێژی ئێوارەی دەچێ وەکو ئەوەیە ماڵو منداڵی بە فەتارەت چو بێت.

(کێ نوێژی ئێوارەی بچێ ئەوە کارە چاکەکانی هەڵوەشاونەوە)[٢].

**ـ تاوانی ئەو کەسەی تا زەردایی دوای دەخات:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەمە نوێژی دووڕووە، دادەنیشێ چاوەڕێی خۆرە تا دەگاتە نێوان هەردوو قۆچەکانی شەیتان ئەنجا هەڵدەستێ چوار جار دەنوك بە زەوی دا دەداتو کەم نەبێ یادی خوا ناکات) [٣].

**ـ سوننەتە نوێژی شێوان پەلەی لێ بکرێو دواخستنی پەسەند نییە:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

(لا تزال امتي بخير او على الفطرة ما لم يؤخر المغرب حتى تشتبك النجوم) [٤].

واتە: بەردەوام ئوممەتم لەسەر چاکەیە یان لەسەر سروشتە مادام شێوان دوا ناخەن تا ئەستێرەکان بە تەواوی دەردەکەون.

لە(سلمة بن الأكوع)ەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ نوێژی شێوانی دەکرد کە خۆر ئاوا دەبوو لەبەر چاو ون دەبوو)[٥].

**ـ سوننەتە نوێژی خەوتنان دوا بخرێ مادام دژواری تێدا نەبێت:**

عائیشە گێڕاویەوە: شەوێکیان بە تەواوی دونیا تاریك داهات تا زۆربەی شەو رۆیشتو خەڵکی مزگەوت خەوتن، پاشان ئەو چوو نوێژی کرد فەرمووی: (ئەمە کاتەکەیەتی گەر دژواری

---

(١) متفق عليه (م: ١/٤٣٥/٦٢) (خ: ٢/٣٠/٥٥٢).

(٢) صحيح: (ص. نس ٤٩٧) (خ: ٢/٣١/٥٥٣) (نس: ١/٢٣٦)

(٣) صحيح: (ص. د ٣٩٩) (م: ٢١/٤٣٤/٦٢٢).

(٤) حسن صحيح: (ص.د ٤٠٣) (د: ١/٨٧/٤١٤)

(٥) صحيح: (مختصر م ٢٢٣) (م ٦٣٨ /٢١٩/ ـ ١/٤٤٢).

بۆ ئوممەتەکەمی تیّ دا نەبوایە)[١].

**ـ پەسەند نەبوون (کراهة)ی خەوتن بەر لەنوێژی خەوتنانو قسە کردن لەدوایدا مەگەر لەبەر بەرژەوەندی نەبێت):**

(ئەبو بەرزە) گێراویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوستنی بەر لەنوێژی خەوتنانو قسەکردن بە دوای دا پەسەند نەبو)[٢].

ئەنەس گێراویەوە: (شەوێکی چاوەڕێی پێغەمبەرمان (ﷺ) کرد تا گەیشتە نیوەی شەو، نوێژی بۆ کردین، ئەنجا وتاری بۆ داین، پاشان فەرمووی: (الا ان الناس قد صلوا ثم رقدوا، وانكم لم تزال في صلاة ما انتظرتم الصلاة)[٣]: واتە: بێگومان خەڵکی نوێژیان کردووە ئەنجا خەوتون، ئێوە ئەوەندە چاوەڕێی نوێژتان کردووە لەنوێژدا بوون.

**ـ سوننەتە زوو نوێژی بەیانی بکرێ هەر لەیەکەم ساتیەوە کە کۆتایی شەوە (التغليس):**

عائیشە گێراویەوە (رضي الله عنها): (ئێمە کۆمەڵە ژنەکی موسڵمان بووین لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لەنوێژی بەیانی دا ئامادە دەبوینو خۆمان داپۆشی بوو، کاتێ نوێژیان دەکرد دەچونەوە ماڵەوەو لەبەر تاریکی کەس نەیدەناسین)[٤].

**ـ کەی بە کاتەکە رادەگەیت؟**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ یەك رکەعەت لەسبەینێ پێ ڕابگات بەر لەوەی خۆر هەڵبێ ئەوە فریای نوێژی بەیانی کەوتووە، هەر کەسێ بە رکەعەتێکی نوێژی ئێوارە ڕابگات بەر لەخۆر ئاوابوون ئەوە فریای ئێوارە کەتووە)[٥]. ئەم حوکمەش هەر بە بەیانیو ئێوارەوە پەیوەندی نییە، بەڵکو حوکمەکی گشت گرە، لەفەرمودەدا هاتووە : (من ادرك ركعة من الصلاة فقد ادرك

---

(١) صحيح: (مختصر مسلم ٢٢٣) (م ٦٣٨ ـ ٢١٩ ـ ٢/٤٤٢).

(٢) متفق عليه: خ(٥٦٨/٤٩/٢) (م ٦٤٧ ـ ٢٣٧ ـ ١/٤٤٧) د(٢/٦٩/٣٣٩٤).

(٣) متفق عليه: (خ ٦٠٠/٤٩/٢) م(١/٤٤٣/٦٤٠) (نس : ١/٢٦٨).

(٤) متفق عليه: (خ: ٥٧٨/٥٤/١) (م ٦٤٥/١/٤٤٥).

(٥) متفق عليه: خ(٥٧٨/٥٤/١) م(١/٤٤٥/٦٤٥).

الصلاة) [١].

واتە: کێ فریای یەك رکەعەت نوێژ بکەوێ ئەوە فریای نوێژەکە کەوتووە.

**ـ گێڕانەوەی نوێژە چووەکان (قضاء الفوائت):**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من نسي صلاة او نام عنها فكفارتها ان يصليها اذا ذكرها) [٢]. واتە: هەرکەسێ نوێژی لەیاد کرد یان لەکاتی ئەودا خەوتبوو، کەفارەتی ئەوەیە، کە هەر کاتێ یادی هاتەوە بیکات.

**ـ ئایا هەر کەسێ نوێژ بە ئەنقەست بچوێنێ قەزاو گێڕانەوەی لەسەرە کە کاتەکەی بە سەر چوو بێت؟**

**(ابن حزم) لەراست ئەمەدا (رحمه الله) لە(المحلى) دا (٢/٢٣٥) وتویەتی:**

(خوداوەند بۆ هەموو نوێژێکی فەرز کاتەکی دیاری کراوی بۆ داناوە لەدوولاوە: دەڕواتە ناو کاتەکی دیاریکراوەوەو لەکاتەکی دیاری کراویشدا بەتاڵ دەبێتەوە، جیاوازی نییە لەنێوان کەسێ بەر لەکاتی خۆی دا بیکات یان دوای کاتی خۆی بیکات چونکە هەردووکات لەکاتی خۆیاندا نەکراون. دیسان قەزا هێنانی شەرعە، شەرع بۆ خوا نەبێ دروست نابێ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ)، گەر قەزاو نوێژ گێڕانەوە واجب بووایە لەسەر ئەو کەسەی بە ئەنقەست نوێژی چواندووە کە لەکاتی خۆی چووە دەر، خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لەوە بێ ئاگا نەبوون و لەیادیان نەچووەو بەئەنقەست بەیانکردنی ئەوەیان واز لێ نەهێناوە ﴿وماكان ربك نسيا﴾[٣] هەر شەریعەتێ قورئان و سوننەت نەیان هێنابێ بەتاڵە) [٤].

---

(١) متفق عليه: خ(١/٥٧/٥٨٠) م(١/٤٢٣/٦٠٧)

(٢) صحيح: مختصر م (٢٢٩) م(١/٤٧٧/٣١٥/٦٨٤).

(٣) سورة مريم/٦٤

(٤) (الشوكانى) لە(الدرر البهية في المسائل الفقهية/الباب التاسع/ قضاء الفوائت)دا دەنوسێ: (اذا كان الترك عمدا لا لعذر: فدين الله احق ان يقضى). واتە: گەر نوێژ نەکردنەکەبە ئەنقەست بێ قەرزی خوا دانەوەی لەپێشترە بدرێتەوە. (وەرگێڕ).

**ـ ئەو کاتانەی نوێژکردنیان تیێ دا قەدەغەکراوە:**

لەفەرمودەدا هاتووە کە وەکو (عقبە بن عامر) گێڕاویەوە:

(سێ کات هەبوو پێغەمبەر (ﷺ) نەیدەهێشت نوێژی تێدا بکەین، یان مردومانی تێدا بە خاك بسپێرین: کاتێ خۆر هەڵدێ تا بڵند دبێ، کاتێ نیوەڕۆ دێ تا خۆر لادەدات، کاتێ خۆر لەسەر سوتیە بۆ ئاوابوون تا ئاوا دەبێت) [١].

وە پێغەمبەر (ﷺ) هۆکاری قەدەغەکردنی ئەو کاتانەی لەم فەرمایشتەدا رون کردۆتەوە کە بە (عمرو بن عبسە)ی فەرمووە:

**(نوێژی سبەینێ بکە، پاشان نوێژ مەکە تا خۆر هەڵدێو بەرز دەبێتەوە، چونکە ئەو کاتە لەنێوان هەردوو قۆچەکانی شەیتاندا هەڵدێ،** ئەو کاتە بێ بڕوایان کرنۆشی بۆ دەبەن، پاشان نوێژ **بکە ئەو نوێژە مەشهودەو بینراوە، تا ئەو کاتەی سێبەر بە قەد رمەکەی لێ دێت** (کە لەزەوی دا چەقێنراوە)، پاشان نوێژ مەکە، چونکە ئەو کاتە دۆزەخ گەرم دادێ، کاتێ سێبەر هات نوێژ بکە چونکە نوێژ مەشهودەو بینراوە تا نوێژی ئێوارە دەکەیت، پاشان نوێژ مەکە تا خۆر ئاوا دەبێ، خۆر لەنێوان دوو قۆچی شەیتاندا ئاوا دەبێو بێ بڕوایان کورنوشی بۆ دەبەن) [٢].

**ـ لەم قەدەغەکردنە کاتو جێگا جیا دەکرێنەوە:**

لەفەرمودەدا هاتووە: (ئەو کەسەی هەینی جوان خۆی دەشواتو چەوری بەکاردێنێ، یان بۆنو بەرامەی ماڵەوە لەخۆی دەدات، پاشان دەڕواتە دەرو جیاوازی ناخاتە نێوان دوو کەس(کەس ئازار نادات‌و بەسەر ملی خەڵکی دا ناڕوات)، پاشان نوێژ دەکات کە بۆی نوسراوە، پاشان گەر قسەی کرد بێ دەنگ دەبێ، ئەوە مسۆگەر لەنێوان ئەم هەینی یەو هی داهاتووش خوا لەگوناهەکانی بوراوە) [٣].

سوننەتی ئەو کە لەسەری نوسراوە، ئەو کاتە لێی یاساغە، کە پێشەواو ئیمام دەردەچێ، بۆیە هەندێ لەپێشینی یەکان وەکو عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه)و (احمد) کوڕی (حنبل) کە

---

(١) صحيح: (ص.جە ١٢٣٣) (م ١/٥٦١/٨٣٨) (د: ١/٤٨١/٣١٧٦).

(٢) صحيح (المشكاة ١٠٤٢) م(١/٥٧٠/٨٣٢).

(٣) صحيح: (الترغيب : ٦٨٩) (خ: ٢/٣٧٠/٨٨٣).

پەیڕەوی لەو کردووە وتویەتی: (دەرچوونی پێشەوا نوێژ قەدەغە دەکات و وتاری ئەو قسەکردن یاساغ دەکات، بەربەستی نوێژ کردن لێرەدا پێشەوایە نەك نیوەڕۆ.

**ـ بەڵام جێگا:** مەککە خوا شکۆدارتری بکات، لەهیچ کام لەو کاتانەدا نوێژی تێدا نادروست نییە، وەکو (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەی عەبدولمەنافیەکان رێ بە کەس مەگرن کە بەم کەعبەیەدا دەسورێتەوەو لەهەر کاتێ دا نوێژ بکات لەشەوو لەرۆژدا)[1].

ئەم نوێژانەی لەم کاتانەدا قەدەغەکراون نوێژی سوننەتی رەهایە، کە بێ هۆن، لەم کاتانەدا دروستە نوێژی گێڕانەوە (قەزا) فەرزبێ یان سوننەت وەکو (ﷺ) فەرمویەتی: (من نسي صلاة فليصل اذا ذكرها، لا كفارة لها الا ذلك)[2]. واتە: کێ نوێژەکی لەیاد چوو، گەر یادی هاتەوە با بیکات، کەفارەتەکەی تەنیا ئەوەیە.

دیسان سوننەتی دوای دەست نوێژ لەهەموو کاتێکدا دروستە، وەکو (ﷺ) لەکاتی نوێژی بەیانی دا بە بیلال (رضي الله عنه) دەفەرموێ: (بیلال پێم بڵێ کام کردارەت لەهەموو کردارێ زیاتر بە ئومێدەوە بۆ ئیسلام کردووە، من گوێم لەچرپەی پێیەکانی تۆ بو لەبەهەشتدا؟! وتی: ئەو کارەی بە ئومێدی تەواوە کردوومە ئەمەیە: هەر جارێ دەست نوێژێکم گرتبێ لەهەر ساتێکی رۆژو شەودا بەو دەست نوێژە ئەو سوننەتەم کردووە کە خودا بۆی نوسیوم بیکەم)[3]. واتە: دیسان سوننەتی سڵاوی مزگەوت (تحية المسجد) لەهەموو کاتێ دا دروستە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر کەسێ لەئێوە چووە مزگەوت با دانەنیشێ تا دوو رکەعەت نوێژ دەکات)[4].

**ـ قەدەغەکردنی سوننەت دوای هەڵاتنی سپێدەو بەر لەنوێژی سپێدە:**

(یسار) کار گوزاری (ئیبنو عمر) گێڕاویەتیەوە (ابن عمر) منی بینی کە دوای هاتنی سپێدە (طلوع الفجر) نوێژم دەکرد، وتی: ئەی یەسار پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لامان ئێمە ئەم

---

(١) صحيح: (ص. جه ١٠٣٦) جه(١/٣٩٨/١٢٥٨).

(٢) متفق: (خ: ٢/٧٠/٥٩٨) م(١/٤٧٧/٦٨٤).

(٣) رابردو باسكراه.

(٤) متفق عليه: (خ ٣/٤٨/١١٦٣) (م ١/٤٩٥/٧١٤).

نوێژەمان دەکرد، فەرمووی: (ليبلغ شاهدكم غائبكم لا تصلوا بعد الفجر الا سجدتين)[١].

واتە: با ئەوەی لێرەیە بەو کەسانە راگەیەنێ کە لێرە نی یە دوای سپێدە زیاتر دوو رکەعەت نەبێ نەکەن. (کە سوننەتی بەر لەنوێژی بەیانی یە).

**- قەدەغەکردنی سوننەت دوای ئەوەی قامەتی نوێژ دەکرێت:**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (کاتێ قامەتی نوێژ کرا تەنیا نوێژی فەرز دەکرێت)[٢].

**- ئەو شوێنانەی نابێ نوێژیان لەسەر بکرێ:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بە شەش شتان زێدە چاکەیم بەسەر پێغەمبەراندا پێ دراوە: وشە ئاسانو پڕ ماناکانی (کە قورئانە، جوامع الكلم)و سەرخرام بە ترس و دەستکەوتی جەنگم بۆ رەوا کراو زەویم بۆ کرا بە پاکیو مزگەوتو بۆ تەواوی مەردوم رەوانە کرامو بوومە مۆرکی پێغەمبەران)[٣].

**- زەوی هەمووی مزگەوتە تەنیا ئەو شوێنانە نەبێ، کە لەم فەرمودەیە دا جیاکراونەوە:**

(جندب بن عبدالله البجلي) گێڕاویەتیەوە، کە بەر لەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی بکات پێنج شتم لەو بیست: (الا ان من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور انبيائهم وصالحهم مساجد، الا فلا تتخذوا القبور مساجد، اني انهاكم عن ذلك)[٤]. واتە: بەر لەئێوە گۆڕی پێغەمبەرانیانو پیاوچاکانیان دەکرد بە مزگەوت، بەڵام ئێوە مەیکەن بە مزگەوت، من لەمە قەدەغەتان دەکەم.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الأرض كلها مسجد الا المقبرة والحمام)[٥]. واتە: زەوی هەمووی تەنیا مزگەوتە گۆڕستانو گەرماو نەبێت.

(البراء بن مالك) گێڕاویەتیەوە: (لەراست نوێژکردن لەشوێنی گەوری وشتر (مبارك الإبل)

---

(١) صحيح: (ص.جە ٥٣٥٣) (د ٤/١٥٨/١٢٦٤). الترمذي گێڕاویەوە: (لا صلاة بعد الفجر الا سجدتين).

(٢) صحيح: (س. جە ٩٤٥) م(١/٤٩٣/٧١٠).

(٣) صحيح: (مختصر م٢٥٧). م(١/٣٧١/٥٢٣)

(٤) صحيح الارواء (٢٨٦) م(١/٣٧٧/٥٣٢).

(٥) صحيح: (ص.ج ٧٣٥١) (٢/١٥٩/٤٨٩).

پرسیار لەپێغەمبەر (ﷺ) کرا؟ فەرمووی: نوێژ لەگەوڕی وشتر مەکەن ئەوە لەشەیتانەوەیە.

لەراست نوێژکردن لەگەوڕی مەڕو ماڵات (مـرابض الغـنم) پرسـیاری لـێ کـرا، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: نوێژی تێدا بکەن ئەوە فەڕو بەرەکەتە) [١].

## بانگدان (الآذان)

حوکمەکەی: بانگدان ڕاگەیاندنی کاتی هاتنی نوێژە بە چەند وشەیەکی تایبەت، بانگ واجبە.

پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (اذا حـضرت الـصلاة فليـؤذن لكـم احـدكم وليـؤمكم اكبركم)[٢]. واتە: گەر کاتی نوێژ هات با یـەکێ لـەئێوە بـانگ بـدات و گەورەکەشـتان بـا پـێش نوێژیتان بۆ بکات. لێرەدا ئەم فەرمانە وەکو زانراوە بۆ واجبە (نەك سوننەت).

ئەنەس گێڕاویەتیەوە: (کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) غەزای بە ئێمە دەکرد لەگەڵ گەلێکـدا تـا سپێدە دەهات چاوەڕێی دەکردو غەزای نەدەکرد، کاتێـك گـوێی لـەدەنگی بـانگ دەبـوو لێیـان دەگەڕا، گەر گوێی لێ نەبوایە هێرشی دەکرد)[٣].

**ـ چاکەی بانگ و گەورەیی یەکەی:**

(ان المؤذنين اطول الناس عنقا يوم القيامة) [٤]. واتە: بانگدەران لەقیامەتدا ملیان لەهەموو کەس درێژترە.

(المازنی) لەباوکی گێڕاویەتیەوە، کە (ئەبو سعيد الخدری) ـ ر ـ پێی وتووە: (من دەبینم تۆ حەزت بە مەڕو ماڵات و لادێ یە، گەر لەناو رانەمەڕتدا بووی یان لەلادێیەکەت بوویـت بانگتـدا

---

(١) صحيح: (ص..ج ٧٣٢١) د(٢/١٥٩/٤٨٩).

تێبینی: (الشوكاني) لە(نيل الأوطـار)/ج١/ل:٧٧٩)دا لەسـەر فـەرمودەی: (لعـن رسـول الله (ﷺ) زائـرات القبـور والمتخذين عليها مساجد والسرج) رواه الخمسة الا ابن ماجة. لەوێ دا دەنوسی: (فلا تتخذوا القبور مساجد فاني انهاكم عن ذلك) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە حەرامە دروست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان. هەندێ بڕوایان وایە ئەمە بۆ ئەو کاتە بووە، چونکە خەڵکی لەو سەردەمەدا لەپەرستنی بت نزیك بوون..).

(٢) متفق عليه: خ(٢/١١١/٦٣١) / (م ٦٧٤، ١/٤٦٥)

(٣) متفق عليه: خ(٢/٨٩/٦١٠) ، (١/٢٨٨/٣٨٢).

(٤) (ص. ج ٦٦٤٥) (م ٣٨٧/١/٢٩٠)

دەنگت بەرز بکەوە، هەتا ئەو دەنگە بڕوات هەر جنۆکەو مرۆڤێو هەر شتەکی تر گوێ بیستی بێ رۆژی قیامەت گەواهیت بۆ دەدات) ئەمەم لەپێغەمبەری خودا (ﷺ) بیستووە[١].

- ڕەوشتی بانگ:

(عبدالله بن زید بن عبد ربه) دەڵێ: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەنگی لەسەر ئەوەدا کە خەڵکی بۆ بانگدان زەنگ بەکاربێنن پێی خۆش نەبوو، چونکە مەسیحی یەکان بەکاریان دەهێنا، شەو خەونم بینی کەسێ بەلامدا رابرد دووپارچە بەرگی سەوزی لەبەر دابوونو زەنگەکی پێ بوو هەڵی گرتبوو، منیش پێم وت: ئایا ئەو زەنگە نافرۆشیت؟ وتی: بۆچیتە؟ وتم: بۆ بانگدانی نوێژمە. وتی: شتەکی لەمە باشترت پێ بڵێم؟ وتم: بەڵێ. وتی بڵێ: (الله اكبر الله اكبر، الله اكبر الله اكبر. اشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان لا اله الا الله. اشهد ان محمدا رسول الله، اشهد ان محمدا رسول الله. حي على الصلاة، حي على الصلاة. حي على الفلاح، حي على الفلاح. الله اكبر الله اكبر. لا اله الا الله). پاشان زۆر دوور نەڕۆیشت ئەنجا پێ ی وتم: گەر هەڵسای بۆ نوێژ (قامەت) بڵێ: (الله اكبر الله اكبر، اشهد ان لا اله الا الله. اشهد ان محمدا رسول الله. حي على الصلاة حي على الصلاة قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة الله اكبر الله اكبر لا اله الا الله).

کاتێ بەیانی داهات ئەوەی بینیبووم بۆ پێغەمبەرم (ﷺ) گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی:

(ان هذا الرؤيا حق ان شاء الله) پاشان فەرمانی دا بەبانگدان، بیلال کارگوزاری ئەبوبەکر بانگی دا)[٢].

- سوننەتە بانگدەر هەردوو (الله اكبر)لەیەك هەناسەدا کۆبکاتەوە:

عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: گەر بانگدەر وتی: (الله اكبر الله اكبر) یەکێ لەئێوە وتی: (الله اكبر الله اكبر) پاشان وتی: (اشهد ان لا اله الا الله) وتی: (اشهد ان لا اله الا الله)[٣]. ئەمە ئاماژەیە کە بانگدەر (الله اكبر)ەکان دوو

---

(١) صحيح: (ص. نس ٦٢٥) خ(٢/٨٧/٦٠٩)، (نس ٢/١٢).

(٢) حسن صحيح: (ص.د ٤٦٩) أ(٣/١٤/٢٤٤) د(١/١٦٩/٤٩٥).

(٣) صحيح: (ص.د ٥٢٧) م(١/٢٨٩/٣٨٥) د(٢/٢٢٨/٥٢٣).

دوو کۆدەکاتەوەو بیسەریش وەکو خۆی وەڵامیان دەداتەوە[١].

**- سوننەتی گێڕانەوە (الترجیع):**

گێڕانەوە بریتی یە لەگەڕانەوە بۆ هەردوو شەهادەکان دووجار بە دەنگی بەرز، دوای ئەوەی دووجار بە دەنگی نزم وتراون[٢].

(ابو محذرة) گێڕاویتیەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم بانگەی فێرکردووە: **(الله اکبر، الله اکبر. اشهد ان لا الەالا الله، اشهد ان لا اله الا الله. اشهد ان محمدا رسول الله، اشهد ان محمدا رسول الله)** پاشان دەگەڕێتەوەو دەڵێ: **(اشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان لا اله الا الله. اشهد ان محمدا رسول الله، اشهد ان محمدا رسول الله. حي على الصلاة حي على الصلاة. حي على الفلاح حي على الفلاح. الله اكبر الله اكبر لا اله الا الله)** [٣].

**ـ (التثويب) لەبانگی یەکەمی بەیانی دا:**

(ابو محذرة) گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فێری بانگی کردووەو **(حي على الفلاح، حي على الفلاح.الصلاة خير من النوم، الصلاة خير من النوم)**ی لەبانگی یەکەمی بەیانی دا تێدابووە **(الله اكبر الله اكبر لا اله الا الله)** [٤].

میری سەنعانی لە(سبل السلام/١٢٠/١) دەڵێ: (ابن ئەرسەلان) دەڵێ: (شەرعی یەتی (التثويب) لەبانگی یەکەمدایە لەبەیانیدا، چونکە بۆ بێدارکردنی خەڵکە کە لەخەو هەڵسن، بەڵام بانگی دووەم ڕاگەیاندنی کاتی نوێژو بانگکردنە بۆ نوێژ).

**ـ سوننەتە بانگ لەگەڵ بوونی نوێژدا بگوترێ، بەڵام پێشخستنی لەبەیانیدا تایبەتی یە:**

(جابر بن سمره) دەڵێ: **(كان بلال يؤذن اذا زالت الشمس لايخدم، ثم لا يقيم حتى يخرج اليه النبي (ﷺ)فاذا خرج اقام حين يراه)** [٥]. واتە: کاتێ خۆر لایدەدا هیچ شتەکی لەوشەکانی لێ

---

(١) شرح النووي للمسلم(٣/٧٩).

(٢) سەرچاوەی رابردوو (٣/٨١).

(٣) صحيح (مختصر م (١٩١) (م ١/٢٨٧/٣٧٩).

(٤) صحيح: (ص. نس ٦٢٨) (نس ٢/٧).

(٥) صحيح: (ص.د ٥٠٣)، أ(٣/٣٥/٢٨٣). (م ١/٤٢٣/٦٠٦) د(٢/٢٤١/٥٣٣).

نەدەگەرا، تا پێغەمبەر (ﷺ) نەچووبایە قامەتی نەدەکرد، گەر چاوی پێ دەکەوت هەڵدەستا قامەتی دەکرد)[١].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر شەوە بیلال بانگ دەدات، بخۆن و بخۆنەوە تا (ابن مکتوم) بانگ دەدات).

پێغەمبەر (ﷺ) گەرزانی پێش خستنی نوێژی بەیانی بەسەر کاتی خۆی دا راڤە کردووە، کاتێ فەرموویەتی: (لا یمنعن احدکم اذان بلال من سحوره فانه یؤذن، او قال ینادي بلیل لیرجع قائمکم ولینبه نائمکم)[٢] واتە: (با کەس بانگی بیلال لەپارشێو(السحور)ی قەدەغە نەکات، ئەو بانگ دەدات لەشەودا تا ئەو کەسەی بۆ شەو نوێژ هەڵساوەتەوە بگەڕێتەوەو ئەوەی نوستووە بێداری بکاتەوە.

## ئەوەی لەکاتی بیستنی بانگ و قامەتدا دەگوترێت:

سوننەتە گوێگری بانگ ئەوەی بانگدەر دەیڵێ ئەوە دووبارە بکاتەوە، وەکو لەفەرمودەدا هاتووە: (اذا سمعتم النداء فقولوا مثل ما یقول المؤذن)[٣]. واتە: کاتێك گوێتان لەبانگ بوو ئەو چی گوت ئەوە دووبارە بکەنەوە.

وپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (گەر بانگدەر وتی: (الله اکبر الله اکبر) یەکێ لەئێوە وتی: (الله اکبر الله اکبر) پاشان وتی: اشهد ان لا اله الا الله) وتی: (اشهد ان لا اله الا الله). پاشان وتی : (اشهد ان محمدا رسول الله) وتی: (اشهد ان محمدا رسول الله) پاشان وتی: (حی علی الصلاه) وتی: (لا حول ولا قوه الا بالله) پاشان وتی: (الله اکبر الله اکبر). وتی: (الله اکبر الله اکبر) پاشان وتی: (لا اله الا الله) وتی: (لا اله الا الله) لەدڵەوە وا بڵێ ئەوە دەرواتە ناو بەهەشتەوە)[٤].

---

(١) متفق علیه: (خ٢/١٠٤/٦٢٢) م(٩٢ ـ ٣٨ ـ ٢/٧٦٨).
(٢) متفق علیه: (خ ٢/١٠٣/٦٢١) (م ٣٨/١٠٩٣ ـ ٢/٧٦٨).
(٣) متفق علیه: (خ٢/٩٠/٦١١) (م ١/٢٨٨/٣٨٣).
(٤) رابردو باسکراوە.

هەرکەسێ وەکو بانگدەر بانگەکە بڵێتەوە، یان لەکاتی وتنی : هەردوو (حي علی)دا وتی (لا حول ولا قوه الا بالله) یان (حي علی) ، (ولا حول ولا...)ی پێکەوە کۆکردنەوە ئەوە راستی پێکاوە (ان شاء الله).

کاتێ بانگدەر لەبانگ یان قامەت بۆوەو بیسەر وەڵامی دایەوە دوای لێ بونەوە با ئەمە بڵێ، کە لەم دوو فەرمایشتەدا هاتووە: (کاتێ گوێتان لەبانگدەر بوو ئەو چی وت ئێوەش ئەوە دووبارە بکەنەوە، پاشان سەڵەوات لەدیداری من بدەن، هەر کەسێ سەڵەوات لەمن بدات خوداوەند دە سەڵاوەتی لێ دەدات، پاشان داوای وەسیلە بۆ من بکەن لەخودا، پلەیەکە لەبەهەشتداو تەنیا بۆ بەندەیەکە لەبەندەکانی خودا، تکا خوازم ئەو بەندەیە من بم، هەر کەسێ داوای وەسیلە بۆ من بکات ئەوە شەفاعەتو تکای منی لەقیامەتدا بۆ واجب دەبێت) [١].

جابر (ﷺ) دەفەرمووێ کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ دوای بانگ بیستن بڵێ: (اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمدا الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاما محمودا الذي وعدته) ئەوە شەفاعەتی منی بۆ واجب دەبێت لەقیامەتدا) [٢].

بۆ سوود وەرگرتن: پێویستە موسڵمان لەنێوان بانگو قامەتدا زۆر دوعا بکات، چونکە وەکو لەفەرمودەدا هاتووە: (الدعاء لا يرد بين الآذان والإقامة) [٣]. پاڕانەوە لەنێوان بانگو قامەتدا ڕەت کردنەوەی نییە.

## ئەوەی بۆ بانگدەر سوننەتە[٤]:

پێویستە بانگدەر ئەم سیفەتانەی هەڵگرتبێت:

(١): مەبەستی لەو بانگە ڕەزای خوا بێو پاداشت وەر نەگرێ. (عثمان بن ابي عاص) دەڵێ: بە پێغەمبەرم (ﷺ) وت: بمکە پێش نوێژ خوێنی هۆزی خۆم، ئەویش فەرمووی: (تۆ پێش نوێژ

---

(١) صحيح: (مختصر م ١٩٨) (م ١/٢٨٨/٣٨٤) د(٢/٢٢٥/٥١٩).

(٢) صحيح (الارواء ٢٤٣) (خ ٢/٩٤/٦١٤). (د ٢/٢٣١/٥٢٥) (ت ٢١١ /١/١٣٦).

(٣) صحيح: (ص .د ٤٨٩) د(١/١٣٧/٢١٢) (ت: ٢١٢ /١/١٣٧).

(٤) فقه السنة/ ١/٩٩).

خوێنی ئەوانیو کامەیان لاوازە (زەعیفە) ئیقتیدا بەوەبکە، بانگدەرێ بگرە لەبڕی ئەوە کـرێ وەرنەگرێت) [١].

(٢): دەبێ پاکژ بێ لەهەردوو بێ دەست نوێژیەکان، وەکو لەباسی (دەست نوێـژ بـۆ ئـەو شـتانە سوننەتە) باسکرا.

(٣) بە پێوە وەستابێو ڕووی لەقیبلە کردبێ. (ابن المنذر) دەڵێ: زانایان کۆکن لەسـەر ئـەوە کـە بانگ بە پێوە سوننەتە چونکە باش بە گوێ ی خـەڵکی دەگـات، وە سـوننەتە روو لەرووگـە بکات، چونکە هەردوو بانگدەرکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوویان تێ کردووە.

(٤): کاتێ وتی : (حي على الصلاة) روو لەلای ڕاست بکاتو کاتێ وتی (حي على الفـلاح) روو لەلای چەپ بکات.

(ابي جحيفة) دەڵێ: (بيلالم بينى کاتێك بانگی دەدا ڕووی لەولاو لەولا دەکرد) [٢].

(٥): جووت قامکی بخاتە گوێچکەکانیەوە وەکـو (ابـو جحيفـة) بيلالـی بينيـوە(...واصـبعاه في اذنيه) [٣].

(٦): دەبێ بانگی بە دەنگی بەرز بڵێ وەکو لەفەرمودەی ئـەودا (ﷺ) هـاتووە: (هـەر جنۆکـەو مرۆڤێ گوێ ی لێ بێ، لەپەسلاندا گەواهی بۆ دەدات[٤].

**ـ ماوەی نێوان بانگو قامەت چەندە؟**

پێویستە نێوان بانگو قامەت کردن ئەوەندە بێ کە بـوار هـەبێ بـۆ نوێـژو ئامـادەبوونی، چونکە بانگ بۆ ئەوەیە، گەر نا لەسوودی خۆی دادەبڕێت.

(ابن بطال) وتویەتی[٥]: ئەمە سنووری نییە، تا کات نەیەتو نوێژکەر کۆنەبنەوە.

---

(١) صحيح: (ص.د ٤٩٧) (د ٥٢٧/٢٣٤/٢).

(٢) متفق عليه: ((خ٦٣٤/١١٤/٢) م(٥٠٣/٣٦٠/١). بەلام گۆڕینی سنگو مل هیچ فەرمودەی لەسەر نییە. (تمام المنة/١٥٠).

(٣) صحيح: (ص.ت ١٦٤) (ت ١٩٧/١٢٦/١) وقال: (حديث حسن صحيح). زانایان کاری پێ دەکەنو قامك خستنە گوێ لەلایەن بانگدەرەوە بە سوننەت دەزانن.

(٤) صحيح: (ص. نس ٦٢٠) خ(٦٠٩/٨٧/٢) نس(١٢/٢).

(٥) (الحافظ) لە(فتح الباري/١٠٦/٢) باسی کردووە.

**ـ دەرچوون لەمزگەوت دوای بانگدان قەدەغەیە:**

(ابي شعثاء) گێڕاویەتیەوە: (لەگەڵ (ابـي هريـرة) لەمزگـەوت بـووین، بانگـدەر بـانگی دا پیاوێ لەمزگەوت هەڵسا بڕوات، ئەبو هورەیرە سەیری کرد تا لەمزگەوت چووە دەرو پاشان وتـی: ئەمە سەرپێچی باوکی قاسمی (ﷺ) کرد)[١].

**ـ بانگو قامەت بۆ نوێژی قەزاو لەدەست چوو:**

ئەو کەسەی خەوتووە یان لەیادی چووە ڕێگای پێ دراوە کە بانگی بـۆ بـدریۆ قامـەتی بـۆ بکرێ، (ابو داود) لەبەسەرهاتی خەوتنی پێغەمبـەر (ﷺ)و یـارانی دا لەسـەفەرێکدا لەنوێـژی بەیانی دا، گێڕاویەوەیتە، کە کاتێ بێدار بونەوەو خـۆر هـەڵاتبوو پێغەمبـەر (ﷺ) بـە بیلالـی فەرموو: بانگبداتو قامەت بکات[٢].

**گەر نوێژە چووەکان زۆربوون یەك بانگ دەدریۆ بۆ هەر نوێژێ قامەتێ دەکرێت:**

(ابن مسعود) ـ ر ـ فەرمویەتی: (بت پەرستان پێغەمبـەریان (ﷺ) لەجـەنگی خەندەقـدا لەچوار نوێژ سەرقاڵ کرد، تا ئەوەندەی خوا حەز بکات شەو ڕۆیشت، ئەنجا فەرمانی بە بیلال کرد بانگبدات، پاشان قامەتی کردو نوێژی نیوەڕۆی کرد، ئەنجا قامەتی کـرد نوێـژی ئێـوارەی کـرد، پاشان قامەتی کردو نوێژی شێوانی کرد، دوایی قامەتی کردو نوێژی خەوتنانی کرد) [٣].

**ـ مەرجەکانی دروستی نوێژ (شروط صحة الصلاة):**

ئەمانە بە مەرجو شەرت دەگیرێن:

**(١) دەبێ بزانی نوێژ بووە وەکو خوا فەرمویەتی:**

﴿إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا﴾[٤]. واتە: نوێژ لەسـەر بـڕواداران فەرزێکـە کاتی بۆ دانراوە.

نوێژ تا کاتی نەیەتو دوای کات بەسەر چوونی گەر پاساوێ نەبێ دروست نابێت.

---

(١) صحيح: (مختصر م ٢٤٩) م(١/٤٥٣/٦٥٥).

(٢) صحيح: (ص.د ٤٢٠) د(٢/١٠٦/٤٣٢).

(٣) صحيح: (ص.نس ٦٣٨) (ت ١/١١٥/١٧٩) (نس ١/٢٧٩).

(٤) النساء: ١٠٣.

**(٢) پاكژی لەهەردوو بێ دەست نوێژیەكان (الحدثین):**

﴿یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَیْدِیَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَینِ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًافَاطَّهَّرُواْ﴾[١]. فەرمودە هاتووە: (لا یقبل الله صلاة بغیر طهور)[٢]. واتە: خوا نوێژی بێ پاكی قبوڵ ناكات (لەدەست نوێژی بچووكو لەش پیسی).

**(٣) دەبێ جلو بەرگو لەشو شوێنی نوێژ پاكژ بن:**

لەراست پاكژی پۆشاك هاتووە: ﴿وَثِیَابَكَ فَطَهِّرْ﴾[٣]. واتە: جلو بەرگت خاوێن بكەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كێ لەئێوە هاتە مزگەوت با پێڵاوی ئاوەژووبكاتەوەو سەیری بنی بكات، گەر پیس بوو با لەزەوی بخشێنێو پاشان نوێژیان پێوە بكات)[٤].

لەراست پاكی لەش لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە كە بە عەلی (رضي الله عنه) دەفەرمووێ، كە لەراست مەزی لێی دەپرسرێ: (دەست نوێژ بگرەوەو چوكت بشۆوە)[٥].

لەراست ژنێ كە خوێن چركەو نەزیفی زێ ی هەبوو(المستحاضة) فەرموی (ﷺ) : خوێنەكە لەخۆت بشۆوەو نوێژ بكە)[٦].

لەدەربارەی پاكی جێگا: پێغەمبەر (ﷺ) بە یارانی فەرموو كاتێ عەرەبێك میزی لەمزگەوتدا كرد فەرمووی: (ستڵە ئاوێ بە سەر شوێنەكە دا بڕێژن)[٧].

بۆ سوود وەرگرتن: هەر كەسێ نوێژی كردو پیسی پێوە نوسابوو نەیزانی ئەوە نوێژەكەی دروستەو گێڕانەوەی لەسەر نییە. گەر لەكاتی نوێژدا پێی زانی: گەر توانی لای ببات، وەك ئەوەی پێڵاوی پیس بن ئەوە دەتوانێ پێڵاو دابنێو گەر بەرگەكی زیادی لەبەر بوو شەرمگەی

---

(١) المائدة: ٦.

(٢) رابردوو باسكرا.

(٣) المدثر: ٣.

(٤) رابردوو باسكرا.

(٥) رابردوو باسكرا.

(٦) متفق علیه: خ(١/٣٣١/٤٢٨و ٤٢/١) م(١/٢٦١/٣٣٣) ت(١/٨٢/١٢٥).

(٧) رابردوو باسكراوە.

داپۆشی بوو ئەوە دەتوانێ لایبباتو نوێژەکەی تەواو بکات، گەر نەیتوانی لای ببات ئەوە با نوێژەکە تەواو بکاتو گێڕانەوەی لەسەر نییە:

(ابو سعید الخدری) گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کردو پێڵاوەکانی دانا، خەڵکیش پێڵاویان دانا، کاتێ نوێژی کرد فەرمووی: بۆچی پێڵاوتان دانا؟ وتیان: چونکە بینیمان تۆ پێڵاوت داناو ئێمەش دامانناا. فەرمووی: (جبریل هاتە لام وتی: پێڵاوەکانت پیسن، گەر یەکێ لەئێوە هاتە مزگەوتو پێڵاوی پیس بوون با پێڵاوەکانیی ئاوەژوبکاتەوەو سەیرییان بکات، گەر بینی پیسن با بە زەوییان خاوێن بکاتەوەو پاشان نوێژیان پێوە بکات)[1].

**(٤) داپۆشینی شەرمگە (العورة):**

خوا فەرمویەتی: ﴿یا بني آدم خذوا زینتکم عند کل مسجد﴾[2]. واتە: ئەی ئادەمیزاد لەلای هەمو مزگەوتێ خۆتان برازێننەوە.

لێرەدا ئەم ئایەتە کاتێ هات کە خەڵکی بەڕووتی تەوافیان دەکردو دەستوری دا، کە شەرمگەیان داپۆشن.وە (ﷺ) فەرمویەتی: (خودا نوێژی حەیزدار"ژنی بالغ" گیرا ناکات بە داپۆشراوی نەبێت)[3].

شەرمگەی پیاو نێوان ناوکو ئەژنۆیە، وەکو (ﷺ) فەرمویەتی: (ما بین السرَة والرکبة عورة)[4]. واتە: نێوان ناوکو ئەژنۆ شەرمگەیە(جرهه الأسلمي) گێڕاویەتیەوە: پێغەمبەر (ﷺ) رابردو عەبایەکم پێدا بوو، ڕانم دەرکەوت، ئەویش فەرمووی: ڕانت داپۆشە چونکە ڕان شەرمگەیە[5].

ئافرەت لەدەمو چاویو دەستی نەبێ هەموو لەشی شەرمگەیە لەنوێژدا (المرأة عورة)[6].

---

(١) د (٢/٣٥٣/٦٣٦).

(٢) الأعراف: ٣١.

(٣) صحیح: (ص.جه ٥٣٤).

(٤) حسن (الارواء ٢٧١) رواه الدار قطني واحمد وابو داود.

(٥) صحیح لغیره (الارواء: ٢٦٩) ت(٤/١٩٧/٢٩٤٨).

(٦) (ص.ج : ٦٦٩٠) ت(٢/٣١٩/١١٨٣).

(لا يقبل الله صلاة حائض الا بخمار) [١].

**(٥) روو لەرووگە کردن:**

وەکو خوا دەفەرموویّ: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾[٢]. واتە: روو لەناوەڕاستی مزگەوتی حەرام بکە، لەهەر کویّ یەك بن روو لەناوەڕاستی ئەو بکەن. یان پێغەمبەر (ﷺ) بە نەفەرێك دەفەرموویّ کە چاك دەست نوێژی نەگرتبوو: (اذا قمت الى الصلاة فاسبغ الوضوء ثم استقبل القبلة) [٣]. واتە: کاتێك چویت نوێژ بکەی چاك دەست نوێژ بگرە، پاشان روو لەرووگە بکە.

دروستە لەکاتی ترسداو لەنوێژی سوننەتدا لەسەفەردا لەسەر ولاّخو (ئامێری سواری)دا روو لەرووگە نەکرێت. خوا فەرمویەتی: ﴿فَإنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا﴾[٤]. واتە: گەر ترسان بە پیادەو سواری (نوێژ بکەن). وەکو (ابن عمر) وتی: بەرەو رووگە یان بەرەو رووگە نەبێت. (نافیع) دەڵێ: مسۆگەر ئیبنو عومەر ئەمەی لەپێغەمبەر (ﷺ) گێڕاوەتەوە[٥].

(ابن عمر) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ولاّخەکەی نوێژی دەکرد رووبەرووی ئەوو ویتری لەسەر دادەکرد، بەلاّم نوێژی فەرزی لەسەر دانەدەکرد) [٦].

بۆ سوود وەرگرتن: کێ رووی لەرووگە کرد، نوێژی کردو رووی لەو شوێنە کرد کە وای بۆ دەچوو رووگە بێ، پاشان زانی هەڵەی کردووە، ئەوە گێڕانەوەی لەسەر نییە: (عامر بن ربیعە) وتویەتی: (لەگەڵ پێغەمبەردا بووین (ﷺ) لەسەفەرێکداو شەو تاریك بوو نەمان دەزانی رووگە لەکوێیە، هەر پیاوە لەسەر گومانی خۆی رووی لەلایەك کردونوێژی کرد، کاتێ بەیانی بۆوە ئەوەمان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە، ئەنجا ئایەتی: ﴿فاینما تولوا فثم وجه الله﴾ دابەزی[٧].

---

(١) صحيح: (ص.جه ٥٣٤) د(٢/٣٤٥/٦٢٧) (ت ١/٢٣٤/٣٧٥).
(٢) البقرة: ١٥٠.
(٣) متفق عليه (خ ١١/٣٦/٦٢٥١) (م ١/٢٩٨/٣٩٧).
(٤) البقرة: ٢٣٩.
(٥) صحيح ما (١٢٦/٤٤٢) خ(٨/١٩٩/٤٥٣٥).
(٦) متفق عليه: م(١/٤٨٧/٣٩/٧٠٠) خ تعليقا (٢/٥٧٥/١٠٩٨).
(٧) حسن: (ص. جه ٨٣٥) ت(١/٢١٦/٣٤٣).

واتە: روو لەهەر کوێ بکەن خوا لەوێیە.

**(٦) نیازو مەبەست (النیة):**

ئەوەیە بە دڵ ئەو نوێژە دیاری بکەیت کە دەیکەیت، وەکو نیوەڕۆو ئێوارە[1]. بە زمان وتن شەرعی نییە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك بۆ نوێژ هەڵساوە فەرمویەتی: (الله اکبر)و هیچی بەر لەمە نەگوتووە، نە نیەتی بە زمان وتووەو نەی فەرمووە: نوێژ بۆ خودا دەکەم، فلاٌن نوێژەو بەرەو ڕووگە چوار رکەعەتان بە ئیمامەتی یان بە مەئمومی، نە فەرمویەتی بە (ئەدا) نە بە (قەزا)و نە فەرزی کات، ئەم (١٠) شتانە داهێنراوو بیدعەن، نە بە (اسناد صحیح) نە بە (ضعیف) نە بە (مسند) نە بە (مرسل) هیچ وشەیەکی ئاوا نەگەڕاوەتەوە، نە وتەی سەحابەی لەسەر گەڕاوەتەوەو نە هیچ کام لەتابعین‌و نە چوار سەرە مەزهەبەکان بە چاکیان داناوە)[2].

---

(١) تلخیص صفة الصلاة للألباني/ل:١٢.

(٢) زاد المعاد/ابن القیم الجوزیة/١/٥١.

# سیفەتی نوێژ (صفة الصلاة)[(١)]

کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هەڵساوە نوێژ بکات بە وەستاوی رووی لەکەعبە کردووە نزیک لەپەردەکەی. ئەو (ﷺ) دەی فەرموو: (انما الأعمال بالنيات). هەموو کارێ بە نییەتو نیازە. پاشان نوێژەکەی بە (الله اكبر) دەست پێ دەکردو لەگەڵی دا دەستەکانی بەرز دەکردنەوە. پاشان دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دادەنا لەسەر سنگی دا. پاشان چاوی دەبڕییە زەوی. پاشان بە زۆر چەشنە دوعاو پاڕانەوە دەستی بە نوێژ دەکردو حەمدو سەنای خوای دەکرد. دوایی (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم)ی دەگوت، ئینجا (بسم الله الرحمن الرحيم)ی دەخوێندو بە ئاشکرا نەیدەخوێند، پاشان فاتیحەی دەخوێند ئایەت بە ئایەتی بە جیا دەخوێند.گەر فاتیحەی تەواو کرد دەیفەرموو: (آمين). ئامینەکەی بە ئاشکرایی دەفەرموو درێژی دەکردەوە. پاشان دوای فاتیحە سوڕەتی تری دەخوێند، هەندێ جار درێژو هەندێ جار کورتی دەکردەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) دوو رکەعەتی نوێژی بەیانیو دوو رکەعەتی نوێژی شێوانیو دو رکەعەتی خەوتنانی بە دەنگ دەخوێندەوە، بەڵام لەچوار رکەعەتی نیوەڕۆو ئێوارەو رکەعەتی دوای شێوانو دوو رکەعەتی دوای خەوتنان بە دەنگی نزم دەیخوێند.

دیسان فاتیحەی لەنوێژی هەینیو دوو جەژنەکانو نوێژی باران بارینو خۆرگیراندا بە ئاشکرایی خوێندووە. دوو رکەعەتی دوایی بە نیوەیی کورتر لەدوو رکەعەتی پێشوودا خوێندووە، بە ئەندازەی (١٥) ئایەت، یان لەفاتیحەدا کورتی کردۆتەوە.

پاشان کاتێ (ﷺ) خوێندنی فاتیحەی تەواو دەکرد بێ دەنگی یەکی دەکرد، پاشان دەستی بەرزکردەوەو (الله اكبر)ی کردو رکوعی برد. ئەو دەستی لەسەر ئەژنۆی دادەناو قامکەکانی لێك جیادەکردەوە، ئەوەندە دەستی لەئەژنۆکانی گیر دەکرد وەك ئەوەی بە ئەوێوە گیانی دەرچو بێت.

ئەنجا ئانیشکەکانی لەتەنیشتەکانی دور دەخستەوەو رێکی دەکرد، هەتا گەر ئاوت بەسەردا رشتبایە دەمایەوە.

---

(١) لە(صفة صلاة النبـي للألباني)کورتکراوەتەوە.

لەرکوعدا دەمایەوەو دەیفەرموو: (سبحان ربي العظيم وبحمده) سێ جاران‌و لەو روکنەدا جۆرەها زیکری دەکردو دوعای دەخوێندو جارەك بەمەو جارەك بە ئەوەی تر یان لەرکوعو کورنۆشدا بۆ خوێندنی قورئانی قەدەغە کرد.

پاشان لەرکوع پشتی بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده)و لەو خۆ بەرزکردنەوەیە دەستی بلند دەکردن‌و دەیفەرموو هەر بە قیتی یەوە: (ربنا ولك الحمد). پاشان (الله اكبر)ی دەکردو دەچووە کورنۆشەوەو بەر لەئەژنۆی دەستی دەگەیاندنە زەوی‌و خۆی دەدایە سەر لەپی دەستی‌و پانی رادەخستن‌و قامکەکانی پێکەوە دەلکاندن‌و رووەو روگەی دەکردن‌و، لەگەڵ شانی دا تەریبی دەکردن‌و هەندێ جار لەگەڵ گوێچکەکانی داو سەرو دەمی لەسەر زەوی دەهێشتنەوەو دەیفەرمو: فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت ئێسقان کورنۆش بەرم: ئاماژەی بە ناوچەوان (تەوێڵ)و لوتی‌و هەردو دەستی‌و هەردو ئەژنۆی‌و هەردو سەرەپەنجەی پێ یەکانی دەکرد.

دەیفەرموو: (لا صلاة لمن لا يصيب انفه من الأرض ما يصيب الجبين) واتە: لەکورنوشدا دەمایەوەو دەیفەرمو: (سبحان ربي الأعلى وبحمده) سێ جاران. جۆرەها پارانەوەو یادی دەفەرمین، جارێ ئەمەو جارێك ئەوە.

فەرمانی دەکرد کە لەم روکنەدا خۆ ماندو بکەن‌و سکاڵای زۆر بکەن.

پاشان سەری بەرز دەکردەوە بە (الله اكبر)ەوە، پاشان پێی چەپی رادەکێشاو لەسەری دادەنیشت‌و قاچی راستی بەرەو رووگە دەچەقاند. دەیفەرموو: (اللهم اغفر لي وارحمني واجبرني وارفعني واهدني وعافني وارزقني).

پاشان (الله اكبر) دەکات‌و کورنوشی دووەم وەکو هی یەکەمجار دەبات، پاشان بە (الله اكبر)ەوە سەری بەرز دەکاتەوە. پاشان بەرێکی لەسەر پێی چەپی دەوەستێ تا هەمو ئێسقانی دەچنەوە شوێنی خۆیان. پاشان هەڵدەستێتەوە بۆ رکەعەتی دووەم. وەکو جاری پێشوو دەکات، بەڵام کورتری دەکاتەوە لەرکەعەتی یەکەم.

دوای تەواو کردنی رکەعەتی دووەم بۆ تەحیات دادەنیشێ، گەر نوێژەکە دو رکەعەت بە (المفترش) دادەنیشێ، وەکو چۆن لەمیان دو کورنوشدا دادەنیشت. دیسان لەتەحیاتی یەکەمدا

دادەنیشێ لەتەحیاتی سێ رکەعەتی‌و چوار رکەعەتی دا، گەر لەتەحیات (التشهد) دا دادەنیشت دەستی راستی لەسەر رانی راستی دا دەناو دەستی چەپی لەسەر رانی چەپی دادەنا، دەستی چەپی رادەخست‌و دەستی راستی دەکردە مشتە کۆڵەو ئاماژەی بە قامکی شەهادە دەکردو سەیری دەکرد، گەر قامکی بەرزدەکردەوە دەیجولاندو دوعای پێ دەکردو دەیفەرمو: (ئەمە بۆ شەیتان لەئاسن توندو بە زەبر ترە).

پاشان لە دوای هەر دوورکەعەتێکدا (التحیات)ی خوێندووە. ئەنجا لەتەحیاتی یەکەم‌و دووەمدا سەڵەواتی لەخۆی داوەو ئەمەی کردۆتە یاسا بۆ ئوممەتەکەی. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دوعای جۆراو لەنوێژ دا کردووە.

پاشان بە لای راستدا سەلامی دەدایەوە: (السلام علیکم ورحمة الله)و بەلای چەپیش دا بە هەمان شێوەو، هەندێ جار (وبرکاته)ی زیاد کردووە.

## روکنەکانی نوێژ:

نوێژ فەرزو روکنی هەیە حەقیقەتی نوێژی لەسەر دادەمەزرێ، گەر یەکێ لەفەرزەکانی نەهاتە دی لەشەرعدا وەرناگرێت، ئەمەش روکنەکانیەتی:

**(١) (الله اکبر)ی ئیحرام (نوێژ دابەستن):** پێشەوا عەلی (س) لەپێغەمبەر (ﷺ) گێراویەوە: (مفتاح الصلاة الطهور، وتحریمها التکبیر، وتحلیلها التسلیم) [١]. واتە: کلیلەی نوێژ دەست نوێژو پاکژییەو ئیحرام‌و دەست پێکردنی بە (الله اکبر)ەو تەواو بونی بە سەلام دانەوەیە.

پێغەمبەر (ﷺ) بە کەسێکی دەفەرموێ کە نوێژەکە بە چاکی ناکات: (گەر هەڵسایت بۆ نوێژ (الله اکبر) بڵێ) [٢].

**(٢) وەستان بە پێوە (القیام) لەنوێژی فەرزدا:** وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ﴾[٣]. واتە: هەڵسنە بان پێ بۆ خوا بە قنوت‌و ملکەچی یەوە. ئەو (ﷺ) بە (عمران بن

---

(١) صحیح (الارواء: ٣١٩) نس(٤٠/٣).

(٢) متفق علیه: خ(٦٢٦٥/٥٦/١١) م(٤٠٢/٣٠١/١).

(٣) البقرة: ٢٣٨.

حصين) دەفەرمووێ: (نوێژ بە پێوە بکە، گەر نەتتوانی بە دانیشتنەوە نوێژ بکـە، گـەر ئەوەشـت نەتوانی لەسەر کەلەکە نوێژ بکە) [١].

**(٣) خوێندنی فاتیحە لەهەمو رکەعەتێکدا:** لەفەرمودەدا هاتووە: (لا صـلاة لمـن لم یقـرأ بفاتحة الکتاب) [٢] واتە: ئەو کەسەی فاتیحە نەخوێنێ نوێژی گیرا نابێت. پێغەمبەر (ﷺ) بەو پیـاوەی فەرموو کە نوێژی بە تەواوی نەدەکرد کە فاتیحە بخوێنێو پاشـان فـەرموی لەهـەمو نوێژەکەتـدا ئاوا بکە[٣].

**(٤ ـ ٥) رکوعو مانەوە لـەناوی دا:** وەکـو خـوا فەرمویـەتی: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا ارْكَعُـوا وَاسْجُدُوا﴾[٤]. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە رکوع ببەنو کوڕنـوش ببـەن. بـە ئـەو کەسـەی بەباشی نوێژ نەکرد فەرموی (ﷺ): (ثم ارکع حتی تطمئن راکعا) [٥].

**(٦ ـ ٧) ڕاست بوونەوە دوای ڕکوعو مانەوە لەناوی دا:** پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: (ئـەو کەسەی پشتی لەرکوعو سوجدەدا راست ناکاتەوە نوێژی دروست نابێت) [٦].

بە کەسێکی فەرموو (ﷺ) کە بەباشی نوێژەکەی نەدەکرد: (پاشان خۆت راست بکـەوە تـا بە تەواوی قیتو ڕێك دەبیت) [٧].

**(٨ ـ ٩): کورنوشو مانەوە لەناوی دا: وەکو خوا فەرمویـەتی:** ﴿ارْكَعُـوا وَاسْـجُدُوا﴾[٨]. وەکـو (ﷺ) بەو کەسەی فەرموو نوێژی باش نەدەکرد: (پاشان کورنوش ببە تا دڵنیا دەبـی کورنوشـت بردووە، پاشان سەرت بەرز بکەوە تا دڵنیا دەبی سەرت بەرز کردۆتەوە، پاشان کوڕنوش ببەوە تـا

---

(١) صحیح (جه ٣٧٧٨) خ(٢/٥٨٧/١١١٧).
(٢) متفق علیه: خ(٢/٢٣٦/٧٥٦) م(١/٢٩٥/٣٩٤).
(٣) رابردووە.
(٤) الحج: ٧٧.
(٥) رابردووە.
(٦) صحیح:(ص. جە: ٧١٠) (نس: ٢/١٨٣). (ت: ١/١٦٥/٢٦٤).
(٧) رابردووە.
(٨) الحج: ٧٧.

دڵنیا دەبی کورنۆشت بردووە)[١].

ئەندامەکانی کورنۆش (سوجدە): (ابن عباس) لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (فەرمانم پێ کراوە کورنۆش لەسەر حەوت ئێسقان ببەم: لەسەر ناوچەوانو ئاماژەی بۆ لووتی کرد، ئەنجا دوو دەستەکانو دوو ئەژنۆکانو سەرە پێ یەکان)[٢].

(ﷺ) فەرمویەتی: (ئەو کەسەی لووتی نا گەیەنێتە زەوی نوێژی گیرا نابێت).

**(١٠ ـ ١١): دانیشتن لەنێوان هەردوو کورنۆشەکانداو مانەوە لەناوی دا.**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (نوێژی ئەو کەسە دروست نابێ کە پیاو لەرکوعو سوجدەدا پشتی راست ناکاتەوە)[٣].

دیسان هەمان فەرمانی کرد (ﷺ) بەو کەسەی نوێژی خراپ دەکرد، وەکو لە (سجدە) داباسکرا.

**١٢ ـ تەحیاتی کۆتایی:**

(ابن مسعود) گێڕاویەوە: (بەر لەوەی تەحیاتمان بەسەر دا فەرز ببێ دەمانگوت: (السلام علی الله، السلام علی جبریلو میکائیل). پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئاوا مەڵێن، بەڵکو بڵێن: (التحیات لله)[٤].

بۆ سوود وەرگرتن: راسترین شێوازی تەحیات ئەوەیانە (ابن مسعود) وتویەتی: لەپی دەستی لەنێوان لەپی دەستم (پێغەمبەر (ﷺ) دا بوو کە فێری تەحیاتی کردم، وەکو چۆن فێری سورەتەکی قورئانی دەکردم: (التحیات لله والصلوات والطیبات، السلام علیك ایها النبي ورحمة الله وبرکاته، السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین، اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد عبده ورسوله)[٥].

---

(١) رابردووە.

(٢) متفق علیه: (خ ٢/٢٩٧/٨١٢) (م ٤٩٠/٢٣٠/١/٣٥٤).

(٣) صحیح (قط ٣٤٨/٣) ئەلبانی لە(صفة الصلاة)دا باسي کردووە.

(٤) صحیح: (الارواء: ٣١٩) (نس ٤٠/٣) (قط ٤/١/٣٥٠).

(٥) متفق علیه: (خ ١١/٥٦/٦٢٦٥) م(٤٠٢/٣٠١/١).

سوودەکی تر: فەرمایشتەکەی (السلام علیك ایها النبي ورحمة الله وبركاته) (الحافظ) لە(فتح/٢/٣١٤)دا وتویەتی:

(لەهەندێ رێگای ئیبن مەسعود داهاتووە کە (ك)ی کەسی دووەم گۆڕاوە بۆ کەسێکی نادیار، (ابي معمر) لە(ابن مسعود) گێڕاویەوە. دوای گێڕانەوەی (التحيات): (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەناومان بوو ئەو تەحیاتەمان دەوت، بەڵام کاتێ وەفاتی کرد وتمان: السلام، یعني علی النبي). ئەمە لەبوخاری دا هاتووەو (ابو عوانة) لە (صحيحه) کەیدا باسی کردووەو (السراج) و(الجوزقي)و (ابو نعیم الأصفهاني)و (البيهقي) لەرێگای جیا جیا لە(ابو نعیم)ی گێڕاوەتەوە کە شێخی بوخاری بووە ئاوا هاتووە: (کاتێ مرد وتمان: السلام علی النبي) وە (ابوبكر بن ابي شيبه) لە (ابی نعیم)ی گێڕاوەتەوە.

(السبکی) لە(شرح المنهاج)دا دوای گێڕانەوەی ئەم گێڕانەوەیە لە (ابي عوانة) دا وتویەتی: گەر ئەمە راست بێ لەسەحابەوە واتە: قسە کردن بە کەسی دووەمو بەرامبەر(الخطاب) لەسەلامدا دوای پێغەمبەر (ﷺ) واجب نییەو دەوترێ: (السلام علی النبي). (ابن حجر) دەڵێ: بێگومان راستەو گێڕانەوەی بەهێزم بینیوە بۆ ئەوە، (عبدالرزاق) گێڕاویەوە کە (ابن جريج) لە(عطاء)ی گێڕاوەتەوە.

کە سەحابەکان لەکاتێدا پێغەمبەر (ﷺ) زیندووبوو دەیان وت: (السلام علیك ایها النبي) بەڵام کە وەفاتی کرد وتیان: (السلام علی النبي). ئەمەش (اسناد)ی (صحيح)ە.

(الألباني) لە(صفة الصلاة/ ١٢٦)دا دەڵێ: پێویستە ئەمە بە یارمەتی ئەو (ﷺ) بوو بێ، ئەم گێڕانەوەی عائیشە ئەمە پشت راست دەکاتەوە کە تەحیاتی ئاوا فێر کردون (السلام علی النبي). (رواه السراج في مسنده ج٩/١/٢)ء (الملخص في الفوائد / ج١١/٥٤/١) (بسندين صحيحين عنها) [1]. (کۆتایی).

**(١٣) سەڵەوات لەدیداری پێغەمبەر (ﷺ) دوای تەحیاتی کۆتایی:**

(پێغەمبەر (ﷺ) پیاوەکی بینی نوێژی کرد حەمدو سەنای خوای نەکردو گەورەی رانەگرت، ئەنجا سەڵەواتی لێ نەداو رۆیشت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەمە پەلەی کرد، ئەنجا

(١) صحيح الأسناد (صفة الصلاة ١٨٢/ط) ت(٣٥٤٦/١٨٠/٥) (د: ١٤٦٨/٤/٣٥٤).

بانگی کردەوەو بە ئەمو کەسانی تری فەرمووی: (اذا صلى احدكم فليبدأ بتمجيد ربه والثناء عليه، وليصل على النبي (ﷺ) ثم يدعو بما شاء) [١]. واتە: گەر کەسێ لەئێوە نوێژی کرد با حەمدو سەناو شکۆی خوا دەست پێ بکاتو سەلاوەت لەدیداری پێغەمبەر (ﷺ) بدات، پاشان با بە ئارەزوی خۆی بپارێتەوە). (ابی مسعود) گێڕاویەوە: پیاوێ هات تا لەبەر دەم پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتو وتی: باشە ئەی پێغەمبەری خودا فێربوین چۆنت سەلام لێ بکەین، ئەی لەنوێژەکانماندا چۆنت سەلەوات لێ بدەین خوا سەلەواتی لێ داویت؟ پێغەمبەر ئەوەندە داماو بێ دەنگ مایەوە کە دەمان وت خۆزگە پرسیاری لێ نەکردبایە، پاشان (ﷺ) فەرموی: (گەر ئێوە سەڵەواتتانو لەسەر لێدام بڵێن: (اللهم صل على محمد النبي الأمي وعلى آل محمد...) [٢].

بۆ سوود وەرگرتن: باشترین شێوازی سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیانە کە(کعب بن عجره) گێڕاویەوەو وتی: بە پێغەمبەری خوامان (ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خوا زانیمان چۆن سەلامت لێ بکەین، بەڵام سەڵەوات لێدان چۆنە؟ فەرموی (ﷺ): بڵێن: (اللهم صل على محمد وآل محمد كما صليت على آل ابراهيم انك حميد مجيد، اللهم بارك على محمد وآل محمد كما باركت على آل ابراهيم انك حميد مجيد) [٣].

**(١٤) سەلام دانەوە:** وەکو (ﷺ) فەرمویەتی: (مفتاح الصلاة الطهور، وتحريمها التكبير، وتحليلها التسليم) [٤].

## پێویستی یەکانی نوێژ (الواجبات):

**(١) (الله اكبر)ەکانی گواستنەوەو وتنی (سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد) :**

(ابو هريره) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەستا بۆ نوێژ (الله اكبر)ی دەگوت، لەرکوعدا (الله اكبر)ی دەگوت، پاشان کاتی راست بوونەوە دەیفەرمو: (سمع الله لمن حمده) کە بە

---

(١) صحيح الإسناد: (صفة صلاة النبي ١٨٢) (ت ٣٥٤/١٨٠/٥) (د: ١٤٦٨/٤/٣٥٤).
(٢) اسناده حسن (خز ٣٥١/٧١١و ١/٣٥٢).
(٣) متفق عليه: (خ ١١/١٥٢/٦٣٥٧) م(١/٣٠٥/٤٠٦).
(٤) رابردووباسکرا.

تەواوی پشتی راست دەکردەوە دەیفەرموو: (ربنا لك الحمد)، کاتێ دادەهاتەوە (الله اكبر)ی دەگوت، گەر سەری بەرز دەکردەوە (الله اكبر)ی دەگوت کە دەچۆوە کڕنۆش (الله اكبر)ی دەگوتە، ئەنجا لەگەڵ سەر بەرزکردنەوە (الله اكبر)ی دەگوتەوە، تا نوێژی تەواو دەکرد ئاوای دەکرد، کاتێ دو رکەعەتی دەکردو دادەنیشت لەهەڵسانەوەدا (الله اكبر)ی دەگوت) [1].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (چۆنتان من بینیوە ئاوا نوێژ بکەن) [2].

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بەم پیاوە کرد، کە باش نوێژەکەی نەدەکرد: (کەس نوێژی تەواو نابێ تا دەست نوێژ هەڵنەگرێو لەجێ ی خۆیدا دەیکات، پاشان (الله اكبر) دەڵێو حەمدو سەنای خوا دەکات، ئەنجا هەر چەندەکی بوێ لەقورئان دەیخوێنێ، پاشان دەڵێ (الله اكبر)، دوایی رکوع دەبات تا جومگەکانی دەمێننەوە، پاشان دەڵێ: (سمع الله لمن حمده)، تا راست دەبێتەوە، پاشان دەڵێ: (الله اكبر)، دوایی کورنوش دەبات تا جومگەکانی دەمێننەوە، پاشان سەری بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: (الله اكبر)و بە تەواوی بە دانیشتنەوە خۆی راست دەکاتەوە، پاشان دەرواتەوە کورنوش تا دڵنیا دەبێو جومگەکانی دەمێننەوە، دوایی سەری بەرز دەکاتەوەو دەڵێ (الله اكبر)، گەر ئەمەی ئەنجام دان نوێژەکەی تەواو کردووە) [3].

**(٢) تەحیاتی یەکەم:**

(ابن مسعود) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر لەهەر دوو رکەعەتێکدا دانیشتن تەحیات بخوێنن: (التحيات لله والصلوات والطيبات السلام عليك ايها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا عبده ورسوله) پاشان کام پاڕانەوەی پێ خۆشە با بیکاتو با لەپەروەردگاری گەورەی بپاڕێتەوە) [4].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بەم پیاوە کرد، کە نوێژەکەی باش ئەنجام نەدەدا: (گەر لەناوەڕاستی نوێژدا دانیشتیت بمێنەوەو پێی چەپت درێژ بکەوو پاشان تەحیات بخوێنە) [5].

---

(١) متفق عليه: (خ ٢/٢٧٢/٢٨٩) (م ١/٢٩٣/٢٨/٣٩٢).

(٢) صحيح: (الارواء: ٢٦٢) (خ ٢/١١/٦٣١).

(٣) صحيح: (ص.د ٧٦٣) د(٨٤٢/٩٩و ٣/١٠٠).

(٤) صحيح الارواء: ٣٣٦) (النسائي ٢/٢٣٨).

(٥) صحيح: (ص.د ٧٦٦) د(٢/١٠٢/٨٤٥).

(٣) پێویستە گەر هەڵسا بۆ نوێژ بەربەستێ بخاتە بەردەمی، تا بوار نەدات کەس بە پێشی دا رابڕێو سەیری دوای ئەوە نەکات:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە نوێژی کرد بالەبەردەم بەربەستێ دانوێژ بکاو لێی نزیك بێتەوە، با شەیتان نوێژی لێ نەبڕێت) [١].

(ابن عمر) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لەبەردەم بەربەستێ دا نەبێ نوێژ مەکەو بوار مەدە کەس بە پێشت دا رەت بێ، گەر یاخی بوو شەڕی لەگەڵدا بکە، ئەو قەرینی لەگەڵدایە[٢].

بەربەست (السترة) دیوارو گۆچانەکی چەقیوو وڵاخ هەموو ئەوانە دەبن کە لەبەردەمدا دابنرێتو کەمترین شت کە دروستە ئەو تەختە دارەیە سوار لەسەر وڵاخ پشتی پێوە دەدات، وەکو لەفەرمودەدا هاتووە: (اذا وضع احدکم بین یدیه مثل مؤخرة الرحل فلیصل، ولا یبال من مر وراء ذلك) [٣]. واتە: گەر یەکێ لەئێوە ئەو تەختەیەی دانا لەبەردەمیدا بۆ نوێژ، با وابکاتو گوێ بەوە نەدات کێ بەدوای ئەوداره رەت دەبێت.

## نزیك بوونەوەی نوێژکەر لەبەربەستێك (السترة):

بیلال (رضي الله عنه) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کردو نێوان ئەوو دیوارەکە سێ گەز ـ الذراع ـ دەبوو) [٤].

(سهل بن سعد) گێڕاویەوە: (نێوان نوێژگەی پێغەمبەر(ﷺ)و دیوارەکە رێگای مەڕێك دەبوو) [٥].

**ـ گەر بەربەست دانرا رێگا نادرێ کەس بە نێوانی دا گوزەر بکات:**

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی دەکرد مەڕێ بە بەردەمی دا رەت بوو

---

(١) صحیح (ص. نس ٧٢٢) (نس ٢/٦٢).

(٢) صحیح/صفة الصلاة/٦٢) (خز/٨٠٠/٩٠/٢).

(٣) صحیح (مختصر م ٣٣٩) م(٤٩٩/٣٥٨/١).

(٤) صحیح: صفة الصلاة/٦٢) (خ ٥٠٦/٥٧٩/١).

(٥) متفق علیه: خ(٤٩٦/٥٧١/١) م(٥٠٨/٣٦٤/١).

پێشی کەوتەوە بەرەو قیبلە تا سکی بە قیبلەوە نوساند) [١].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە نوێژ دەکات با رێگا نەدا کەس بەپێشی دا رەت بێ، تا دەتوانێ با پالّی پێوە بنێ، گەر وازی نەهێنا لەگەلّی دا بجەنگە، ئەوە شەیتانە) [٢].

**- گەر بەربەستێك دا نەنێ ئەوە (کەر) یان (ژن) یان (سەگی رەش) نوێژی دەبڕێت:**

(ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە هەلّسا نوێژ بکات، با بەربەستێ دابنێ گەر تەختەی پالّ پێوەدانی دوای ولاّخیش بێ، گەر ئەمە نەبوو ئەوە گوێ درێژ یان ئافرەت یا سەگی رەش نوێژی دەبڕێت؟ وتم: ئەی ئەبوذەر بۆچی سەگی رەش نەك سوورو زەرد؟ وتی: برازام هەمان پرسیارم لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد؟ فەرموی: (سەگی رەش شەیتانە) [٣].

**- نارەوایی رابردن بە بەردەم نوێژکەردا:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر ئەو کەسەی بەبەردەم نوێژکەردا رادەبرێ بزانێ چ گوناهەکی گەورەیە، چل (رۆژ یان سالّ)بۆی باشتر بوو بوەستێ نەك بە پێشی دا بڕوات) [٤].

**- بەربەستی پێش نوێژ خوێن بەربەستە بۆ پابەندبوون بە پێشەوا (المأموم):**

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (سواری ماکەرێ بووبووم هاتمو سەرو بەری هەرزەکاری بووم، پێغەمبەر (ﷺ) لەمینا نوێژی دەکرد، بەناو ریزەکەدا ڕەت بووم، دابەزیمو ماکەرەکەم بەرەلاّکرد بلەوەڕێو چوومەوە ریزەکەوەو کەس ئەمەی پێ ناخۆش نەبوو) [٥].

---

(١) صفة الصلاة/٦٤) (خز ٢/٢٠/٨٢٧).

(٢) صحيح (مختصر م ٣٣٨) (م ١/٣٦٢/٥٠٥).

(٣) صحيح: (ص.ج ٧١٩) م(١/٣٦٥/٥١٠).

(٤) متفق عليه: خ(١/٥٨٤/٥١٠) (م ١/٣٦٣/٥٠٧).

(٥) متفق عليه م(١/٣٦١/٥٠٤) خ(١/٥٧١/٤٩٣).

تێبینی: لە(بوخاري)دا هاتووە: (اربعين خريفا) واتە چل پایز بوەستێت. دووەم شت: لە(مغني المحتاج/ج١/ل: ٣٠٦)دا هاتووە، کە نوێژکردن بە بەردەم بەربەستدا سوننەتەو رابردن بە پێشی حەرامە.

## ـ سوننەتەکانی نوێژ:

دووبەشن: بە قسەو بە کردەوە: بە قسە ئەمانەن:

**(١)دوعای دەست بە نوێژکردن (دعاء الإستفتاح):**

باشترین پاڕانەوە ئەوەیانە (ابو هریرة) گێڕاویەوە، کە دەڵێ: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ـ (الله اکبر)ی نوێژ دابەستنی گوت بەر لەفاتیحە هەندێ بێ دەنگ دەبوو، منیش وتم بە باوكو دایکەوە بە قوربانت بم لەنێوان (الله اکبر)و (خوێندن) دا بێ دەنگ دەبی، چی دەفەرمیت؟ فەرموی دەڵێم: (اللهم باعد بيني وبين خطاياي كما باعدت بين المشرق والمغرب، اللهم نقني من خطاياي كما ينقى الثوب الأبيض من الدنس، اللهم اغسلني من خطاياي بالثلج والماء والبرد) [١].

**(٢) خوێندنی (اعوذ بالله):**

خوا فەرمویەتی: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾[٢]. واتە: (گەر قورئانت خوێند بڵێ ـ اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ).

ئەبو سەعید خودری (رضي الله عنه) لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاویەوە کە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بە نوێژ دەکرد بە ـ اعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم من همزه ونفخه ونفثه ـ دەستی پێ دەکرد) [٣].

**(٣) ئامین خوێندن:**

(وائل بن حجر) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرمو: (ولا الضالين) دەیفەرمو: (آمين)و دەنگی بەرز دەکردەوە) [٤].

ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کاتێ پێشنوێژ خوێن ئامینی کرد ئێوەش ئامین بکەن، گەر کەس ئامینی بەر ئامینی فریشتەکان بکەوێ خوا لەتاوانی رابردووی

(١) متفق علیه خ(١/٥٨٤/٥١٠) م(١/٣٦٣/٥٠٧).

(٢) النحل: ٩٨.

(٣) صحيح: (الارواء: ٣٤٢) د(٢/٤٧٦/٧٦٠) (ت ٢٤٢/١/١٥٣).

(٤) (صفة الصلاة/٨٢) (د: ٣/٢٠٥/٥٢٠).

دەبورێت) [1].

**(٤) قورئان خوێندن دوای فاتیحە:**

(ابی قتادە) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەرکەعەتی یەکەمو دووەم لەنوێژی نیوەڕۆدا فاتیحەو دو سوڕەتی دەخوێندن، لەهی یەکەم دا درێژتر بو لەهی دووەمو هەندێ جار دەبیسترا، لەئێوارەدا دو سوڕەتی دوای فاتیحە دەخوێندن، لەنوێژی بەیانی دا رکەعەتی یەکەمی درێژ کردەوەو هی دووەمی کورت دەکردەوە) [2].

هەر لەمەوە گەڕاوەتەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەرکەعەتی یەکەمو دووەمی نیوەڕۆو ئێوارەدا فاتیحەو سوڕەتێکی دەخوێندو هەندێجار دەمان بیست، لەدوو رکەعەتی دوایی دا تەنیا فاتیحەی دەخوێند) [3].

**هەندێ جار لەدوو رکەعەتی کۆتاییشداخوێندنی قوڕئان سوننەتە:**

ئەبو سەعیدی خودری گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژی نیوەڕودا لەهەردوو رکەعەتی پێشوودا نزیکەی (٣٠) ئایەتی دەخوێندو لەدوور کەعەتی دوایی نزیکەی (١٥) ئایەتی دەخوێند، یان نیوەی ئەوە، لەئێوارەدا لەرکەعەتی یەکەمو دووەمدا بە ئەندازەی (١٥) ئایەت قوڕئانی دەخوێندو لەدوورکەعەتی دوایی دا نیو ئەوەندەی دەخوێند) [4].

سوننەتە لەنوێژی بەیانیو دوو رکەعەتی شێوانو خەوتناندا بە ئاشکرایی قوڕئان بخوێنرێو لەنیوەڕۆو عەسرو رکەعەتی کۆتایی شێوانو دوو رکەعەتی کۆتایی خەوتناندا قوڕئان بەبێ دەنگی بخوێنرێت.

**(٥) تەسبیحات لەچەمانەوە(الركوع)و كوڕنوش(السجود)دا:**

(حذیفة) دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژم کرد لەرکوعی دا دەیوت: (سبحان ربي

---

(١) متفق علیه: م(٤١٠/٣٠٧/١) (خ ٧٨٠/٢٦٢/٢).

(٢) صحیح: (ص. نس ٩٣٢) (خ ٧٥٩/٢٤٣/٢).

(٣) صحیح: (مختصر م ٢٨٦) (م ٤٢١ ـ ١٥٥/٣٣٣/١).

(٤) صحیح: (مختصر ٢٧٨) م(٤٥٢ ـ ١٥٧ ـ ٣٣٤/١).

العظيم وبحمده) و لەکورنوشدا دەیوت: (سبحان ربي الأعلى وبحمده) [١].

(عتبة بن عامر) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) رکوعی دەبرد دەیفەرمو: (سبحان ربي العظيم وبحمده) وکاتێ کورنوشی دەبرد دەیفەرموو: (سبحان ربي الأعلى وبحمده) [٢].

**(٦) زیاد راست بوونەوە لەرکوعەوە لەسەر فەرمایشتی (ربنا ولك الحمد) بەیەکێ لەم زیادانە:**

(ملء السماوات والأرض وما بينهما وملء ما شئت من شيء من بعد) [٣]. گەر مەبەستی دەتوانێ ئەمەندەش زیاتر بکات: (اهل الثناء والمجد احق ما قال العبد وكلنا لك العبد، لا مانع لما اعطيت ولا معطي لما مانعت ولا ينفع ذا الجد منك الجد) [٤]. یان (ربنا ولك الحمد كثيرا طيبا مباركا عليه كما يحب ربنا ويرضى) [٥].

**(٧) پاڕانەوەی نێوان دوو کورنوش:**

(حذيفة) گێڕایەوە پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوان دو کورنوشدا دەیفەرموو: (رب اغفر لي، ربي اغفر لي) [٦].

(ابن عباس) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوان دوو کورنوشدا دەیفەرموو: (اللهم اغفر لي وارحمني واجبرني واهدني وارزقني) [٧].

**(٨) سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لەتەحیاتی یەکەمدا چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی کردویەتی:**

---

(١) صحيح: (ص. نس ١٠٠١) نس (٢/١٩٠) (د ٣/١٢٣/٨٥٧).

(٢) صحيح: (صفة الصلاة: ١٢٧) د(٣/١٢١/٨٥٦) هق(٢/٨٦).

(٣) صحيح (مختصر م ٢٩٦) م(١/٣٤٧/٤٧٧/٤٧٨).

(٤) صحيح (مختصر م ٢٩٦) م(١/٣٤٧/٤٧٧/٤٧٨).

(٥) صفة الصلاة/١١٩/ صحيح.

(٦) صحيح ابن ماجة ٧٣١) ج(١/٢٨٩/٨٩٧).

(٧) صحيح (ص. جه ٧٣٢) (ت ١/١٧٥/٢٨٣) (د: ٣/٨٧/٨٣٥) (جه ١/٢٩٠/٨٩٨).
لە لای(ابو داود)دا لەجیاتی (واجبرني)دا (عافني) هاتووە، لە(ابن ماجة)دا لەجیاتی (واهدني)دا (وارفعني) هاتووە. سوننەتە هەموویان زیاد بکرێن.

عائیشە گێڕاویەوە: (ئێمە سیواك‌و ئاوی دەست نوێژمان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئامادە دەکرد، لەهەر کاتەکی شەودا خوا مەبەستی بایە پێغەمبەری (ﷺ) بێداردەکردەوە، سیواکی بەکاردەهێناو دەست نوێژی دەگرت، پاشان (٩) رکەعەتی دەکرد، تەنیا لەهەشتەمدا دادەنیشت لەنێوانیاندا، دەپاڕاوەو سەڵەواتی لەسەر پێغەمبەرەکەی دەدا، پاشان هەڵدەستاوەو سەلامی نەدەدایە، پاشان نوێژی نۆیەمی دەکردو دادەنیشت، پاشان حەمدو ستایشی خوای دەکردو سەڵەواتی لەپێغەمبەرەکەی دەدایەوە (ﷺ) دوعای دەکردو سەلامی دەدایەوە) [1].

**(٩) پاڕانەوە دوای تەحیاتی یەکەم‌و دووەم وەکو یەکە:**

لەدوای تەحیاتی یەکەم: (ابن مسعود) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر لەهەردوو رکەعەتێکدا دانیشتن بڵێن: (التحیات لله والصلوات والطیبات، السلام علیك ایها النبي ورحمة الله وبرکاته، السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین. اشهد ان لا اله الا الله. واشهد ان محمدا عبده ورسوله). پاشان سەرپشکە هەر یەکێ لەئێوە چی پێ خۆشە لەپاڕانەوە بیکات لەپەروەردگاری شکۆداری خۆی) [2].

بۆ تەحیاتی دووەم: (ابو هریرة) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کاتێ هەریەك لەئێوە تەحیاتی دوایی تەواو کرد با (اعوذ بالله) بکات لەچوار شت: لەسزای دۆزەخ‌و سزای گۆڕو فیتنەکانی زیندووبونەوەو مردن‌و شەڕی مەسیحی دەججال) [3].

**(١٠) سەلامی دووەم:**

چونکە ئەو دوو سەلامی دەدایەوە، وەکو (ابن مسعود) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) دوو سەلامی داوەتەوە لەراست‌و چەپدا: (السلام علیکم ورحمة الله ـ السلام علیکم ورحمة الله) تا سپیایی کوڵمی دەبینرا [4].

هەندێ جار یەك سەلامی داوەتەوە وەکو عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) یەك

---

(١) صحیح: (مختصر م ٣٩٠) م(١/٥١٢/٧٤٦).

(٢) رابردوو باسکرا.

(٣) صحیح (مختصر م ٣٠٦٦) (ص. جه ٧٤١) (م ٥٨٨ /٤١٢/١).

(٤) صحیح: (ص.د ٨٧٨) د(٣/٢٨٨/٩٨٣) (نس ٣/٦٢).

سەلامی دەدایەوە هەندێ مەیلی لای راستی دەکرد) [١].

## ـ سوننەتی کرداری:

**(١)لەکاتی (الله اکبر)ی نوێژدابەستن (ئیحرام)داو کاتی رکوعو بەرزبونەوەو هەڵسانەوە لەتەحیاتی یەکەمدا دەستی بەرزدەکردنەوە:**

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بە نوێژ دەکرد دەستی تا ئاستی شانەکانی بەرز دەکردەوە، دیسان لەکاتی (الله اکبر)ی رکوعو سەربەرزکردنەوەی لەرکوعدا بەرزی کردونەوە) [٢].

(نافع) گێڕاویەوە: (ابن عمر) گەر دەستی بە نوێژ دەکرد (الله اکبر)ی وت و دەستەکانی بەرزدەکردنەوە، گەر دەیوت: (سمع الله لمن حمده) دەستی بەرزدەکردنەوە، گەر لەهەردوو رکەعەتێ بەرز دەبۆوە دەستی بەرز دەکردنەوەو ئەمەی دەگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) [٣].

هەندێ جار سوننەتە لەهەموو هەڵسانو نزم بوونەوەیەکدا دەست بەرز بکرێتەوە: (مالك بن حویرث) دەڵێ: (ئەو پێغەمبەری (ﷺ) بینی دەستی بەرز کردنەوە لەنوێژی دا لەرکوعدا، گەر لەرکوعدا سەری بەرزکردەوەو گەر چووە کورنوشو گەر سەری لەکورنوش بەرزکردەوە دەستەکانی بەرزکردنەوە تا هاوتەریبی گوێیەکانی دەکردن) [٤].

**(٢) دانانی دەست لەسەر دەست لەسەر سنگەوە:**

(سهل بن سعد) دەڵێ: (فەرمان بە خەڵکی دەکرا دەستی راست لەسەر دەستی چەپدا دابنێن لەنوێژدا). (ابو حازم) دەڵێ: پێم وایە ئەمە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) بێت[٥]. (وائل بن حجر)

---

(١) صحيح: (ص.ت ٢٤٢) (ت ١/١٨٢/٢٩٠).

(٢) متفق عليه: (خ ٢/٢١٨/٧٣٥) (م ٣٩٠ ـ ٢/٢٩٢/٢٢).

(٣) صحيح: (ص.د ٦٦٣) خ(٢/٢٢٢/٧٣٩) د(٢/٤٣٩/٧٢٧).

(٤) (ص. نس ١٠٤) نس(٢/٢٠٦) أ(٣/١٦٧/٤٩٣).

(٥) صحيح (مختصر خ ٤٠٢) (خ ٢/٢٢٤/٧٤٠).

گێڕاویەوە: (نوێژم لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کرد دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی دانا لەسەر سنگەوە)[١].

**(٣) سەیرکردنی خاڵی کوڕنوش بردن:**

عائیشە گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) چووە ناو کەعبەوە چاوی لەخاڵی کوڕنوش لا نەبرد تا لێ ی هاتە دەرەوە)[٢].

**(٤) لەرکوعدا ئەم ئاکارانە (الهیئآت) بکات کە لەم گێڕانەوانەدا هاتووە:**

عائیشە گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) رکوعی دەبرد نە سەری بەرزدەکردەوە، نە راستی دەکرد لەو نێوانەدا بوو)[٣].

(ابی حمید) لەوەسفی نوێژی پێغەمبەر دا (ﷺ) گێڕاویەوە:

(گەر رکوعی دەبرد دەستی لەئەژنۆکانی گیر دەکردن، پاشان پشتی دەچەماندەوە بێ ئەوەی بیکات بە کەوانەیی)[٤].

(وائل بن حجر) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) رکوعی دەبرد پەنجەکانی لێك بلاو دەکردەوە)[٥].

(ابی حمید) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) رکوعی دەبرد دەستی لەسەر ئەژنۆکانی رۆدەنان دەستی لێ گیر دەکردنو لەتەنیشتەکانی دوور دەخستنەوەو خواری دەکردنەوە)[٦].

**(٥) پێش خستنی دەستەکان بەر لەچۆکەکان لەکوڕنوشدا:**

ئەبو هورەیرە گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: گەر یەکێ لەئێوە کوڕنوشی برد باوەکو وشتر چۆك دانەدات، با دەستەکانی پێش چۆکی دابنێت)[٧].

---

(١) (صحيح الارواء:٣٥٢) خز(٢٤٣/٤٧٩/١).
(٢) صحيح: (صفة الصلاة/٦٩). كم(٤٧٩/١).
(٣) صفة الصلاة/١١١) م(٣٥٧/٤٩٨/١) (د: ٤٨٩٨/٦٨/٢).
(٤) صحيح (صفة الصلاة: ١١٠) خ(٣٠٥/٨٢٨/٢).
(٥) صحيح (صفة الصلاة: ١١٠) (خز ٣٠١/٥٩٤/١).
(٦) صحيح: (ص. ت ٢١٤) (د: ٤٢٩/٧٢٠/٢) (ت: ١٦٣/٢٥٩/١).
(٧) صحيح: (ص.د ٧٤٦) د(٧٠/٨٢٥/٣) نس(٢٠٧/٢).

**(٦) لەکوڕنوشدا ئەم فەرمودانە ئەنجامدا کە ئاکارەکانی باسکردون:**

(ابی حمید) لەوەسفی نوێژی پێغەمبەردا (ﷺ) وتی: (گەر کوڕنوشی دەبرد دەستەکانی نە پان رادەخستو نە دەیکردن بە مشتو سەری پەنجەکانی ئاراستەی رووگە دەکرد) [١].

(البراء) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر کوڕنوشت برد دەستەکانت دابنێو ئانیشکەکانت بەرزبکەوە)[٢].

(عبدالله بن مالك ابن بجینە) گێڕاویەوە: (گەر پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی دەکرد نێوانی دەستەکانی ئەوە لێك دوور دەگرت سپیایی بن هەنگلی دەردەکەوت) [٣].

عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر جێگای من نەمابوو بینیم لەکوڕنوشدایە هەر قولنگەکانی رێك کردبوو قامکەکانی بەرەو قیبلە ئاراستە کردبوو) [٤].

(وائل بن حجر) گێڕاویەوە: (هاتمە مەدینە وتم سەیری نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەم (......پاشان خۆی شۆڕ کردەوەو کوڕنوشی برد سەری خستنە نێوان هەردوو لەپی دەستەکانی یەوە) [٥].

(وائل بن حجر) گێڕاویەوە: (گەر پێغەمبەر (ﷺ) کوڕنوشی دەبرد پەنجەکانی کۆدەکردەوە)[٦].

(البراء) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کوڕنوشی دەبرد دەستی لەسەر زەوی دادەناو لەپو قامکی ئاراستەی قیبلە دەکردن) [٧].

**(٧) دانیشتنی نێوان کوڕنوشەکانی لەسەر شێوەی گێڕانەوەی ئەم فەرمودانە بێت:**

عائیشە گێڕاویەوە: (پێ ی رادەخستو پێ ی راستی دەچەقاند) [٨].

---

(١) صحيح: (ص.د ٦٧٢) (خ ٢/٣٠٥/٨٢٨) (د: ١/٤٢٧/٧١٨).

(٢) صحيح: صفة الصلاة/١٢٦) (م ١/٣٥٦/٤٩٤).

(٣) متفق عليه: (خ ٢/٢٩٤/٨٠٧) م(١/٣٥٦/٤٩٥).

(٤) صحيح: (صفة الصلاة/١٢٦) (خز ١/٣٢٨/٦٥٤).

(٥) صحيح الإسناد (خزية ١/٣٢٣/٦٤١).

(٦) صحيح(صفة الصلاة ١٢٣) (خز ١/٣٢٤/٦٤٢).

(٧) صحيح الإسناد (صفة الصلاة ١٢٦) (هق ٢/١١٣).

(٨) صحيح (مختصر م ٣٠٢) م(١/٣٥٧/٤٩٨).

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (سوننەتێکی نوێژ ئەوەیە قاچی راست بچەقێنیو قامکەکانی ئاراستەی قیبلە دەکردو لەسەر پێ ی راست دادەنیشت)[١].

(طاوس) گێڕاویەوە لەراست دانیشتن لەسەر هەردو پێ یەکان لە(ابن عباس) پرسیارمان کرد؟ وتی: سوننەتە. وتمان: پێمان وایە ئەمە پێ ئازار بدات، (ابن عباس) وتی: ئەمە سوننەتی پێغەمبەرەکەتە (ﷺ)[٢].

**(٨) لەکورنوش راست نەبێتەوە تا دادەنیشیت:**

(ابی قلابە) گێڕاویەوە: (مالك بن الحويرث الليثي)گێڕاویەوە: (پێغەمبەری (ﷺ) بینی نوێژی دەکرد گەر نوێژی بە نیوە دەکرد تا بەتەواوی دانەنیشتبایە هەڵنەدەستایەوە)[٣].

**(٩) گەر لەرکەعەت هەڵسایەوە دەست بداتە بەر زەوی:**

(مالك بن الحويرث) هاتە لامانو لەم مزگەوتەدا نوێژی پێ کردین، وتی: من نوێژتان پێ دەکەم، مەبەستیشم نوێژەکە نییە، بەڵکو دەمەوێ نوێژی پێغەمبەرتان (ﷺ) فێر بکەم. (ایوب) وتی: بە (ابو قلابە)م وت: نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) چۆن بوو؟ وتی: وەکو نوێژی ئەم پیرەمێردەمان بوو، واتە: (عمرو بن سلمە). وتی: ئەو پیرەمێردە (الله اكبر)ی تەواو دەکرد، گەر لەکورنوشی دووەم سەری بەرز دەکردەوە دادەنیشتو خۆی دەدایە سەر زەویو هەڵدەستایەوە)[٤].

**(١٠) دانیشتنی لەهەردوو تەحیاتەکاندا بەم شێوەیە بێت:**

(ابی حمید) لەوەسفی نوێژی پێغەمبەردا (ﷺ) باسی کردووە: (گەر لەدوو رکەعەتەدا دادەنیشت لەسەر قاچی چەپ دادەنیشتو قاچی راستی دەچەقاند، لەرکەعەتی دوایی دا پێ ی چەپی پێش دەخستو ئەوەی تری دەچەقاندو دادەنیشت)[٥].

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (گەر پێغەمبەر (ﷺ) دادەنیشت لەنوێژدا، لەپی راستی لەسەر رانی

---

(١) صحيح: (ص.نس ١١٠٩) (نس ٢/٢٣٦).

(٢) صحيح: (مختصر م ٣٠٣) (م ١/٣٨٠/٥٣٦).

(٣) صحيح: (مختصر خ ٤٣٧) خ(٢/٣٠٢/٨٢٣).

(٤) صحيح: (مختصر خ ٤٣٧) خ(٢/٣٠٣/٨٢٤).

(٥) صحيح: (مختصر ٤٤٨).

چەپی دادەناو قامکەکانی پێکەوە دەلکاندو ئاماژەی بە قامکی شـەهادە دەکـردو لـەپی چـەپی لەسەر رانی چەپی رۆدەنا) [١].

(نافع) گێڕاویەوە: (ابن عمر) گەر لەنوێژدا دادەنیشت هەر دەستی لەسـەر ئـەژنۆی دادەنـاو ئاماژەی بەپەنجەی دەکردو تەماشای دەکـردو پاشـان وتـی: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی ئـەم پەنجەی شەهادەیە بۆ شەیتان لەئاسن بەهێز ترە) [٢].

## ـ زیکرو پاڕانەوە شەرعی یەکان دوای نوێژ

(١) (ثوبـان) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنوێژ دەچووە دەر سێ جار دەیفـەرموو: (استغفر الله)و دەیفەرموو: (اللهم انت السلام ومنـك السلام تبارکـت ذا الجلال والإکـرام).
(الولید) گێڕاویەوە: لە (الأوزاعي) پرسیارم کرد چۆنی (الإستغفار = داواکردنی لێ بـووردن) دەکرد؟ وتی: دەیفەرمو: (استغفر الله، استغفر الله) [٣].

(٢) (ابن زبیر) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) لەدوای سەلام دانەوەی هەر نوێژێکدا دەیفەرموو: (لا اله الا الله وحده لا شریك له، له الملك وله الحمد وهو علی کل شيء قـدیر، لا حـول ولا قـوة الا بالله، لا اله الا الله، ولا نعبد الا ایاه، له النعمة وله الفضل، وله الثناء الحسن، لا اله الا الله، مخلصین له الدین ولو کره الکافرون). دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دوای هەمو نوێژێ بەمەی دەست پێ دەکرد [٤].

(٣) (مغیرة بن شعبة) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی تەواو دەکرد دەیوت: (لا اله الا الله وحده لا شریك له، له الملك وله الحمد وهو علی کل شيء قدیر. اللهم لا مانع لما اعطیت

---

(١) صحیح: (ص.د ٨٥١) م(٥٨٠ ـ ١١٦/١/٤٠٨).

تێبینی: لە(مغني المحتاج)دا (ج١)دا مەبەست لـەئاماژە بـە قامـك کـردن لەشـەهادەدا تـەنیا لـە(لا الـه الا الله) بەرزدەکرێتەوەو ئاپجولێنێ وەکو (ابو داود) لە(ابن الزبیر) گێڕاویەوە.

(٢) حسن (صفة الصلاة/١٤٠) (أ: ٤/١٥/٧٢١).

(٣) صحیح: (ص.جه ٧٥٦) (م ١/٤١٤/٥٩١) جه(٩٢٨/١/٣٠٠).

(٤) صحیح (ص. نس ١٢٧٢) (نس ٣/٧٠).

ولا معطي لما منعت، ولا ينفع ذا الجد منك الجد) [١].

(٤) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (چەند شتێ دوای نوێژ (المعقبات) هەیە ئەوەی لەدوای هەمو نوێژێکدا بیانڵێ بێ بەش نابێت: سیو سێ جار (سبحان الله)و سیو سێ جار (الحمد لله) بڵێ و سیو سێ جار (الله اکبر) بکات، [٢].

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێ: (هەر کەسێ دوای هەموو نوێژێ (٣٣) جار بڵێ (سبحان الله ـ بێ گەردی بۆ خوا)و (٣٣) جار (الحمد لله ـ سوپاسو ستایش بۆ خودا) بکاتو (٣٣) جار (الله اکبر ـ خوا گەورەیە) بکات ئەوە (٩٩) دانە، بە: (لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك له الحمد وهو على كل شيء قدير) بیکات بە (١٠٠)، ئەوە خوا لەگوناهەکانی خۆش دەبێ گەر وەکو کەفی دەریاش وابن) [٣].

(٥) (معاذ بن جبل) وتویەتی: (رۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) دەستی گرتمو فەرموی: ئەی مەعاذ سوێند بەخوا خۆشم دەوێ ی. وتم: بە باوكو دایکەوە بەقوربانت بم، سوێند بەخوا من خۆشم دەوێیت. فەرموی: ئەی (معاذ) ئامۆژگاریت دەکەم نەکەی ئەم دوعایەیە دوای هەموو نوێژێ پشت گوێ بخەیت: (اللهم اعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك) [٤].

(٦) (ابي امامة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: هەر کەسێ دوای هەموو نوێژێکی فەرز (آیة الكرسي) بخوێنێ، مەگەر نەمردن گەر نا هیچ شتێ لەچوونە بەهەشتی ناگێڕێتەوە) [٥]. (محمد بن ابراهيم) ئەمەی زیاد کردووە: (قل هو الله احد)یش.

(٧) (عقبە بن عامر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دامێ گەر دوای هەموو نوێژێ (قل اعوذ)ەکان بخوێنم) [٦].

(٨) (ام سلمه ـ ر ـ)گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) دوای سەلام دانەوەی نوێژی بەیانی دەیفەرمو:

---

(١) متفق عليه: (خ ٢/٣٢٥/٨٤٤) (م ١/٤١٤/٥٩٣).

(٢) صحيح (ص. نس ١٢٧٨) م(١/٤١٨/٥٩٦). (م ١/٤١٨/٥٩٦)..

(٣) صحيح (مختصر م ٣١٤) (م ١/٤١٨/٥٩٧).

(٤)(ص.ج ٧٩٧٦).

(٥) (ص.ج ٦٤٦٤).

(٦) صحيح (ص. نس ١٢٦٨) (د ٤/٣٨٤/١٥٠٩).

(اللهم اني اسألك علما نافعا ورزقا طيبا، وعملا متقبلا) [١].

## ـ ئەو شتانەی لەکاتی نوێژدا مەکروهە ئەنجام بدرێن:

**(١) دەست وەردان لەپۆشاكو لەش بەبێ پێویست بوون:**

(پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوێکی فەرموو کە لەکاتی کوڕنوشدا خاکی تەخت کرد: گەر وا دەکەیت یەکجار وابکە)[٢].

**(٢) دەست دانان لەسەر کەلەکە (الإختصار):**

(ابو هريرة) گێڕاویەوە: (نهى ان يصلي الرجل مختصرا) [٣].

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە پیاو دەست بە کەلەکەوە نوێژ بکات.

**(٣) بەرز کردنەوەی چاو بۆ ئاسمان:**

(ﷺ) فەرمویەتی: (هەندێ خەڵکی لەکاتی نزایاندا ئەبێ واز لەوە بێنن کە سەیری ئاسمان بکەن، یان هێزی سۆمای چاویان دەبردرێت) [٤].

**(٤) ئاوڕدانەوە بێ پێویست بوون:**

عائیشە گێڕاویەوە لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) پرسی لەراست ئاوڕدانەوە لەنوێژدا؟ فەرموی: (هو اختلاس يختلسه الشيطان من صلاة العبد) [٥].

واتە: ئەوە فڕاندنێکە شەیتان لەنوێژی بەندەی دەفڕێنێت.

**(٥) سەیرکردنی شتێ سەرت قاڵ بکات:**

عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەبەرگێکی رەشی چوار گۆشە (الخميصه)دا نوێژی کرد، کە چەند نیشانەیەکی تێدا بوو، فەرموی: (ئەم نیشانانە سەر قاڵی کردم، بیبەن بۆ (ابی جهم)و

(١) صحيح (ص. جه ٧٥٣) جه (٢/٢٩٨/٩٢٥).

(٢) متفق عليه: (خ ٣/٧٩/١٢٠٧) (م(٥٤ ـ ٤٩ ـ ١/٣٨٨).

(٣) متفق عليه (خ٣/٨٨/١٢٢٠) (م ١/٣٨٧/٥٤٠)

(٤) صحيح (مختصر ٣٤٣) م(١/٣٢١/٤٢٩)ز

(٥) صحيح (ص.ج ٧٠٤٧) خ(٢/٢٣٤/٧٥١).

جلە بەرگە ئەستورو سادەی (الانبجاني) ئەوم بۆ بێنن)[(١)].

**(٦) دەمامك كردن:**

لەفەرمودەدا هاتووە: (ان النبي (ﷺ) نهى عن السدل في الصلاة وان يغطى الرجل فاه)[(٢)].

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە خۆی بە پەشتەماڵ بپێچی‌و پیاو دەمامكی خۆی بدات، یادەمی داپۆشێت.

(شمس الحق) لە(عون المعبود ٢/٣٤٧)دا وتویەتی: (الخطابي) وتویەتی: (السدل) ئەو پۆشاكەیە بگاتە زەوی.

لە(النيل)دا دەڵێ: (ابو عبيدة) لە(غريب)ەكەیدا دەڵێ: ئەو پۆشاكەیە كە پیاو بیكاتە بەر بێ ئەوەی تەنیشت‌و قولیچكەكانی لوول بداتەوە بە هەردوولاكانی دا، گەر نا (السدل) نییە. خاوەنی (النهاية) دەڵێ: ئەوەیە وەكو پەتۆ لەخۆی وەرپێچی‌و لەكاتی ركوع‌و كورنوشدا دەستەكانی هەر لەناو پۆشاكەكە دابن، ئەمە بۆ كراس‌و پۆشاكی تریش باسكراوە.

دەڵێ: وتراوە ئەوەیە ناوەڕاستی پۆشاكە كە بخەیە سەر سەرو تەنیشتەكانی بە راست‌و چەپدا بەرداتەوەو نەیخاتە سەر شانی.

(الجوهري) وتویەتی: (سدل ثوب يسدله بالضم سدلا): واتە: ئەو بەرگەی شۆڕكردەوەو بەردایەوە. هیچ كۆسپێ نییە فەرمودەكان هەمو ئەو مانایەی پێ بدات، مادام (السدل) مانایەكی هاوبەشی هەبێت‌و، لێكدانەوەی (السدل) بەم هەموو مانا هاوبەشانە بەهێزترین بەڵگە.

**(٧) باوەشك (التثاؤب):**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (باوەشك لەنوێژدا لەشەیتانەوەیە، گەر یەكێ لەئێوە باوەشكی بۆ هات ئەوەندەی بۆی كرا با بیخواتەوە)[(٣)].

---

(١) صحيح: (ص. جه ٢٠٦٦) (خ ٢/٢٣٤/٧٥٢) (م ١/٣٩١/٥٥٦).

(٢) حسن (ص. جه ٩٦٦) جه (٩٦٦/١/٣١٠) (د: ١/٣٤٧/٦٢٩).

(٣) صحيح (ص.ج ٣٠١٣) (ت ١/٢٣٠/٣٦٨).

**(٨) تف رۆکردن بە ئاراستەی قیبلە یان بە لای راستی دا:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە هەڵسا نوێژ بکات ئەوە خوداوەندی لەپێشەوەیە، با کەس تف نەخاتە بەردەمی یان لای راستی یەوە، با تف بە لای چەپی دا رۆبکاتو بیخاتە ژێر پێی چەپییەوە، گەر زۆر بەپەلە هات با ئاوا بە پۆشاکی خاوێنی بکاتەوە). پاشان پۆشاکی پێچایەوە[١].

**(٩) دەست تێك وەرهێنان (تشبيك الأصابع):**

(گەر یەکێ لەئێوە لەماڵێ دا نوێژی کردو پاشان هاتە مزگەوت هەر لەنوێژدایە تا دەگەڕێتەوە، با دەستی ئاوا تێك وەرنێنێ (وقامکەکانی تێك وەرهێنان)[٢].

**(١٠) هەڵپێچانی قژ یان جلو بەرگ (كف الشعر والثوب):**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت (ئەندام) کوڕنوش ببەم، نە قژو نە پۆشاك هەڵنەپێچم)[٣].

**(١١) پێش خستنی ئەژنۆ بەسەر دەستەکانی دا لەکوڕنوشدا:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە چووە کوڕنوش با وەك وشتر چۆك دانەداتو با دەستەکانی پێش چۆکەکانی دابنێت)[٤].

**(١٢) راخستنی دەستەکانی لە سوجدەدا (بسط اليدين):**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (رێکی بکەن لەکوڕنوشدا با کەس لەئێوە باسکی رانەخات وەکو باسك راخستنی سەگ)[٥].

**(١٣) نوێژکردن لەکاتی ئامادەبوونی خواردندا یان تارەت گرانی دا:**

عائیشە دەڵێ لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)م بیست دەیفەرموو: (لا صلاة بحضرة الطعام ولا هو

---

(١) صحيح مسلم (٣٠٠٨/٢٣٠٣) د(٢/١٤٤/٤٧٧).

(٢) صحيح: (ص.ج ٤٤٥) كم(١/٢٠)

(٣) رابرد.

(٤) رابرد.

(٥) متفق عليه (خ ٢/٣٠١/٨٢٢) م(١/٣٥٥/٤٩٣)

يدافعه الأخبثان) [١].

واتە: نوێژکردن نیە لەکاتی خواردەمەنی ئامادەبووندا، یان کە تارەت گران بێ بەهۆی میزو پیسایی هاتن.

**(١٤) پێش (پێش نوێژ) کەوتن:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئایا ناترسن گەر یەکێ لەئێوە بەر لەپێش نوێژ خوێن سەری بەرز دەکاتەوە، خوا سەری بکات بە سەری کەر یان وێنەی بکات بە وێنەی کەر) [٢].

## ـ هەندێ لەوشتانەی لەکاتی نوێژدا ڕێگای پێ دراوە:

**(١) ڕۆیشتن بۆ پێویستی:**

عائیشە گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵدا نوێژی دەکردو دەرگای لەسەر داخرابوو، هاتم داوام لێ کرد بۆم بکاتەوە، ئەویش ڕۆیشت بۆی کردمەوەو پاشان گەڕایەوە بۆ نوێژو وای وەسف کرد کە دەرگاکە لەئاراستەی قیبلە بوو) [٣].

**(٢) هەڵگرتنی منداڵ:**

(ابی قتادة) گێڕایەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی دەکردو (امامە)ی کچی (زینب)ی کچی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کە هی (ابي العاص بن الربيع) بوو هەڵدەگرت، گەر هەڵدەستا تان پێ تاوی دەدایەو گەر دەچووە کوڕنوش دایدەنا) [٤].

**(٣) کوشتنی (مارو دوپشك):**

(ابو هريرة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە لەکاتی نوێژدا مارو دووپشك بکوژرێن) [٥].

---

(١) صحيح (ص.ج ٧٥٠٩) م(١/٣٩٣/٥٦٠).

(٢) متفق عليه (خ ٢/١٨٢/٦٩١) (م ١/٣٣٠/٤٢٧).

(٣) حسن (ص.نس ١١٥١) (نس ٣/١١).

(٤) متفق عليه : خ(١/٥٩٠/٥١٦) م(١/٣٨٥/٥٤٣)

(٥) صحيح (ص.ج ١١٤٧) (خز٢/٤١/٨٦٩).

**(٤) ئاوڕ دانەوەو ئاماژە کردن بۆ لێ حاڵی کردن بۆ پێویستی:**

(جابر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) سکاڵای (لەدەست نەخۆشی) کرد ئێمەش بە پێوە نوێژمان لەپشتەوە کردو ئەو دانیشتبوو، ئاوەڕی لێمان دایەوە بینی وەستاوین، ئاماژەی کردو ئێمەش دانیشتین) [١].

**(٥) تف کردنە پۆشاکێ، یان دەرهێنانە کلێنسێ یان دەستەسڕێ لەگیرفان:**

وەکو رابردو لەفەرمودەی (جابر) دا باسکرا لەراست تف رۆکردن لەراست قیبلەوە.

**(٦) ئاماژە کردن بە وەڵام دانەوەی سەلام:**

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) چووە ـ القباء ـ نوێژی تێدا بکات، ئەنصارەکان هاتنە لای سەلامیان لێ کردو ئەو لەنوێژدا بوو. بە (بیلال)م وت: چۆن پێغەمبەرت (ﷺ) بینی وەڵامیان بداتەوە لەنوێژدا کاتێ سەلامیان لێ کرد؟ وتی: ئاوا دەستی بەرزکردەوە، (جعفر بن عون) لەپی دەستی کردەوە ناو لەپی دەستی شۆڕکردەوەو پشتە دەستی بردە سەرەوە) [٢].

**(٧) (سبحان الله) کردن بۆ پیاوانو چەپڵەلێدان بۆ ژنان لەکاتی روودانی شتێ لەنوێژدا بۆ ئاگاداری کردنەوە (التسبیح للرجال والتصفیق للنساء):**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەی خەڵکینە بۆچی گەر لەنوێژدا تووشی رووداوێ هاتن چەپڵە لێدەدەن، چەپڵە بۆ ژنانە، هەرکەسێ رووداوێ لەنوێژدا بەرۆکی گرت با بلێ: (سبحان الله)، هەر کەسێ گوێ ی لە(سبحان الله) بێ ئاوڕ دەداتەوە) [٣]

**(٨) پێ گوتنەوە بە پێش نوێژ خوێن (الفتح علی الإمام):**

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) یەکێ لەنوێژەکانی کردو قورئانی تێدا خوێندو لێی تێك چوو، کاتێ رۆیشت بە باوکمی فەرموو: تۆ نوێژت لەدوامانا کرد؟وتی: بەڵێ. فەرموی: ئەی بۆچی پێت نەگوتینەوە) [٤]

---

(١) صحیح (ص. نس ١١٤٥) (نس ٣/٩) (م: ١/٣٠٩/٤١٣).

(٢) حسن صحیح (ص.د ٨٢٠) د(٣/١٩٥/٩١٥).

(٣) متفق علیه خ(٣/١٠٧/١٢٣٤) م(١/٣١٦/٤٢١).

(٤) صحیح (ص.د ٨٠٣) د(٣/١٧٥/٨٩٤).

**(٩) نوقورچە دان لەقاچی کەسێکی خەوتوو:**

عائیشە گێڕاویەوە: (من قاچم رادەکێشا بە بەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) کە نوێـژی دەکـرد، گەر کورنوشی دەبرد نوقورچەی لێ دەدام و لام دەبردن، گەر هەڵدەستایەوە رام دەکێشانەوە) [١]

**(١٠) جەنگ کردن لەگەڵ کەسێکدا گەر بیەوێ بە بەردەم نوێژکەردا تێ بپەڕێت:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: گەر یەکێ لەئێوە ویستی نوێژ بکات لەبەردەم بەربەستێکداو کەسێ ویستی بە پێشی دا رەت بێ با پاڵی پێوە بنێ، گەر یاخی بوو با شەڕی لەگەڵـدا بکـات، ئەوە شەیتانە) [٢].

**(١١) گریان:**

پێشەوا عەلی (رضي الله عنه) فەرمویەتی: (لەجەنگی بەدردا تـەنیا (میقـداد) ئەسـپ سـوار بـوو، دەتبینی هەموومان خەوتوین تەنیا پێغەمبەر (ﷺ) نەبێ لەژێر درەختێ دا بوو نوێـژی دەکـردو دەگریا تا سپێدە هات) [٣].

## ـ ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە (ما يبطل الصلاة):

**(١) دڵنیابون لەبێ دەست نوێژی:**

(عـباد بن تميم) لەمامی گێڕاویـەوە سـکالای بـردە لای پێغەمبـەر (ﷺ) دەربـارەی ئـەو پیاوەی وا خەیاڵ دەکات شتەکی لەنوێژدا بۆ دروست دەبێ؟ فەرموی: (با نوێژ نەبڕێ مەگەر گوێ ی لەدەنگێ بێ یان بۆنێ بکات) [٤].

**(٢) نەکردنی روکنێ یان مەرجەکی نوێژ بە ئەنقەست:**

وەکو پێغەمبەر (ﷺ) بەو کەسەی فەرموو کە نوێژەکەی بە خراپی کرد: (ارجع فصل فإنك لم تصل) [٥]. بگەڕێوە نوێژ بکە، تۆ نوێژت نەکردووە.

---

(١) صحيح (ص.ج ٦٣٨) (م ٥٠٥ـ ٢٥٩ ـ ١/٣٦٢).

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣) اسناده صحيح (أ ٢٢٥/٣٦/٢١)

(٤) متفق عليه (خ ١٣٧/٢٣٧/١) (م ٣٦١/٢٧٦/١).

(٥) متفق عليه (خ ٧٩٣/٢٧٦، ٢٧٧/٢) (م ٣٧٩/٢٩٨/١).

یان وەکو فەرمانی بەو کەسە کرد کە پەڵەیەکی وشکی کە تەڕ نەبووبوو (لمعة) لەسەر پێ ی بینی کە دەست نوێژ بگرێتەوەو نوێژ بکاتەوە[١].

**(٣) خواردنو خواردنەوە بە ئەنقەست:**

(ابن المنذر) دەڵێ: (زانایان لەسەر ئەوە کۆکن لەنوێژی فەرزدا هەرکەسێ بە ئەنقەست بخواو بخواتەوە گێڕانەوەی لەسەرە)[٢]. دیسان لای جەماوەری زانایان نوێژی سوننەتیش، چونکە هەر شتێ نوێژی فەرز ببڕێ ئەوە نوێژی سوننەت بەتاڵ دەکاتەوە.

**(٤) قسەکردن بە ئەنقەست بۆ غەیری بەرژەوەندی نوێژ:**

(زید بن ارقم) گێڕاویەوە: سەرەتا قسەمان لەنوێژدا دەکرد، پیاو قسەی لەگەڵ هاوڕێ ی تەنیشتی دا دەکرد، تا ئایەتی ﴿قُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ﴾[٣]. دابەزی، فەرمانمان پێ کرا قسەنەکەینو بێ دەنگ بین)[٤].

**(٥) پێکەنینی بە قاقا (الضحك):**

(ابن المنذر) گێڕاویەوە زانایان کۆکن لەسەر ئەوە کە بەقاقای پێکەنین نوێژ دەبڕێت[٥].

**(٦) ڕابردنی ژنی باڵغو کەرو سەگی ڕەش بە بەردەم نوێژ کەردا بێ لەجێگای کڕنوش:**

لەفەرمودەدا هاتووە: (گەر یەکێ لەئێوە هەڵسا نوێژ بکات با بەربەستی لەپێش خۆیدا دابنێ، گەر پارچە تەختەکەی پشت وڵاخیش (آخرة الرحل) بێ، گەر ئەوەش نەبوو، کەر یان ئافرەت، یان سەگی ڕەش نوێژی دەبڕێت)[٦].

---

(١) باسکراوە.

(٢) الإجماع/٤.

(٣) البقرة:٢٣٨.

(٤) متفق علیه م(١/٣٨٣/٥٣٩) خ(٣/٧٢/١٢٠٠).

(٥) الإجماع/٤.

(٦) ڕابردو باسکراوە. تێبینی وەکو لە(نیل الأوطار/ج١/للشوكاني/ل:٤٨٤)دا هاتووە لای مالیکیو شافیعیو ئالو بەیت ڕابردنی هیچ شتێ بە پێش نوێژکەردا نوێژ نابڕێت. مەبەست لەم فەرمودەیە ئەوەیە خێری نوێژ بە ڕابردنی ئەم شتانە کەم دەبێتەوە کە سەرقاڵ کەرن نەوەك نوێژ ببڕێت.

# نوێژی سوننەت ( صلاة التطوع )

گەورەیی یان سوودی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (یەکەم شت کە خوداوەنـد لەپەسـلاندا لەراست کردەوەکانی لێی دەپرسێتەوە نوێژە، گەر نوێژی باش بوو ئەوە سـەرکەوتووە، گـەر سـەر نەکـەوت ئـەوە دۆڕاوو زیـان لـێ کـەوتووە، گـەر ناتـەواوی یـەك لەفـەرزەکانی هـەبوو، خـوای پەروەردگارو مـەزن دەفـەرمووێ: سـەیر بکـەن بەندەکـەی مـن سـوننەتی هەیـە، ئـەنجا کـەم و کوڕیەکانی فەرزەکانی پێ تەواو دەکرێن، پاشان هەمو کارەکانی ئاوا دەبن) [١].

## ـ سوننەتە لەماڵدا ئەنجامبدرێن:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە نوێژی لەمزگەوت کرد بـا ماڵـەوەش بـێ بەش نەکات، چونکە خوداوەند نوێژەکەی لەماڵدا بۆ دەکات بە رۆشنایی) [٢].(ﷺ) فەرمویەتی: (نوێژ لەماڵەکانتاندا بکەن، باشترین نوێژ ئەوانەن لەماڵەوەدا دەکرێن، جگـە لەنوێـژە فـەرزەکان نەبێت).

**ـ جۆرەکانی : نوێژی سوننەت دوو بەشە: (رەها)و بەستراوەکان (مطلقة ومقيدة):**

بەستراوەکان بە راتیبەکان ناسـراون کـە پـێش و دوای نوێـژ دەکـرێن و ئـەوانیش دووبەشـن: (موئەککەدو نا موئەککەد):

(ابن عمـر) گێڕاویـەوە: مـسۆگەرەکان (١٠) رکەعــەتم لەپێغەمبـەر (ﷺ) دەرخ کـردووە: دوو رکەعەت بەر لەنیوەڕۆ، دوو رکەعەت دوای نیوەڕۆو دوو رکەعەت پـاش شـێوان و دوو رکەعـەت دوای خەوتنان و دوو رکەعەت پێش بەیانی، وە کاتێ دەبێ کە ئەو ناچێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) تێ یدا، بـۆ ئەمەش حەفصە پێ ی وتم: گەر بانگدەر بەیانی بانگی داو سپێدە هات دوو رکەعەتی دەکرد) [٣].

**سوننەتی نا موئەککەدە:** لەعەبـدوڵلا کـوڕی موغـەفەلـەوە وتـی پێغەمبـەر فەرموویـەتی

---

(١) صحيح (ص.نس ٤٥١/٤٥٢). (نس٢٣٢/١).

(٢) صحيح (مختصر ٣٧٥) م(١/٢٣٩/٧٧٨).

(٣) صحيح (الارواء: ٤٤٠) خ((١١٨١،٨٠/٥٨/٣).

(نێوان هەموو بانگو قامەتەکان نوێژێ هەیە، نێوان هەموو بانگو قامەتەکان نوێژێ هەیە) پاشان فەرموی: (بۆ کەسێ حەز بکات) (١).

## ـ سوننەتە چوار رکەعەت بەر لەنوێژی عەسر بپارێزرێت:

پێشەوا عەلی (کرم الله وجهە) فەرمویەتی: (پێغەمبەر (ﷺ) بەر لەئەنجامدانی نوێژی عەسر چوار رکەعەتی دەکردو بە سەلام دانەوە لەفریشتە نزیکەکانی بارەگای خواو موسڵمانانو بڕوادارانی شوێن کەوتوی ئەوان لێکی جیادەکردنەوە) (٢).

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (ﷺ) فەرمویەتی: (خوا ڕوحم بە کەسێ بکات بەر لەعەسر چوار رکەعەت نوێژ دەکات) (٣).

## ـ قورئان خوێندنی پێغەمبەر (ﷺ) لەهەندێ لەم سوننەتانە:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (باشترینی ئەو دوو سوڕەتانە کە لەدوو رکەعەتی بەر لەبەیانی دا بخوێنرێن: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾و ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ە) (٤).

(ابو هریرە) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەردوو رکەعەتی بەیانی دا ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ و ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ ی دەخوێند)(٥).

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەدوو رکەعەتی بەر لەبەیانی دا لەرکەعەتی یەکەمدا ﴿قُولُواْ آمَنَّا بِاللّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ی دەخوێند لە سوڕەتی بەقەرەداو لەرکەعەتی دووەمدا ﴿آمَنَّا بِاللّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ی دەخوێند(٦).

(ابن مسعود) گێڕاویەوە: (لەژمار نایەت کە لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە لەدوو رکەعەتی دوای شێوانو دوو رکەعەتی پێش بەیانی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ

---

(١) صحيح (ص.نس ١٦٥٨) خ(٣/٥٨/١١٨٢).
(٢) حسن (ص.ت ٣٥٣) ت(١/٢٦٩/٤٢٧).
(٣) حسن (ص.ت ٣٥٤) ت(١/٢٧٠/٤٢٨).
(٤) صحيح (ص.جه ٩٤٤) جه(١/٣٦٣/١٥٠).
(٥) صحيح/مختصر(م٣٦٠) م(١/٥٠٢/٧٢٦).
(٦) صحيح (ص.نس ٩٠٥) (نس٢/١٥٥) (د:٤/١٣٧/١٢٤٦).

أَحَدٌ‌ی خوێندووە) [١].

**- (ویتر - تاکە رکەعەت):**

حوکمەکەو گەورەیی یەکەی: ویتر سوننەتەکی موئەککەددەو پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری سوور بووە هانی خەڵکی داوە بۆ ئەنجامدانی:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ان الله وتر يحب الوتر) [٢]. واتە: خوا تاکەو بۆیە تاکی خۆش دەوێت (کە نوێژی ویترە).

پێشەوا عەلی (ﷺ) فەرمویەتی: (ویتر مسۆگەر نییەو وەکو فەرزەکان نییە، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ویتری کردووە، پاشان فەرمویەتی: (ئەی ئەهلی قورئان ویتر بکەن، خوا ویترەو تەنیا ویتری خۆش دەوێت) [٣].

**- کاتەکەی:**

دوای نوێژی خەوتنان درووستە تا هەڵاتنی سپێدەو لەسێ یەکی کۆتایی شەودا خێری پترە. عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەهەموو شەودا ویتری کردووە لەسەرەتاو ناوەندو دواکات شەودا، بۆ بەیانی ویترەکەی سەری کێشاوە) [٤]. سوننەتە ویتر ، گەر ئەو کەسە بترسێ درەنگی شەو بێدار نەبێتەوە سەرەتای شەو بکرێ ، بەڵام گەر زانی درەنگی شەو هەڵدەستێتەوە سوننەتە بۆ ئەو کاتە دوای بخات. پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبوبەکری فەرموو: (کەی ویتر دەکەیت؟ وتی: بەر لەنووستن. بە عومەری فەرموو: کەی ویتر دەکەی؟ وتی: دەخەوم پاشان ویتر دەکەم، بە ئەبوبەکری فەرمو: (ئەمەت بە توندی (الحزم) گرتووە (تا لەدەست نەڕوات)و بە عومەری

---

(١) حسن صحيح (ص.ت ٣٠٠) (ت:١/٢٧٠/٤٢٩).

(٢) متفق عليه (خ ١١/٢١٤/٦٤١٠) (م٤/٢٠٦٢/٢٦٧٧).

(٣) صحيح (ص.جه ٩٥٩) جه(١/٣٧٠/١١٦٩).

(٤) متفق عليه (م ١/٥١٢/٧٤٥) خ(٢/٤٨٦/٩٩٦) بە کورتی.

فەرموو: (ئەمەت بەهێزو خۆڕاگری (**القوة ـ العزيمة**) بە دەست هێناوە) [١].

عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی دەکرد من لەسەر جێگای ئەو رادەکشام، گەر دەیویست ویتر بکات بێداری دەکردمەوە منیش ویترم دەکرد) [٢].

**ـ ژمارەی رکەعەتەکانی ویترو سیفەتەکەی:**

لای کەمی ویتر رکەعەتێکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (شەو نوێژ ـ صلاة الليل ـ دوو دووە، گەر یەکێ لەئێوە ترسا بەیانی بێتەوە، بایەك رکەعەت بکات دەبێتە ویتر بۆ ئەو نوێژانەی کردویەتی) [٣].

**ـ دروستە ویتر لە(٣ـ ٥ ـ ٧ ـ ٩) رکەعەت بێت:**

عائیشە (رضي الله عنهما) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەرەمەزان‌و غەیری رەمەزاندا لەیانزە رکەعەت پتری نەکردووە، چوار رکەعەتی دەکرد لەجوانی‌و درێژیان پرسیار ناکرێ، پاشان چواری تری دەکرد لەجوانی‌و درێژی یان پرسیار ناکرێ، پاشان سێ رکەعەتی دەکردن) [٤].

وەگێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) شەوانە (١٣) رکەعەتی دەکردو پێنجی دەکردن بە ویتر، تەنیا لەدواییەکەیدا دادەنیشت) [٥].

عائیشە گێڕایەوە: (ئێمە سیواك‌و دەست نوێژمان بۆ پێغەمبەر (ﷺ)ئامادە دەکرد، هەر کاتەکی خوا مەبەستی بایە لەشەودا هەڵی دەستاندەوەو سیواکی دەکردو دەست نوێژی دەگرت‌و نۆ رکەعەتی دەکردن‌و تەنیا لەنۆیەمی دا دادەنیشت، یادو زیکرو حەمدی دەکردو دەپاڕایەوە، پاشان هەڵدەستایەوەو سەلامی نەدەدایەوە، پاشان هەڵدەستا نۆیەم رکەعەتی دەکرد، پاشان دادەنیشت زیکرو حەمدو پاڕانەوەی دەکرد، پاشان سەلامی بە دەنگی بەرز دەدایەوە گوێمان لێ ی دەبوو، پاشان دوای سەلامدانەوە دوو رکەعەتی دەکرد کە دانیشتووبوو، ئەی کوڕم ئەمە یانزە

(١) حسن صحيح (ص.جه ٩٨٨) جه(١/٣٧٩/١٢٠٢) (د: ٤/٣١١/١٤٢١).

(٢) متفق عليه (خ٢/٤٨٧/٩٩٧) م(١/٥١١/٧٤٤)

(٣) متفق عليه (خ٢/٤٧٧/٩٩٠) (م: ١/٥١٦/٧٤٩).

(٤) متفق عليه: (٣/٣٣/١١٤٧) (م ١/٥٠٩/٧٣٨).

(٥)صحيح (مختصر م ٣٨٢) م(١/٥٠٨/٧٣٧) (د:٤/٢١٦/١٣٢٤).

ركەعەت، كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بە تەمەندا چوو گۆشتن بوو حەوت ركەعەتی ویتر دەكرد، لەدوو ركەعەتەكانی وەكو یەكەم جاری دەكرد، ئەمە نۆ ركەعەت كورەكەم)[١].

**گەر سێ ركەعەت ویتری دەكرد ئەم ئایەتانەی دەخوێندەوە:**

(ابن عباس (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەویتردا ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ و ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ی لەهەر یەكێ لەو ركەعەتانەدا دانە دانە دەیخوێندن)[٢].

**ـ (قونوت لەویتردا):**

(حسن بن علی ـ س ـ) فەرمویەتی: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند وشەیەكی فێركردم لەویتردا: (اللهم اهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت، وتولني فيمن توليت، وبارك لي فيما أعطيت، وقني شرّ ما قضيت، فانك تقضي ولا يقضى عليك، وانه لا يذل من واليت، تباركت ربنا وتعاليت)[٣].

سوننەتە ئەم قونوتە بەر لەركوع بێت، وەكو لەفەرمودەی (ابی بن كعب) دا هاتووە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەویتردا بەر لەركوع ویتری دەخوێند)[٤]. خوێندنی قنوت لەنوێژی فەرزدا شەرعی نییە تەنیا لەكاتی كارەساتێكدا نەبێت، بە هیچ نوێژێكەوە تایبەت نەكراوەو نەبخستۆتە دوای ركوعەوە. (ابو هريره) گێڕاویەوە: (گەر پێغەمبەر (ﷺ) دوعا لەكەسێ یان بۆ كەسێ بكات دوای ركوع قنوتی دەخوێند)[٥].

هەرچی قنوتی نوێژی بەیانی یە بە بەردەوامی بیدعەیە، وەكو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) گەواهی ئەوەیان داوە:

(سعد بن طارق) گێڕاویەوە: (بە باوكم وت: باوكە تۆ لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) نوێژت كردووە، هەروەها لەدوای ئەبوبەكرو عومەرو عوسمانو عەلی ئالێرە لەكوفە، تا پێنج ساڵان، ئایا

---

(١) صحيح (ص.نس ١٥١٠) م(١/٥١٢/٧٤٦) (نس ٣/١٩٩).
(٢) صحيح ((ص. نس ١٦٠٧) ت(١/٢٨٨/٤٦١) (نس ٣/٢٣٦).
(٣) صحيح (ص.نس ١٦٤٧) (نس ٣/٢٤٨).
(٤) صحيح (ص.د ١٢٦٦) (د: ٤/٣٥٢/١٤١٤).
(٥) صحيح (ص.ج ٤٦٥٥) (خ ٨/٢٢٦/٤٥٦٠).

بەیانیان قنوتیان دەخوێند؟ وتی: کوڕەکەم ئەمە بیدعەیە)[١].

هەرچی (ابن القیم)ە لە(زاد المعاد/١/٢٧١)دا دەڵێ: (ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) هەمو وبەیانیەك دوای راست بوونەوە لەرکوع گوتبی: (اللهم اهدنی فیمن هدیت وتولنی فیمن تولیت...الخ). دەنگ بەمە بەرز بکاتەوەو یارانی دوای ئەو بڵێن: (ئامین) تا مرد بێ، پاشان ئەمە لای ئوممەت زانراو نەبوو بێ‌و بەڵکو زۆربەی ئوممەت نایکەن‌و جەماوەری سەحابە گوێ ی پێ نادەن، بەڵکو هەموویان تا کەسانی وەکو (سعد بن طارق الأشجعي) دەڵێ: ئەمە بیدعەیە).

## ـ شەو نوێژەکان (قيام الليل):

شەو نوێژ سوننەتەو گرنگترین سیفەتی بڕوادارانە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ* آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ* كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ* وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ* وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾[٢]. واتە: تەقواکاران لەسێبەرەکان‌و سەرچاوەکاندانە، ئەوەی پەروەردگاریان پێی داون وەریان گرتووە، بێگومان ئەوان بەر لەوە چاکە کار بوون. کەم لەشەو دا دەخەوتن. بەیانیان ئەوان داوای لێ بووردنیان لەخوا دەکرد. لەماڵیاندا ماف هەبو بۆ سواڵ کەرو بێ بەشان.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (چەند ژوورێ لەبەهەشتدا هەیە لەژوورەوە دەرەوەی دەبینرێ‌و، لەدەرەوە ژوورەوەی دەبینرێ، خودای گەورە بۆ ئەو کەسانەی ئامادە کردووە خۆراکیان بەخشیوەو قسەی نەرمیان کردووەو بەرۆژوو بووەو بە شەوو شەو نوێژیان کردووەو خەڵکی نووستون)[٣].

---

(١) صحيح (الارواء ٤٣٥) (أ (٣/٤٧٢و ٦/٣٩٤) جه(١/٣٩٣/١٢٤١).

تێبینی: لەمەزهەبی شافیعی‌و مەزهەبی تردا قونوت لەنوێژی بەیانی دا سوننەتە وەکو لە(تفسير الطبري)دا هاتووە: ((ابن عباس) گێڕاویەوە (الصلاة الوسطى) کە قورئان دەفەرمێ: ﴿وقوموا لله قانتين﴾ ئەمە نوێژی بەیانی یە کە قنوتی تێدایە.

(٢) الذاريات: ١٥ ـ ١٩.

(٣) حسن (ص.ج ٢١٢٣).

**ـ لەرەمەزاندا سوننەتەکەی جەختی لەسەر کراوە:**

(ﷺ) فەرمویەتی:

(من قام رمضان ايمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه) [١].

کێ لەشەوانی رەمەزانانددا هەڵسابێتەوە بۆ خواپەرستی بە ئیمانو دڵسۆزییەوە لەگوناهی رابردوی چاوپۆشی لێ دەکرێت.

**ژمارەی رکەعەتەکانی:**

لای کەمی یەك رکەعەتەو زۆرینەی (١١) رکەعەتە: (عائیشە (رضي الله عنها) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەرەمەزانو غەیری رەمەزاندا لە(یانزە) رکەعەت پتری نەکردووە)[٢].

**ـ دروستی بە جەماعەت کردنی شەو نوێژ لەهەڵسانەوەی رەمەزاندا (کە بە تەراویح ناسراوە):**

عائیشە (رضي الله عنها) گێڕاویەوە: (شەوێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لەمزگەوت نوێژی کردو خەڵکانێکیش لەگەڵ ئەودا نوێژیان دابەست، پاشان خەڵکێ هاتن دایان بەستو خەڵکێکی زۆر بون، لەدواییدا لە شەوی سێ یان چوارەمدا کۆبوونەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) تا بەیانی دا نەچووە لایان، کاتێ بەیانی بۆوە فەرموێ (ﷺ): (ئەوەی کردتان بینیم، تەنیا لەبەر ئەوەنەهاتمەوە ناوتان، لەوە ترسام لەسەرتان فەرز بکرێت) [٣].

(عبدالرحمن بن القاری) گێڕاویەوە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا (رضي الله عنه) شەوێ لەرەمەزاندا چوینە مزگەوت، خەڵکی جیا جیا نوێژیان بە تەنیا دەکرد، پیاو هەبوو دەستەیەك نوێژیان لەدوا دەکرد، عومەر وتی: گەر ئەوانە لەدەوری یەك قورئان خوێندا کۆ ببنەوە پێم چاکترە. پاشان لەدەوری (ابی بن کعب)دا کۆی کردنەوە، پاشان شەوێکی تر لەگەڵی دا چوومەوە خەڵکی نوێژیان بە دوای قورئان خوێنەکەدا دەکرد. عومەر وتی: ئەمە دانراوەکی باشە، بەڵام ئەوانە باشترن کە شەو دەخەونو بۆی هەڵدەستنەوە ـ کە مەبەستی دوایی شەو بوو ـ بەڵام خەڵکی سەرەتای شەو دەیکەن) [٤].

---

(١) متفق عليه: م(٧٥٩ ـ ١٧٤ ـ ١/٥٢٣) خ(٢٠٠٩/٢٥٠/٤).

(٢) رابرد.

(٣) متفق عليه (م ١/٥٢٤/٧٦١) خ(١١٢٩/١٠/٣).

(٤) صحيح (مختصر خ ٩٨٦). خ(٢٠١٠/٢٥٠/٤).

**ـ سوننەتە شەو نوێژ لەگەڵ خێزاندا بکرێ لەغەیری رەمەزاندا:**

(ابو سعید (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: (گەر پیاو خێزانی خۆی شەو بێدار بکاتەوە دوو بە دوو نوێژ بکەن، یان دوو رکەعەت نوێژ بکەن پێکەوە، هەردووکیان لە (الذاکرین الله کثیرا والذاکرات) دەنووسرێن) (١).

**ـ گێڕانەوەی شەو نوێژ (قضاء قیام اللیل):**

عائیشە (رضي الله عنها) گێڕاویەوە: (گەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەوانە لەبەر ئازارێ یان بە هۆی تر شەو نوێژی دەچوو بە رۆژ (١٢) رکەعەتی قەزادەکردنەوە) (٢).

(عمر ابن الخطاب) گێڕاویەوە: (کێ لەبەشە شەوی خۆی دا نووست، یان ماوەیەك لەشەودا نوست، ئەنجا لەنێوان بەیانیو نیوەڕۆ دا کردیەوە، خوا ئەو حیسابەی بۆ دەکات کە لەشەودا کردویەتی) (٣).

**مەکروهیو ناپەسەندی وازهێنان لەشەو نوێژ بۆ کەسێ خووی پێوە گرتبوون:**

(عبدالله بن عمرو بن عاص) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) بە منی فەرموو: تۆ وەکو فیسار کەس مەبە شەوانە هەڵدەستایەوەو وازی لەشەو نوێژ هێنا)(٤).

**ـ نوێژی چێشتەنگاو (صلاة الضحی):**

رێگا پێ درانی: (ابو هریرة) گێڕاویەوە خۆشەویستەکەم (ﷺ) سێ ئامۆژگاری کردم: (هەر مانگە سێ رۆژ بەرۆژوو بم، دوو رکەعەتی نوێژی چێشتەنگاوو، ویتر بەر لەنوستن بکەم) (٥).

**ـ گەورەییەکەی:**

(ابو ذر (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە پێغەمبەری خوای (ﷺ) فەرمویەتی:

(هەمو سپێدە کردنەوەیەك تەواوی جومگەی قامکەکانی ئێوە ـ السلامی ـ خێرەکی لەسەرە، هەر ـ سبحان الله ـ خێرێکە، هەر ـ الحمد لله ـ یەك خێرێکە ـ هەر ـ لا الە الا الله

---

(١) (ص.جە ١٠٩٨) (جە ١/٤٢٣/١٣٣٥) (د ٤/١٩٤/١٢٩٥).

(٢) صحیح (ص.ج ٤٧٥٦) م(١/٥١٥/١٤٠/٧٤٦).

(٣) صحیح (ص.جە ١١٠٤) جە(١/٤٢٦/١٣٤٣) (م ١/٥١٥/٧٤٧).

(٤) متفق علیە (خ٣/٣٧/١١٥٢) (م ١٨٥/١١٥٩ ـ ٢/٨١٤).

(٥) صحیح (مختصر ٣٦٧) م(١/٤٩٩/٧٢١) (د: ٤/١٦٤/١٤١٩).

محمد رسول الله ـ یەك خێرێكەو هەر ـ الله اكبر ـ یێك خێریكە، فەرمان كردن بە چاكە خێرێكـە، رێگرتن لەخراپە خێرێكە، دوو ركەعەتی چێشتەنگاو بە ئەندازەی ئەوانە خێری دەبێت) [١].

**ـ ژمارەی ركەعەتەكانی:**

لای كەمی دوو ركەعەتەو ئەوپەڕیەكەی هەشت ركەعەتـە: (ام هـانيء) گێڕاویـەوە: (ڕۆژی رزگاری مەككە لەماڵی ئەودا خۆی شووشتو هەشت ركەعەت نوێژی كرد) [٢].

**ـ باشترین كاتەكانی:**

(زید بن ارقم) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر چووە لای خەڵكی ـ قباء ـ نوێژی چێـشتەنگاوی یـان دەكردو فەرموی: (صلاة الأوابين اذا رمـضت الفـصال مـن الـضحى) [٣]. واتـە: لەچێـشتەنگاودا نوێژی گەڕاوەكان (الاوابين) كاتێكە سمی بەچكە وشترەكان لەبەر گەرمی لمی بیابان دەسووتێ.

**سوننەتی دەست نوێژ (سنة الوضوء):**

(ابو هريرة) گێڕاویەوە لەكاتی نوێژی بەیانیدا پێغەمبەر(ﷺ) بە بیلالی فەرموو: (هـەواڵم بدەیە كام كردەوەت كردووە لەئیسلامدا كـە ئومێـدی خێـرت پـێ هەیـە، مـن گـوێم لەتەپـەی پێڵاوەكانت بوو لەتەك خۆمدا لەبەهەشتدا؟ وتی: من تەنیا ئەو كارەم كردووە كە ئومێدی چـاكی لێ بكەم. كە لەهەر كاتێ دا دەست نوێژێ دەگرم لەشەودا یان لەڕۆژدا، چەند نوێژێ بـەو دەسـت نوێژە دەكەم كە خوا بۆی نوسیبم بیكەم).

**ـ نوێژی داواكردنی چاكە (صلاة الإستخارة):**

سوننەتە بۆ هەموو كارەكی گرنگ داوای خێر لەخوا بكرێ، وەكو لەم فەرمودەیەدا هـاتووە: (جابر (رضي الله عنه) فەرمویەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەهـەموو كارەكانـدا فێـری (الإستخارة)ی دەكردین وەكو سورەتێك لەقورئانو فەرمویەتی: (گەر یەكێ لەئێوە مەبەستی بوو كارێ بكات با دوو ركەعەت بكات بەبێ فەرز ـ واتە بە سوننەت ـ پاشـان بڵـێ: (اللـهم انـي اسـتخيرك بعلمـك

---

(١) (مختصر م ٣٦٤) (م ١/٤٩٩/٧٢١).

(٢) متفق عليه (خ ٣/٥١/١١٧٦) (م ٣٣٦ ـ ٧١ ـ ١/٢٢٦).

(٣) صحيح (مختصر م ٣٦٨) م(٧٤٨ ـ ١٤٤ /١/٥١٦).

واستقدرك بقدرتك واسألك من فضلك العظيم، فإنك تقدر ولا اقدر وتعلم ولا اعلم، وانت علام الغيوب، اللهم ان كنت تعلم ان هذا الأمر خير لي في ديني ومعاشي وعاقبة امري ـ يان فەرموی: (في عاجل امري وآجله ـ فاقدره لي. وان كنت تعلم ان هذا الأمر شر لي في ديني ومعاشي وعاقبة امري ـ يان فەرموی: في عاجل امري وآجله فاصرفه عني واصرفني عنه، واقدر لي الخير حيث كان ثم رضني به) پاشان پێویستیو داواکاریەی خۆی دەڵێت) [١].

**ـ نوێژی خۆر گیرانو مانگ گیران:**

گەر مانگ گیرا یان خۆر سوننەتە بانگ بدرێ بە: (الصلاة جامعة).

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (کاتێ خۆر لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) گیرا بانگدرا: (الصلاة جامعة) [٢]. واتە: نوێژی بە کۆمەڵە.

گەر خەڵکی لەمزگەوت کۆبوونەوە پێش نوێژ خوێن دوو رکەعەتی نوێژیان بۆ دەکات، وەکو لەم فەرمودەیەدا هاتووە کە عائیشە گێڕاویەوە: (لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) خۆر گیرا، ئەویش (ﷺ) چووە مزگەوتو خەڵکی بە دوای ئەودا ریزیان بەستو (الله اکبر)ی گوت، پێغەمبەر (ﷺ) خوێندنەکی درێژی خوێندەوە، پاشان (الله اکبر)ی گوتو روکوعەکی درێژی برد، پاشان فەرموی: (سمع الله لمن حمده)، ئەنجا هەڵساوە کورنوشی نەبردو خوێندنەکی درێژی خوێند بەڵام بەئەندازەی رکەعەتی یەکەم نەدەبوو، پاشان (الله اکبر)ی کردو رکوعەکی درێژی برد، بەڵام بە ئەندازەی رکوعی یەکەم نەدەبوو، پاشان فەرموی: (سمع الله لمن حمده ـ ربنا ولك الحمد)و کورنوشی برد، پاشان رکەعەتی دووەم بە هەمان رکەعەتی یەکەمی بردە سەرو خوێندنو چوار رکەعەتی لەچوار کورنوشدا تەواو کرد، بەر لەوەی برۆن خۆر دەرکەوتەوە) [٣].

---

(١) صحيح (ص.جه ١١٣٦) خ(١١/١٨٣/٦٣٨٢) د(٤/٣٩٦/١٥٢٤) (ت ٤٧٨/١/٢٩٨) جه(١/٤٤٠/١٣٨٤) نس(٦/٨٠).

(٢) متفق عليه (خ ٢/٥٣٣/١٠٤٥) م(٢/٦٢٧/٩١٠).

(٣) متفق عليه (خ ٢/٥٣٣/١٠٤٦) م(٩٠١ ـ ٣ ـ/٢/٦١٩).

## وتار دوای نوێژ:

سوننەتە بۆ ئیمام کاتێك سەلامی نوێژی دایەوە، وتار بۆ خەڵکی بدات‌و ئامۆژگاری یان بکات‌و هانیان بدات بۆ کاری باش. عائیشە گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی خۆر گیران نوێژی کردو پاشان چۆنیەتی نوێژکردنەکەی باس کرد، پاشان وتی: سەلامی دایەوەو خۆر دەر کەوتەوە، ئەنجا وتاری بۆ خەڵکی داو فەرموی: (خۆرگیران‌و مانگ گیران دوو نیشانەی خودان، بۆ مردن‌و ژیانی کەس ناگیرێن، گەر بینیتان ڕابکەن بۆ نوێژ) [(١)].

پێغەمبەر (ﷺ) وەکو (ئەسما) گێڕاویەوە: (لەکاتی گیرانی خۆردا فەرمانی دا بە ئازادکردنی کۆیلەکان) [(٢)].

(ابی موسی) گێڕاویەوە: (خۆر گیرا، پێغەمبەر (ﷺ) لەترسان هەڵسا، وەك ئەوەی قیامەت بێ، هاتە مزگەوت، درێژترین هەڵسان‌و درێژترین رکوع‌و کوڕنوشی برد کە ئەوە یەکەمجار بوو ئاوای ببینم‌و فەرموی: ئەمانە چەند نیشانەیێکی خودان ڕەوانەیان دەکات، بۆ مردن‌و ژیانی کەس نین، بەڵکو خوا بەندەکانی خۆی دەترسێنێ، گەر شتەکی لەو چەشنەتان بینی، بۆ یادو پاڕانەوەو داواکردنی لێ بوردن بە ترسەوە ڕابکەن) [(٣)].

ڕواڵەتی فەرمودەکە (فافزعوا...) بۆ واجبەو نوێژی خۆر گیران‌و مانگ گیران فەرزی کیفایەیە، وەکو (ابو عوانة) لە(صحیح)ەکەیدا باسی کردووە (٢/٣٩٨): (بیان وجوب صلاة الکسوف)، پاشان هەندێ فەرمودەی ڕاستی لەم بارەوە هێناونەوە کە فەرمانیان تێدایە، ئەمەش ڕواڵەتی ئاکاری (ابن خزیمة)یە لە(صحیح)ەکەیدا، ئەو لەم بارەوە وتویەتی (٢/٣٨): (الأمر بالصلاة عند کسوف الشمس والقمر).پاشان هەندێ فەرمودەی هێناونەوە کە فەرمان بەمە دەکەن. (الحافظ) لە(الفتح ٢/٥٢٧) دەڵێ: (جەماوەر لەسەر ئەوەن ئەمە سوننەتەکی موئەککەدە بێ، تەنیا (ابو عوانە)م بینیوە پێ ی واجب بێ، دیسان (مالك) وەکو نوێژی هەینی داناوە(الزین بن منیر) لە (ابو حنیفە)ی گێڕاوەتەوە کە واجبە، هەندێ نووسەری (المصنف) حەنەفی بە واجبیان داناوە) [(٤)].

---

(١) متفق علیە/ڕابرد.

(٢) صحیح (مختصر خ ١١٨) خ(١٠٤٠/٥٤٣/٢).

(٣) متفق علیە: خ(١٠٥٩/٥٤٥/٢) م(٩١٢/٦٢٨/٢) نس(١٥٣/٣).

(٤) تمام المنة (٢٦١) بە هەندێ دەستکارییەوە.

## ـ نوێژی باران بارین ( صلاة الإستسقاء ):

کاتێ باران نەباری‌و وڵات بێ سەوزایی‌و شینایی بوو پیت نەما، چون بۆ نوێژی باران بارین سوننەتە، پێش نوێژ خوێن دوو رکەعەت دەکات‌و زۆر نزاو داوای لێ بوردن‌و (استغفر الله) دەکات‌و عەبای ئاوەژوو دەکاتەوەو لای راست دەخاتە لای چەپی.

(عباد بن تميم) لە(عبدالله بن زيد)ی مامی گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) چوو نوێژی باران بارین بکات‌و رووی لەقیبلە کردوو دوو رکەعەتی کردن‌و عەبایەکەی ئاوەژوو کردەوە.. (سفيان) گێڕاویەوە (المسعودی) بۆی گێڕامەوە لە(ابی بكر): لای راستی لەسەر لای چەپی دانا [1].

لەئەمەوە گەڕاوەتەوە: (پێغەمبەرم (ﷺ) بینی کاتێ چوو داوای باران بارینی کرد پشتی لەخەڵکی کردو رووی لەقیبلە کرد، دەپاڕایەوە، پاشان عەباکەی ئاوەژو، کردەوە پاشان دوو رکەعەتی کردوو، خوێندنەوەی بە دەنگەوەبوو لەهەردوو رکەعەتدا) [2].

## ـ کوڕنوشی قورئان خوێندن ( سجدة التلاوة ):

(ابن حزم) لە(المحلی)دا (٥/١٠٥)، (٥/١٠٦)دا دەڵێ: لەقورئاندا (١٤) کوڕنوش (سوجدە) هەیە: یەکەمیان دەکەوێتە کۆتایی سورەتی (الاعراف) پاشان لە(الرعد)داو پاشان لە(النحل)داو پاشان لەهەردوو (سبح)داو پاشان لە(کهیعص)و پاشان لەسەرەتای (الحج)دا، نەك نزیك ئاخری (سجدە)و پاشان لە(الفرقان)داو پاشان لە(النمل)داو پاشان لە(الم تنزيل)داو پاشان لە(ﷺ)داو پاشان لە(حم فصلت)داو پاشان لە(النجم)دا لەکۆتایی یەکەیدا، پاشان لە(اذا السماء انشقت)دا لە(لايسجدون)دا، پاشان لەکۆتایی (اقرأ باسم ربك) لەکۆتایی یەکەیدا.

## حوکمی کوڕنوشەکان:

وتویەتی: (کوڕنوشەکان) فەرز نین بەڵکو فەزڵن، لەنوێژی فەرزو سوننەتداو غەیری نوێژدا لەهەمو کاتێکدا دەبردرێت، لەکاتی خۆرهەڵاتن‌و ئاوابون‌و گەیشتنە ناوەڕاستی ئاسمانداو بۆ

---

(١) متفق عليه (خ١٠٢٧/٥١٠/٢) هی ئەوە (م ٨٩٤ ـ ٢ ـ /٦١١/٢).

(٢) صحيح (ص.د ١٠٢٩) خ(١٠٢٥/٥١٤/٢) ئەمە گێڕانەوەی ئەوە.

قیبلەو غەیری قیبلەو بە دەست نوێژەوەو غەیری دەست نوێژەوە. (کۆتایی).

منیش وتم: بەڵام خێرە (فضل)ە نەك فەرز چونکە پێغەمبەر (ﷺ) (والنجم)ی خوێندەوە کورنوشی تێ دا برد [١].

(زید بن ثابت) بەسەری دا خوێندو کورنوشی نەبرد [٢]، چونکە دروستە وەکو لە(الحافظ) لە(فتح ٢/٥٥٥)دا باسی کردووە. (ابن حزم ٥/١١١) دەڵێ: بەڵام کورنوش بردن بەبێ دەست نوێژو بۆ غەیری قیبلە دەبێ چونکە ئەمە نوێژ نییە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (نوێژی شەوو رۆژ دوودووە) [٣]. هەر کە لەیەك رکەعەت کەمتر بوو نوێژ نییە، بەڵام دەبێ دەقێ هەبێ بە نوێژی بژمێرێ، وەکو رکەعەتی ترسو ویترو نوێژی مردوو، هیچ دەقێ نیە سوجدەی قورئان خوێندن بە نوێژ دابنێت...(کۆتایی).

## گەورەیی یەکەی:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر مرۆڤ کورنوشەکی دەبات، شەیتان گۆشەگیر دەبێو دەگرییو دەڵێ: ئەی هاوار فەرمانی پێدا کورنوشی ببات و ئەویش بردی لەپاداشتدا بەهەشتی بۆ هەیە، بەڵام من فەرمانم پێ کرا کورنوش ببەم سەر پێچیم کرد بۆیە ئاگر بۆ منە) [٤].

## گەر کورنوشی برد چی دەڵێت:

عائیشە گێراویەوە: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەکورنوشی قورئاندا بە شەو لەکورنوشەکەدا چەند جارێ دەیفەرموو: (سجد وجهي للذي خلقه وشق سمعه وبصره بحوله وقوته).

پێشەوا عەلی (س) گێراویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کورنوشی دەبرد دەیفەرموو: (اللهم لك سجدت، وبك آمنت، ولك اسلمت، انت ربي، سجد وجهي للذي شق سمعه وبصره تبارك الله

---

(١) متفق علیه (خ ١٠٧٠/٥٥٣/٢) (م ٥٧٦/٤٠٥/١).

(٢) متفق علیه (خ١٠٧٣/٥٥٤/٢) م(٥٧٧/٤٠٦/١).

(٣) صحیح (مختصر م ٣٦٩) م(٨١/٨٧/١).

(٤) صحیح (ص.د ١٢٥٥) د(١٤٠١/٢٨٩/٤).

احسن الخالقين) [١].

(ابن عباس (ﷺ)) گێڕاویەوە: (لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بووم پیاوێ هاتە لای وتی: (من دوێنێ خەونەکی ئاسایيم بینی، وەك بڵێ ی من نوێژ بکەم بەرەو درەختێ، سورەتی سوجدەم خوێندو کوڕنوشم برد، ئەنجا درەختەکەش وەکو من کوڕنوشی برد، گوێم لێ بوو دەیگوت: (اللهم احطط عني بها وزرا، واكتب لي بها اجرا، واجعلها لي عندك ذخرا).(ابن عباس) دەڵێ: (بینیم پێغەمبەر (ﷺ) سورەتی سوجدەی خوێندو کوڕنوشی برد، گوێم لێ بو ئەو دوعایەی دەخوێند کە پیاوەکە لەدرەختەکەی گێڕایەوە) [٢].

## کوڕنوشی سوپاس و ستایش (سجدة الشكر):

سوننەتە هەر کەسێ خودا دەروویەکی بەهرەو خۆشی لێ کردەوە، یان بەڵاو کارەساتەکی لەسەر لابرد، یان مژدەیەکی دڵخۆشکەری پێ درا، وەکو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە کوڕنوشدا بکەوێ. وەکو (ابي بكرة) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) مژدەیەکی دڵخۆشکەری دەدرایە، وەکو سوپاس بۆ خودا کوڕنوشی دەبرد) [٣]. حوکمەکەشی وەکو حوکمی کوڕنوشی قورئان خوێندنە.

## ـ کوڕنوشی لەیادکردن (سجدة السهو):

لەپێغەمبەرەوە گەڕاوەتەوە (ﷺ) لەنوێژدا بە سەهو چووەو لەمەوە هاتووە: (منیش مرۆڤم وەکو ئێوە شتم لەیاد دەچێ، گەر لەیادم چوو یادم بخەنەوە) [٤]. لەم بارەوە چەند حوکمەکی داناوە بۆ ئوممەتەکەی کە بەم رەنگە کورتی دەکەینەوە:

---

(١) صحيح (ص.جه ٨٦٦) م(١/٥٣٤/٧٧١) جه(١/٣٣٥/١٠٥٤).
(٢) صحيح (ص.جه ٨٦٥) جه(١/٣٣٤/١٠٥٣) ت(٢/٤٦/٥٧٦).
(٣) حسن (ص.جه ١١٤٣) جه(١/٤٤٦/١٣٩٤).
(٤) الارواء: ٣٣٩). تێبینی : لەیاد چوونەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ حیکمەت بووە، گەر نا خوا لە هەمو شتەکی وریاکردۆتەوە: (سنقرئك فلا تنسى الا ما شاء الله).

### ١- گەر لەرکەعەتی فەرز هەڵساوەتەوەو تەحیاتی یەکەمی نەخوێندووە:

(عبدالله بن بجينه (ﷺ)) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژێکی دا دوو رکەعەتی نوێژ بۆ کردین، پاشان هەڵسایەوە دانەنیشت، خەڵکیش لەگەڵی دا هەڵسانەوە، کاتێ نوێژی تەواو کردو چاوەڕێ ی سەلامدانەوەمان کرد، بەر لەسەلام دانەوە (الله اکبر)ی گوتو دوو سوجدەی بە دانیشتنەوە برد پاشان سەلامی دایەوە) (١).

موغیرەی کوڕی شوعبە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: گەر یەکێ لەئێوە هەڵساوە لەدوو رکەعەتەکانو بە تەواوی راست نەبوو بۆوە با دابنیشێتەوە، بەڵام بە تەواوی هەڵسابۆوە با دانەنیشێتەوەو دوو کوڕنوشی سەهو ببات) (٢).

### ٢ـ گەر پێنج رکەعەت نوێژ بکات:

(عبدالله) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی پێنج رکەعەت کرد. نەفەرێ پێی فەرموو: ئایا رکەعەتەکانی نوێژ زیاتر بوون؟ فەرموی: بۆچی؟ وتی: پێنج رکەعەتت کرد، ئەنجا بەر لەسەلامدانەوە دوو کوڕنوشی بردن) (٣).

### ٣ ـ گەر لەدوو یان سێ رکەعەتدا سەلامی دایەوە:

(ابي هريرة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) دوو رکەعەتی کردن، (ذو اليدين) وتی: ئایا نوێژ کورت بونەوە یان لەیادت چوو ئەی پێغەمبەری خودا؟ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی: ئایا (ذو اليدين) راستی گوت؟ خەڵکی وتیان: بەڵێ. ئەنجا پێغەمبەری خودا (ﷺ) بڵندبوو دوو رکەعەتی تری کردن، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان (الله اكبر)ی گوت وەکو کوڕنوشی خۆی یان درێژتر کوڕنوشی بردو ئەنجا هەڵسا) (٤).

---

(١) متفق عليه خ(٣/١٢/١٢٤) (م ١/٣٩٩/٥٧٠).

(٢) صحيح (الارواء: ١٠٩ ـ ١١٠) (د: ١٠٢٣/٣/٣٥٠).

(٣) متفق عليه (خ ٣/٩٣/١٢٢٦) م(٥٧٢ ـ ٩١ ـ ٦/٤٠١).

(٤) متفق عليه: (خ ٣/٩٨/١٢٢٦) م(١/٤٠٣/٥٧٣).

(عمران بن حصين) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی عەسری لەسێ ڕکەعەتدا کرد، پاشان چووەوە جێگای خۆی. پیاوێ بە ناوی (الخرباق) هەڵسا چووە لای، هەندێ باسکی درێژ بوون. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پاشان ئەوەی کردبوی بۆی باس کرد، دواتر بە تووڕەیی یەوە دەرچوو عەباکەی رادەکێشا تا گەیشتە خەڵکی. فەرمووی: ئایا ئەمە راست دەکات؟ وتیان: بەڵێ. ئەنجا ڕکەعەتەکی کردو سەلامی دایەوە، پاشان دوو کوڕنوشی برد، پاشان سەلامی داوە)(١)

## ٤ ـ گەر نەیزانی چەند ڕکەعەتی کردووە؟

(ابراهيم) لە(علقمە) گێڕاویەوە: (عبداللە) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی کرد (ئیبراهیم) وتی: ڕکەعەتێ زیادی کرد یان ڕکەعەتی کەمی کرد) کاتێ سەلامی دایەوە کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی لەنوێژ روویداوە؟ فەرمووی: بۆچی؟ وتیان: ئاواو ئاوا نوێژت کرد. وتی: قاچەکانی چەماندەوەو رووی لەقیبلە کردوو دوو کوڕنوشی بردن، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان رووی لەئێمە کردو فەرمووی: گەر شتێ لەنوێژدا رووی دا ئەوە پێم راگەیاندون، بەڵام من مرۆڤێکم وەکو ئێوە، وەکو ئێوە شتم لەیاد دەچێتەوە، گەر شتەکم لەیاد کرد یادم بخەنەوە، گەر یەکێ لەئێوە لەنوێژێ دا کەوتە گومانەوە با سۆراغی راست بکاتو لەسەر ئەوە تەواوی بکات، پاشان دوو کوڕنوش ببات) (٢)

سۆراغەکە ئەوەیە کە(ئەوە یاد بخاتەوە چی لەنوێژدا خوێندووە، دەتوانێ ئەوە یادبخاتەوە کە دوو سوڕەتی لەو دوو ڕکەعەتە دا خوێندووە، بزانێ کە ئەو دو ڕکەعەتی کردووە نەك یەك ڕکەعەت، یادی خۆی بێنێتەوە کە ئەو تەحیاتی یەکەمی خوێندووە، ئەو بزانێ ئەو دوو ڕکەعەت نەك یەك دانەی کردووە، ئەو سێ ڕکەعەتی کردووە نەك دوو، یادی خۆی بکات ئەو فاتیحەی لەرکەعەتێکدا خوێندووەو پاشان لەرکەعەتەکی تر خوێندویەتیو بزانێ چوار نەك سێ ڕکەعەتی

---

(١) صحيح (ص.جه ١٠٠١) م(١/٤٠٤/٥٧٤). جه(١/٣٨٤/١٢١٥).

(٢) متفق عليه (١/٥٠٣/٤٠١)(م(١/٤٠٠/٥٧٢). لێرەدا ئیبراهیم دەکەوێتە گومانەوە، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە ئەو زیادی کردووە (جامع الأصول/ابن الأثير/٥/٥٤١).

کردووە، ئاوەها، کاتێ سۆراغی کرد کام رایەی لەراستی یەوە نزیکە، دەتوانێ گومانی لابدات، ئەمەش جیاوازی نییە پێش نوێژ خوێن (ئیمام) بێ یان بە تاك بێت) [١].

گەر سۆراغی کردو هیچ لایەکی بۆ ساغ نەبۆوە دڵنیای بکات، ئەوە بەلای کەمەوە وەکو (ابي سعيد الخدري) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە لەنوێژدا کەوتە گومانەوە، نەیزانی چەند رکەعەتی کردووە؟ سێ یان چوار؟ با گومان لابدات‌و بێتە سەر دڵنیایی. پاشان بەر لەسەلامدانەوە دوو کوڕنوش ببات. گەر پێنج رکەعەتی کرد ئەوە نوێژەکەی بووە بە جووت بە هۆی ئەو کوڕنوشانەو لەتاك چۆتە دەر، گەر تەواوکەری چوارەکە بوو، شەیتان سەرشۆڕ دەکەن) [٢].

## ـ حوکمی کوڕنوشی سەهو:

کوڕنوشی سەهو واجبە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردووەو دەوامی لەسەر کردووە لەکاتی لەیادکردنداو هەرگیز وازی لێ نەهێناوە.

## ـ جێگای کوڕنوشەکان:

(گێڕانەوەکان ئەوە دەردەخەن کە جیاوازی هەیە لەنێوان رکەعەت پەڕاندن‌و زیادکردنی‌و نێوان گومان‌و سۆراغ کردنداو، گومان‌و دامەزراندن لەسەر یەقین....ئەمەش لەگەڵ بەکارهێنانی دەقەکاندا بەگشتی: جیاوازی یەکی رێ تێچووی تێدایە.

گەر پەڕاندنی (نقص)ی تێدابوو وەکو نەکردنی تەحیاتی یەکەم نوێژەکە پێویستی بە پڕکردنەوەیە، پڕکردنەوەکەشی دەبێ بەر لەسەلامدانەوە بێ تا نوێژەکە سەد بکات، سەلامدانەوە تەواوکردنی نوێژە.

گەر زیادەکرابوو وەکو رکەعەتێ، نابێ لەنوێژدا دوو زیادە بکرێ، بەڵکو کوڕنوشەکە دوای سەلامدانەوەیە، چونکە سەرپێ شۆڕکردنی شەیتانەو وەکو نوێژەکی سەربەخۆیە ناتەواوی نوێژەکە

---

(١) مجموع الفتاوى ابن تيمية (٢٣/١٣).

(٢) صحيح (ص: ٦٣٢) م(١/٤٠٠/٥٧١) (د: ٣/٣٣٠/١٠١١) (ن: ٢/٢٧).

تەواو دەکات، پێغەمبەر (ﷺ) دوو کوڕنوشەکەی وەکو رکەعەتێ ژمار دووە.

هەروەها گەر وای زانیو سۆراغی کرد نوێژی تەواو کردووە، ئەو دوو کوڕنوشە بۆ سەر پێ شۆڕکردنی شەیتانەو سەلامەکە دوای سەلام دانەوە دەبێت...دیسانەوە گەر سەلامی دایەوەو هەندێ نوێژی لەسەر ما بوو، پاشان تەواوی کرد ئەوە تەواوی کردووە، سەلامدانەوە تێ یدا زیادەیە، کوڕنوش لەمەدا دوای سەلام دانەوەیە، چونکە مل کەچ کردنی شەیتانە. بەڵام ئەگەر کەوتە گومانەوەو نەیزانی گومانی بەکام لایەدا دەشکێتەوە، لێرەدا یان چوار یان پێنج رکەعەتی کردووە، گەر پێنج رکەعەتی کردبێ دوو کوڕنوشەکان دەیکەنە جووتانە، واتە: شەش رکەعەتی کردووە نەك پێنج، ئەمە بەر لەسەلامدانەوە دەبێت.

ئەو رایەی پەسەندمان کردووە لەهەمو فەرمودەکاندا ئەوە کاری پێ دەکرێ، هیچ فەرمودەیەك پشت گوێ ناخرێ، لەگەڵ بەکارهێنانی پێ گرتن (القياس)ەکی دروست کە دەقی لەسەر نەهاتووەو پێ وەلکاندنی شتەکیش کە دەق نییەو گەرچی واش پێ دەچێ دەقێ بێ لەدەقەکان)[١].

## ـ کوڕنوشی سەهوو بۆ دەست بەرداربونی سوننەتێ لەسوننەتەکان:

گەر کەسێ سوننەتەکی لەیادچوو کوڕنوشی سەهوو لەیادچوون دەبات:

وەکو لەفەرمودەدا هاتووە: (لكل سهو سجدتان)[٢]. ئەمە سوننەتە نەك واجب تا ئەم لقە سەرنەکەوێ بەسەر پایەکەیدا[٣].

---

(١) مجموع الفتاوى ٢٣/٢٤.

(٢) حسن (ص.د ٩١٧) د(١٠٢٥/٣٥٧/٣).

(٣) السيل الجرار: ١/٢٧٥).

# نوێژی بە کۆمەڵ ( صلاة الجماعة )

**حوکمەکەی:**

نوێژی بە کۆمەڵ(جەماعەت) فەرزی عەینە لەسەر هەموو موسڵمانێ مەگەر پاساوێکی هەبێت[1]:

(ابو هريرة)گێڕاویەوە: (سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، هاتۆتە سەرم فەرمان بکەم دارچیلکە کۆبکەنەوە، پاشان فەرمان بکەم بانگ بدرێ بۆ نوێژ، پاشان فەرمان بە پیاوێ بکەم پێش نوێژییان بۆ بکات، دوایی هەڵکوتمە سەر پیاوانێ،ماڵیان بەسەر دا بسوتێنم. سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە گەر یەکێ لەئەوانە پارچە ئێسکەکی قەڵەو شك ببات کە کەمێ گۆشتی پێوە مابێ، یان دوو نێوانی دوو سمی باش ـ ی کاوڕ بێ ـ دەهاتە نوێژی خەوتنان) [2].

(ابو هريرة) گێڕاویەوە: پیاوەکی کوێر هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەس نییە ڕێگای مزگەوتم پیشان بدات، داوای لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد ڕێگای بدات لەماڵەوەدا نوێژی بکات، ئەو ڕێگای دا، پاشان کە پشتی کردەوە بانگی کردو فەرموی: ئایا گوێت لەدەنگی بانگە؟ وتی: بەڵێ. فەرموی: وەڵامی بدەوە)[3].

(عبدالله) وتویەتی: (کێ حەز دەکات سبەی بە مسوڵمان بە ژوانی خودای بگات، با ئەو پێنج نوێژانە بپارێزێ کە بانگی دەکرێ بۆیان، خوا بۆ پێغەمبەری ئێوە (ﷺ) ڕێو شوێنی ڕێنوێنی داناوە، ئەمانەش لەرێو شوێنی ڕاستین، گەر ئێوە وەکو ئەو دواکەوتووە لەماڵەکانتاندا نوێژەکانتان بکەن، ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەکەتان تەرك کردووە، گەر سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) تەرك بکەن ئەوە لاڕێ بوون، هەر کەسێ دەست نوێژی بشوات و جوان هەڵی بگرێ بڕواتە مزگەوتێ لەو مزگەوتانە ئەوە بە هەر هەنگاوێك چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ و پلەیەکی بەرز

---

(١) تێبینی: لەمەزهەبی شافیعی دا (النووي) لە(منهاج)دا دەڵێ: قسەی لەپێشتر ئەوەیە کە فەرزی کیفایەیە.

(٢) متفق عليه: خ(٦٤٤/١٢٥/٢) م(٦٥١/٤٥١/١).

(٣) صحيح (مختصر مسلم ٣٢٠) م(٦٥٣/٤٥٢/١).

دەكاتەوەو گوناهەكی پێ رەش دەبێتەوە، تۆ ئێمەت بینی تەنیا دووڕویەك لێ ی دوادەكەوێ كە دووڕویی یەكەی ئاشكرایە، پیاو هەیە دەهێنرێ لەنێوان دوو پیاودا راست كراوەتەوە تا لەنێو ڕێزدا دا دەنرێت) [1].

(ابن عباس (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: (هەر كەسێ گوێ ی لەبانگ بێ نەیەت نوێژی بۆ نییە، مەگەر پاساوەكی هەبێت) [2].

## - گەورەیی جەماعەت (نوێژی بە كۆمەڵ):

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (نوێژی بە كۆمەڵ بە ئەندازەی بیستو حەوت پلە لەنوێژی بە تەنیا گەورەترە) [3].

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (نوێژی پیاو بە كۆمەڵ بیستو پێنج ئەوەندەی نوێژی ماڵەوەو بازاڕ پلەی پتر دەبێ، چونكە گەر دەست نوێژەكی باشی گرتو چووە مزگەوت، تەنیا بە مەبەستی نوێژ بۆ هەر هەنگاوێ پلەیەكی بەرز دبێتەوەو تاوانەكی پێ هەڵدەوەرێ، هەر یەكێ لەئێوە تا چاوەڕوانی نوێژ بكات ئەوە لەنوێژدایە) [4].

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر كەسێ بەیانیو ئێوارە بڕواتە مزگەوت تا بڕواتە مزگەوت لەبەیانیو ئێوارەدا ئەوە خوا جێگای لەبەهەشتدا بۆ دیاری كردووە) [5].

ـ ئایا ژنان لەنوێژی بە كۆمەڵ دا ئامادە دەبن؟

دروستە ژنان بڕۆنە مزگەوتو نوێژی بە كۆمەڵ بكەن، بەو مەرجەی خۆیان لەم شتانە بپارێزن كە وروژێنەری ئارەزووی پیاوانو سەر بۆ خراپەكاری دەكێشن وەكو خۆڕازاندنەوەو ئارایشو بۆن لەخۆدان [6].

---

(١) صحيح (ص.جه ٦٣١) م(١/٤٥٣/٢٥٧/٦٥٤)(جه١/٢٥٥/٧٧٧)

(٢) صحيح: (ص.جه ٦٤٥) جه(١/٢٦٠/٧٩٣).

(٣) متفق عليه (خ ٢/١٣١/٦٤٠) م(١/٤٥٠/٦٥٠).

(٤) متفق عليه (خ ٢/١٣١/٦٤٧) (م ١/٤٥٩/٦٤٩).

(٥) متفق عليه (خ ٢/١٤٨/٦٦٢) (م ١/٤٦٣/٦٦٩).

(٦) فقه السنة ١/١٩٣.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئافرەتان لەمزگەوت قەدەغە مەکەن، بەڵام ماڵەوەیان بۆ باشترە) [١].

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر ژنێ بۆنی خۆشی لەخۆداوە، با نوێژی خەوتنان لەگەڵ ئێمەدا ئامادە نەبن) [٢].

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ژنان لەمزگەوت قەدەغە مەکەن، بەڵام با بۆنی خۆشیان لەخۆیان نەدابێت) [٣].

## ـ ماڵیان بۆ ئەوان باشترە:

هەرچەندە ژن رێگای پێ دراوە بێتە مزگەوت بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، بەڵام نوێژی ماڵەوەی خێری بۆ زیاترە:

(ام حميد الساعدیە) گێڕاویەوە: هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا حەز دەکەم نوێژ لەخزمەت تۆدا بکەم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (من ئاگادارم پێت خۆشە نوێژ لەگەڵ مندا بکەیت، بەڵام نوێژ لەماڵەکەتدا خێرترە نەك لەژووری خۆتدا، وە نوێژ لەژوری خۆتدا چاکترە لەنوێژی خانوەکەتدا، نوێژی خانوەکەت باشترە لەنوێژ لەمزگەوتی خزمەکانتدا، مزگەوتی خزمەکانیش چاکترە لەمزگەوتی من دا) [٤].

## ـ نەریتی رۆیشتن بەرەو مزگەوت:

(ابي قتادة) گێڕاویەوە: لەکاتێ دا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژمان دەکردو گوێ ی لەغەڵبە غەڵبی پیاوان بوو، کاتێ نوێژی تەواو کرد فەرموی: ئەوە چیتان بوو؟ وتیان: بۆ نوێژ پەلەمان کرد. فەرموی: وامەکەن، گەر هاتنە نوێژ ئارامی بنوێنن، ئەوەی پێ ی راگەیشتن

(١) صحيح (ص.د ٥٣٠) د(٢/٢٧٤/٥٦٣).

(٢) صحيح (ص.ج ٢٧٠٢) م(١/٣٢٨/٤٤٤) د(١١/٢٣١/٤١٥٧).

(٣) حسن صحيح (ص.د ٥٢٩) د(٢/٢٧٣/٥٦١).

(٤) حسن (أ: ٥/١٩٨/١٣٣٧).

بیکەن، ئەوەی پێ ی رانەگەیشتن تەواوی بکەن) [١].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر گوێتان لەئیقامەی نوێژ بوو بچن بۆ نوێژو لەسەر خۆیی‌و شکۆ بنوێنن، پەلە مەکەن، ئەوەی پێ ی راگەیشتن بیکەن‌و ئەوەی پێ ی رانەگەیشتن تەواوی بکەن) [٢].

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە دەست نوێژەکی باشی گرت‌و پاشان بە مەبەستی نوێژی چووە مزگەوت با قامکەکان تێك وەرنێنێ ئەو لەنویژدایە) [٣].

## ـ گەر لەماڵ چووە دەر چی دەڵێ:

(ئەنەس) دەڵێ: (کێ وتی ـ واتە گەر لەماڵ چووە دەر ـ بسم الله، توكلت على الله، ولا حول ولا قوة الا بالله) ئەو کاتە پێ ی دەوترێ: (تۆ رێنمو ما بووی‌و پارێزراوی‌و شەیتان لێی دوورکەوێتەوە) [٤].

(ابن عباس (رضي الله عنه))گێڕاویەوە: (ئەو شەو لای پێغەمبەر (ﷺ) نوستبوو، پاشان وەسفی شەو نوێژی ئەوی کردووە، پاشان وتی: ئەنجا بانگدەر بانگی داو ئەو چووە مزگەوت‌و دەیفەرموو: (اللهم اجعل في قلبي نورا، وفي لساني نورا، واجعل في سمعي نورا، واجعل في بصري نورا، واجعل من خلفي نورا، ومن امامي نورا، واجعل من فوقي نورا ومن تحتي نورا، اللهم اعطني نورا) [٥].

کاتێ چووە ناو مزگەوت چی دەڵێ:(عبدالله بن عمرو بن العاص) گێڕاویەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) گەر دەچووە مزگەوت دەیفەرموو: (اعوذ بالله العظيم وبوجهه الكريم وسلطانه القديم من الشيطان الرجيم) [٦].

(فاطمة س ـ)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەچووە

---

(١) متفق عليه: (خ٦٣٥/٢/١١٦) م(٦٠٣/١/٤٢١).

(٢) متفق عليه: خ(٦٣٦/٢/١١٧). م(٦٠٢/١/٤٢٠).

(٣) صحيح (ص.ت ٣١٦) ت(٣٨٤/١/٢٣٩).

(٤) صحيح (ص.ج ٦٤١٩) د(٥٠٧٣/٤٣٧/١٣).

(٥) صحيح (مختصر م ٣٧٩) م(٧٦٣ ـ ١٩١ ـ/١/٥٣٠).

(٦) صحيح (ص.د ٤٤١) د(٤٦٢/١٣٢/٢).

مزگەوت دەیفەرموو: (بسم الله، والسلام على رسول الله، اللهم اغفر لي ذنوبي وافتح لي ابواب رحمتك). گەر دەچووە دەر دەیفەرموو: (بسم الله والسلام على رسول الله، اللهم اغفر لي ذنوبي وافتح لي ابواب فضلك) [١].

**- سوننەتی سڵاوی مزگەوت ( تحية المسجد ):**

گەر چووە ناو مزگەوت پێویستە لەسەری بەر لەدانیشتن دوو ڕکەعەت نوێژ بکات:

(ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە چووە مزگەوت دانەنیشێ تا دوو ڕکەعەت نوێژ دەکات) [٢]. بۆیە باسی پێویستیو واجیبم کرد لەبەر دیاردەی ئەم فەرمانە، ئەنجا هیچ بەڵگەی تر نییە لەم ڕواڵەتە لابدات، تەنیا فەرمودەی (طلحة بن عبيدالله) نەبێ، کە عەرەبەکی ڕەسەن (ئەعرابی) بەسەرو قژی ئاڵۆز هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێم بڵێ چی لەسەرم فەرز کراوە لەنوێژ؟ فەرموی: پێنج فەرزەکان مەگەر سوننەتەکان نەبێت) [٣].

(ئەم فەرمودەیە وادەکات بۆچوونی من لەڕاست واجب بوونی دا ڕاست نەبێ، چونکە ئەوەی لەپڕەنسیپەکانی زانیارییەکاندا ڕوویداوە ناشێ پشتی پێ ببەسترێ لەڕووکردنە شتی تر کە دوای ئەمە هاتووە، ئەمەش واجیباتەکانی شەریعەت لەم پێنج دانانەی ڕابردودا کورت دەکاتەوە، ئەمەش پێچەوانەی کۆمەڵی زانایانو کۆکی ئەوانە لەشەریعەتدا، ئەوەی ڕاستی بێ بەڵگەی داهاتووش گەر سەرچاوەکەی ڕاست بێ بەهەند وەردەگیرێ لەواجبو سوننەتو شتی تردا، لەمەسەلەی جیاوازی دا، ئەمە لەپێشترینی هەر ڕاوبۆچوونەکانە) [٤]. ئەوەی واجبی یەکەی دادەمەزرێنێ فەرمانکردنی پێغەمبەرە (ﷺ) بەمە:

---

(١) صحيح (ص.جه ٦٢٥) جه(١/٢٥٣/٧٧١).

(٢) صحيح (ص.جه ٦٢٥) جه(١/٢٥٣/٧٧١).

(٣) ڕابرد.

(٤) نيل الأوطار: ١/٣٦٤).

## ـ گەر پێش نوێژ خوێن وتاری دەدا:

(جابر بن عبدالله (ﷺ)) دەفەرمووێ: (پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەفەرموو لەهەینی دا پیاوێ هات ، فەرموی: فیسار نوێژت کرد ؟ وتی: نەء، فەرموی: هەڵسە نوێژ بکە).

(گەر ـ تحیة المسجد ـ لەهیچ دۆخێکدا نەکرابایە ئێستا کاتی بووە نەکرێ، چونکە دانیشتووەو بەر لەدانیشتن شەرعی یەتی پێ دراوە، لەبەر ئەوەی ئاگای بە حوکمەکەی نەبووە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) وتارەکەی پچڕیوەو قسەی لەگەڵدا کردووەو فەرمانی پێ کردووە کە (تحیة المسجد) بکات، ئەگەر لەهەموو کاتێکدا ئەو پەڕی گرنگیدان بە (تحیة المسجد) نەبوایە ، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم بایەخەی پێ نەدەدا) [١].

## ـ گەر قامەتی نوێژ کرا تەنیا نوێژی فەرز دەکرێت:

(ﷺ) فەرمویەتی: (گەر قامەتی نوێژ کرا تەنیا نوێژی فەرز دەکرێت)[٢].

(مالك بن بجينة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێ دەبینێ و ئەو کاتەی قامەت کراوە، دوو رکەعەت نوێژ دەکات، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەڕوات خەڵکی دەوریان لێ دا، پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی دەفەرمووێ: (ئایا نوێژی بەیانی بووە بە چوار رکەعەت؟ ئایا نوێژی بەیانی بووە بە چوار رکەعەت؟)[٣].

## ـ گەورەیی پێ راگەیشتن بە (الله اکبر)ی ئیحرام لەگەڵ پێشنوێژخوێندا:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ چل رۆژ بە (الله اکبر)ی ئیحرامی پێش نوێژ خوێن رابگات، دوو رزگاربونی بۆ دەنوسرێ: رزگاربون لەئاگرو رزگار بون لەدووروویی) [٤].

---

(١) صحيح: (مسلم بشرح النووي: ٥/٢٢٦).
(٢) صحيح (مختصر م ٢٦٣) م(١/٤٩٣/٧١٠).
(٣) متفق عليه (خ ٢/١٤٨/٦٦٣).
(٤) حسن (ص.ت ٢٠٠) ت(١/١٥٢/٢٤١).

**ـ کێ هاتو پێش نوێژ خوێن (الإمام) لەنوێژ دا تەواو بوو بوو:**

(سعيد بن المسيب) گێڕاویەوە: (پیاوێکی ئەنصارەکان دەکەوێتە باری سەرە مەرگەوە وتـی: من فەرمودەیەکتان بۆ دەگێڕمەوە، تـەنیا بـۆ ئـەوە دەیگێڕمـەوە کـە خـوا پاداشـتم بداتـەوە، لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە: هەر کەسێ دەسـت نوێـژەکی بـاش بگـرێو پاشـان بڕواتـە مزگەوت، هەر کە پێ ی راستی بەرز کردەوە خوا چاکەیەکی بۆ دەنووسێ، هەر کە قاچـی چـەپی دانا خوای گـەورە تاوانـەکی دەسـڕێتەوە، بـا هـەر یـەکێ لـەئێوە دوور بکەوێتـەوە یـان نزیـك بکەوێتەوە، گەر هاتە مزگەوت نوێژی بە کۆمەڵ کرد، خوا لەتاوانەکانی خۆش دەبێت، گەر هاتـە مزگەوتو هەندێ نوێژ کرابوو هەندێ مابۆوە ئەوەی ما بۆوە با تەواوی بکات، ئەوە وەکـو ئـەوە وایە، گەر هاتە مزگەوتیشو نوێژکرابوو ئەوە هەروایە) [(١)].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ دەست نوێژەکی تەواو بگرێ، پاشـان چـووە مزگـەوتو نوێژکرابوو، خوای گەورە بە ئەنـدازەی ئـەو کەسـانەی نوێـژیان کـردووەو ئامـادەی نوێـژ بـووە، پاداشتی دەداتێ، بێ ئەوەی هیچ بڕێ لەپاداشتەکەیان کەم بکرێتەوە)[(٢)].

**ـ چوونە مزگەوت کە ئیمام لەهەردۆخێکدا بێت:**

پێشەوا عەلی ـ س ـ و مەعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه) گێڕاویانەوە:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە هاتە مزگـەوت پـێش نوێـژ خـوێن لـەچ دۆخێکدا بوو، با ئەویش وا بکات) [(٣)].

**ـ کەی حیساب بۆ رکەعەت دەکرێت؟**

(ﷺ) فەرمویەتی: (ئەگەر ئێوە هاتنە مزگەوت ئێمە لەکوڕنوشدابوین، کوڕنوش (سوجدە) ببەنو بە رکەعەتی دامەنێن، کێ بە رکوع راگەیشت ئەوە بە نوێژ راگەیشتووە) [(٤)].

---

(١) صحيح (ص.د ٥٢٧) د(٢/٢٧٠/٥٥٩).

(٢) صحيح (ص.د ٥٢٨) (د: ٢/٢٧٢/٥٦٠) نس(٢/١١١).

(٣) صحيح (ص.ت ٤٨٤) (ص.ج ٢٦١) (ت ٢/٥١/٥٨٨).

(٤) صحيح (ص.ج ٣٥٦٥) خ(٢/٢٦٧/٧٨٣).

**ـ كێ هێشتا نەگەیشتبێتە ڕیزو ڕكوع ببات:**

(ابی بكره) گێڕاویەوە: (ئەو گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) ڕكوعی بـرد، ئـەویش بـەر لـەوەی بگاتە ریزەكە ڕكوعی برد، ئـەویش ئەمـەی بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) گێڕایـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموی: (زادك الله ولا تعد)[1].

واتە: خوا بۆ سەر چاكە سوورترت بكات، جارەكی تر وامەكە.

(عطاء) گێڕاویەوە: لە(ابن زبیر)ی بیستووە لەسەر مینبەر وتویەتی: (هەر كەس هاتـە نـاو مزگەوتو خەڵكی لەركوعدا بوون با ئەویش ڕكوعی ببات، تا دەڕواتە ناو، پاشان بـە ڕكوعـەوە بڕوات تا دەڕواتە ناو ریز ئەمە سوننەتە)[2].

(زید بن وهب) دەڵێ: (لەگەڵ (عبدالله ابن مسعود) لەماڵـەوەوەیان بـۆ مزگـەوت چـووین، كاتێ گەیشتینە ناوەڕاستی مزگەوت پێش نوێژ خوێن ڕكوعی بـرد، (عبـدالله)ش ڕكـوعی بـرد، منیش ڕكوعم لەگەڵی دا برد، پاشان ڕۆیشتین تا گەیشتینە ریز، ئەو كاتە خەڵكەكە سەریان بەرز كردەوە، كاتێ پێش نوێژ خـوێن نوێـژی تـەواو كـرد، هەڵـسامەوە وام زانـی پـێ رانەگەیـشتوم، (عبدالله) دەستی گرتمو داینیشتاندمەوە، پاشان وتی: تۆ پێ ڕاگەیشتویت)[3].

**ـ ئەوەی پێش نوێژ خوێن فەرمانی پێ دەكرێ نوێژەكە كورت بكاتەوە:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەكێ لەئێوە نوێژی بۆ خەڵكی كرد با كورتی بكاتەوە، چونكە خەڵكی بێ هێزو نەخۆشو پیری تێدایە، بەڵام گەر بۆ خۆی نوێژی كـرد بـا بـە ئـارەزووی خۆی درێژی بكاتەوە) [4]

---

(١) صحيح (ص.ج ٣٥٦٥) خ(٢/٢٦٧/٧٨٣).

(٢) صحيح الإسناد: (الصحيحة ٢٢٩).

(٣) صحيح الإسناد (الصحيحة: ٢/٥٢) هق(٢/٩٠). تێبینی: لەڕوویەكی ترەوە ئەم فەرمودەیە ئاوا هاتووە: (صل ما ادركت واقض ما سبقك). واتە: ئەوەی پێ ڕاگەیشتی بیكەو ئەوەی تر تەواو بكە. هەندێ زانای تر (لا تعد) بەوە لێك دەدەنەوە دروست نییە جارەكی تر ئەم كارە دووبارە بكاتەوە، ئەمەش شێو ازی بوخاری یە لەبەشی (قراءة الإمام)دا. (فتح الباري/ج٢/ح:٧٨٣)..

(٤) متفق عليه: (خ ٢/١٩٩/٧٠٣) (م ١/٣٤١/٤٦٧).

**ـ رکوعی یەکەم لەلایەن پێش نوێژ خوێن درێژ دەکرێتەوە:**

(ابی سعید الخدری) گێڕاویەوە: (نوێژی نیوەڕۆ دەستی پێ دەکرا نەفەر هەبوو دەچووە بەقیع کاری خۆی بەجێ دەهێنا، پاشان دەست نوێژی دەگرتو دەهات پێغەمبەر (ﷺ)بەهۆی درێژ کردنەوەی هەر لەرکەعەتی یەکەمدا بوو،) [١].

**ـ پێویستە شوێن کەوتنی پێش نوێژ خوێنو حەرامە پێش کەوتنی:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (دەبێ پێش نوێژ خوێن ئیقتیدای پێوە بکرێ، گەر ـ الله اکبر ـ ی گوت ئێوەش- الله اکبر- بڵێن، ئەگەر کوڕنوشی برد کوڕنوش ببەن، گەر بەرزبۆوە بەرز ببنەوە)[٢].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئایا گەر یەکێ لەئێوە بەر لەپێش نوێژ خوێن سەری بەرز کردەوە لەوە ناترسێ خوا سەری بکات بە سەری کەر، یان وێنەی وەکو وێنەی کەر لێ بکات) [٣].

**ـ کێ لە پێشترە بۆ پێش نوێژ خوێنی؟!**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ لەهەمووتان چاکتر قورئان خوێندنی رەوانە با پێش نوێژی بکات، گەر لەخوێندنەوە وەکو یەکتری بوون، کامەیان لەسوننەت شارەزاترە، گەر لەسوننەتدا وەکو یەکتری بوون کامەیان زووتر کۆچی کردووە، گەر لەکۆچکردن وەکو یەکتری بوون، کامەیان پێشتر موسڵمان بووە، نابێ پیاو پێش نوێژی بۆ پیاوێ بکات کە ئەو جێگایە هی خۆیەتی، نابێ لەماڵی خۆیدا لەشوێنی ئەودا دابنیشێ بە روخسەتی ئەو نەبێت) [٤].

بەو پێیە خاوەن ماڵو پێش نوێژ خوێنی نیشتەجێ لەکەسانی تر لەپێشترن بۆ پێش نوێژی خوێندن، مەگەر ئەو رێگای پێ بدات، وەکو (ﷺ) فەرمویەتی: (ولا يؤمّن الرجلُ الرجلَ في سلطانه).

---

**(١) صحيح (ص.نس ٩٣٠) م(١/٣٣٠/٤٥٤) (نس ٢/١٦٤).**

**(٢) متفق عليه م(١/٣٠٨/٤١١) خ(٢/١٧٣/٦٨٩).**

**(٣) متفق عليه (خ ٢/١٨٢/٦٩١) م(١/٣٢٠/٤٢٧).**

**(٤) صحيح (مختصر م ٣١٦) م(١/٤٦٥/٦٧٣) جه(١/٣١٣/٩٨٠). لەریواتی (مسلم)دا هاتووە (گەر لەکۆچکردن وەکو یەك بوون کامە لەهەموویان بەتەمەنتر بوو).**

**ـ پێش نوێژ خوێنی منداڵ:**

(عمرو بن مسلمه) گێڕاویەوە: (کاتێ مەککە رزگار کرا هەر خەڵکەو بە هۆی ئیسلامەتی خۆی بردە پێش، باوکیشم خۆی بردە پێش خەڵکی خۆی بە ئیسلامەتی ئەوان، کاتێ چووە پێش وتی: من لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) بە نوێنەر هاتووم، ئەو نوێژە لەفلان کاتەدا بکەن، فیسار نوێژ لەفلان کاتەدا بکەن، گەر نوێژ بو، با یەکێ لەخۆتان بانگبدات، کێ لەهەمووان قورئانی لەبەر تر بوو با پێش نوێژیتان بۆ بکات، روانیان کەس لەمن قورئانی پتر لەبەر نەبوو، پێشوازیم لێ کراو پێش خۆیان خستم، ئەو کاتە من شەش حەوت ساڵانە بووم) [١].

**ـ نوێژ کردنی ئەو کەسەی فەرز دەکات لەدوای ئەو کەسەی سوننەت دەکات و بە پێچەوانەوەش:**

(جابر) گێڕاویەوە: (مەعاز کوڕی جەبەل لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژی دەکردو پاشان دەگەڕایەوە لای خەڵکی خۆی و پێش نوێژی بۆ دەکردن)[٢].

(یزید بن الأسود) گێڕاویەوە: (ئەو تازە لاو بوو نوێژی لەدوای پێغەمبەردا (ﷺ) کرد، کاتێ نوێژی کرد، دوو پیاو لەگۆشەیەکی مزگەوتدا نوێژیان نەکردبوو، ئەنجا بانگی کردن، دەست و قاچیان هەڵدەلەرزین، فەرموی چی رێگای پێ گرتن نوێژمان لەگەڵدا نەکەن؟وتیان: لەجێگاکانی خۆماندا نوێژمان کردووە. پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ): وامەکەن، گەر یەکێ لەئێوە لەشوێنی خۆی نوێژی کرد، پاشان بە پێش نوێژ خوێن گەیشت و نوێژی نەکردبوو با نوێژ لەگەڵ ئەودا بکات، ئەوە بۆی دەبێ بە سوننەت) [٣].

**ـ ئەو کەسەی نیشتەجێیە نوێژ لەدوای ئەو کەسە دەکات لەسەفەردایەو بە پێچەوانەوەش:**

(ابن عمر) دەڵێ: (عومەر نوێژی نیوەڕۆی بۆ خەڵکی کرد لەدوورکەعەتدا سەلامی دایەوە، پاشان وتی: ئەی خەڵکی مەککە ئێوە نوێژی خۆتان تەواو بکەن ئێمە لەسەفەرداین) [٤].

---

(١) صحيح (ص. نس ٧٦١) خ(٨/٢٢/٤٣٠٢) (نس ٢/٨٠).

(٢) صحيح (مختصر خ ٣٨٧) خ(٢/١٩٢/١٩٢/٧٠٠) م(١/٣٣٩/٤٦٥).

(٣) صحيح (ص.د ٥٣٨) د(٢/٢٨٣/٥٧١) ت(١٤٠/٢١٩) (نس ٢/١١٢).

(٤) صحيح (الارناؤط في تحقيق جامع الأصول: ٥/٧٠٨) مصنف عبدالرزاق (٤٣٦٩).

**ـ گەر باباى سەفەر كەر نوێژى لەدواى باباى نیشتەجێ كرد دەبێ نوێژەكەی تەواو بكات:**

(موسى بن سلمة الهذلي) دەڵێ: لە(ابن عباس)م پرسیار كرد: گەر لەمەككە بوومو لەگەڵ پێش نوێژ خوێندا نوێژم نەكرد، چۆن نوێژ بكەم؟ وتی: دوو ركەعەت، ئەوە سوننەتی (ابی القاسم)ە (ﷺ) (١).

(ابی مجلز) وتویەتی: (بە (ابن عمر)م وت: (گەر باباى سەفەرچی بە دوو ركەعەتی خەڵكەكی نیشتەجێ راگەیشت، دەبێ دوو ركەعەت بكات، وەكو نوێژی ئەوان نوێژ بكات؟ ئەویش پێكەنیو وتی: وەكو نوێژی ئەوان نوێژی دەكات)(٢).

**ـ نوێژكردنی ئەو كەسەی دەتوانێ بەوەستاوی نوێژ بكات لەدواى ئەو كەسەی بە دانیشتنەوە نوێژ دەكاتو ئەو لەگەڵ ئەودا دادەنیشێت:**

عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵەوە نوێژی دەكرد لەبەر نەخۆشیان دەیناڵاند، بۆیە بە دانیشتنەوە نوێژی كردو دەستەیەك لەدواى ئەودا بە وەستاوی نوێژیان كرد، ئەویش ئاماژەی بۆكردن دانیشن، كاتێ نوێژی تەواو كرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دەبێ پەیوەندی بە پێش نوێژ خوێنەوە بكرێ، گەر ركوعی برد ركوع ببەنو گەر هەڵساوە هەڵسنەوە، گەر بە دانیشتنەوە نوێژی كرد بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن) (٣).

(انس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەئەسپی كەوتە خوارو لای راستەی روشا، چوونە لای سەردانی بكەین، ئەنجا نوێژ بوو، بە دانیشتنەوە نوێژی بۆ كردین، كاتێ نوێژی تەواو كرد فەرمووی (ﷺ): (دەبێ چاو لەپێش نوێژ خوێن بكەین، گەر (الله اكبر)ی گوت ئێوەش (الله اكبر) بڵێن، گەر كورنوشی برد ئێوەش كورنوش ببەن، گەر هەڵساوە هەڵسنەوە، گەر وتی: (سمع الله لمن حمده) ئێوەش بڵێن: (ربنا لك الحمد)، گەر بەدانیشتنەوە نوێژی كرد هەمووتان بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن) (٤).

---

(١) صحيح (الارواء: ٥٧١) م(٦٨٨/٤٧٩/١) نس(٣/١١٩).

(٢) صحيح الإسناد (الارواء: ٢٢) هق(٣/١٥٧).

(٣) متفق عليه: خ (٦٨٨/١٧٣/٢) م(٤١٢/٣٠٩/١).

(٤) رابرد.

**ـ گەر یەك كەس لەدوای پێش نوێژ خوێن نوێژی دەكــرد، دەبــێ لــەلای راســتیەوە نوێــژ دابەستێ‌و پێ ی بە پێ ی ئەوەوە بنێ:**

(ابن عبــاس (رضي الله عنه)) فەرمویــەتی: (شــەو لــەماڵی پلكــە مەیمونــە مامــەوە، پێغەمبــەری خوا(ﷺ) نوێژی خەوتنانی كــرد، پاشــان چــوار ركەعــەتی تــری كــرد، پاشــان نووســت، دواتــر هەڵسایەوە، چووم لەلای چەپیەوە وەستام، ئەویش خستمی یە لای راستی یەوە)[1].

**ـ دوو كەس و بە سەرەوەتر وەكو ریز لە دوای پێش نوێژ خوێنەوە رادەوەستن:**

(جابر) فەرمویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسا نوێژ بكات، هــاتم لــەلای چــەپیەوە وەســتام، دەستی گرتم سوڕاندمیەوە تا لەلای راستیەوە داینام، پاشان (جبار بن صخر) هات لــەلای چــەپی پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەستا، ئەویش دەستی هەمومانی گــرت پــاڵی پێوەنــاین لــەدوای خۆیــەوە وەستاندنی)[2].

**ـ گەر ئەو كەسەی نوێژ لەدوای پێش نوێژ خوێن دەكات ئافرەت بوو ئــەوە لــەدوای پــێش نوێژخوێنەوە دەوەستێت:**

(انس بن مالك) وتویەتی: (پێغەمبەر (ﷺ) پێش نوێژی بە ئەوو دایك‌و پلكی كرد، وتــی: منی لەلای راستیەوە وەستاندن‌و ژنەكانی خستنە دواوە)[3].

**ـ پێویستی رێك خستنی ریزەكان:**

پێویستە پێش نوێژ خوێن تا ریزەكان رێك دەخات نوێژەكەی دانەبەستێ‌و دەبــێ فــەرمانیان پێ بكات بەمە، خۆی ریزەكان راست بكات یان فەرمان بە كەسێ بكات رێكیــان بخــات: (انــس) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ریزەكــان راســت بكــەن چــونكە راســتكردنی ریزەكــان

---

(١) صحيح (الارواء: ٥٤٠) (ص.جه ٧٩٢) (خ ٢/١٩٠/٦٩٧) ئەمە هی ئەوە، (م ١/٥٢٥/٧٦٣).

(٢) صحيح الأرواء: ٥٤٠) (م ٦٦٠ ـ ٢٦٩ـ ١/٤٥٨) (د: ٢/٣١٨/٥٩٥).

(٣) متفق عليه : خ(٢/١٩٢/٧٠) م(١/٣٣٦/٤٦٥).

بەشێکە لەتەواوکردنی نوێژ)[1].

(ابی مسعود) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) شانەکانی لەنوێژ وێک دەدایەن و دەیفەرموو: (ڕاست بن و خوار مەبن ئەگەر نا دڵتان نارێك دەبێت)[2].

(نعمان بن بشیر) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ریزەکانی راست دەکردین وەکو چۆن جام (القداح) ریزبکات، هەتا بینی ئێمە لێ ی حاڵی بووین، پاشان ڕۆژێ خەریك بوو (الله اکبر) بکات، پیاوەکی بینی سنگی لەریزدا دەرچواندبوو ، فەرموی: (بەندەکانی خودا ریزتان راست بکەن، ئەگەروانەکان خودا ناکۆکیتان دەخاتە ناو)[3].

(ابن عمر) گێڕاویەوە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: (ریزەکان راست بکەن، شانەکان هاوتەریب بکەن و کەلێنەکان پڕ بکەنەوەو نەرمی بنوێنن بە دەستی براکانتان (لەکاتێ دا پێش و پاشتان دەخەن بە قسەیان بکەن) کەلێنەکانی شەیتان لێ مەگەڕێن، کێ ریزێکی بگەیەنێ خودا دەیگەیەنێ، کێ ڕێزێکی بپچڕێنێ خودا دەیپچڕێنێ)[4].

(انس) گێڕاویەوە: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (ریزەکان ڕێك و راست بکەن و نێوانیان نزیك بخەنەوەو ملەکان پێك بدەن، سوێند بەوەی گیانی منە بە دەستە، من دەبینم شەیتان دەڕواتە ناو کەلێنەکانی ڕیز وەکو کاوڕەکی ڕەش وایە)[5].

## - چۆن ریزەکان ڕێك دەخرێن؟

**ئەنەس گێڕاویەوە: (ﷺ)**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ریزەکانتان راست بکەن، من لەدواوە ئێوە دەبینم). ئێمە شان و پێیەکانمان پێکەوە دەنووساند[6].

---

(١) متفق علیه: م(٤٣٣/٣٢٤/١) خ(٧٢٣/٢٠٩/٢).

(٢) صحیح (ص.ج ٩٦١) (م ٤٣٢/٣٢٣/٢).

(٣) صحیح (ص.ج ٣٩٧٢) م(٤٣٦ ـ ١٢٨ـ /٣٢٤/١).

(٤) صحیح (ص.د ٦٢٠) (د: ٦٥٢/٣٦٥/٢).

(٥) صحیح (ص.د ٦٢١) (د: ٦٥٣/٣٦٦/٢).

(٦) صحیح (مختصر خ ٣٩٣) خ(٧٢٥/٢١١/٢).

(النعمان بن بشير) گێڕاویەوە: (دەمبینی هەر پیاوێ لەخۆمان گوێزنگی بە گوێزنگی هاوڕێکەوە دەلکاند) [١].

## - ریزی پیاوان و ژنان:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (باشترین ریزی پیاوان یەکەمینیانەو خراپەکەیان دواترین ریزیانە، چاکترین ریزی ژنان ریزی دواوەیانەو خراپترین ریزیان ریزی پێشەوەیانە) [٢].

## - گەورەیی ریزی یەکەم و لای راستی ریزەکان:

(براءبن عازب) گێڕاویەوە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (خوداو فریشتەکان سەڵەوات لەریزی یەکەم دەدەن)[٣].

گێڕاویەوە: (کاتێ لەدوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژمان دەکرد، پێمان خۆش بوو بکەوینە لای راستیەوە، رووی تێمان دەکردو گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (ربّ قني عذابك يوم تبعث عبادك) [٤]. واتە:لەرۆژی زیندووبوونەوەدا لەئەشکەنجەو ئازار بەدوورم بخە.

## - کێ لەدوای پێش نوێژ خوێن دەوەستێت؟!

(ابي مسعود الأنصاري) دەیوت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرمو: با کەسانێ لەدوای من نوێژ دابەستن کە زاناو دانان، پاشان ئەوانەی بە دوای ئەواندا دێن، پاشان ئەوانەی بە دوای ئەواندا دێن) [٥].

---

(١) صحيح (مختصر خ ١٢٤/ص١٨٤) (خ ٢/٢١١) تعليقا.

(٢) صحيح (ص.ج ٣٣١٠) م(٣٢٦/٤٤٠) د(٣٧٤/٦٦٤) ت(١/١٤٣/٢٢٤).

(٣) صحيح (ص.د ٦١٨) د(٢/٣٦٤/٦٥٠) نس(٢/٩٠).

(٤) صحيح (الترغيب ٥٠٠) م(١/٤٩١/٤٩٢/٧٠٩).

(٥) صحيح (ص.د ٦٢٦) م(١/٣٢٣/٤٣٢) (د: ٢/٣٧١/٦٦٠).

**ـ ناپەسەند (کەراهەت)ی ریز لەنێوان ستوندەو پایەکاندا:**

(معاویة بن قرة) لەباوکی گێراویەوە: (لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) رێگامان نەدەدا ریزەکان لەنێوان ستوندەو پایەکاندا ببەستین بە توندی دەردەکراین)[١].

ئەمە لەراست نوێژی بە کۆمەڵدا، بەڵام تاك کەسانە قەیدی نییە لەنێوان دوو ستوندەو پایەدا نوێژ بکات مادام بەربەستەکەی لەبەر دەمەوەیە.

(ابن عمر) گێراویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) چووە بەیتەوە لەگەڵ (اسامة بن زید)و (عثمان بن صلحة)و (بلال)دا بوو، ماوەیەکی درێژی پێ چوو، پاشان دەرچوو. من یەکەم کەس بوم بە شوێنی ئەودا چووم. لەبیلالم پرسی لەکوێ نوێژی کرد؟وتی: لەنێوان دوو ستوندەی پێشەوە)[٢].

**ـ پاساو بۆ نەکردنی نوێژی بە کۆمەڵ (جەماعەت):**

**(١) بارانو سەرما:** (نافع) گێراویەوە: (ابن عمر لەشەوێکی ساردو سەرماداو بای دەهات بانگی دا، ئەنجا وتی: لەجێگای خۆتاندا نوێژدا بکەن، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دەکرد بە بانگدەر لەکاتی بارانو سەرمادا کە بڵێ: ألا صلوا فی الرحال ـ لەجێگای خۆتاندا نوێژ بکەن)[٣].

**(٢) ئامادەبونی خواردەمەنی:** (ابن عمر) گێراویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر ئێوارە خوانی ئێوە ئامادەبوو قامەتی نوێژ کرا دەست بە خواردنەکە بکەن، نابێ پەلە بکەن تا نانەکە دەخورێت). ئیبن عومەر خواردنی لەبەردەمدا دادەنراو قامەتی نوێژ دەکرا تا خواردنی تەواو نەکردبایە نەدەچوو، گوێ ی لەخوێندنی پێش نوێژ خوێن دەبوو)[٤].

**(٣) تەنگاوی بە پیسایی و میز هاتن:** عائیشە وتویەتی: (لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: (گەر خواردن ئامادە بوو نوێژ کردن نییە، نە لەکاتێ دا بە پیساییو میز

---

(١) صحیح (ص.جه ٨٢١) (جه ١٠٠٢/٣٢٠/١).

(٢) صحیح (مختصر خ ص١٣٩) (خ ٥٠٤/٥٧٨/١).

(٣) متفق علیه: (خ ٦٦٦/١٥٦/٢ * م(٦٩٧/٤٨٤/١).

(٤) متفق علیه: (خ ٦٧٣/١٥٩/٢) (م ٤٥٩/٣٩٢/١) (د: ٣٧٣٩/٢٢٩/١٠).

تەنگە تاو دەبێت)[١].

**ـ نوێژی رێبوارو سەفەرچی: ( صلاه المسافر )**

کورت کردنەوەی نوێژ لەسەر رێبوارو گەشتیارو سەفەرچی واجبە:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾[٢].

واتە: گەر رۆیشتن بە زەوی دا گوناهتان لەسەر نییە نوێژ کورت بکەنەوە، گەر لەوە ترسان ئەوانەی بێ بڕوان زیانتان لێ بدەن.

(یعلی بن امیە) گێڕاویەوە: (لەراست ئەم ئایەتە لەعومەری کوڕی خەتتابم پرسی: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوەتا خەڵکی ترسیان لەسەر نەماوە. عومەر وتی: منیش ئەوەم وەکو تۆ بەلاوە سەیر بوو، بۆیە لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) پرسی، ئەویش فەرموی: (ئەمە چاکەیەکە خوا لەگەڵی دا کردوونو چاکەکەی پەسەند بکەن)[٣].

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (خوا نوێژی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) فەرز کردووە، لەماڵەوە دا چوار دانەو لەسەفەرو گەشتدا دوو رکەعەتو لەترسدا یەك رکەعەت)[٤].

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (نوێژی رێبوارو سەفەر دوو رکەعەتەو نوێژی هەینی دوو رکەعەتە، نوێژی جەژنی رەمەزانو قوربان دوورکەعەتە بە تەواویو بێ کورت کردنەوە، لەسەر زمانی موحەممەد (ﷺ))[٥].

(عائیشە) گێڕاویەوە: (یەکەمجار کە نوێژ فەرز بوو دوو رکەعەت بوون، نوێژی سەفەر دامەزراو نوێژی ماڵەوە تەواو کرا)[٦].

---

(١) صحيح (ص.ج ٧٥٠٩) م(١/٣٩٣/٥٦٠) (د: ١/١٦٠/٨٩).

(٢) النساء: ١٠١.

(٣) صحيح (ص.ج ٣٧٦٢) م(١/٤٧٨/٦٨٦).

(٤) صحيح (ص.جە ٨٧٦) م(١/٤٧٩/٦٨٧).

(٥) صحيح (ص.جە ٨٧١) نس(٣/١٨٣) جە(١/٣٣٨/١٠٦٣).

(٦) متفق عليه (خ ٢/٥٦٩/١٠٩٠) م(١/٤٧٨/٦٨٥).

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (لەگەشتو ڕێبواریدا هاوڕێی پێغەمبەر (ﷺ) بووم تا وەفاتی کرد، لەدوو ڕکەعەتی پتر نەکرد، هاوڕێیەتی ئەبوبەکرم کرد تا کۆچی دوایی کرد، لەدوو ڕکەعەتی پتر نەکرد، هاوڕێیتی عومەرم کرد تا کۆچی دوایی کرد، لەدووڕکەعەت پتری نەکرد، هاوڕێیەتی عوسمانم کرد لەدوو ڕکەعەت پتری نەکرد تا کۆچی دوایی کرد، خوا فەرمویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[(١)].

## ـ ماوەی کورت کردنەوەی نوێژ:

(زانایان لەدیاری کردنی ماوەکە، کە نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە، ناکۆکی زۆری لەسەر هەیە، تا (ابن المنذر) لەراست ئەم مەسەلەیەدا (٢٠) وتەی هێناوەتەوە، رای لەپێشتر ـ الراجح ـ ئەوەیە: (قەت سنووری بۆ ئەمە نییە، تەنیا سەفەر باسکراوە لەزمانی عەرەبی دا، کە پێغەمبەر (ﷺ) قسەی پێ کردووە، گەر سەفەرەکە سنووری هەبوایە ئەو (ﷺ) بێ ئاگا نەبووە لەدیاری کردنی دا، ئەوانیش لەپرسیار کردن لە پێغەمبەر (ﷺ) بێ ئاگا نەبووە، قەتیش ڕێك نەکەوتون تەرکی گواستنەوەی ماوەکەی بۆ ئێمە بکەن)[(٢)].

## ـ ئەو جێگایەی نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە:

(جەماوەری زانایان یەك دەنگن لەوەدا کە دەبێ گەشتیارو سەفەرچی لەکاتێ دا بۆی هەیە نوێژی کورت بکاتەوە، کە لەسنوورو توخوبی شارو دێهاتەکەی بڕوادەر، ئەمە مەرجێکە، ئەمەش تەواو نابێ تا نەڕواتە یەك ماڵی ئەو شوێنە، (ابن منذر) گێڕاویەوە: (نەمزانیوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەر لەمەدینە نەچووبێتە دەر نوێژی کورت کردبێتەوە، . (انس) دەڵێ: (لەمەدینەدا چوار ڕکەعەتم لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کردوو لە(ذي الحليفة)دا دوو ڕکەعەت)[(٣)].

---

(١) متفق عليه (خ ٦٨٩/٤٧٩/١) (خ ١١٠٢/٥٧٧/٢).

(٢) المحلى: ٥/٢١.

(٣) فقه السنة (١/٢٤١/٢٤٠) وقول أنس رواه خ(٢/٥٦٩/١٠٨٩) م(١/٤٨٠/٦٩٠). مەبەست لەو دوو ڕکەعەتە نوێژی عەسرە، وەکو لەریوایەتی تری غەیری بوخاری هاتووە.

ـ گەر گەشیتارو سەفەرچی بۆ جێبەجێ کردنی پێویستی یەك مایەوەو مەبەستی مانەوە نەبوو تا دەردەچێ کورتیان دەکاتەوە:

(جابر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەتەبوك بیست رۆژ مایەوە نوێژی کورت کردەوە) (١).

(ابن القیم) وتویەتی: (لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) نەیفەرمووە بە ئوممەتەکەی گەر لەمە پتر بمێننەوە نابێ نوێژ کورت بکەنەوە، بەڵکو مانەوەی لەوێ ئەوەندە مایەوە وا رێك کەوتووە) (٢).

گەر مەبەستی بو دوای (١٩) رۆژ بمێنێتەوە ئەوە تەواویان دەکات، وەکو (ابن عباس (ﷺ) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نۆزدە رۆژ مایەوە کورتی کردنەوە، ئێمە گەر نۆزدە رۆژ دەماینەوە کورتمان دەکردنەوە، گەر زیاتر بوایە تەواومان دەکردن) (٣).

## ـ کۆکردنەوەی دوو نوێژ (الجمع بین الصلاتین):

### هۆیەکانی:

**(١)سەفەرو گەشت:** (انس) دەڵێ: گەر پێغەمبەر (ﷺ) بەر لەلادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا گەشتی کردبایە نوێژی نیوەڕۆی بۆ عەسری دوا دەخست، پاشان دادەبەزیو کۆی دەکردنەوە، گەر بەر لەوەی بڕوات خۆر لایدابایە نیوەڕۆی دەکرد ئەنجا سوار دەبوو) (٤).

(معاذ) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەغەزای تەبوکدا، گەر بەر لەزەوالو لادانی خۆر سەفەری کردبایە نیوەڕۆو عەسری پێکەوە دەکردن ئەنجا دەڕۆیشت، گەر بەر لەشێوان رۆیشتبایە شێوانی دوادەخست تا لەگەڵ خەوتنان کۆی دەکردنەوەو دەیکردن، گەر دوای شێوان سەفەری کردبایە خەوتنانی پێش دەخستو لەگەڵ شێوانی دەکرد) (٥).

هەر ئەو گێڕاویەوە: (ئەوان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ساڵی تەبوك دەرچون، پێغەمبەر

---

(١) صحیح (ص ١٠٩٤٠) (١/١٠٢/١٢٢٣).

(٢) فقه السنة (١/٢٤١)

(٣) صحیح (الارواء: ٥٧٥) (خ ٢/٥٦١/١٠٨٠) (ت ٢/٣١/٥٤٧) (د: ١٢١٨/٤/٩٧) ئەو وتویەتی (١٧) رۆژ.

(٤) متفق علیه (خ ٢/٥٨٣/١١١٢) م(١/٤٨٩/٧٠٤).

(٥) صحیح (ص.د ١٠٦٧) (د: ٤/٥/١١٩٦).

(ﷺ) نوێژیـنیوەڕۆو عەسر، شێوانو خـەوتنانی پێکـەوە کۆکردنـەوە، وتـی: ڕۆژەکیـان نوێـژی دواخست، پاشان دەرچوو نیوەڕۆو عەسری پێکەوە کـردن، پاشـان هاتـەوە ژوور، پاشـان دەرچـوو شێوانو خەوتنانی پێکەوە کردن) [١].

**(٢) باران:** (نافع) گێڕاویەوە: (ابن عمر (رضي الله عنه))گەر لەگەڵ میرەکان لەبارانە یکدا کۆدەبنەوە لەنێوان شێوانو خەوتناندا نوێژی کۆدەکرنەوە لەگەڵیاندا) [٢].

(هشام بن عروة) گێڕاویەوە: (عروة)ی باوکیو (سعید بن مسیب)و (ابـابکر بـن عبـدالرحمن بن الحارث بن هشام بن مغیرة المخزومي) لەشەوی باراناوی دا شـێوانو خـەوتنانیان کـۆدەکردەوە لەگەڵ گەورە پیاوانی ئەو سەردەمەداو نکۆڵی یان لەمە نەدەکرد) [٣].

(ابن عبـاس) گێڕاویـەوە: (پێغەمبـەری خـوا نیـوەڕۆو عەسـری پێکـەوە کـردن، شـێوانو خەوتنانیش بە بێ هەبوونی ترسو سەفەر) [٤].

(ابن عباس) (رضي الله عنه) گەڕاوەیتەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێـژی نیـوەڕۆو عەسـر، ئـەنجا شێوانو خەوتنانی لەمەدینەدا پێکەوە کۆکردنەوە، بەبێ بوونی تـرسو بـاران) [٥]. ئـەو هەسـتی دەکرد کە کۆکردنەوە نوێژ بە باران لەسەر دەمی پێغەمبەر (ﷺ) زانـراو بـوو، گـەر نـا لێـرەدا بوونی باران وەکو پاساوێ بۆ کۆکردنەوە بێ مانا دەبوو [٦].

**(٣) بوونی پێویستی یـەکی ناکـاو:** (ابـن عبـاس (رضي الله عنه)) گێڕاویـەوە: (پێغەمبـەر (ﷺ) لەمەدینەدا نیوەڕۆو ئێوارەی پێکەوە کردن بەبێ بوونی ترسو سـەفەر). (ابـو زبـیر) گێڕاویـەوە: لە(سعید)م پرسی بۆچی وای کرد؟ وتی: منیش ئـەم پرسـیارەم لـە(ابـن عبـاس) کـرد، ئـەویش

---

(١) صحيح (ص.د ١٠٦٠) (د: ٤/٧٢/١١٩٤) واخرج مسلم الشطر الأول (م ٧٠٦/٤٩٠/١).

(٢) صحيح (الارواء: ٣/٤٠) ما (١٠٢/٣٢٨).

(٣) صحيح (الارواء: ٣/٤٠) هق(١٦٨، ٣/٢٦٩).

(٤) صحيح (ص.ج ١٠٦٨).

(٥) صحيح (ص.ج ١٠٧٠) م(٧٠٥/٤٨٩/١).

(٦) الألباني لە(الارواء: ٣/٤٠) باسی کردووە.

فەرموی: (اراد الا يحرج احدا مـن امتـه) [١]. واتـە: (ویـستی کـەس لەئوممـەتی تووشـی بێـزاری نەبێت).

هەر ئەو گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەمەدینەدا نوێژی نیـوەڕۆو عەسـر، ئـەنجا شـێوان‌و خەوتنانی پێکەوە کردن بەبێ بوونی ترس‌و باران). لە(ابن عباس) پرسیار کرا مەبەستی چی بـوو لەوە؟ فەرموی: (ویستی ئوممەتی بێزار نەبێت)[٢].

(النووی) لە(شرح مسلم)دا (٢/٢١٩)دا دەڵێ: (کۆمـەڵێ زانـا بـۆ ئـەوە چـوون کـە نوێـژ کۆکردنەوە (جەمع) لەماڵەوەشدا بۆ پێویستی بۆ کەسـێ دروسـتە، کـە نـەیکردووە بـە نـەریت، ئەمەش قسەی (ابن سيرين)و (اشـهب) لـەیارانی (مالـك). (الخطـابي) لـە(القفـال)و (الـشاشی الكبير) لەیارانی (الشافعي) لە(ابـي اسـحاق المـروزي) گێڕاویانـەوە، ئـەویش لەکۆمـەڵێ یـارانی فەرمودەوە گێڕاویەوە، (ابن المنـذر) ئەوەی هەڵبژاردووە، ئەمەش قسەی (ابن عباس) پشت ڕاست دەکاتەوە: (اراد الا يحرج امته). لێرەدا بە نەخۆشی‌و هـیچ شـتەکی تریـەوە نەبەسـتۆتەوە. خـوا دەزانێت).

(١) ڕابردوو باسکرا.

(٢) ڕابردوو باسکرا.

# نوێژی هەینی (الجمعة)

ئامادەبوون بۆ نوێژی هەینی لەسەر هەموو موسڵمانێك فەرزی عەینە تەنیا پێنج کەسی لێ بڕواتە دەر: کۆیلە، ژن، منداڵ، نەخۆش، گەشتیارو ڕێبوار. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[١]. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە کاتێ ا بۆ نوێژبانگدر لەڕۆژی هەینی بە پەلە بەرەو یادی خوا بڕۆنو دەست لەکڕینو فرۆشتن هەڵبگرن، ئا ئەوە بۆ ئێوە چاکترە گەر ئێوە بزانن.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (نوێژی هەینی حەقێکی واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێ بە کۆمەڵ تەنیا چوار کەس نەبێ: کۆیلەو ژنو منداڵو نەخۆش) [٢]. (ابن عمر) دەڵێ: (لەسەر گەشتیارو سەفەرچی نوێژی هەینی نییە).

## هاندان بۆ ئەنجامدانی:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ خۆی بشوات پاشان بێتە نوێژی هەینیو ئەوەندەی بۆی دانراوە نوێژی کرد، پاشان بێ دەنگ بوو تا وتار بێژ وتاری خۆی دەخوێنێتەوە، پاشان نوێژی لەگەڵدا دەکات، ئەو کاتە خودا لەگوناهەکانی نێوان ئەم هەینیو هەینی یەکەی تری خۆش دەبێو چاکەی سێ ڕۆژیش زیاتر بەئەو دەدات) [٣].

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (پێنج نوێژەکانو لەهەینی یەوە بۆ هەینیو ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان خودا لەگوناهەکانی نێوانیان خۆش دەبی، مادام لەگوناهە گەورەکان خۆی چەپاڵە بدات)[٤].

---

(١) الجمعة: ٩.

(٢) صحيح (ص.د ٩٤٢). (ص.ج ٣١١١) د(١٠٥٤/٣٩٤/٣).

(٣) صحيح (ص.ج ٦٠٦٢) م(٨٥٧/٥٨٧/٢).

(٤) صحيح (ص.ج ٣٨٧٥) م(٢٣٣/١٦ ـ ٢٠٩/١) (ت ٢١٤/١٣٨/١).

## هۆشیاری دان لەکەمتەرخەمی کردن لیٚ ی:

(ابن عمر)و (ابو هريره) گێڕاویانەوە لەپێغەمبەری خوامان (ﷺ) بیست لەسەر تەختەکانی مینبەرەکەی: (ئەو کەسانەی وازیان لەنوێژی هەینی هێناوە، یان دەبێ دەست هەڵگرن، یان خودا دڵیان مۆر دەکات، یان لەو کەسانە دەبن، کە بێ ئاگان) [١].

(عبدالله) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) بە گەلێکی فەرموو کە لەهەینی دوا دەکەوتن: (بێگومان ویستم فەرمان بە پیاوێ بکەم نوێژ بۆ خەڵکی بکات، پاشانماڵی ئەو کەسانە ئاگر بدەم کە لەهەینی دوا دەکەون) [٢].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ وەکو کەمتەرخەمی لەسێ هەینی یان دوا بکەوێ خوا دڵی مۆر کردووە) [٣].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ سێ هەینی بەبێ هەبوونی پاساو بچوێنێ خودا لەپێڕی دوو روەکانی دەکات) [٤].

## کاتەکەی:

کاتەکەی نیوەڕۆیەو بەر لەمەش دروست دەبێت.

(أنس) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی هەینی دەکرد، خۆر لایدەدا) [٥].

(جابر بن عبدالله) گێڕاویەوە: پرسیاری لێ کرا کەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەکرد؟ فەرموی: (نوێژی دەکرد پاشان دەچووینە لای وشترەکانمان لەکاتی لادانی خۆر ـ زوال الشمس ـ تاوەکو پشوو بدەن) [٦].

---

(١) صحيح (ص.ج ٥٤٨٠) م(٨٦٥/٥٩١/٢).

(٢) صحيح (ص.ج ٦١٤٤) طب(٤٢٢/١٧٠/١).

(٣) حسن صحيح (ص ٩٢٣٠) د(١٠٣٩/٣٧٧/٣).

(٤) صحيح (ص.ج ٦١٤٤) طب (٤٢٢/١٧٠/١).

(٥) صحيح (ص.د ٩٦٠) خ(٩٠٤/٣٨٦/٢).

(٦) صحيح (الارواء /٥٩٧) م(٨٥٨ ـ ٢٩ /٥٨٨/٢).

## وتار (الخطبة):

واجبە، چونکە هەرگیز پێغەمبەر (ﷺ) جارێ نەبووە نەیخوێنێ، دیسان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (چۆنتان من بینیووە ئاوا نوێژ بکەن) (١).

## ڕێنوێنی پێغەمبەر (ﷺ) لەوتاردا:

پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: (درێژی نوێژی پیاوو کورتی وتارەکەی نیشانەیەکە لەفیقهی ئەو، نوێژ درێژ بکەنو وتار کورت بکەنەوە، بێگومان لەبەیاندا سەرنج ڕاکێشان هەیە ـ ان من البیان لسحرا ـ) (٢).

(جابر) گێڕاویەوە: (من لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژەکانم دەکردن، نوێژەکەی مام ناوەند بوو، وتارەکەشی مام ناوەند بوو) (٣).

جابر (رضي الله عنه) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەدا چاوی سوور دەبوونەوەو دەنگی بەرز دەکردەوەو زۆر توڕە دەبوو، وەکو بڵێ ی ئاگاداری دەر هاتنی سوپایەکە دەڵێ: بەیانی یان ئێوارە دێت) (٤).

## وتاری پێویستی (خطبة الحاجة) (*):

پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتارو ئامۆژگاریەکانیو وانەکانی بەم وتارە دەست پێ دەکرد، کە بە وتاری (الحاجة) ناسراوەو ئەمەش دەقەکەیەتی (٥):

(ان الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له واشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له،

---

(١)(الارواء /٢٦٢) (خ ٦٣١/ ٢/١١١).

(٢) صحيح (ج.د ٢١٠٠) (الارواء ٦١٨) (م ٢/٥٩٤/٨٦٩).

(٣) صحيح (ص.ت ٤١٨) م(٢/٥٩١/٨٨٦).

(٤) صحيح (ص.ج ٤٧١١) (الارواء : ٦١١) م(٢/٥٩١/٨٦٦).

(*) تێبینی: وتار واچاکە لە (٢٠) خولەك کەمتر نەبێ لەنیو کاتژمێر پتر نەبێت.

(٥) صحيح (ص. نس ١٣٣١) (م ٢/٥٩٢/٤٦٧).

واشهد ان محمدا عبده ورسوله. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾[1]. ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾[2]. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾[3]. اما بعد، فان اصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشرّ الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعه وكل بدعه ضلالة وكل ضلالة في النار).

(هه‌ر كه‌سێ سه‌رنجی وتاری پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)، وتاری یارانی ده‌دات ده‌بینی به‌یانی ڕێنوێنیو یه‌كتاپه‌رستیو ناوی سیفاته‌كانی په‌روه‌ردگاری مه‌زنیانو بنه‌ما گشتی یه‌كانی بڕواو بانگه‌وازی به‌ره‌و خوا، فه‌رمان كردن به‌ یادی ئه‌وو سوپاسی ئه‌و، كه‌لای خوا خۆشه‌ویستو ده‌سته‌ به‌ر ده‌كات، باسی گه‌وره‌یی خوداو سیفه‌ته‌كانیو ناوه‌كانی ده‌كات، كه‌ لای خه‌ڵكی خۆشه‌ویستی ده‌كه‌ن، فه‌رمان به‌ گوێڕایه‌ڵیو سوپاسو زیكری ئه‌و ده‌كات، كه‌ وایان لێ ده‌كات لای ئه‌و خۆشه‌ویستو دلۆڤان بن، ئه‌نجا گوێگره‌كان ده‌ڕۆن كه‌ خوایان خۆش ویستووه‌و ئه‌وانیش خوایان خۆش ویستووه‌. پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) وتاری زۆری به‌ قورئانو سوره‌تی (ق) [4]داوه‌. (ام هشام بنت الحرث بن النعمان) وتویه‌تی: (ئه‌م سوره‌ته‌م ته‌نیا له‌ده‌می پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ (ﷺ) ده‌رخ كردووه‌ كه‌ له‌سه‌ر مینبه‌ر وتاری پێ ده‌دا) [5].

## واجبه‌ له‌كاتی وتارداندا بێ ده‌نگی بپارێزرێو قسه‌كردن حه‌رامه‌:

پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمویه‌تی: (گه‌ر له‌ كاتی وتاری هه‌ینی دا به‌ هاوڕێ كه‌ت وت: بێ ده‌نگ به‌، ئه‌وه‌ قسه‌ی به‌تاڵ كردووه‌)[6].

---

(١) آل عمران: ١٠٢.

(٢) النساء: ١.

(٣) الأحزاب: ٧٠ ـ ٧١.

(٤) زاد المعاد (١/١٦).

(٥) متفق عليه: خ(٩٣٤/٤١٤/٢) م(٢/٥٨٢/٨٥١).

(٦) صحيح (ص.جه ٩١٤) جه(١/٣٥٦/١١١٠).

## بەچی بە نوێژی هەینی رادەگەیت؟

نوێژی هەینی دوو رکەعەتە بە کۆمەڵ(جەماعەت) دەکرێ، کێ لەجەماعەت دوا بکەوێ، کە هەینی لەسەر نییە، یان پاساوی هەبوو ئەوە دەبێ چوار رکەعەتی نیوەڕۆ بکات، کێ بەیەك رکەعەتی پێش نوێژ خوێن بگات ئەوە بە هەینی راگەیشتووە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ بەیەك رکەعەتی نوێژی هەینی رابگات ئەوە بە نوێژەکە راگەیشتووە)[١].

## نوێژ بەر لەهەینیو دوای هەینی:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ لەرۆژی هەینی دا خۆی بشوات، پاشان بێتە هەینیو ئەوەندەی لەچارەی نوسرابوو نوێژی کرد، پاشان بێ دەنگ بوو تا وتار تەواودەبێ، دواتر نوێژی کرد، نێوان ئەم هەینیو تا هەینی تر خوا لێ ی بوراوەو، سێ رۆژیشی لێ زیاد کردووە)[٢].

کێ بەر لەهەینی هات بابێ شومار نوێژ بکات، تا پێش نوێژ خوێن دەردەچێ، بەڵام ئەوەی ئیمڕۆ بە (سوننەتی هەینی) ناوزەد دەکرێ هیچ بنەمایەکی نییە، شتەکی زانراوە(پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ بیلال بانگی تەواو دەکرد دەستی بە وتار دەکردو کەس هەڵنەدەستا دوو رکەعەت نوێژ بکات، تەنیا یەك بانگ هەبو، ئەی کەی سوننەتیان کردووە؟ بەڵام دوای هەینی گەر مەبەستی بایە چوار یان دوو رکەعەتی کردووە. (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ نوێژی هەینی کرد، با چوار رکەعەتی بە دوادا بکات)[٣]. (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) دوای هەینی نوێژی نەدەکرد تا دەڕۆیشت لەماڵەوە دوو رکەعەتی دەکردن)[٤].

## نەریتی هەینی:

**سوننەتە هەر کەس نوێژی هەینی دەکات، کار بەم فەرمودانە بکات:**

(سەلمانی فارسی (رضي الله عنه)) فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

---

(١) صحيح (الارواء ٦٢٢) (ص.ج ٥٩٩٩) (نس ٣/١١٢) (جه ١/٣٦٥/١١٢١).

(٢) صحيح (ص.ج ٢/٥٨٧/٦٠٦٢).

(٣) زاد المعاد/١/١١٨).

(٤) صحيح (الارواء ٦٢٠) (م ٢/٦٠٠/٨٨٢).

(هەر پیاوێ لەهەینی دا خۆی پوختە بشوات‌و ئەوەندەی توانی پاکژی کردو خۆی چەور کردیا لەبۆن‌و بەرامەی ماڵەوە خۆی بۆن خۆشکرد، پاشان دەرچوو کەلێنی نەخستە نێوان دوو کەسەوە، پاشان ئەوەندەی نوێژ کرد کە بۆی نوسرابوو، گەر پێش نوێژ خوێن قسەی کرد ئەو بێ دەنگ بوو، مسۆگەر خوا لەنێوان ئەم هەینی‌و هەینیەکی تر چاوپۆشی لێ دەکات) (١).

لە(ابي سعيد الخدري ـ ر ـ)ەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەس رۆژی هەینی خۆی بشوات‌و جل‌و بەرگی جوانی خۆی پۆشتە بکات، گەر بۆنی خۆشی هەبوو لەخۆی دا، پاشان هات‌و بەسەر ملی خەڵکی دا بازی نەدا، پاشان ئەوەندەی خوا بۆی نوسی بوو نوێژی کرد، پاشان گەر پێش نوێژ خوێنەکەی وتار نوێژی تەواو دەکرد ئەو دەنگی لەبەر نەهات، ئەوە دەبێتە شورینەوەی گوناهی نێوان ئەم هەینی یەو هەینی یە کەی پێش ئەو)(٢).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر رۆژی هەینی هات لەسەر هەموو دەرگاکانی مزگەوت فریشتە هەیە، ناوی خەڵکی بە پێی ئاستی خۆیان دەنوسن، ئەوەی یەکەم کەس بێ ئەوە یەکەمە، گەر پێش نوێژ خوێن دانیشت پەڕەکە لوول دەدەنەوە، دێن گوێ لەیاد دەگرن، نمونەی ئەو کەسەی لەیەکەم سەروبەری کاتی خۆی دادێ (بۆ مزگەوت) وەکو ئەوە وایە وشترەکی کردبێ بەخێر، پاشان ئەوەی دوای ئەو وەکو ئەو کەسەیە مانگایەکی کردبێ بەخێر، پاشان ئەوەی دوای ئەو وەکو ئەوە وایە بەرانەکی کرد بێ بەخێر، پاشان ئەوەی دوای ئەو کەسەیە مریشکەکی کردبێ بەخێر، پاشان ئەوەی دوای ئەو وەکو ئەوە وایە هێلکەکی کردبێ بەخێر) (٣).

## ئەو دوعاو پاڕانەوەو زیکرانەی لەرۆژی هەینی سوننەتن:

### (١): سەلەوات‌و سەلامدانی زۆر لەسەر پێغەمبەر (ﷺ):

(اوس بن اوس) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (چاکترین رۆژانی ئێوە رۆژی هەینی یە، لەو رۆژەدا ئادەم دروستکراوە، لەو رۆژەدا گیانی کێشراوە، لەو رۆژەدا نەفخی سوور

(١) صحيح (ص. ٧٧٣٦) خ(٨٨٣/٣٧٠/٢).
(٢) صحيح (ص.ج ٦٠٦٦) د(٣٣٩/٧/٢).
(٣) صحيح (ص.ج ٧٧٥) م(٨٥٠/٥٨٧/٢). نس(٩٨/٣).

لێ دەدرێ، دەنگە گەورەکە (الصعقة) لەورۆژەدایە، ئێوە زۆر سەڵەوات لەمن بدەن تێ یدا، سەڵەواتی ئێوە پیشانی من دەدرێت. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەر بویەوە خۆڵو ئێسقانی ڕزیو چۆن سەڵەواتی ئێمەت پێ دەگات؟ فەرموی: خوای گەورە حەرامی کردووە زەوی جەستەی پێغەمبەران بخوات) [١].

**(٢): خوێندنی سورەتی کەهف:**

(ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەس سورەتی کەهف لەهەینی دا بخوێنێ، خوا نێوانی ئەو دوو هەینی یەی بۆ دەکات بە روناکی) [٢].

**(٣): زۆر پاڕانەوە بەڵکو لەگەڵ دەمو ساتی قبوڵ بوونەکە دا ڕێك بکەوێت:**

(ﷺ) فەرمویەتی: (هەینی دوانزە سەعاتە، مرۆڤی موسڵمان هەر داواکاری یەك بکات تێ یدا لەخوای گەورەی مسۆگەر پێ ی دەبەخشێ، دوا سەعاتی دوای نوێژی عەسر بە دەستی بێنن) [٣].

## لەو مزگەوتەدا هەینی تێ دا بکرێت (الجامع):

عائیشە گێڕاویەوە: (خەڵکی لەهەینی دا لە ـ العوالي ـ دەهاتنە خوار) [٤].

(الزهري) گێڕاویەوە: (خەڵکی ـ ذي الحليفة ـ لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کۆدەبوونەوە، ئەمەش لەدووری شەش میل لەمەدینەوە) [٥].

(عطاء بن ابي رباح) وتویەتی: (خەڵکی مینا لەهەینی دا لەمەککە ئامادە دەبوون) [٦].

(الحافظ) لە(تلخيص)دا (٢/٥٥) دا وتویەتی: (لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) نەگەڕاوەتەوە ڕێگای بە کەسێ دابێ لەهیچ کامێ لەمزگەوتەکانی مەدینەداو گوندەکانی دەوری نزیکی دا هەینی

---

(١) صحيح (ص.جه ٧٨٨٩) د(١٠٣٤/٣٧٠/٣).

(٢) صحيح الارواء: ٦٢٦.

(٣) صحيح (رواه ابو داود والنسائي و الحاكم).

(٤) متفق عليه (د ١٠٤٢/٣٨٠/٣). ئەمە کورتەکەیەو بەشێکە لەدرێژەی (خ ٩٠٢/٣٨٥/٢) (م ٨٤٧/٥٨١/٢).

(٥) هق: ٣/١٧٥.

(٦) هق: ٣/١٧٥.

بکات).

## پێکەوەکردنی نوێژی هەینیو جەژن لەیەك ڕۆژدا[١]:

گەر هەینیو جەژن کەوتنە یەك ڕۆژەوە، هەر کەسێ نوێژی جەژنی کرد ئەوە نوێژی هەینی لەسەر لادەکەوێت.

(زید بن ارقم) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی جەژنی کرد، پاشان روخسەتی لەهەینی دا وتی: کێ ویستی نوێژ بکات با نوێژ بکات)[٢].

سوننەتە پێش نوێژ خوێن هەینی بکات بۆ کەسێ بیەوێ بیکات بۆ ئەوانەی ئامادەی نوێژی جەژن نەبوون:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لەم ڕۆژەی دوو جەژن پێکەوە کۆبوونەوە، کێ ویستی هەینی کیفایەتە، ئێمە کۆدەبینەوە ـ بۆ هەینی ـ)[٣].

---

(١) فقه السنة: ١/٢٦٧).

(٢) صحيح (ص.جه ١٠٨٢) د(٣/٤٠٧/١٠٥٧).

(٣) صحيح (ص.جه ١٠٨٣) د(٣/٤١٠/١٠٦٠) (جه ١/٤١٦/١٣١١).

# نوێژی هەردوو جەژنەکان

**حوکمەکەی:**

نوێژی هەردوو جەژنەکان لەسەر پیاوو ژنان واجبە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەوامی لەسەر کردووەو فەرمانی داوە لەم رۆژەدا بچنە دەرەوە. (ام عطية) دەڵێ: (فەرمانمان پێ درا کچانی تازە پێ گەیشتو ناو پەردە بێنە دەرەوە) [1].

(حفصة بنت سيرين) گێڕاویەوە: (نەمان دەهێشت کەنیزەکانمان لەرۆژی هەینی دا دەربچن، ژنێ هات چووە کۆشکی بەنی خەلەف، منیش چوومە لای، گێڕایەوە، کە مێردی خوشکەکەی لە(١٢) غەزادا بەشداری کردووە، خوشکەکەی لەشەش غەزادا بەشداری کردووە، ئەنجا وتی: ئێمە بەسەر نەخۆشەکاندا دەگەڕاینو برینەکانمان دەرمان دەکردن، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئایا گەر یەکێ لەئێمە پۆشتەی نەبێ کێشە هەیە کە دەرنەچێ؟ فەرمووی: با دەستە خوشکەکەی جلی بداتێ و بەشداری خێرو دوعای بڕواداران بکات) [2].

**کاتەکەی:**

(يزيد بن خمير الرحيي) گێڕاویەوە: (عبدالله بن بسر) هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) لەجەژنی رەمەزان یان قوربانی چووە دەر لەگەڵ خەڵکی داوگلەیی لەدواکەوتنی پێش نوێژ خوێنی کرد، وتی: (جاران لەم دەمەدا نوێژی جەژنمان تەواو کردبوو، ئەمە کاتی نوێژی سوننەتە) [3].

**- چوون بۆ شوێنی نوێژ:**

لەفەرمودەکانی رابردوودا دەزانرێ کە شوێنی نوێژی جەژن دەشتە نەك مزگەوت، پێغەمبەر (ﷺ) دەچووە ئەوێو دوای پێغەمبەریش کار بەمە کراوە.

---

(١) صحيح (ص.د (١٠٠٥) د(٣/٤٨٦/١١٢٣).

(٢) متفق عليه (المشكاة ١٤٣١) خ(٢/٤٦٩/٩٨٠).

(٣) صحيح (ص.د ١٠٠٥) (د: ٣/٤٨٦/١١٢٣).

## ـ ئایا بانگو قامەتی تێدایە؟

(جابر (ﷺ))و (ابن عباس (ﷺ)) گێڕاویانەوە: (نــە لەجــەژنی رەمەزانــداو نــە لەجــەژنی قورباندا بانگ نادرێت)[١].

## چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژی جەژن:

نوێژی جەژن دوو رکەعەتە، دوانزە (الله اکبر)ی تێدا دەدرێ، (٧) دانە لەرکەعەتی یەکەمدا دوای (الله اکبر)ی ئیحرامو (٥)دانە لەرکەعەتی دووەمدا بەر لەخوێندنی فاتیحــەدا: (عمــرو بــن شعیب) لەباوکی گێڕاویــەوە: (پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) لەهــەردوو جەژنەکــەدا ـ الله اکـبر ـ ی فەرموو، (٧)یان لەرکەعەتی یەکەمداو (٥) یان لەرکەعەتی دووەمدا)[٢].

عائیشە(رضي الله عنها) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنوێــژی جــەژنی رەمــەزانو قوربان (٧)و (٥) دانە (الله اکبر)ی کرد جگە لە(الله اکبر)ی ئیحرام) [٣].

## خوێندن تێ یدا:

(نعمان بن بشیر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەردوو جــەژنو هــەینی دا ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾و ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ی دەخوێند) [٤].

(عبیدالله بن عبدالله) گێڕاویەوە: (عومەر لەجەژندا دەرچوو، بە شوێن (ابی واقد اللیثي)دا نارد پرسیاری لێ کرد: پێغەمبەر (ﷺ) لەم رۆژەدا چی دەخوێند؟ وتی: (ق) و(اقترب)) [٥].

---

(١) متفق علیه (خ ٩٦٠/٢/٤٥١) م(٨٨٦/٢/٦٠٤).

(٢) صحیح (ص.جه ١٠٥٧) (جه ١٢٧٩/١/٤٠٧).

(٣) صحیح (الارواء: ٦٣٩) (ص.جه ١٠٨٥) (جه ١٢٨٠/١/٤٠٧).

(٤) صحیح (الارواء: ٦٤٤) (ص.جه ١٢٨١) م(٨٧٨/٢/٥٩٨).

(٥) صحیح الارواء: ج٣: ١١٨) (ج ١٢٨٢/١/٤٠٨) نس(٣/١٨٣).

**وتار دوای نوێژ:**

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (من لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبوبەکرو عومەرو عوسماندا جەژنم کرد هەموویان بەر لەوتارەکە نوێژیان دەکرد) [1].

**نوێژ بەر لەنوێژی جەژن و دوای ئەوە:**

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر(ﷺ) رۆژی جەژنی رەمەزان دوو رکەعەتی کردن، بەر لەمەو دوای ئەمە نوێژی نەکردووە) [2].

**ئەوەی لەرۆژی جەژندا سوننەتە:**

**(١) خۆشوشتن:** دەربارەی غوسل لەعەلی (رضي الله عنه) پرسیار کرا؟ فەرموی: (رۆژی هەینی و رۆژی عەرەفەو رۆژی جەژنی رەمەزان و رۆژی جەژنی قوربان) [3].

**(٢) پۆشینی باشترین و جوانترین جل و بەرگ:** (ابن عباس (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەرۆژی جەژندا عەبایەکی سووری دەپۆشی) [4].

**(٣) خواردن لەجەژنی رەمەزاندا بەر لەدەرچوون لەماڵ:** (انس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) بەیانی دەرنەدەچوو بۆ نوێژی جەژن تا چەند دانکە خورماو قەسپێکی نەخواردبایە) [5].

**(٤) دواخستنی خواردن لەرۆژی جەژنی قوربانی دا تا نوێژی جەژنی لەقوربانیەکەی دەخوات:**

(ابي بريدة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەرۆژی جەژنی رەمەزان نەدەچووە دەر تا خواردنی نەخواردبایە، وە لەقوربانی دا نانی نەدەخوارد تا قوربانی نەکردبایە) [6].

---

(١) صحيح: خ(٢/٤٥٣/٩٦٢) م(٢/٦٠٣/٨٨٤).

(٢) متفق عليه: خ(٢/٤٥٣/٩٦٤) م(٦٠٦٢/٨٨٤).

(٣) رابردو باسکرا.

(٤) اسناده جيد(الصحيحة: ١٢٧٩) قال الهيثمي في جكع الزوائد (٢/٢٠١). رواه الطبراني في الأوسط ورجاله ثقات.

(٥) صحيح (ص. ت٤٨٨) (ت ٢/٣٧/٥٤١).

(٦) صحيح (ص.ت ٤٤٧) (ت:٢/٢٧/٥٤٠). لای ئەو: (حتى يصلي) هاتووە.

**(٥) رێ گۆڕین:** (جابر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەجەژناندا رێگا گۆڕی دەکرد)[١].

**(٦) وتنی (الله اکبر) لەهەردوو جەژنەکاندا:** خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿لِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[٢]. واتە: تا ماوەکە تەواو بکەنو ـ الله اکبر ـ بڵێن لەسەرئەوەی رێنومای کردوونو بۆ ئەوەی سوپاسو ستایشی بکەن. ئەمەیان لەجەژنی رەمەزاندا.

بۆ جەژنی قوربان خوا فەرمویەتی: ﴿وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ﴾[٣]. واتە: یادی خوا بکەن لەرۆژە دیاریکراوەکاندا. ﴿كَذَلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَبَشِّرِ الْمُحْسِنِينَ﴾[٤].

واتە: هەروەها بۆی رام کردن، تا ـ الله اکبر ـ بکەن لەسەر ئەوەی رێنومای کردون.

## کاتی وتنی (الله اکبر) لەجەژنی رەمەزاندا لەو کاتەوەیە تا دەڕواتە شوێنی نوێژ تا نوێژ دەکات:

(ابن شیبە) گێڕاویەوە لە(الزهری): (پێغەمبەری خوا (ﷺ) رۆژی جەژنی رەمەزان دەردەچوو ـ الله اکبر ـ ی دەوت تا دەهاتە شوێنی نوێژو تا نوێژی تەواو دەکرد، کاتێ نوێژی تەواو دەکرد ـ الله اکبر ـ ی نەدەگوت)[٥].

(الألباني) دەڵێ[٦].: (ئەمە سەنەدەکەی ـ صحیح ـەو ـ مرسل ـ ە لە روویەکی ترەوە لە ـ ابن عمر ـ ەوە هاتووە بە (مرفوع)ی، (البیهقی/٣/٢٧٩)دا گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەرۆژی هەردوو جەژنەکاندا لەگەڵ (الفضل بن عباس)و (عبدالله بن عباس)و (علی)و(الحسن)و (الحسین)و (اسامە بن زید)و (زید بن حارثة)و (ایمن بن ام ایمن) رەزای خوایان لێ بێ، دەردەچووە دەرەوە بە (لا الە الا الله)و (الله اکبر) دەنگی بەرز دەکردەوە، رێگای ئاسەواری پێڵاوەکانی

---

(١) صحیح (خ٩٨٦/٤٧٢/٢).

(٢) البقرة: ١٨٥.

(٣) البقرة: ٢٠٣.

(٤) الحج: ٣٧.

(٥) صحیح (الصحیحة) ١٧١) (١٦٤/٢).

(٦) الارواء: (١٢٣/٣).

دەگرێت تا دەگاتە شوێنی نوێژی، کاتێ نوێژی تەواو کرد گەڕایەوە سەر ئاسەواری پێڵاوەکانی تاوەکو گەڕایەوە ماڵەوە). (البیهقي) دەڵێ: (هذا امثل من الوجه المتقدم).

(الألباني) دەڵێ: (پیاوەکانی هی ـ مسلم ـ ەو بڕوا پێ کراون، جگە لە(عبدالله بن عمر) کە (العمری المکبر)ە لای (الذهبي) راستگۆیەو لەدەرخدا ناتەواوی هەیە. ئەوو کەسانی تر هێمای پیاوانی (مسلم) یان بۆ کردووەو، نمونەی ئەو دەکرێ بە شاهیدو شاهیدەکی باشە بۆ (الزهري) کە (مرسل)ە فەرمودەکە لای من (صحیح)ە بە (موقوف)و بە(مرفوع). خوا دەزانێت. (کۆتایی).

## کاتی وتنی (الله اکبر) لەجەژنی قوربانی دا لەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوەیە، تا دوا ڕۆژانی (التشریق)،

ئەمە راستە لەپێشەوا عەلی (س)و (ابن عباس)و (ابن مسعود)ەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ)[1].

بەڵام بۆ شێوازی (الله اکبر) وتن مەسەلەکە فراوانە، لە(ابن مسعود)ەوە دوو جار وتنی (الله اکبر) سەلماوە، کە لەرۆژانی جەژندا واتە: (وتنی، الله اکبر، الله اکبر، لا اله الا الله، الله اکبر، الله اکبر، ولله الحمد)ی کردووە. (ابن شیبە) گێڕاویەوەو (اسناد)ەکەی (صحیح)ە. بەڵام (البیهقی) بە سێ کردنی (الله اکبر) گێڕاویەوە (٣/٣١٥)، لە(یحیی بن سعید)ەوە کە (ابن فروح ابوبکار)ە، ئەویش لە(عکرمە)ەوە، ئەویش لە(ابن عباس) گێڕاویەوە کە سێ جار (الله اکبر)ی گوتووەو سەنەدی ئەمەش هەر (صحیح)ە[2].

---

(١) لە(ابن شیبة) گێڕاویەوە (٢/١٦٥) بە دو ڕێگا، یەکێکیان (جید)ەو لە روانگەوە (البیهقي) گێڕاویەوە (٣/٣١٤). پاشان وەکو ئەو لە(ابن عباس) گێڕاویەوەو (سند)ی (صحیح)ەو (حاکم) بە هەمان شێوە لە(ابن مسعود)ی گێڕاوەتەوە. بڕوانە (الارواء).

(٢) الارواء: ٣/١٢٥.

# نوێژی ترس ( صلاة الخوف )

خوا فەرمویەتی: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ [١]. واتە: کاتێ تۆ لەناویاندابوویت، نوێژت بۆ کردن، با دەستەیەك لەوانەی لەگەڵ تۆدان هەڵسن چەکەکانیان هەڵبگرن، گەر کورنوشیان برد با ئەوان لەدوای ئێوەوە بن، با دەستەیەکی تر بێن کە نوێژیان نەکردووە، با نوێژ بکەن لەگەڵ تۆداو وریا بن‌و چەکیان هەڵبگرن.

## سیفەتی ئەم نوێژە:

(الخطابي) گێڕاویەوە: (نوێژی ترس چەند جۆرێکەو پێغەمبەر (ﷺ) لەرۆژانی جیا جیا دا کردوونی‌و بە شێوەی جیا جیا ئەنجامی داون، ڕەچاوی ئەوە کراوە کام شێوازە بۆ نوێژ باشترەو بۆ پاسەوانی کردن تەواو ترە، ئەو شێوازانە بە پێ ی جیاوازییان لەشێوەدا لەمانادا وەکو یەکن)[٢].

(١): (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی ترسی یەك رکەعەت بە یەکێ لەو دوو کۆمەڵە کرد، کۆمەڵەکەی تر بەرەو رووی دوژمن وەستا بوون، پاشان رۆیشتن‌و چوونە جێگای ئەو یارانەیان کە بەرەو رووی دوژمن وەستا بوون، ئەنجا ئەوان هاتن، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی پێ کردن یەك رکەعەت، دوایی پێغەمبەر (ﷺ) سەلامی دایەوە، ئەنجا ئەمان رکەعەتێك‌و ئەوان رکەعەتێکیان کرد) [٣].

(٢): (سهل بن ابي حثمة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی ترس دا نوێژی بە یارانی کردو بە دوای خۆیدا کردنی بە دوو ریز، ئەوانەی لەدوای ئەودا وەستابوون رکەعەتێکی پێ یان کرد، پاشان هەڵساوە، هەر وەستاو مایەوە، تا ئەوانەی لەدوای ئەوانەوەن رکەعەتێکیان کرد، ئەنجا هاتنە پێش‌و، ئەوانەی پێش ئەوان چوونە دواوەو رکەعەتێکی پێیان کرد، پاشان

---

(١) النساء: ١٠٢.

(٢) شرح مسلم للنووي (٦/١٢٦).

(٣) متفق عليه: م(١/٥٧٥/٨٤١) خ(٧/٤٢٢/٤١٣١).

دانیشت تا ئەوانەی دواکەوتن رکەعەتێکیان کرد، ئەنجا سەلامی دایەوە)[(١)].

(٣): (جابر بن عبدالله (ﷺ)) گێڕاویەوە: (لەگەڵ پێغەمبەری خـوادا (ﷺ) نوێـژی ترسـم بینی، بووینە دوو ریز: پۆلێ لەدوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) بووین، دوژمـن کـەوتبۆ نێـوان ئێمـەو قیبلەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بۆ نوێژ دابەستن (الله اکبر)ی کردو ئێمەش هەموومان (الله اکبر) مان کرد، پاشان لەرکوع سەری بەرز کردەوە، ئێمەش سەرمان بەرز کردەوە، دوای خـۆی بـۆ کوڕنـوش شۆڕکردەوە، پۆلی دوای ئەویش بە هەمان شێوە، هەرچی پۆلی دوای ئەوان بو بەرەو رووی دوژمن وەستا بوون، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کوڕنوشەکەی بەرێ کرد، ئەو پۆلەی دوای ئـەو دێ هەڵـسا، پۆلی دواوە کوڕنوشیان بردو هەڵسانەوە، پاشان پۆلی دواوە چـوو پـێش و پـۆلی پێـشەوە چـوونە دواوە، دوایی پێغەمبەر (ﷺ) رکوعی بردو ئێمەش هـەموومان رکوعمـان بـرد، پاشـان سـەری لەرکوع بەرزکردەوەو ئێمەش سەرمان بەرزکردەوە، دوایی خـۆی بـۆ کوڕنـوش شـۆڕکردەوە پـۆلی دوای ئەویش بە دوای ئەودا، کە لەرکەعەتی یەکەمـدا لـەدواوە بـون، پـۆلی دواوە بـەرەو رووی دوژمن چون، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوڕنوشی تەواو کـردو پـۆلی دوای ئـەویش بـە دوای ئەودا، پۆلی دواوە بۆ کوڕنـوش شـۆڕبونەوە، ئـەنجا کوڕنوشـیان بـرد، پاشـان پێغەمبـەر (ﷺ) سەلامی دایەوە، ئێمەش هەمووومان سەلاممان دایەوە)[(٢)].

---

(١) متفق علیه (م ١/٥٧٥/٨٤١) (خ: ٧/٤٢٢/٤١٣١).

(٢) صحیح مسلم (١/٥٧٤/٨٤٠) (ص.ن ١٤٥٦) (نس ٣/١٧٥).

# باسی تەرم (كتاب الجنائز)[١]

ئەو کەسەی لەموسڵمانان دەکەوێتە سەرە مەرگو گیانەڵاوە سوننەتە خزمانی وشەی (شەهادە)ی پێ ڕابگەیێنن کە بیڵێت:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لقنوا موتاكم لا اله الا الله)[٢].

واتە: (لا اله الا الله) تەلقینی مردوەکانتان بکەن. بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە پێ گوتنی شەهادە بەو کەسەی لەگیانەڵادایە، شایەد لا الـه الا الله دوا وشەی ئەو بێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ دوا وتەی (لا اله الا الله) بێ دەڕواتە بەهەشتەوە)[٣].

**گەر گیانی سپارد پێویستە ئەم ڕێو شوێنانە بگرێنە بەر:**

**(١ ـ ٢): چاوەکانی دابخرێنو دوعاو پاڕانەوەی بۆ بکرێت:**

(پێغەمبەر (ﷺ) چووە لای (ابی سلمه) چاوی لەقوچ نابوون (مردبوو) ئەویش چاوەکانی داخستن، پاشان فەرموی: (ان الروح اذا قبض تبعه بصره). واتە: گەر گیان کێشرا چاو دوای دەکەوێ. ئەو کاتە خزمانی ئەو هاواریان لێ بەرز بۆوە. ئەنجا فەرموی: (تەنیا بەخێر بۆ خۆتان داواو پاڕانەوە بکەن، چونکە فریشتەکان دەڵێن ئامین لەسەر ئەوەی ئێوە دەیڵێن. پاشان فەرموی: (اللهم اغفر لأبي سلمة، وارفع درجته في المهديين، واخلفه في عقبه في الغابرين، واغفر لنا وله يا رب العالمين. وافسح له قبره ونوره له فيه)[٤].

**(٣) دەبێ مردوو داپۆشرێو گشت لاشەی بگرێتەوە:**

(عائیشە) (رضي الله عنها) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد بە عەبایەکی

---

(١) لە(احكام الجنائز) الألباني کورتکراوەتەوە.

(٢) صحيح (م ٩١٦/٦٣١/٢) (الارواء/٦٨٦).

(٣) صحيح (ص.د ٢٦٧٣) (د: ٣١٠٠/٣٨٥/٨).

(٤) صحيح (الجنائز ١٢ م(٩٢٠/٦٣٤/٢).

خەت خەتاوی داپۆشرا)[١].

**(٤) دەبێ زوو تەرمەکە ئامادە بکرێو ببردرێت:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (پەلە لەتەرم بکەن، گەر چاکە کار بێ ئەوە خێری لەپێشە بۆی دەبەن، گەر خراپەکار بێ ئەوە لەکۆڵ خۆتان دەکەنەوە)[٢].

**(٥) پێویستە بە پەلە قەرزەکانی بدرێنەوە لەماڵی خۆی گەر هەمووشی بێت:**

(جابر بن عبدالله (رضي الله عنه)) دەفەرموێ: (پیاوێ مرد، شوشتمانو کفنمان کردو بۆنمان لێیدا، دوایی لەجێگای جبریلدا داماننا کە تەرمی لێ دادەنران، پاشان بانگی پێغەمبەر (ﷺ) کرا تا نوێژی لەسەر بکات، ئەویش هات لەگەڵماندا، پاشان فەرموی: (رەنگە ئەو هاوڕێیەتان قەرزدار بێ). وتیان: بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو دینار قەرزدارە، ئەویش گەڕایەوە دواوە، ئەنجا پیاوێ لەئێمە بە ناوی (ابو قتادة)پێ ی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم دوو دینارە لەسەر من بێ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئەمانە لەسەر تۆنو لەماڵی تۆ دایەو مردوو لێیان بەری یە). وتی: بەڵێ. ئەنجا نوێژی لەسەر کرد، پێغەمبەر (ﷺ) هەر کە توشی (ابا قتادة) دەبوو دەیفەرموو: چیت کرد لەگەڵ دوو دینارەکان؟ تا دوا جار وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داومەوە: فەرموی: (الآن بردت عليه جلده)[٣]. واتە:ئێستا پێستی لەئاگر ساردبۆتەوە.

## ئەوەی بۆ ئامادەبووان و کەسانی تر دروستە:

دروستە رووی مردوو هەڵبدەنەوەو ماچی بکەنو سێ رۆژ بۆی بگرین:

عائیشە گێڕایەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) چووە لای (عوثمان بن مظعون) کە مرد بوو، پاشان دەمو چاوی هەڵدایەوەو خۆی دا بەسەری داو ماچی کردو گریا، تا بینیم فرمێسکەکانی بە

(١) متفق عليه: م(٢/٦٥٢/٩٤٢) بە کورتی. (خ ٣/١١٣/١٢٤١) بە درێژی.

(٢) متفق عليه: خ(٣/١٨٢/١٣١٥) م(٢/٦٥١/٩٤٤).

(٣) صحيح (الجنائز/١٦) کم(٢/٥٨) (هق ٦/٧٤).

کۆڵمەکانی دا دەهاتنە خوارەوە) [١].

(عبدالله بن جعفر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) سێ ڕۆژ ماوەی خێزانی جەعفەری دا (رضي الله عنه)کە بڕواتە لایان، پاشان هاتە لایانو فەرموی: دوای ئیمڕۆ لەسەر براکەم مەگرین) [٢].

**ئەوەی لەسەر خزمانی مردووەکە پێویستە:**

کاتێ خزمانی هەواڵی مردنی مردوویان پێ گەیشت پێویستە دووشت بکەن:

یەکەم: ئارامگرتنو سەبرو رازی بوون بە چارەنوسو قەدەری خودا، وەکو خودا دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ *الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ * أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴾ [٣].

واتە: ئێوە تاقی دەکەینەوە بە شتێ لەترسو برسێتیو کەمی دارایيو گیاندارو میوەجات، مژدە بدە بە خۆڕاگران. ئەوانەی کاتێ تووشی کارەساتێ هاتن دەڵێن ئێمە موڵکی خوداینو بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە. ئەوان سەڵەواتی پەروەردگاریان لەسەرەو هەم بەزەیی، ئەوانەن ڕێنوما بووەکان.

(انس (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە لای ژنێکدا ڕەت بوو لەتەك گۆڕێکەوە بوو دەگریا، پێ ی فەرموو: (لەخوا بترسەو ئارامبگرە). وتی: لێم گەڕێ، تۆ تووشی کارەساتی من نەبوویت، نەیزانی ئەوە پێغەمبەرە (ﷺ). نەفەرێ وتی: ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، لەو کاتەدا وەکو بمرێ ئاوای لێ هات. هاتە بەر دەرگای پێغەمبەری خواو (ﷺ) دەرگاوانی لەتەك ئەودا نەبینی. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من نەم زانی ئەوە تۆی . پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی (ان الصبر عند اول الصدمة)[٤]. واتە: ئارامگرتن لەگەڵ یەکەم زەبر بەرکەوتندایە.

---

(١) صحيح (الارواء: ٦٩٣) (ص.جه ١١٩١) (جه ١/٤٦٨/١٤٥٦).

(٢) صحيح (ص. نس ٤٨٢٣) (الجنائز ص ٢١) (نس ٨/١٨٢).

(٣) البقرة: ١٥٥ ـ ١٥٧.

(٤) متفق عليه: م(٢/٦٣٧/١٥/٦٢٦) خ(٣/١٤٨/١٢٨٣).

**ئارام گرتن لەسەر مردنی منداڵان پاداشتەکی گەورەی هەیە :**

(ابو سعيد الخدری) گێڕاویەوە: (ژنـان بـە پێغەمبـەری خوایـان (ﷺ) وت: ڕۆژێکمـان بـۆ دەست نیشان بکە ئامۆژگاریمان تێ دابکە. ئەنجا ئەویش ئامۆژگاری کردنو فەرموی: (هـەر ژنـێ بمرێ سێ منداڵی بمرن دەبنە بەربەست بۆی لەئاگر). ژنێ وتی: گەر دوو بن؟ فەرموی: گەر دووش بن)[1].دووەم شت کە لەسەر خزمان پێویست دەبێت:گوتنی (انا لله وانا اليه راجعون) وەکـو لـەم ئایەتەدا هاتووەو، پێویستە ئەم دوعایەش زیاد بکرێ: (اللهم أجرنی فی مصيبتی واخلف لی خيرا منها).

(ام سلمه (رضي الله عنها)) گێڕاویـەوە: لەپێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیـست دەیفـەرموو: (هەر کەسێ تووشی کارەساتێ ببێو بڵێ: (انا لله وانا اليه راجعون/ اللـهم أجرنـی فی مـصيبتی واخلف لی خيرا منها) ئەوە مسۆگەر خودا خێری بۆ دێنێتـەوە جێگـای ئـەوە. ئـەنجا (ام سـلمه (رضي الله عنهـا)) دەفەرمووێ: (کاتێ (ابو سلمه) مرد وتم: (کێ لەموسڵمانان لە ـ ابو سـلمه ـ باشترە، یەکەم خانەوادەیە بەرەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی کردووە؟ پاشان مـن ئـەوەم وت، ئەنجا خوای گەورە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بۆمن هێنا جێ ی ئەو)[2].

**ئەوەی لەسەر خزمانی مردووەکە حەرامە :**

**(١) شینو ڕۆڕۆ (النياحـة)**: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (چوار شت لەئومـەتی مـنـدا نـەریتی سەردەمی نەزانینو دەستی لێ بەرنادەن: شـانازی کردنـی بـە حەسـەبەوەو تانـەدان لەپـشتەکانو داواکردنی باران بەهۆی ئەستێرەکانەوەو شینو ڕۆڕۆ ـ النياحة ـ).(ئەو ژنەی شـینو ڕۆڕۆ دەکـاتو بەر لەمردن تۆبە ناکات، لەڕۆژی دوایی دا گەر زینـدوو بـۆوە پۆشـاکەکی لەقـەترانو زرێ یـەك لەگەڕی لەبەر دەکرێت)[3].

---

(١) متفق عليه: خ(١٢٤٩/١١٨/٣) م(٢٦٣٣/٢٠٢٨/٤).

(٢) صحيح (ص.ج ٥٧٦٤) (الأحكام/ص ٢٣) م(٩١٨/٦٣١/٢).

(٣) (صحيح الجنائز/ص٢٧) م(٩٣٤/٦٤٤/٢)..

**(٢ ـ ٣): لەکوڵمی خۆدانو بەرۆك دادڕین (ضرب الخدود ـ شق الجيوب):** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لەئێمە نییە ئەو کەسەی لەرووومەتی خۆی دەداتو بەرۆکی خۆی دادەڕیّو قسەی سەردەمی نەزانی دەکات) [١].

**(٤) پرچو قژ دەرهێنان (حلق الشعر):** (ابي بردة بن ابي موسى) وتویەتی: ((ابو موسى)ژانو ئازارەکی تووش هات بورایەوە، لەماڵی ژنەکی خزمی بوو، ئەو ژنە خزمەی هاواری کردو قیژاندی، بەڵام ئەو نەیتوانی وەڵامێکی بداتەوە، کاتیّ وەئاگا هاتەوە، وتی: من لەو شتە بەریم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لیّ ی بەری بووە، پێغەمبەری خوا بەری بووە لەو ژنەی شینو رۆرۆ (الصالقة) دەکاتو پرچی خۆی دەردێنیّ (الحالقة)و جلو بەرگی دەدڕێنیّ (الشاقة) [٢].

**(٥) قژ بەربڵاوکردن (نشر الشعر):** لەفەرمودەی ئەم ژنەیەدا هاتووە کە بەیعەتی بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کردووەو وتویەتی: ئەوەی لەپێغەمبەرمان (ﷺ) وەرگرتووە لەچاکە ، هەرگیز سەرپێچی نەکەین ئەوەیە: رووخسارمان دانەڕنینو هاوارو رۆ رۆنەکەینو بەرۆك دانەدڕینو، قژو پرچ بەر بڵاو نەکەین) [٣].

## ئەوەی بۆ مردوو پێویستە:

ئەوەی بۆ مردو پێویستەو واجبە کە خزمو کەسانی تر بۆی بکەن چوار شتە: (شوشتنی، کفن کردنی، نوێژ لەسەر کردنی، بەخاك سپاردنی).

**یەکەم: شوشتنی مردوو:**

واجبیەکەی لەفەرمانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەرگیراوە لەفەرمودەی تری جگە لەمانە:

---

(١) متفق عليه: خ(٣/١٦٣/١٢٩٤) م(١/٩٩/١٠٣).

(٢) متفق عليه: (خ ١٦٣/١٢٩٤) م(١/٩٩/١٠٣).

(٣) صحيح (الجنائز/ص٣٠) (د: ٨/٤٠٥/٣١١٥).

(١) فەرمودەی ئـەو کەسـەی لـەئیحرام دابـوو وشـترەکەی تێکـی هـاڕی: (واغـسلوه بمـاء وسدر)[١]. واتە: بە ئاوو مۆردی بشۆن.

(٢) فەرمودەی ئەو لەراست زەینەبی کچی دا، کاتێ (ﷺ) فـەرموی: (اغـسلنها ثلاثـا او خمسا او سبعا...) [٢]. واتە: سێ یان پێنج یان حەوت جار بیشۆن.

## چۆنیەتی شوشتنی مردوو:

(ام عطیة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەشوشتنی کچەکەی دا پـێ ی فـەرموون: (لەلای راستو ئەو شوێنانەوە دەست پێ بکەن کە جێگای دەست نوێژن) [٣].

هەر لەو گەڕاوەتەوە: (لەکاتی شوشتنی کچی پێغەمبـەر (ﷺ) هاتـە لامـان و فـەرموی: (سێ جار یان پێنج یان زیاتر بیشۆن، ئەگەر ئەوەتان پێ بـاش بـو بـە ئـاوو مـۆرد ـ الـسدر ـ و دواجار بە کافور بیشۆن، یان بە هەندێ کافور، گەر لەخۆبوونەوە بانگم بکەن. کـاتێ تـەواو بـوو بانگمان کرد، ئەنجا پۆشاکەکەی هێناو فەرموی: بەمە دایپۆشن)[٤].

هەر لەئەو گەڕاوەتەوە: (قژی ئەومان کرد بە سێ کەزیو هۆنیمانەوە، دوو لەلاکانی سەریو دانەیەکمان لەپێشە سەری دا شۆڕکردەوە) [٥].

هەر لەئەو گەڕاوەتەوە: (قژمان هۆنیەوە کردمان بە سێ کەزیو خستمانە دواوەی سەری)[٦].

## کێ مردوو دەشوات؟

کێ لەهەموو کەس شـارەزاترە بـە سـوننەتی غوسـل، پیـشەی شوشـتن دەگرێتـە ئەسـتۆ، نەخوازەڵا گەر کەسو کاری بن، چونکە ئەوانەی پێغەمبەریان شوشت (ﷺ) خزمی ئەو بوون:

پێشەوا عەلی (رضي الله عنه) فەرمویەتی: (پێغەمبەری خوا(ﷺ)م شوشت سەیرم کرد دەزانم مردوو

---

(١) متفق علیه (خ ١٢٦٥/١٣٠/٣) (م ١٠٢٦/٨٦٥/٢).

(٢) متفق علیه: (خ ١٢٥٩/١٣٢/٣) م(٣٩م ـ ٣٩ ـ ٦٤٧/٢).

(٣) متفق علیه: (خ ١٢٥٥/١٣٠/٣) م(٩٣٩/٤٣/٦٤٨/٢).

(٤) متفق علیه: (خ ١٢٥٣/١٢٥/٣) م(٩٣٩/٦٤٦/٢).

(٥) متفق علیه: (خ ٦٢، ١٢٦٣/١٣٣، ١٣٤/٣) م(٩٣٩/٢٤٦/٢).

(٦) متفق علیه: (خ ٦٢، ١٢٦٣/١٣٣، ١٣٤/٣) م(٩٣٩/٢٤٦/٢).

چی لیّ بە سەردیّ، هیچم نەبینی، ئەو بە زیندوییو مردوویی پاکژ بو(ﷺ) [١].

پێویستە پیاوان پیاوانو ژنان ژنان بشۆن، ژنو مێرد نەبیّ، دروستە هەریەکە لەوان ئەویتر بشوات: عائیشە (رضي الله عنها) گێڕاویەوە: (گەر ئەوەی رابرد جارەکی تر روو لەمن بکاو بگەڕێتەوە تەنیا ژنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو دەشۆن) [٢].

هەر ئەو گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای ناشتنی تەرمیّ بۆ لای من گەڕایەوە لەبەقیعدا، من سەرم دێشاو دەمگوت: ئای سەرم. فەرموی: بەڵکو ئای سەرم بۆمن، گەر تۆ بەر لەمن مردی، باکت نەبێت خۆم دەتشۆمو کفنت دەکەمو نوێژت لەسەرت دەکەمو بە خاکت دەسپێرم) [٣].

ئاگاداری: دروست نییە شەهیدی بەرەی جەنگ بشۆردرێت:

(جابر(رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لەرۆژی (ئوحود)دا (بە خوێنیانەوە بیان نێژنو مەیان شۆن)[٤].

## دووەم: کفن کردن (الکفن):

واجبیەکەی لەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) وەرگیراوە، کە دەرحەق بەو کەسە ئیحرامی بەستبوو فەرموو کە لە ئیحرام دابوو وشترەکەی هاڕی کوشتی : (اغسلوه بماء وسدر وكفنوه في ثوبين) [٥].

واتە: بە ئاوو مۆرد بیشۆنو لەدوو بەرگدا کفنی بکەن.

کفن یان پارەکەی دەبیّ بە ماڵی مردووەکە بیّ، ئەگەر تەنیا ئەوەندەشی لەدوا بەجیّ مابێت، (خەبابی کوڕی ئەڕەت (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کۆچمان کرد تا رەزامەندی خوا بە دەست بێنین، پاداشتمان کەوتە سەر خوا، هەبوو لەئێمە مردو پاداشتەکەی

(١) صحيح (ص.جه ١١٩٨) (الأحكام/٥٠) (جه ١/٤٧١/١٤٦٧).

(٢) صحيح (ص.جه ١١٩٦) جه(١/٤٧٠/١٤٦٤).

(٣) (ص.جه ١١٩٧) (جه ١/٤٧٠/١٤٦).

(٤) صحيح (ص.نس ١٨٨٩) (نس ٤/٦٢) (خ ٣/٢١٢/١٣٤٦).

(٥) رابردو باسكرا.

نەخوارد، هەبوو لەوانە (مصعب بن عمير)، هەبوو بەرهەمەکەی هەراش بوو ئەوە چنیەوە، کاتێ ئەو لەئوحود شەهیدبوو، شتەکمان دەست نەکەوت بیکەینە کفن لەبۆی، تەنیا پەشتەماڵێ (بردة) نەبێ، گەر سەرمان پێ داپۆشیبایە قاچی دەردەکەوتن، گەر قاچمان داپۆشیبان سەری بەدەردەکەوت، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا سەری داپۆشینو قاچەکانی بەگیای وشتر (اذخر) داپۆشین) [1].

واجبە هەمو لەشی مردوو داپۆشرێ، گەر جگە لەپەڕۆیەکی کورت نەبێ نەبوو هەموو لەش داپۆشی ئەوە سەری دادەپۆشرێو قاچەکانی بە گای وشتر (الأذخر) دادەپۆشرێ، وەکو لەفەرمودەی (خەبباب)دا هاتووە.

## چەند شتێ لەکفن کردندا سوننەتە:

(١) سپیەتی: وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بەرگی سپی بکەنە بەر، باشترین بەرگەو مردووەکانی پێ کفن بکەن) [2].

(٢) سێ بەرگ بن: عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسێ بەرگی یەمەنی سپی سحولی لەلۆکە دا کفن کرا، کراسو مێزەری تێدا نەبوو) [3].

(٣) گەر کرا پۆشاکێکی خەتخەتاوی (الحبرة) بێ وەکو (جابر) گێڕاویەوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە مرد، با لەبەرگی خەتخەتاوی (حبرة) کفنی بکات) [4].

## نوێژی مردوو (صلاة الجنازة):

نوێژی مردوو فەرزی کیفایەیە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەچەند فەرمودەیەکدا فەرمانی

---

(١) متفق عليه (خ ٣/١٤٢/١٢٧٦) (م ٢/٦٤٩/٩٤٠). تێبینی: مەبەست لەچنینەوەی بەرهەم دەستکەوتی جەنگە وەکو لە(فتح الباري)دا (ج٣) دا هاتووە.

(٢) صحيح (ص.ج ٣٢٣٦) (الجنائز ٦٢) (ت ٢/٢٣٢/٩٩٩).

(٣) متفق عليه: خ(٣/١٣٥/١٢٦٤) م(٢/٦٤٢/٩٤١).

(٤) صحيح (ص.ج ٤٥٥) (الجنائز: ٦٣) (د: ٨/٤٢٥/٣١٣٤).

پێ کردووە: لەوانەش فەرمودەی (زید بن خالد الجهنی): (پیاوێ لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ) لەخەیبەردا مرد، ئەمەیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسکرد، ئەویش فەرموی: (صلوا علی صاحبکم ـ نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن). خەڵکی روویان لەمە گۆڕا، ئەویش فەرموی: (ئەو هاوڕێیەی ئێوە لەرێگای خوادا دزی لەدەست کەوتی جەنگدا کردووە ـ الغل ـ).

ئێمەش کەلو پەلەکەمان پشکنی مورووەکمان لەمۆرووەکانی ـ الخرز ـ جوولەکە بینی دوو درهەمی نەدەهێنا) [1].

**دوو کەس لەمە جیادەبنەوە نوێژیان لەسەر واجب نییە**

(١) ئەو منداڵەی پێ نەگەیشتووە، عائیشە (رضي الله عنها)گێڕاویەوە: (ئیبراهیمی ـ س ـ کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك وەفاتی فەرموو ، تەمەنی(١٨) مانگ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر نەکرد)[2].

(٢) شەهید، ئەنەس گێڕاویەوە: (شەهیدانی ئوحود نوێژیان لەسەر نەکرا بەخوێنیانەوە خرانە ناوگۆڕو نوێژیان لەسەر نەکرا) [3].

**بەڵام واجب نەبوونی مانای وانییە دروست نییە نوێژیان لەسەر بکرێت:**

عائیشە گێڕاویەوە: (منداڵەکی ئەنصارەکان هێنرا خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد...) [4].

(عبدالله بن الزبیر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەئوحود فەرمانی کرد حەمزە (رضي الله عنه)بەکراسەکی ملداری خەت خەت ـ البردة ـ داپۆشرێ، ئەنجا نوێژی لەسەر کردو نۆ (الله اکبر)ی تێدا کرد، پاشان کوژراوانی هێنا ریزی کردن، نوێژی لەسەر ئەوانیش کرد لەگەڵیاندا) [5].

تا خەڵکی نوێژ کەر پتر بن بۆ مردوو بەسوودترە:

---

(١) صحيح (الجنائز/ ص ٧٩) (د ٧/٣٧٨/٢٦٩٣).

(٢) حسن الإسناد (ص.د ٢٦٨٨) (د ٨/٤٧٦/٣١٧١)

(٣) حسن (ص.د ٢٦٨٨) (د ٨/٤٠٨/٣١١٩).

(٤) صحيح (ص. نس ١٨٣٩) (م ٤/٢٠٥٠/٢٢٦٢) (نس ٤/٥٧).

(٥) اسناده حسن (الجنائز ٤٩). رجاله كلهم ثقات اخرجه الطحاوي في معاني الآثار (١/٢٩٠).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ بمرێو دەستە گەلێ لەموسڵمانان نوێژی لەسەر بکاتو بگاتە سەد کەسو شەفاعەتی بۆ بکەن، مسۆگەر دەبنە شەفاعەت تێ یدا) [١].

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (هەر موسڵمانانی بمرێو چل پیاو نوێژی لەسەر بکەنو هیچ هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەن، ئەوە مسۆگەر خوا لەوەدا دەیانکات بە شەفاعەت)[٢].

## سوننەتە سێ ریز لەدوای پێش نوێژ خوێن بوەستن گەر کەمیش بن:

((مالك بن هبیرە) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر موسڵمانێ بمرێو سێ ریز لەموسڵمانان نوێژی لەسەر بکەن ئەوە وەلامی یان دەدرێتەوە (قبوڵ دەبێت). وتی: (مرثد بن الیزني) کاتێ خەڵکی سەر نوێژی جەنازە کەم دەبوون (مالك) دەیکردن بە سێ ریزەوە[٣].

## گەر چەند تەرمێ ئامادەکران لەژنانو پیاوان:

گەر نوێژ لەسەر هەموو جەنازەیەك بکرێ بە تەنیایی ئەوە بنەڕەتیەتی، گەر لەسەر هەر هەموویان یەك نوێژ بکرێ هەر دروستە، نێرەکان گەر منداڵیش بن لەپێش پێشنوێژ خوێن دادەنرێنو ژنان دەخرێنە رووی قیبلەوە:

(نافع) لە(ابن عمر)ی گێڕاوەتەوە: (ئەو نوێژی لەسەر نۆ تەرم کردوە پێکەوە، پیاوی لەپێش پێشنوێژ خوێنەوە دانانو بەیەك ریزی دانانو ژنانی خستە بەرامبەر قیبلە، جەنازەی (ام کلثوم)ی کچی عەلی (کرم الله وجهه) کە خێزانی عومەر (ﷺ)بوو کوڕەکەی بە ناوی (زید) پێکەوە دانان، ئەو کاتە پێش نوێژ خوێن (سعید بن العاص)بوو، ئەو کاتە (ابن عباس)و (ابو هریرة)و (ابو سعید)و (ابو قتادة) لەناو خەڵکی دابوون، منداڵەکە یان بەدوای پێش نوێژ خوێنەوە دانا، وتم ئەمە چی یە؟ وتیان: ئەمە سوننەتە) [٤].

---

(١) صحیح (ص.نس ١٨٨١) م(٩٤٧/٦٥٤/٢) (ت ١٠٣٤/٢٤٧/٢) (نس ٧٥/٤).

(٢) صحیح (الصحیحة ٢٢٦٧) (م ٩٤٨/٦٥٥/٢).

(٣) حسن (الجنائز ٩٩ ـ ١٠٠) د(٣١٥٠/٤٤٨/٨) (ت ١٠٣٣/٢٤٦/٢).

(٤) صحیح (ص.نس ١٨٦٩) (الجنائز ١٠٣) (نس ٧١/٤).

## لەکوێ نوێژ لەسەر مردوو دەکرێت؟

(عائیشە) (رضي الله عنها) گێڕاویەوە: (کاتێ سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس مرد، ژنانی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵیان نارد کە جەنازەکەی بە مزگەوتدا ڕەت بکرێ نوێژی لەسەر بکەن، لەدەرگای جەنازەکانەوە برایە دەر کە جێگای جەنازەکان بوو، هەواڵ گەیشتە ژنانی پێغەمبەر (ﷺ) کە خەڵکی نەنگی یان لەمە گرتووەو وتویانە: نابێ جەنازە ببرێتە مزگەوت، عائیشە کە ئەمەی زانی وتی: خەڵکی بە تاڵۆکە نەنگی یان لەکارێ گرتووە کە زانیاری یان لەبارەوە نییە، نەنگی یان لەمە گرتووە جەنازە بە مزگەوت دا ڕەت بکرێ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەناو مزگەوتدا نوێژی لەسەر (سهیل بن بیضاء) کرد) [(١)].

بەڵام واچاکە نوێژی مردوو لەدەرەوەی مزگەوتدا بکرێ لەو جێگایەدا کە بۆ نوێژکردن لەسەر جەنازە ئامادەکراوە، ئەمە زیاتر کراوە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ): (ابن عمر) گێڕاویەوە: (لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) جولەکەکان ژنو پیاوێکیان هێنا زینایان کردبوو، فەرمانی دا ڕەجم بکرێن، لەنزیك جێگای جەنازەکاندا لەتەك مزگەوتدا ڕەجم کران)[(٢)]. (ابو هريرة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەو ڕۆژەدا کە هەوالی مردنی نەجاشی پێ گەیشت کە تێ ی دا مردو چووە شوێنی نوێژ کردن، ریزی پێیان بەستو چوار (الله اکبر)ی کرد) [(٣)].

لەنێوان گۆڕەکاندا (گۆڕستان) دروست نییە نوێژ بکرێ، وەکو (انس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە لەنێوان گۆڕەکاندا نوێژ لەسەر جەنازەکان بکرێت) [(٤)].

## پێش نوێژ خوێن لەکوێ رادەوەستێت؟

(ابي غالب الخياط) گێڕاویەوە وتی: (ئەنەسی کوڕی مالیکم بینی نوێژی لەسەر تەرمی پیاوێ کرد لەتەك سەریەوە وەستا، کاتێ بەرزکرا، تەرمی ژنەکی قوڕەیشیان هێنا یان ئەنصار

---

(١) صحيح (ص. نس ١٨٥٩) م(٩٧٣ ـ ٢/٦٦٨/١٠٠) (نس ٤/٦٨).

(٢) صحيح (الجنائز ١٠٦) خ(٣/١٩٩/١٣٢٩).

(٣) متفق عليه: (خ ٣/١١٦/١٢٤٥) م(٢/٦٥٦/٩٥١).

(٤) اسناده حسن: (الجنائز: ١٠٨) (الألباني) وتویەتی: (رواه طس/١/٨٠/٢)..

بوو، پیّ ی وترا: (ابا حمزە) ئەمە تەرمی فلانە ژنەی کچی فلانە نوێژی لەسەر بکە، ئەویش نوێژی لەسەر کردو لەناوەڕاستی تەرمەکەدا وەستا، ئەو کاتە (العلاءالدین بن زیاد العدوی) لەناوماندا بوو، کاتێ ئەم جیاوازی یەی بینی لەوەستان بۆ ژنو بۆ پیاو لیّ ی پرسی: (ئەی (ابا حمزە): ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو تۆ لەو جێگا دەوەستا، بۆ ژنیش لەو جێگایەی تۆ لیّ ی وەستاوی دەوەستا؟ وتی: بەڵێ. (العلاء) رووی لەئێمە کردو وتی: دەرخی بکەن) [١].

## سیفەتی نوێژەکە:

چوار (الله اکبر)ی تێدایە، یان پێنج یان نۆ، پێغەمبەر (ﷺ) هەموویانی جار جارە کردووە:

چواریان: (ابی هریرە) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی وەفاتی نەجاشی پیّ گەیشت، لەو رۆژەدا کە مرد، چووە شوێنی نوێژو ریزی کردنو چوار (الله اکبر)ی کردن[٢].

بۆ پێنج (الله اکبر): (عبدالرحمن بن ابی لیلی)گێڕاویەوە: (زید بن ارقم) چوار (الله اکبر)ی لەسەر تەرمەکانی ئێمەدا لیّ دەدا، هەر ئەو پێنج (الله اکبر)ی لیّ دا، منیش لێم پرسی: وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوها (الله اکبر)ەی دەکرد) [٣].

هەرچی (٦ ـ ٧) جار هەندێ گێڕانەوەی (مەوقوف)ی تێدایە، بەڵام لە حوکمی (مەرفوع) دایە، چونکە هەندێ هەواڵی گەورە بە ئامادەبونی کۆمەڵێ هاوەڵ کردویانە، بیّ ئەوەی کەس نکۆڵی لیّ بکات:

(عبدالله بن معقل) گێڕاویەوە: (عەلی کوڕی ئەبو تالّب (ﷺ) نوێژی لەسەر (سهل بن حنیف) کرد شەش (الله اکبر)ی لیّ دا، پاشان ئاوڕی لێمان دایەوەو فەرموی: ئەو بەدری بوو) [٤].

(موسی بن عبدالله بن یزید) گێڕاویەوە: (عەلی (ﷺ) نوێژی لە (ابی قتادە) کردو حەوت

---

(١) صحیح: (ص.جه ١٢١٤) (جه ١٤٩٤/٤٧٩/١).

(٢) باسکراوە.

(٣) صحیح (ص.جه ١٢٢٢) م(٩٥٧/٦٥٩/٢).

(٤) صحیح (الجنائز/١١٣) کم(٤٠٩/٣) (هق/ ٣٦/٤).

(الله اكبر)ی كردو فەرمووی: ئەو بەدری بوو) [١].

(عبد خير) گێڕاویەوە: (عەلی (رضي الله عنه) شەش (الله اكبر)ی لەسەر خەڵكی بەدر لێ دەداو لەسەر هاوەڵەكان پێنج (الله اكبر)و لەسەر خەڵكی تر چوار جار) [٢].

بەڵام نۆ: (عبدالله بن زبیر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر (حەمزە (رضي الله عنه))كرد نۆ (الله اكبر)ی كردن).

## دروستە لە(الله اكبر)ی یەكەم دا دەستەكانی بەرزبكاتەوە:

(عبدالله بن عباس (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنوێژی جەنازەدا لەیەكەم (الله اكبر)دا دەستی بەرز دەكردەوە، پاشان نەدەگەڕایەوە) [٣].

پاشان دەستی ڕاستی دەخستە سەر پشتی لەپە دەستی چەپی‌و مەچەكی‌و باسكی‌و توند لەسەر سنگی دەیگرتن: (سەهل بن سعد) گێڕاویەوە: (خەڵكی فەرمانیان پێ دەكرا دەستی ڕاستی لەسەر باسكی چەپی دابنێ لەنوێژدا).

## دوایی بە شوێن (الله اكبر)ی یەكەمدا فاتیحەو سوڕەتێكی دەخوێند:

(طلحة بن عبدالله بن عوف) گێڕاویەوە: (لەدوای (ابن عباس (رضي الله عنه)) نوێژم كرد لەسەر جەنازەیەك، فاتیحەو سوڕەتەكی خوێند، دەنگی بەرز كردەوە تا گوێمان لێ ی بوو، كاتێ تەواو بوو دەستم گرت‌و لێم پرسی ؟ وتی: بۆیە دەنگم بەرز كردەوە تا بزانن ئەمە سوننەتەو حەقە) [٤].

خوێندنەوەی فاتیحەو سوڕەتەكە سوننەتە بە بێ دەنگی بێ، وەكو (ابی امامە بن سهل) وتویەتی: (سوننەتە لەنوێژی جەنازەدا لە(الله اكبر)ی یەكەمدا فاتیحەی بە دەنگی نزم بگوترێ، پاشان سێ (الله اكبر) لێ بدات‌و لەدوا (الله اكبر)دا سەلام بداتەوە) [٥]. پاشان (الله اكبر)ی دووەم

---

(١) صحيح (الجنائز/١١٤) هق(٤/٣٦).

(٢) صحيح (الجنائز: ١١٣) (هق : ٤/٣٧).

(٣) رجاله ثقات (الجنائز ص١١٦).

(٤) صحيح (الجنائز ص١١٩) نس(٤/٧٥) خوێندنەوەی فاتیحە (خ ٣/٢٠٣/١٣٣٥) (د ٨/٤٩٥/٣١٨٢) گێڕاویەوە.

(٥) اسناده صحيح (الجنائز ١١١) نس (٤/٧٥).(

لیّ دەدات‌و سەلاّوەت لەدیداری پیّغەمبەر (ﷺ) دەدات، وەکو لەگێڕانەوەی (ابي امامة)دا هاتووە کە کەسیّ لەیارانی پیّغەمبەر (ﷺ) پیّ ی راگەیاندووە: (سوننەت ئەوەیە لەنوێژدا کە پیّشنوێژ خوێن (الله اكبر) بکات، پاشان دوای (الله اكبر)ی یەکەم بە نهیّنی فاتیحە بخوێنیّ، پاشان سەلەوات لەدیداری پیّغەمبەر (ﷺ) بدات‌و بەدڵسۆزی دوعای بۆ جەنازەکە بکات لە(الله اكبر)ی سیّ یەمداو نابیّ هیچیان تیّدا بخوێنیّ پاشان لەدڵی خۆیدا سەلام بداتەوە) [1].

پاشان (الله اكبر)ەکانی تردێن دوعای بۆ مردوو تیّ دا دەکریّ، وەکو لەفەرمودەدا هاتووە: (گەر نوێژتان لەسەر مردوو کرد بەدڵسۆزی دوعای بۆ بکەن) [2].

ئەو نزایانە کە دەکرێن کە سەلماوە لەپێغەمبەرەوە، لەوانە کە (عوف بن مالك) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر تەرمێك کردو ئەو پاڕانەوەیەم لەو دەرخ کرد کە دەیفەرموو: (اللهم اغفر له وارحمه، وعافه واعف عنه واكرم نزله، ووسع مدخله، واغسله بالماء والثلج والبرد، ونقه من الخطايا كما ينقى الثوب الأبيض من الدنس وابدله دارا خيرا من داره واهلا خيرا من اهله وزوجا خيرا من زوجه وادخله الجنة، واعذه من عذاب القبر وعذاب النار).ئەو کاتە خۆزگەم دەخواست من ئەو مردووە بوامە) [3].

پاڕانەوە لەنێوان (الله اكبر)ی دوایی‌و سەلامدانەوە دروستە: لەگێڕانەوەی (ابي يغفور) دا هاتووە کە من(عبدالله بن ابی اوفی)م بینی چوار ـ الله اكبر ـ ی لەسەر جەنازەکەدا، پاشان ساتیّ وەستا، واتە دەپاڕایەوە، پاشان وتی: منتان بینی پێنج (الله اكبر) لیّ بدەم؟ وتیان: نەء. وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوار (الله اكبر)ی دەکرد) [4].

پاشان دوو سەلام دەداتەوە، وەکو سەلامدانەوەی نوێژی فەرز، سەلامیّ بەلای راستداو سەلامیّ بە لای چەپدا، (عبدالله بن مسعود (ﷺ)) گێڕاویەوە: (سیّ شت لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دەکران خەڵکی دەستی لیّ کردونەوە، یەکیّ لەوانە سەلامدانەوەیە لەسەر

(١) صحيح (الجنائز ١٢٢) فع في الأم (١/٢٧٠) هق(٤/٣٩).
(٢) حسن (الارواء ٧٣٢) (ص.ج ٦٦٩) د(٨/٤٩٦/٣١٨٣).
(٣) صحيح (الجنائز ١٢٣) م(٢/٦٦٢/٩٦٣) جه(١/٤٨١/١٥٠٠).
(٤) اسناده حسن (الجنائز ١٢٦) هق (٤/٣٥).

تەرم وەکو سەلامی ناو نوێژ)[١].

دروستە بە سەلام دانەوەی یەکەم نوێژەکە دوایی بێت، وەکو (ابو هريره) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خودا (ﷺ) چوار (الله اکبر)ی لەسەر تەرمێ کردو یەك سەلامی دایەوە) [٢].

نوێژ کردن لەسەر تەرم لەو کاتانەدا حەرامە کە نوێژی تێدا حەرامە لەبەر ناچاری نەبێت:

لەگێڕانەوەی (عقبه بن عامر)دا هاتووە: (سێ کات هەبوو پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای پێ نەدەداین نوێژیان تێدا بکەین یان مردووی خۆمانی تێدا بنێژین: کاتێ خۆر هەڵدێ تا بەرز دەبێتەوە، کاتێ نیوەڕۆ دادێ تا لادەدات، کاتێ خۆر سەر لەسوێ ی ئاوابون دەنێ تا ئاوادەبێت)[٣].

## پاداشتو گەورەیی نوێژکردن لەسەر مردوو بەشداری کردن لەمەراسیمی ناشتنی دا:

(ابو هريرة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ نوێژ لەسەر تەرمێ بکاتو شوێنی نەکەوێ ئەو قیراتەکی هەیە، گەر لەگەڵی دا ڕۆیشت دوو قیراتی هەیە، نەفەرێ وتی: دوو قیراتەکان چین؟ وتی: بچوکترینیان وەکو کێوی ئوحودە) [٤].

ئەم گەورەیی یە لەراست شوێن کەوتنی جەنازەدا بۆ پیاوانە نەك بۆ ژنان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەمەی قەدەغەکردوون، بەڵام حەرام نییە بەڵکو تەنزیهی یە، (ام عطية ـ ر ـ) گێڕاویەوە: (ڕێگامان پێ نەدرا کە شوێن جەنازە بکەوینو توندیشمان لەوەدا لەگەڵدا نەکرا) [٥].

## دروست نییە ئەو کارانە ئەنجام بدەین لەکاتی شوێن کەوتنی تەرم دا کە پێچەوانەی شەریعەتە:

دوو شت بە دەق هاتووە: (دەنگ بەرزکردنەوە بەگریانو هەڵگرتنی ئاگر، وەکو لەفەرمودەدا

---

(١) اسناده حسن (الجنائز ١٢٧) هق (٤/٤٣).
(٢) اسناده حسن (الجنائز/ ١٢٨)(کم ١/٣٦٠) هق (٤/٤٣).
(٣) رابردو باسکرا.
(٤) صحيح (ص.ج ٦٣٥٥) م(٩٤٥ ـ ٥٣ ـ ٢/٦٥٣).
(٥) متفق عليه: (خ ١٢٧٨/١٤٤/٣) (م ٩٣٨/٦٤٦/٢).

هاتووه: (لا تتبع الجنازة بصوت ولا نار) [١].

واته: بەدەنگو ئاگر شوێن جەنازه مەكەون.

دەنگ بەرزكردنەوه بە زیكر لەبەر دەم جەنازەدا دەخرێتە سەر ئەمە، چونكە بیدعەیە، (قیس بن عباد) گێڕاویەوه: (یارانی پێغەمبەر (ﷺ) بەرزكردنەوەی دەنگیان لەكاتی جەنازەدا پێ خۆش نەبوو) [٢].

چونكە ئەم كارانە لاسایی كردنەوەی مەسیحی یەكانی تێدایە، كە بەگریانو ئاواز نزای ئینجیلیان دەخوێننەوه، لەوەش ناپەسەندتر بەڕێكردنی جەنازەیە بە مۆسیقای خەمگین، وەكو لەهەندێ ولاتانی ئیسلامی دا دەكرێو لاسایی غەیره موسڵمانەكان دەكرێتەوه. خوا پەنامان بدات.

## پێویستە تەرم (جەنازه) بە پەلە ببرێ بۆ گۆڕستان بەبێ راكردن:

لەفەرمودەدا هاتووه: (پەلە بكەن لەجەنازەدا، گەر چاكە كار بێ ئەوە خێرێكە بۆ ئەوێ ی دەبەن، گەر خراپە كار بێ ئەوە لەكۆڵ خۆتانی دەكەنەوه) [٣].

دروستە لەپێشو پاشەوەو لەراستو چەپیەوه لەگەڵ جەنازەدا رۆیشتن بكرێ كە لێوەی نزیك بن، تەنیا سوار نەبێ كە دەبێ لەدواوەی بڕۆن، (الراكب خلف الجنازة، والماشي حيث شاء منها)[٤]. ئەمە (موغیره) كوڕی (شعبه) گێڕاویەوه.

بەڵام واچاكترە لەدواوەی جەنازەوه بڕۆن، چونكە لەفەرمودەدا داخواز ركاوه: (واتبعوا الجنائز). واته: بكەونە دوای جەنازەوه.

عەلی پێشەوا (ﷺ) پشتگیری لەمە دەكات: (رۆیشتن لەدوای جەنازەوه باشترە لەوە كە لەپێشیەوە بڕۆیت، وەكو گەورەیی نوێژی بە كۆمەڵ بەسەر نوێژی بەتەنیادا) [٥].

---

(١) حسن (الجنائز ٧٠) د(٨/٤٥٣/٣١٥٥).

(٢) رجاله ثقات (الجنائز/هق ٧٤/٤)..

(٣) رابردو باسكرا.

(٤) صحیح (ص.ج ٣٥٣٣) ت(٢/٢٤٨/١٠٣٦).

(٥) اسناده حسن (الجنائز ٧٤) هق(٤/٢٥). تێبینی: بێگومان پێویستە مرۆڤ بە دوای جەنازە دا بڕواتو لەبەری

## گەر چوویتە ناو گۆڕستان یان پێ ی ڕەت ببی چی دەگوترێت:

عائیشە (رضي الله عنها) گێڕاویەوە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی یان پێ بڵێم: فەرمووی: بڵێ: (السلام علی اهل الدیار من المؤمنین والمسلمین، ویرحم الله المستقدمین منا والمستأخرین، وانا ان شاء الله بکم للاحقون)[١].

(سلیمان بن بریدە) لەباوکی گێڕاویەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فێری دەکردن گەر چونە گۆڕستان بڵێن: (السلام علیکم اهل الدیار من المؤمنین والمسلمین، وانا ان شاء الله بکم للاحقون، اسأل الله لنا ولکم العافیة)[٢].

## بەخاك سپاردن (الدفن):

پێویستە مردوو بشاردرێتەوە گەر موسڵمانیش نەبێ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) بە عەلی(رضي الله عنه) فەرموو کاتێ (ابو طالب) کۆچی دوایی کرد (اذهب فواره)[٣]. واتە: بیبە بیشارەوە.

سوننەتە مردو لەگۆڕستاندا بنێژرێ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەقیع دا مردوی ناشتووەو، هەواڵەکانیش بەتەواتور هاتووە لەم بارەوە، لەسەلەفەوە نەهاتووە کە لەغەیری گۆڕستاندا ویان ناشتبێت، تەنیا پێغەمبەر نەبێ، کە بە تەواتور هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەژووری خۆی دا نێژراوە، کە یەکێکە لەشتە تایبەتەکانی ئەو، عائیشە گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد لەشاردنەوەی دا ناکۆکی لێ پەیدا بوو، ئەبوبەکر وتی: شتەکم لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستووە لەیادم نەچووە، کە فەرمووی: (هەر پێغەمبەرێ لەو شوێنەدا وەفاتی کردووە کە ئارەزووی لێ بووە تێ ی بنێژرێ). بۆیە لەجێگای نووستنی خۆیدا بەخاکی بسپێرن)[٤].

---

هەڵسێت. ئەم فەرمودەیە لەگێڕانەوەی تر دروستترە کە دەڵێ: بە ئارەزووی خۆتە! (وەرگێڕ).

(١) صحیح (ص.ج ٤٤٢١) م(٩٧٤ ـ ١٠٢/٦٦٩/٢).

(٢) صحیح (ص. نس ١٩٢٨) م(٦٧١٢/٩٧٥) (نس ٩٤/٤).

(٣) صحیح (ص.نس ١٨٩٥) نس(٧٩/٤٧).

(٤) صحیح (ص.ج ٥٦٤٩) ت(١٠٢٣/٢٤٢/٢).

شەهیدەکان جیان لەشوێنی شەهید بونیان دەنێژرێن، ئەوان بۆ گۆڕستان ناگوازرێنەوە، (جابر) گێڕاویەوە (ﷺ): (لەئوحوددا کوژراوان هەڵگیران لەبەقیع دا بنێژرێن، بانگ کەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کرد: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە کە کوژراوان لەجێگای خۆیاندا بنێژرێن)[(١)].

## لەم بارودۆخانەدا دروست نییە مردو بنێژرێ لەبەر ناچاری نەبێت:

(١) (عقبة بن عامر) دەڵێ: (سێ سەعات هەیە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی دەکردین نوێژی تێدا بکەین، یان مردوی تێدا بنێژین، کاتێ خۆر هەڵدێ تا بەرز دەبێتەوە، کاتێ نیوەڕۆ دەبێ تا خۆر لادەدات، کاتێ خۆر خەریکە ئاوا دەبێت)[(٢)].

(٢) (جابر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) بیستی پیاوێ لەیارانی مردووەو کفن کراوە بە بەرگێك کە درێژنەبووە، شەو نێژراوە، پێغەمبەر (ﷺ) سەرکۆنەی ئەوەی کرد مردو بە شەو بنێژرێ تا نوێژی لەسەر دەکرێ، مەگەر مرۆڤ ناچاری ئەوە بێت)[(٣)].

گەر ناچاربوون دروستە لەشەودا مردو بنێژرێ‌و چراو گڵۆپی بۆ داگیرسێنرێ تا بە ئاسانی بشاردرێتەوە: (ابن عباس (ﷺ)) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشەودا نایە ناو گۆڕو چرای لەگۆڕدا بۆ داگیرساند)[(٤)].

## پێویستە گۆڕ قووڵ‌و فراوان‌و چاك بكرێت:

(هشام بن عامر) گێڕاویەوە: (کاتێ لەئوحود موسڵمانان تووشی کارەسات هاتن‌و خەڵکی بریندار بوون، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆڕ هەڵکەندن بۆ هەر مرۆڤێ دژوارە، چیمان

---

(١) صحيح: (ص. نس ١٨٩٣) د(٨/٤٤٦/٣١٤٩) (نس ٤/٧٩).

(٢) رابردو باسكرا.

(٣) صحيح (ص. نس ١٧٨٧) (نس ٤/٣٣) (م ٢/٦٥١/٩٤٣).

(٤) حسن (الجنائز ١٤١) ت(٢/٢٦٠/١٠٦٣)

پێ دەفەرمیت؟ فەرموی: (چاڵ لێ بدەن‌و فراوانی بکەن‌و قوڵی بکەن‌و چاك‌و بەسەروبەری بکەن، دوو یان سێ کەس بخەنە ناو چاڵێکەوە، کامە قورئانی پتر دەرخە پێشی بخەن، باوکم سێ یەم کەس بو لەهەمویان زیاتر قورئانی لەبەر بوو، بۆیە پێشیان خست) [1].

لەگۆڕدا (اللحد) (الشق) دروستە، واتە: پانەو پانە گۆڕ هەڵبکەنرێ بە ئاراستەی قیبلە یان بۆ ژێرەوە هەڵکەندرێ ، چونکە هەردووکیان لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کراون، بەڵام یەکەمیان باشترە، (انس) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد لەمەدینەدا پیاوێ هەبوو گۆڕی بە درێژی لێ دەداو یەکێکی تر هەبو بە چاڵی لێ ی دەدا، ئەوان وتیان: ئێمە (استخارة) دەکەین بە پەروەردگارمان‌و بەدوای هەردوو لادادەنێرین، هەرکامێکیان زوتر گۆڕەکەی تەواو کرد لێ ی دەگەڕێین، بەشوێنیاندا ناردن، خاوەن (اللحد)ەکە سەرکەوت، بۆیە بە (اللحد) گۆڕ بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لێ درا) [2].

هەتا گەر مردووەکە ئافرەتیش بێ، هەر پیاوان بۆ ناو گۆڕی شۆڕ دەکەنەوە، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە بووە بە باوو تا ئیمڕۆ موسڵمانان کاری پێ دەکەن.

خزمەکانی مردوو لەخەڵکی تر لەپێشترن مردو شۆڕبکەنەوە، وەکو لەقورئاندا هاتووە: ﴿وَأُوْلُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ﴾[3]. دیسان عەلی (ﷺ) فەرمویەتی: (من پێغەمبەری خوام (ﷺ) شووشت، سەیرم کرد ئەوەی لەمردوو دەبینرێ لەئەوم دا نەبینی، بە مردوویی‌و زیندویی پاکژ بوو، چوارکەس بە خاکیان سپاردو خستیانە سەرکەلەکەو کەسی تر نەء: عەلی‌و عەبباس‌و فەزڵ‌و ساڵح خزمەتکاری پێغەمبەری خودا (ﷺ)و بەدرێژاو درێژی گۆڕی بۆ هەڵکەنراو خشتی لەسەر دانرا چۆن دانانێك) [4].

دروستە مێرد خۆی ژنەکەی بشارێتەوە، وەکو لەگێڕانەوەی عائیشەدا هاتووە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم رۆژەدا تێ ی نەخۆش کەوت هاتە لام، وتم: ئای سەرە. فەرموی: (حەز دەکەم

---

(١) صحيح (الجنائز ١٤٦)، (٤/٨٠)، (٩/٣٤/٣١٩٩)، ت(٣/١٢٨/١٧٦٦)

(٢) اسناده حسن: (جه ٤٩٦/١٥٥٧).

(٣) الأحزاب: ٦.

(٤) اسناده صحيح: كم (١/٣٦٢) (هق ٤/٥٣).

ئەمە بووبایە من زیندوو بام خۆم ئامادەم کردبایو بە خاکم سپارد بایت) [١].

بەڵام ئەمە مەرجە بەمەوە کە ئەو شەوە سەرجێگای نەکردبێ، گەر نا ئەمە دروست نابێت، کەسانی ترن لەپێشترن بۆ ئەمە، گەر بێگانەش بن، وەکو (ئەنەس) گێڕاویەوە: (ئامادەی ناشتنی کچەکی پێغەمبەر (ﷺ) بووینو ئەو لەسەر گۆڕ دانیشتبوو، بینیم فرمێسك بە چاوی دا دەهات، پاشان فەرموی: کەس هەیە لەئێوە ئەم شەو نەچوبێتە لای ژنەکەی؟ (ابو طلحة) وتی: من نەچووم، ئەنجا فەرموی: دابەزە ناوی، ئەویش دابەزییە ناو گۆڕەکەی) [٢].

سوننەتە مردوو لەدواوەی گۆڕەوە بخرێتە ناو گۆڕەوە، وەکو (ابی اسحاق) گێڕاویەوە: (حارث) رایسپارد کە ـ عبدالله بن یزید ـ نوێژی لەسەر بکات، پاشان لەلای قاچەکانیەوە خستی یە ناو گۆڕەوەو وتی: ئەمە یەکێکە لەسوننەتەکان) [٣].

دەبێ مردوو لەگۆڕدا لەسەر لای راستی یەوە دابنرێو رووی لەقیبلە بکرێ، سەرو قاچی بەرەو رووی راستو چەپی قیبلە بێ، هەر لەسەر دەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) تا ئیمڕۆ موسڵمانان کاریان بەمە کردووە.

ئەو کەسەی مردووە کە رادەکێشیتە ناو گۆڕەوە دەڵێ: (بسم الله وعلى سنة رسول الله او ملة رسول الله (ﷺ). (ابن عمر) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) مردووی دەخستە ناو گۆڕەوە دەیفەرمو: (بسم الله وعلى سنة رسول الله) [٤]. لەگێڕانەوەی (البياضي) گێڕاویەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (گەر مردوو لەگۆڕنرا ئەو کەسەی لەکاتی دانانی لەگۆڕدا دەڵێ: (بسم الله، وبالله، وعلى ملة رسول الله) [٥].

سوننەتە ئەو کەسەی لای گۆڕە دوای پڕکردنەوەی گۆڕەکە سێ مشتە خۆڵو خاکی بەسەردا بکات، (ابو هريرة) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر تەرمێ کرد، پاشان هاتە لای

---

(١)صحيح: أ(١٤٤/٦)، ب (١٠١،١٠٢/١٠)، م(١١٠/٧)

(٢) صحيح(الجنائز ١٤٩) خ(٣/٢٠٨/١٣٤٢).

(٣) اسناده صحيح (الجنائز/١٥٠) د(١/٢٩/٣١٩٥).

(٤) صحيح (الجنائز ١٥٢) د(٩/٣٢/٣١٩٧) (ت ١٠٥١/٢/٢٥٥).

(٥) اسناده حسن: (الجنائز/١٥٢) (كم ١/٣٦).

مردوەوە لەلای سەریەوە سێ مشتە خاکی بەسەرداکرد)[١].

## دوای مردوو لەگۆڕنان چەند شتێ سوننەت دەبێت:

(١) بەقەد بستێك گۆڕەکە لەزەوی بەرزبکرێتەوە نەك لەگەڵ زەویدا بکرێت، تا جیابکرێتەوەو بپارێزرێو سووکایەتی لەگەڵدا نەکرێت: جابر(ﷺ) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) گۆڕی بۆ لێ دراو خشتی لەسەر دامەزرێنرانو، نزیکی بستێ لەزەوی بەرزکرایەوە)[٢].

(٢) گۆڕەکە قیت بکرێتەوە: (سفیان التمار) دەڵێ: (رأیت قبر النبي (ﷺ) مسنما)[٣]. واتە: گۆڕی پێغەمبەرم بینی (ﷺ) بەرز کرابۆوە.

(٣) نیشانە بکرێ بە بەردو تاوێرێ یان شتەکی ترو، تا خزمەکانی خۆی لەتەکدا بنێژێت: (المطلب بن ابي وداعة) گێڕاویەوە: (کاتێ (عثمان بن مظعون) گیانی سپارد جەنازەکەی براو بە خاك سپێرا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە پیاوێ کرد تاوێرێ بێنێ، ئەو نەیتوانی تاوی بداتێ، پێغەمبەر (ﷺ) چوو هەڵی گرت، سپیایی باڵەکانی ئەوم بینی کە بەردەکەی هەڵگرتبوو، پاشان بردی لەتەك سەریەوە دایناو فەرموی: گۆڕی براکەمی پێ ئەناسمەوەو خزمانی خۆم لەتەك ئەودا دەنێژم)[٤].

(٤) لەتەك سەریەوە بوەستێو داوای خۆڕاگر (التثبیت)ی بۆ بکەیتو داوای لێ بوردنی بۆ بکەیتو فەرمان بە ئامادەبووان بکرێ کە ئەوانیش ئەمە ئەنجام بدەن، (عثمان بن عفان) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لە بە خاك سپاردنی مردوو لەخۆ دەبۆوە لەسەری دەوەستاو دەیفەرموو: داوای لێ خۆش بوون بۆ براکەتان بکەنو داوای سەقام گیری بۆ بکەن ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت)[٥].

---

(١) صحیح (الارواء ٧٥١) (جه ١٥٦٥/٤٩٩/١).

(٢) اسناده حسن (الجنائز ١٥٣) حب(٢١٦٠) هق(٤١٠/٣).

(٣) صحیح (الجنائز/١٥٤) خ(١٣٩٠/٢٥٥/١).

(٤) حسن (الجنائز ١٥٥) د(٣١٩٠/٢٢/٩).

(٥) صحیح الإسناد (الجنائز ١٥٦) د(٣٢٠٥/٤١/٩).

. دروستە لەکاتی ناشتنی دا بە مەبەستی پەند وەرگرتن لەمردن بۆ ئەوانەی لەئەوێن‌و دوای ئەوان لەکاتی شاردنەوە خەڵکی دابنیشن، (براء بن عازب) گێڕاویەوە: (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لەگەڵ تەرمەکی ئەنصارەکان رۆیشتین، گۆڕمان لێ دا، کاتێ خرایە گۆڕەوە پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت‌و ئێمەش لەدەوری دا دانیشتین، وەك بڵێ ی باڵندە بەسەر سەرمانەوە بێ، دارچیلکەیەکی پێ بوو لەزەوی دەدا، ئەنجا سەری بەرزکردەوەو فەرموی: (استعیذوا من عذاب القبر) دوو تا سێ جار) پاشان فەرموی: (گەر بەندەی بڕوادار سەروبەری دابڕانی بوو لەدونیاو خەریکی رۆیشتن بو بۆ پەسلان، فریشتەی دەم‌و چاو سپی وەکو خۆر دادەبەزنە سەری، کفنی بەهەشتیان پێ یە، لەگەڵ بۆن‌و بەرامەی بەهەشتدا، تا ئەوەندە چاو بڕی بکات لەلای دادەنیشن، پاشان فریشتەی مردن (س) دێ لەلای سەریەوە دادەنیشێ‌و دەفەرمێ: (ئەی دەروونی دڵنیا وەرە بۆ لێ بوردن‌و رەزای خودا) فەرموی: (چۆن ئاو لەدەمی کوندەوە دێتە دەر ئاوا دێتە دەر). کاتێ گرتی، چاو تروکاندنێ وازی لێ ناهێنێ، ئەنجا دەیخەنە ئەو کفن‌و بۆنەوە (واتە رۆحەکەی)، وەکو خۆشترین بۆنی میسك لەزەوی دا بۆنی دێ، ئەنجا بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان، بە لای هەر دەستەیەکی فریشتە دا گوزەر بکرێ دەڵێن: ئەم بۆنە خۆشە چییە؟! دەڵێن: فلانی کوڕی فیسارەو بە جوانترین ناوەکانی ناوی دەبەن کە لەدنیادا پێ ی گوتراوە، تا دەگاتە ئاسمانی دنیا، بۆی دەکەنەوە، فریشتە گەورەکان لەهەر ئاسمانێکدا لەگەڵی دا دەڕۆن تا بە ئاسمانەکەی تری دەگەیێنن، تا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم، ئەو کاتە خوای گەورە دەفەرمووێ: ناوی بەندەی من لە(علیین)دا بنووسن‌و بۆ زەوی بگێڕنەوە، من لەزەویم دروست کردووەو بۆ ئەوێ ی دەگێڕمەوەو جارەکی تر، ئەنجا رۆحی بۆ لاشەی دەگەڕێتەوەو هەردوو فریشتەکانی دێن لەلای دادەنیشن‌و لێ ی دەپرسن: پەروەردگارت کێیە؟ دەڵێ: پەروەردگارم (الله)یە، لێ ی دەپرسن: ئایینت چی یە؟ دەڵێ: ئیسلامە، پێ ی دەڵێن: ئەو پیاوە کێ بوو لەناوتاندا رەوانەکرابوو؟ دەڵێ: پێغەمبەری خوایە (ﷺ) دەڵێن:چ دەزانی؟ دەڵێ: قورئانم خوێند کە کتێبی خوایەو بڕوام پێ هێناو بەراستم دانا، ئەنجا لەئاسمانەوە بانگێشە دەکرێ: بەندەی من راستی کرد، بەهەشتی بۆ رابخەن‌و بەرگی بەهەشتی بکەنە بەرو دەرگایەکی بەرەو بەهەشت بۆ بکەنەوە، لەبۆن‌و بەرامەی بەهەشتی بدەنێ، بە درێژایی بینینی چاو گۆڕی فراوان دەبێت. ئەنجا پیاوەکی دەم‌و چاو جوانی دێتە لا، بەرگەکی کەشخەی لەبەردایەو بۆنەکی خۆشی لێ دێ پێ ی دەڵێ: مژدەبێ بەوەی ئەم رۆژە بەڵێن پێ

دراوەی بۆ ئاسان کردی؟ دەپرسێ تۆ کێ ی؟ دەڵێ: من کرداری باشی تۆم، ئەنجا دەپرسێ: خوایە زوو قیامەت دابێنە تا بگەڕێمەوە لای خێزانو ماڵی خۆم فەرموی: گەر بەندەی بێ بڕوا سەروبەری دنیا چۆل کردنی هاتو خەریك بەرەو پەسلان بڕوات کۆمەڵە فریشتەبەك کە دەمو چاو ڕەشن دادەبەزنە سەری لەئاسمانەوە، بەرگەکی زبری بۆ دێنن، ئەوەندەی چاو بڕ بکات دادەنیشن، دوایی فریشتەی مردن دێ لەتەك سەرییەوە دادەنیشێو دەڵێ: (ئەی دەروونی پیسو چەپەڵ وەرە دەر بۆ رقو خەشمی خودا. فەرموی: لەلەشی جیا دەبێتەوە ئەویش چۆن سوژن لەخوری تەڕدا رادەکێشرێ ئاوا ئەو رۆحە رادەکێشێو دەیگرێ، گەر گرتنی ئەوەندەی چاو تروکاندنێ لێ ی نا گەڕێ تا دەیخاتە ناو ئەو بەرگە زبرەیەو وەکو بۆنگەنیو ترین شت لەسەر زەوی بۆنی ناخۆشی لێ دێت، بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان، بە هەر کوێ دا رەت دەبن مسۆگەر فریشتەکان دەڵێن: ئەم گیانە چەپەڵە چییە؟ دەڵێن: فلانی کوڕی فیسارەو بە ناخۆشترین ناوەکانی لەزەوی دا ناوی هەڵدەدرێت، تا دەگەیەنرێتە ئاسمانی دنیا، داوادەکرێ بۆی بکرێتەوە ناکرێتەوە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاء وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾[1]. پاشان خوا دەفەرمووێ ناوی لە(سجين)دا بنووسن لەزەوی ژێرەوەدا، ئەنجا گیانی بە توندی فڕێ دەدرێت، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾[2]. روحی بۆ ناو لەشی دەگەڕێتەوە. ئەنجا دوو فریشتە دێنە لای لەتەکیەوە دادەنیشنو پێ ی دەڵێن: کێ پەروەردگاری تۆبوو؟ دەڵێ: ها، ها، نازانم. دەڵێن: ئایینت چی بوو؟ دەڵێ: ها، ها، نازانم. دەپرسن: ئەو پیاوە کێ بوو لەناوتاندا هات؟ دەڵێ: ها، ها، نازانم، ئەنجا بانگ کەرێ لەئاسمانەوە بانگ دەکات: ئەو درۆی کرد، ئاگری بۆ رابخەنو دەرگایەکی بەرەو ئاگر بۆ بکەنەوە، ئەنجا گڕو گرەبای ئەوێ ی بۆ دێ، ئەو گۆڕە دەچێتەوە پاڵ یەکتری تا هەموو پەراسووەکانی تێك دەشکێنێت، ئەنجا پیاوەکی دەمو چاو دزێوو پۆشاك ناشیرینو بۆنگەنیو دێتە لایی و پێ ی دەڵێ: مژدەبێ بەوەی سزای دەدات، ئەمە ئەم رۆژە بوو بەڵێنت پێ ی درابوو، ئەنجا دەڵێ: تۆ کێ ی، دەمو چاوت شەڕیان لێ دێ؟ دەڵێ: من کاری خراپی تۆم، ئەنجا دەڵێ: خوایە قیامەت نەیەت). لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە:

---

(١) الأعراف: ٤٠.

(٢) الحج: ٣١.

(پاشان کەسێکی کوێرو کەڕو لاڵی بۆ دەنێرێ چەکوچەکی پێ یە گەر لەچیای بدات دەیکات بە خۆڵ، ئەنجا گورزەکی لێ دەدات دەیکات بە خۆڵ، پاشان خوا دەیگێڕێتەوە بۆ دۆخی رابردوو، ئەنجا زەبرەکی تریشی لێ دەداتەوە، هاوارەکی لێ هەڵدەستێ جگە لەمرۆڤو جنۆکە هەموو شتێ گوێ بیستی دەبێت) [١].

## پرسەو سەرەخۆشی (التعزية):

پرسەو سەرەخۆشی مردوو دروستە، کە دڵخۆشی یان دەداتەوەو لەخەمەکانیان دوور دەخاتەوە، هانیاندەدات بۆ ئارامو دان بەخۆداگرتنو رازی بوون، بەو شتانە کە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) سەلماون، کە دەیزانێو ئامادەی دەکات، گەر نا بە قسەی باش کە مەبەستەکە دێنێتە دیو پێچەوانەی شەرع نییە:

(اسامة) کوڕی (زيد) گێڕاویەوە: (لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، یەکێ لەکچەکانی کەسێکی بە شوێنی دا نارد بانگی بکاتو هەواڵی بداتێ، کە منداڵەکی لەسەرە مەرگدایە، پێغەمبەر (ﷺ) بە قاسیدەکەی فەرموو: بڕۆوە لای پێ ی بڵێ: ئەوەی خوابیبات هی خۆیەتی، ئەوەی بیدات هەر هی خۆیەتی، هەمو شتێ لای ئەو کاتەکی دیاری کراوی هەیە، با ئارام بگرێو بە نیازی پاداشت بێ...) [٢].

---

(١) صحيح (الجنائز ١٥٩) (أ ٧/٧٤/٥٣) (د: ١٣/٨٩/٤٧٢٧).

(٢) متفق عليه: خ(١٢٨٤/٣/١٥٠) م(٢/٦٣٥/٩٢٣).

## پێویستە لەدووشت خۆی بپارێزێ، هەر چەندە لای خەڵکیش بووبێتە بە نەریت:

(١) کۆبونەوە لەشوێنەکی تایبەتی وەکو خانوو گۆڕستانو مزگەوت بۆ پرسەو سەرەخۆشی.

(٢) ماڵی مردوو خواردن بۆ ئەو میوانانە ئامادە بکەن کە دێن بۆ پرسە:

لەگێڕانــەوەی (جریــر بــن عبــدالله البجلــی) دا هــاتووە: (ئێمــە بــۆ مــاڵی خــاوەن مــردو کۆدەبوینەوە دوای شاردنەوەی، خواردنمان بۆ ئامادە دەکردن لەبەر گریانی ئەوان) [١].

سوننەتە خزمانی مردوو دراوسیێ کانی خواردن بۆ ماڵی مردوو ئامادە بکەنو تێریان بکەن، (عبدالله بن جعفـر (ﷺ)گێڕاویـەوە: کـاتێ هـەواڵی شـەهید بـوونی (جەعفـەر (ﷺ)) هـات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (خواردن بۆ ماڵی جەعفەر ئامادەبکەن، چـونکە تووشـی کارەسـاتێ هاتون سەر قاڵی کردون) [٢].

## ئەو شتانەی سوود بە مردوو دەگەیێنن لەکردەوەکانی خۆی:

**(١) پاڕانەوەی موسڵمان بۆی:** وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ...﴾[٣].

واتــە: ئەوانــەی دوای ئــەوان هــاتون دەڵــێن: (پــەروەردگارمان لێمــان خــۆش ببــە، وە لەوبرایەنەمان کە پێش خۆمان بڕوایان هێناوە...).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (پاڕانــەوەی موســڵمان پاشــەملە قبوڵــە، لەتــەك ســەریەوە فریشتەیەك دانراوە، هەر کە بۆ براکەی پاڕایەوە، ئـەو فریـشتە بریکـارە دەڵـێ: ئـامین، هـەمان ئەوەندە بۆ تۆش بێت) [٤].

**(٢) دانەوەی قەرز لەبڕی ئەو لەهەرکەسێکەوە بێ:** وەکو رابردوو لەقەرزی (ابي قتادة)دا کە دوو دیناری لەبریتی مردوێك دا.

**(٣) گێڕانەوەی ڕۆژووی نەزرو هی تر،** وەکو (سعد بن عبادە) گێڕاویەوە: (پرسم بە پێغەمبــەری

---

(١) صحيح (ص.جه ١٣٠٨) جه (١/٥١٤/١٦١٢).

(٢) حسن: (ص.ج ١٠١٥) (د: ٨/٤٠٦/١٣١١٦).

(٣) الحشر: ١٠.

(٤) صحيح (ص.ج ٣٣٨١) م(٤/٢٠٩٤/٢٧٣٣).

خوا (ﷺ) کرد: من دایکم مردووە نەزری لەسەرە؟ فەرمووی: (اقضه عنه)[١]. واتە: بۆی جێبەجێ بکە.

**(٤) ئەو کارانەی منداڵی باش دەیکات:** خوا دەفەرمێ: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾[٢].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (حەڵاڵترین شت ئەوەیە مرۆڤ بە رەنجی خۆی دەیخوات، منداڵ بەشێکە لەرەنجی پیاو)[٣].

**(٥) بەجێ هێشتنی شوێنەواری باشو خێری بەردەوام:** (ﷺ) فەرموویەتی: (گەر مرۆڤ مرد، کارو کردەوەی ئەو لەدنیادا دەپچڕێ لەسێ شت نەبێ: خێری بەردەوام (صدقة جارية)، یان زانستێ سوودی لێ ببینرێ، یان منداڵەکی چاك دوعای بۆ بکات).

## سەردانی گۆڕستان

دروستە سەردانی گۆڕەکان بکرێ بۆ پەند وەرگرتن، بەو مەرجە ئەو کارانە نەکات کە خەشمی خوای تێ دایە وەکو پاڕانەوە لەمردوو، وەکو خۆدا داواکردنی فریاکەوتن (الإستغاثة) لەغەیری خواو شتی تر وەکو خوداو بەخوای بزانێت .

(ابو سعيد الخدري) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (كنت نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها فان فيها عبرة، ولا تقولوا ما يسخط الرب)[٤]. واتە: لەمەوپێش من لەسەردانی گۆڕەکان رێگام لێ گرتبون، بەڵام سەردانی بکەن، چونکە پەندی تێ دایە، قسەی وا مەکەن پەروەردگار توڕە بکەن.

پیاوو ژنیش وەکو یەك وان لەم رێگا پێ دانەدا، گەڕاوەتەوە کە عائیشە (رضي الله عنها) پرسیاری لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد، گەر چوومە سەردانی گۆڕەکان چی بڵێم: ئەوەی دەیڵێ فێری دەکاتو قەدەغەی ناکات، دەری نەخست کە ژنان بۆیان نییە سەردانی گۆڕەکان بکەن.

---

(١) متفق عليه: خ(٥/٣٨٩/٢٧٦١) م(٣/١٢٦٠/١٦٣٨).

(٢) النجم: ٣٩.

(٣) صحيح (الارواء/ ١٦٢٦) (د ٩/٤٤٤/٣٥١١). (ت ٢/٤٠٦/١٣٦٩).

(٤) صحيح (الجنائز/١٧٩) (البزار/٨٦١/٤٠٧/١).

**هەندێ لەو شتانەی لەتەك گۆڕەكاندا دەكرێ حەرامە:**

**(١) كوشتنەوە بۆ خودا:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفرمووێ(لا عقر فی الإسلام). (عبدالرزاق بن همام) دەڵێ: (لەتەك گۆڕدا مانگا یان مەڕ یان دەكوشتنەوە) [١].

**(٢ ـ ٦): ئەم كارانەی لەم فەرمودەیەدا هاتووە:** (جابر (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە: (نهی رسول الله ان يجصص القبر، وان يقعد عليها، وان يبنى عليه، او يزاد عليه، او يكتب عليه) [٢].

واتە: نابێت قەبر گەچكاریی بۆ بكرێت، یا لەسەر قەبر دابنیشن، یا بینای لەسەر درووست بكەن، یا لەسەری بنووسرێت.

**(٧) نوێژ كردن بەرەو گۆڕ:** وەكو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تصلوا الى القبور) [٣].

واتە: نوێژ بەرەو گۆڕ مەكەنو رووی تێ مەكەن.

**(٨) نوێژ لەكن گۆڕ مەكەن گەر رووشی تێ نەكەن،** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الأرض كلها مسجد الا المقبرة والحمام) [٤]. واتە: زەوی هەمووی مزگەوتە، گۆڕستانو گەرماو نەبێت.

**٩- دروست كردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەكان:** (عائیشە) و(ابن عباس گێڕاویانەوە: (كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش كەوت پۆشاكی نیشانەداری(الخميصة) دا بە دەموچاویدا كاتێ لێی بێزار دەبوو لەسەر دەموچاوی خۆی لادەدا، فەرموی: ئاوەها(لعنة الله على اليهود والنصارى اتخذوا قبور انبيائهم مساجد، يحذر ماصنعوا) [٥]. نەفرینی خوا لە جولەكەو مەسیحی یەكان گۆڕی پێغەمبەرانیان دەكردە مزگەوت. بۆ ئاگاداری لەوەی كردویانە).

عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو نەخۆشیەدا كە وەفاتی كرد تێیدا فەرموی:(لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور انبيائهم مساجد). عائیشە دەڵێ: گەر لەبەرئەوە

---

(١) اسناده صحيح (الجنائز ٢٠٣) د(٣٢٠٦/٤٢/٩).

(٢) اسناده صحيح (الجنائز ٢٠٤) م(٩٧٠/٦٦٧/٢) (نس ٨٦/٤).

تێبینی: وەكو لە(سبل السلام/ج٢/ باب الدفن/ل:١٧٧)دا هاتووە لای جەماوەری زانایان گەچ نەكردنی گۆڕو قسڵ نەكردنی بۆ تەنزیهە.

(٣) صحيح (ص.ج ٧٣٤٨) م(٩٧٢/٦٦٨/٢) د(٣٢١٣/٤٩/٩).

(٤) صحيح (ص.ج ٢٧٦٧) (د: ٤٨٨/١٥٨/٢) ت(٣١٦/١٩٩/١).

(٥) صحيح: (ص. ج ٢٧٦٧) و(٤٨٨/١٥٨/٢).

نەبوایە گۆڕەکەیم بەرز دەکردەوە، بەڵام لەوە دەترسم بکرێتە مزگەوت)[١].

**١٠ـ کردنی گۆڕەکان بە جەژن** لەکاتو وەرزی دیاری کراودا هەراو هوریا بۆ خواپەرستیو شتی تر. (ابوهريرة) گێڕاویەوە: (لاتتخذوا قبري عيدا، ولاتجعلوا بيوتكم قبورا، وحيثما كنتم فصلوا فان صلاتكم تبلغني). واتە: گۆڕی من مەکەن بە جەژن، ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕ، لە هەر کوێیەك بن سەلاوەتی ئێوەم پێ دەگات)[٢].

**١١ـ سەفەرکردن بۆ مزگەوتەکان: پێغەمبەر فەرموویەتی** (لاتشد الرحال الا الى ثلاثة مساجد: المسجد الحرام ومسجد الرسول ـ ص ـ والمسجد الاقصى)[٣] .

واتە: سەفەرناکرێ بۆ هیچ مزگەوتی بۆ سێ مزگەوت نەبێ: مزگەوتی حەرامو مزگەوتی پێغەمبەرو مزگەوتی ئەقسا.

**١٢ـ هەڵکردنی چراو روناکی لەسەری:** چونکە بیدعەیەو سەلەفی باش ئەمەیان نەکردووە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار).

واتە: بیدعە لادانە،هەموو لادانێکیش بۆ ئاگری دۆزەخە.

**چونکە زیادە خەرجەو حەرامە بەدەق:**

(ﷺ) فەرمویەتی: (خوا سێ شتی لەئێوە قەدەغەکردووە: قسەو قسەلۆك و ماڵ بەفیڕۆدانو زۆر پرسیارکردن)[٤] .

**١٣ـ شکاندنی ئێسقانی مردوو:** (ﷺ) فەرمویەتی: (شکاندنی ئێسقانی بڕوادار بەمردوویی، وەکو ئەوە وایە بەزیندوویی ئێسقانی بشکێنێت)[٥] .

(١) متفق عليه (خ ٨/١٤٠/٤٤٤) م(١/٣٧٧/٥٣١) نس(٢/٤٠).

(٢) صحيح (ص.ج ٧٢٢٦) (د: ٦/٣١/٢٢٦)

(٣) متفق عليه: (خ ٣/٦٣/١١٨٩) م((٢/١٠١٤/١٣٩٧).

(٤) متفق عليه: خ(٣/٣٤٠/١٤٧٧) (م: ٣/١٣٤٠/١٧١٥).

(٥) صحيح (ص.ج ٢١٤٣) (د: ٩/٢٤/٣١٩١) (جه ١/٥١٦/١٦١٦).

# باسی رۆژوو (كتاب الصيام)

رۆژوی رەمەزان روکنەکی ئیسلامەو فەرزەکە لە فەرزەکانی: خوا فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾(١).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، رۆژوتان لەسەر فەرزکراوە، چۆن لەسەر کەسانی بەر لەئێوە فەرزکرابوو، شایەد تەقوا بکەن.

﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾(٢).

واتە: مانگی رەمەزان ئەو مانگەیە قورئانی تێدا دابەزیوە کە رێنومای تێدا بۆ خەڵکی، چەند رونکردنەوەیەکی تێدایە لەرێنوماییو جیاوازی کردن لەنێوان حەقو ناحەقدا، کێ مانگی بینی لەئێوە با بەرۆژووبێت.

لە(ابن عمر)ەوە، (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شەهادەی (ان لا اله الا الله، وان محمدا رسول الله)و نوێژو زەکات و حەجی کەعبەو رۆژوی رەمەزان)(٣).

هەموو ئومەتی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوە کە رۆژووی رەمەزان واجبەو یەکێکە لە روکنەکانی ئیسلام، کە لەئاییندا بەپێویست زانراوان، ئەو کەسەی نکۆڵییان لێ بکات بڕوای بەئیسلام نییەو هەڵگەڕاوەیە(٤).

---

(١) البقرة: ١٨٣.

(٢) البقرة: ١٨٤.

(٣) رابردو باسکرا.

(٤) فقه السنة (١/٣٦٦).

## گەورەیی ڕەمەزان و ڕۆژوو:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (من صام رمضان ایمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه)[1] . واتە: هەر کەسێ بەرۆژوبێ لەڕەمەزاندا بەئیمانو نیازی پاکەوە لەگوناهەکانی ڕابردووی خۆش بوون هەیە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (خوای شکۆدار فەرمویەتی: هەموو کارەکانی مرۆڤ بۆ خۆیەتی، تەنیا ڕۆژوو نەبێ، ئەوە بۆ منە من پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژوو پارێزەرە، گەر یەکێ لەئێوە بەرۆژووبوو ناڕواتە لای ژنو ناقیژێنێو هاوارناکاتو کاری نەزانانە ناکات، گەر کەسێ جنێوی دایە یان شەڕی لەگەڵدا کرد با دووجار بڵێ: من بەڕۆژووم، سوێند بەوکەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خودا لەقیامەتدا لە بۆنی میسك خۆشترە، ڕۆژووەوان دوو خۆشی هەیە: گەر ڕۆژوی شکاند پێی کامەران دەبێ، گەر بەپەروەردگاری گەیشت بەڕۆژوەکەی کامەران دەبێت)[2] .

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لەبەهەشتدا دەرگایەك هەیە بەناوی ڕەییان ڕۆژووەوانان لێی دەچنە ژوورەوەو کەسی تر نەء، دەگوترێ: ڕۆژوەوانان لەکوێنە؟ هەڵدەستن، جگە لەوان کەسی تری لێوە ناچنە ژورەوە)[3] .

واجبی ڕۆژوی ڕەمەزان بەبینینی مانگی یەك شەوە (هلال): پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (صوموا لرؤيته وافطروا لرؤيته، فان غمي عليكم الشهر فعدوا ثلاثين)[4] . واتە: (بەبینینی بەڕۆژووبنو بەبینینی ڕۆژوو بشکێنن، گەر مانگ هەور داپۆشی بوو سی ڕۆژ بژمێرن).

## بەچی مانگەکە دەچەسپێ؟

(بەبینینی مانگی یەکشەوە ڕەمەزان دەچەسپێ، مادام کەسێکی ڕاستو دادوەر بینی بێ، یان گەر شەعبان بووە سی پڕ). (ابن عمر) دەڵێ: (خەڵکی سەیری مانگی یەکشەوەیان دەکرد،

---

(١) متفق عليه: خ(١٩٠١/١١٥/٤) (نس -١٥٧/٤) (جه ١٦٤١/٥٢٦/١) م(٧٦٠/٥٢٣/١).

(٢) متفق عليه: (خ ١٩٠٤/١١٨/٤) (م ١١٥١ ـ ١٦٣/٨٠٧/٢).

(٣) متفق عليه: (خ ١٨٩٦/١١١/٤) (م ١١٥٢/٨٠٨/٢).

(٤) متفق عليه: م(١٠٨١ ـ ١٩/٧٦٢/٢) خ(١٩٠٩/١١٩/٤).

بەپێغەمبەری خوام (ﷺ) ڕاگەیاند من بینیومە، ئەنجا بەڕۆژووبوو فەرمانی بەخەڵکی کرد ئەوانیش بەڕۆژووبن)[١] . گەر مانگی یەك شەوە نەبینرا لەبەر هەوربێ یان هۆکاری تر ئەوە سی شەعبان تەواودەکەن، وەکو لەگێڕانەوەی تردا هاتووە، بەڵام بینینی شەووال بەشاهیدی دوو کەس دادەمەزرێت: (عبدالرحمن بن زەید بن خطاب) گێڕاویەوە: (ئەو لەو ڕۆژەدا وتاری دا کە گومانی تێدا هەبوو، وتی: من لەگەڵ یارانی پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتومو پرسیارم لێیان کردووە، ئەوان بۆیان گێڕاومەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بەبینینی بەڕۆژووبنو بەبینینی ڕۆژوو بشکێنن، خۆی بۆ ئامادە بکەن بۆ خواپەرستی، گەر هەوربو سی ڕۆژ تەواوبکەن، گەر دوو موسڵمان گەواهییاندا بەڕۆژووبنو بیشکێنن)[٢] .

میری مەککە (الحارث بن حاطب) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندوین بەبینینی مانگ بەڕۆژوو بین، گەر نەمان بینی دوو کەسی دادوەر شاهیدیان دا شاهیدی ئەوان وەردەگرین)[٣] .

ئەم وتەیەی ئەو: (فان شهد شاهدان مسلمان فصوموا وافطروا).. لەگێڕانەوەی (عبدالرحمن ابن زید)دا وەفەرمودەی ئەو: (فان لم نره وشهد شاهدا عدل نسكنا بشهادتهما) لەگێڕانەوەی (الحارث)دا، هەردوو گێڕانەوەکە ئەوە دەردەخەن کە شاهیدی یەك پیاو دروست نییە لە بەڕۆژوو بوونو شکاندنی دا، بەڵام بەڕۆژووبوونەکە بەبەڵگە لەم بازنەیە چووە دەرو، ڕۆژو شکاندن (الافطار) مایەوە، چونکە هیچ بەڵگەیەك نییە کە بڵێ دروستە شاهیدی یەك کەس وەربگیرێت). (تحفة الاحوذي/٣/٣٧٣ـ ٣٧٤) بەدەسکارییەوە.

**ئاگاداری:** هەرکەسێ مانگی یەك شەوەی بینی تا خەڵکی بەڕۆژوو نەبن نابێ بەتەنیا بەڕۆژووبێ، لەئەبو هورەیرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:(ڕۆژو ڕۆژێکە هەمووی تێیدا بەڕۆژوو دەبن، شکاندن ڕۆژێکە دەیشکێنن، قوربانی ڕۆژێکە قوربانی دەکەن)[٤] .

---

(١) صحيح (الارواء/٩٠٨) فقه السنة (١/٣٦٧) (د: ٦/٤٦٨/٢٣٢٥).
(٢)صحيح (ص.ج ٣٨١١) (نس ٤/١٣٣/١٣٢). بێ وشەی (مسلمان).
(٣) صحيح (ص.د ٢٠٥) (د: ٤/٤٦٣/٢٣٢١).
(٤) صحيح (ص.ج ٣٨٦٩) (ت ٦٩٣//٢/١٠١).

## ڕۆژوو لەسەر کێ واجب دەبێت:

(زانایان کۆکن کە ڕۆژوو لەسەر هەموو موسڵمانەکی ژیری باڵغو دروستو لە سەفەر نەبێت (المقیم) واجبە، دەبێ ژن بێ نوێژ نەبێو زەیستانی نەبێت)[١] . لەسەر مرۆڤی ناعاقڵو شێت وباڵغ واجب نابێ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (قەڵەمو خامە لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: شێت تا چاك دەبێتەوە، خەوتوو تا بێدار دەبێتەوە، منداڵ تا باڵغو شەیتانی دەبێت)[٢] .

بەڵام واجب نەبوونی لەسەر کەسێك دروست نییەو لەماڵەوە نییەو لەسەفەرە، لەبەر ئەم ئایەتە قورئانییە: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾[٣] . واتە: گەر کەسێ نەخۆش بوو یان لەسەفەرو گەشتدابوو با ڕۆژانی تر بیگرنەوە.

گەر نەخۆشو سەفەرچی بەڕۆژوو بوون بۆیان دروست دەبێ، چونکە شکاندن بۆ ئەوانە ڕێگەپێدانە، گەر نەیشکێنن ئەوە باشترە.

## کامیان چاکترە؟ ڕۆژوو شکاندن یان ڕۆژوو گرتن؟

گەر نەخۆشو گەشتیار ڕۆژوو ئازاری نەدەدان بەڕۆژووبوون باشترە، ئەگەر بینیان بەڕۆژووبوون ئازاریان دەدات ئەوە شکاندنی چاکترە.

(أبي سعید الخدري) گێڕاویەوە: (لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لەڕەمەزاندا غەزاو خەباتمان دەکرد، هەبوو لەئێمە بەڕۆژوو دەبوو، هەبوو بەڕۆژوو نەبوو، نەئەوەی بەڕۆژووبوو گلەیی لەو کەسە هەبوو بەڕۆژوو نییە، نەئەوەی بەڕۆژوو نەبوو گلەیی لەو کەسە هەبوو کە بەڕۆژوو بوو، دەیانبینی گەر بتوانی بەڕۆژووبی چاکترە، گەر بێ تواناو هێزبێ ئەوا بەڕۆژو نەبوونەکە باشترە)[٤].

---

(١) فقه السنة: (٥٠٦/ط)ط. الريان.

(٢) صحيح (ص.ج ٣٥١٤)(ت ٦٩٣/١٠٢/٢).

(٣) البقرة: ١٨٤.

(٤) صحيح : (ص.ت ٥٧٤) م(١١٦ ـ ٢/٧٨٧/٩٦) ت(٧٠٨/١٠٨/٢).

بەلام واجب نەبوونی لەسەر ژنی بێنوێژو زەیستانی، لەبەر ئەو فەرمودەیە: (ئەی گەر ژنی بێنوێژ نوێژی نەکردو ڕۆژووی نەگرت، ئەمە کەمی لەئاینی ئەو نییە؟)[1] .

گەر ژنی بێنوێژو زەیستانی بەڕۆژوو بوون دروست نابێ، چونکە مەرجە ئەو ژنەی بێنوێژەو زەیستانە ڕۆژوو قەزا بکاتەوە:

عائیشە گێڕاویەوە: (لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) گەر دەکەوتینە بێنوێژییەوە فەرمانمان پێ دەکرا ڕۆژوو بگێڕینەوە، بەلام بۆ نوێژ گێڕانەوە فەرمانمان پێ نەدەکرا)[2] .

## ڕۆژوو لەسەر پیرەمێردو پیرەژن و ئەو نەخۆشە واجب نییە کە هیوای چاك بوونەوەی لێ ناکرێت:

گەر ئەو کەسەی پیرو بەساڵداچوو بو بەڕۆژو نابێ، لە بریتی هەر ڕۆژێك مشتێ خواردن دەدات بە هەژارێك، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾[3] .

(عطاء) دەڵێ: لە(ابن عباس)م بیستوە ئەم ئایەتە نەسخ نەبۆتەوەو ئەوە پیاوو ژنی بەتەمەنن ناتوانن بەڕۆژوبن و لەبریتی ئەوە لەجیاتی هەر ڕۆژێ خواردن بە هەژارێك دەدەن)[4] .

## ئافرەتی دووگیان(سك پڕ)و شیردەر (الحبلى والمرضع):

گەر ژنی سك پڕو شیردەر نەیان توانی بەڕۆژووبن، یان لەمنداڵەکەیان ترسان، بۆیان هەیە فیدیە بدەن قەزایان لەسەر نییە.

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (ڕێگا بە پیرەمێردو پیرەژن درا گەر بتوانن بەڕۆژووبن، گەر مەبەستیان بوو دەتوانن بیشکێنن، لەجیاتی ئەوە بۆ هەر ڕۆژێ هەژارێك نان بدەن و قەزایان لەسەر نییە، پاشان نەسخ بۆوە بە ئایەتی: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ

---

(١) صحيح (مختصر خ ٩٥١) خ(٤/١٩١/١٩٥١).

(٢) صحيح (ص.ت ٦٣٠) م(١/٢٦٥/٣٣٥).

(٣) البقرة: ٨٤.

(٤) صحيح (الارواء/٩١٢) خ(٨/١٧٩/٤٥٠٥)..

عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾[١] . ئەمە بۆ پیرەپیاوو پیرەژن دامەزرا گەر نەتوانن بەڕۆژووبن، وە بۆ دووگیانو شیردەر گەر ترسان، بابیشكێننو لەبریتی ئەوە هەر ڕۆژە هەژارێك نان بدەن)[٢] .

دەڵێ: (گەر دووگیان لەخۆی ترساو شیردەر لەمنداڵەكەی لەڕەمەزاندا، ئەوان ڕۆژو دەشكێننو لەبریتی هەر ڕۆژێ هەژارێ نان دەدەنو ڕۆژوو ناگرنەوە)[٣] .

(نافع) گێڕاویەوە: (ابن عمر) كچەكی هەبوو لای پیاوەكی قورەیشی بوو، دوگیان بوو، لەڕەمەزاندا تینووبوو، (ابن عمر) فەرمانی پێ كرد كە بیشكێنێو لەبریتی هەر ڕۆژێ خۆراكی هەژارێك بدات)[٤] .

## بڕی ئەو خۆراكەی واجبە:

ئەنەسی كوڕی مالیك گێڕاویەوە: (ساڵێكیان ناتوانێ بەڕۆژووبێ تەشتێ تێ كوشین (الثريد) ئامادە دەكات سی هەژار بانگ دەكات تێریان دەكات)[٥] .

## ڕوكنەكانی ڕۆژوو:

١): نیەت (نیاز): وەكو خوا فەرمویەتی: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾[٦] . واتە: فەرمانیان پێ كراوە تەنیا خودا بپەرستن بەنیازی پاك، ئایین بۆ ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كاروكردەوەكان بەنیەتە، بۆ هەركەسێ ئەوە هەیە كە لەنیازی خۆی گرتووە)[٧] .

---

(١) البقرة: ١٨٥.
(٢) اسناده قوي (هق: ٢٣٠/٤).
(٣) صحيح (عزاه الألباني في الارواء (١٩/٤) الى الطبري وقال: (اسناده صحيح على شرط مسلم).
(٤) صحيح الاسناد (الارواء: ٢٠/٤) قط(٢/٢٠٧/١٥).
(٥) صحيح الإسناد (الارواء ٢١/٤) قط(٢/٢٠٧/١٦).
(٦) البينة: ٥.
(٧) رابردو باسكرا.

پێویستە بەر لەنوێژی بەیانی دا نیەتەکە هەموو شەوێك بگوترێ، وەکو (حفصة) گێڕاویەوە: (هەرکەسێ بەر لە بەیانی نیەتی ڕۆژوو نەیەنی ڕۆژووی بۆ نییە)[١] .

**٢) خۆگرتنەوە لەو شتانەی ڕۆژو دەشکێنن لە بەرەبەیانەوە تا خۆر ئاوابون:** خوا فەرمویەتی: ﴿فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ﴾. [٢] .

واتە: ئێستا لەگەڵ ژنەکانتاندا سەرجێگا بکەن، ئەوەی خوا بۆی نووسیون داخواز بکەن، بخۆن و بخۆنەوە، تا داوی سپی لەداوی ڕەش جیادەکەنەوە لەبەیانی دا، پاشان ڕۆژوو تەواو بکەن تا دەگاتە شەو.

## ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن،

**(١ـ٢): خواردن و خواردنەوە بە ئەنقەست:** بەڵام ئەگەر لەیادی نەبوو شتەکی خوارد یان خواردەوە، ئەوە ڕۆژووگرتنەوەی لەسەر نییە، نەکەفارەت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەسێ بەڕۆژووبوو لەیادی نەبوو خواردی یان خواردیەوە با ڕۆژووەکە تەواو بکات، ئەوە خوا خواردن و خواردنەوەی پێ داوە)[٣] .

**٣): خۆڕشانەوەی بەئەنقەست**، گەر بەدەست خۆی نەبوو ڕشایەوە نەقەزاو نەکەفارەتی لەسەر نییە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (کێ ڕشانەوەی بەسەرداهات قەزای لەسەر نییە، بەڵام کێ بەئەنقەست ڕشایەوە با قەزای بکاتەوە)[٤] .

**(٤ـ٥): بێ نوێژی (الحیض ـ الطمث) و زەیستانی (النفاس):** گەر لەساتی دوایی ڕۆژوش بو، زانایان کۆی دەنگیان لەسەرداوە.

**٦ـ کاری جووت بوون (الجماع):** ئەم کەفارەتەی لەسەرە، کە لەم فەرمودەیەی ژێرەوەدا

---

(١)صحيح (ص.ج ٦٥٣٨) (د: ٧/١٢٢/٢٤٣٧) (ت: ٢/١١٦/٧٢٦) (نس ٤/١٩٦).

(٢) البقرة: ١٨٧.

(٣) صحيح (ص.ج ٦٥٧٣) م(٢/١١٥٥:٨٠٩).

(٤) صحيح (ص.ج ٦٢٤٣) ت(٢/١١١/٧١٦) د(٧/٦/٢٣٦٣)

باسکراوە:

(ابوهريرة) گێڕاویەوە: (کاتێ ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبووین، پیاوێ هاتە خزمەتی‌و وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا بە فەتارەت چووم، فەرموی: چیت بەسەر هاتووە؟ وتی: لەکاتێدا بەڕۆژوو بوم‌و لەگەڵ ژنەکەمدا جووت بووم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا کۆیلەت هەیە ئازادی بکەیت؟ وتی نەء. فەرموی: ئایا دەتوانی دومانگ لەسەریەك بەڕۆژووبی؟ وتی: نەء . فەرمووی: ئایا خواردنی دانت بە شەست هەژار لات دەست دەکەوێ؟ وتی: نەء. ئێمە ئاوا ماینەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) سەبەتەیەکی (العرق) هێنا خورمای تێدابو. فەرموی: کوانێ پرسیارکەرەکە؟ وتی: منم. فەرموی: بڕۆ بیکە بە خێر. وتی: لەسەر خێزانی کەسێکدا لەخۆم هەژارتربێ ئەی پێغەمبەری خودا؟ بەخوا لەم سەر بۆ ئەو سەر ماڵێکت دەست ناکەوێ لەماڵی من هەژارتربێ، ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) زەردەخەنەیەکی هاتێ تاددانەکانی پێشەوەی بەدەرکەوتن، پاشان فەرموی: (بیدە بەخێزانەکەت)[١] .

## نەریتەکانی ڕۆژوو: (آداب الصيام):

سوننەتە بابای ڕۆژووەوان چاودێری ئەم نەریتانە بکات لە ڕۆژوویدا:

١) **پارشێو (السحور):** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (تسحروا فان في السحور بركة)[٢] .

واتە: پارشێو بکەن، بێگومان فەڕوپیت لە پارشێودایە.

(تسحروا ولو بجرعة ماء)[٣] . واتە: گەر بە قومە ئاوێ بێ پارشێو بکەن.

سوننەتە پارشێو درەنگ بکرێ (زيد بن ثابت) دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) پارشێومان کرد، پاشان بۆ نوێژ هەڵسا، وتم: نێوانی بانگ‌و پارشێو چەندە؟ فەرموی: ماوەی پەنجا ئایەتە)[٤] .

---

(١) متفق عليه: (خ ٤/١٦٣/١٩٣٦) م(٢/٧٨١/١١١).

(٢) متفق عليه: (خ ٤/١٣٩/١٩٢٣) م(٢/٧٧٠/١٠٩٥).

(٣) صحيح (ص.ج ٢٩٤٥) (حب ٢٢٣/٨٨٤)

(٤)متفق عليه (خ ض٤/١٣٨/٩٢١) (م ٢/٧٧١/١٠٩٧).

گەر گوێی لە بانگ بوو خواردنو خواردنەوەی بەدەستەوەبوو با بیخوات، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە گوێی لە بانگ بوو قاپی لە دەست بوو با داینەنێ تا پێویستی خۆی تەواو دەکات)[1] .

**٢ـ دەست هەڵگرتن لە قسەی بێ ماناو جنێوو شتی تر کە لەگەڵ ڕۆژوودا یەك ناگرنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەکێ لەئێوە بەڕۆژووبوو با قسەی پڕوپوچ نەکاتو نەقیژێنێو کاری نەزانانە ئەنجام نەدات، گەر کەسێ جنێوی پێداو شەڕی پێ فرۆشت بابڵێ من بەڕۆژوم)[2] .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (گەر کەسێ واز لەدرۆو ساختەیی‌و کار پێکردنی نەهێنێ، خوا پێویستی بەوە نییە واز لە خواردنو خواردنەوەکەی بێنێت)[3] .

**٣ـ بەخشندەیی‌و سەخاوەت‌و قورئان خوێندنو دەورکردنەوە:** (ابن عباس ـ د ـ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو کەسێ زیاتر سەخی بوو لە چاکەکردندا، لە ڕەمەزاندا لە هەمو کاتێ سەخی تر بو کاتێ جبریلی ـ س ـ پێ دەگەیشت، هەموو شەوێ جبریلی دەهاتەلا تا کۆتایی رەمەزان قورئانی پێ دەوردەکردەوە، کاتێ جبریلی پێ دەگەیشت لەبا خێراتربوو لە سەخاوەتی کردن لە چاکەدا)[4] .

**٤ـ پەلەکردن لە بەربانگ (الفطر):** (سهل بن سعد) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (خەڵکی بەردەوام چاکن تا ئەوکاتەی لە بەربانگدا پەلە دەکەن)[5] .

**٥ـ بەربانگ بەم چەند شتانە بکات کە بۆی ڕەخسا کە لەم فەرمودەیە داهاتون:** أنس گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرلەوەی نوێژ بکات چەند دەنکە خورمایەکی دەخوارد، گەر ئەو نەبوایە قەسپی دەخوارد، گەر ئەوە نەبووان چەند قومە ئاوەکی نۆش دەکرد)[6] .

---

(١) صحيح (ص.ج ٦٠٧) د(٦/٤٧٥/٢٣٣٣).

(٢) رابرد.

(٣) صحيح (مختصر خ ٩٢١) خ(٤/١١٦/١٩٠٣) (د: ٦/٤٨٨/٢٣٤٥).

(٤)متفق عليه (خ ٤/١٩٨/١٩٥٧) م(٢/٧٧١/١٠٩٨).

(٥) متفق عليه (خ ٤/١٩٨/١٩٥٧) م(٢/٧٧١/١٠٩٨).

(٦) حسن صحيح (ص ٢٠٦٥) (د ٦/٤٨١/٢٣٣٩).

**٦ـ پاڕانەوە لەکاتی بەربانگدا:** (ابن عمر) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بەربانگی دەکردەوە دەیفەرموو: (ذهب الظمأ وابتلت العروق وثبت الاجر ان شاء الله)[١] .

## ئەوەی بۆ ڕۆژووەوان دروستە:

**١) خۆشوشتن بۆ خۆ فێنك كردنەوە:** (أبی بکر بن عبدالرحمن) لە هەندێ هاوڵ دەگێڕێتەوە: (پێغەمبەری خوام (ﷺ) لە عەرج بینی ئاوی بەسەر سەری دا دەپرژاند لەتینووان یان لەبەر گەرما) .

**٢) ئاو لە دەمو لووت وەركردن (المضمضة والاستنشاق) بێ زیادەڕەوی كردن:**
پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (زۆر ئاو لە لووتت وەربكە مەگەر بەڕۆژووبیت)[٢] .

**٣) كەڵەشاخ (الحجامة):** (ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەكاتێدا بەڕۆژووبوو كەڵەشاخی گرت)[٣]. گەر لەخۆی ترسا بێتاقەتی بكات باش نییە: (ثابت البناني) گێڕاویەوە لە(أنس) پرسیاركرا ئایا ئێوە پێتان خۆشە ڕۆژوەوان كەڵەشاخ بگرێ؟ وتی: نەء، مەگەر لەبەر بێ تاقەتی نەبێت)[٤] .

**٤): گەر كەسێ توانی دان بەخۆدا بگرێت: ماچو دەست بازی لەگەڵ ژندا** عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماچو دەست بازی دەكرد بەڕۆژووش بوو، ئەو لە هەمووتان پتر دان بەخۆداگرتوبوو)[٥] .

**٥): گەر بە لەش پیسی بەیانی بكاتەوە:** (أم سلمة)و (عائیشە) گێڕاویانەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بەرەبەیانی لێ دادەهات غوسلیشی لەسەر بوو، پاشان خۆی دەشوشتو بەڕۆژوو دەبوو) .

---

(١) حسن (ص.د ٢٠٦٦) د(٦/٤٨٢/٢٣٤٠).
(٢) صحيح (ص.د ٢٠٧٢) (د ٦/٤٩٢/٢٣٤٨).
(٣) صحيح (ص.د ٢٠٧٩) خ(٤/١٧٤/١٩٣٩) د(٦/٤٩٨/٢٣٠٠).
(٤) صحيح (مختصر ٩٤٧) خ(٤/١٧٤/١٩٤٠).
(٥) متفق عليه (خ: ٤/١٤٩/١٩٢٧) م(٢/٧٧٧/٦٥/١١٠٦).

**٦) پێك گەیاندن (الوصال) تا بەرەبەیان:** (ﷺ) فەرمویەتی: (ڕۆژووان بەیەك مەگەیێنن، کێ دەیەوێ بەیەکیان بگەیەنی با تا کاتی پارشێو بەیەکتریان بگەیەنی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ ڕۆژوەکان بەیەکتری دەگەیەنی، فەرمووی: من وەکو ئێوە نیم من شەوانە کەسێ دێ خۆراکم دەداتێو کەسێ دێ ئاوم دەداتێ)[١] .

**٧ـ سیواكو بۆنی خۆشو ڕۆن لەخۆدانو کل کردنو قەترەو حوقنەو دەرزی لێ دان:** ئەم شتانە حەڵاڵن، گەر لەسەر ڕۆژووەوان حەرام بان، خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕوونیان دەکردەوە ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾[٢] . واتە پەروەردگارت هیچ شتێکی فەرامۆش ناکات.

## ڕۆژووی سوننەت (صیام التطوع):

پێغەمبەر (ﷺ) ئارەزووی گرتنی ئەم ڕۆژوانەی کردووە:

**١) شەشەڵان (شەشەکان = ستة الشوال):** ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (رضي الله عنه) دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ ڕەمەزان بەڕۆژووبێو شەشەڵان بگرێ بەدوایدا، وەکو ئەوە وایە هەموو ساڵ بەڕۆژوو بوبێت)[٣] .

**(٢، ٣): ڕۆژی عەرەفە بۆ غەیری حاجیو عاشوراو ڕۆژی بەر لە ئەو:** (أبي قتادة) گێڕاویەوە: (لەڕاست گرتنی ڕۆژی عەرەفە لە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیارکرا؟ فەرمووی: لە گوناهەکانی ساڵەکی ڕابردوو ساڵەکی باقی خۆش دەبێت. لەڕاست ڕۆژووی عاشورا پرسیاری لێ کرا؟ فەرمووی: لەگوناهی ساڵەکی ڕابردوو خۆش دەبێت)[٤] .

(أم الفضل بنت الحارث) گێڕاویەوە: (هەندێ کەس کەوتنە گومان لەڕاست ڕۆژووی پێغەمبەر (ﷺ) لە عەرەفەدا، هەندێ وتیان بەڕۆژووە، هەندێ وتیان بەڕۆژوو نییە، منیش

---

(١) متفق عليه (خ ١٩٢٦/١٤٣/٤) م(١١٠٩/٧٧٩/٤).

(٢) مريم: ٦٤.

(٣) صحيح (ص.د ٢١٢٥) (م ١١٦٤/٨٢٢/٣).

(٤) (صحيح الارواء ٩٥٥) (م ١٦٢/٨١٨/٢).

دەفرێ شیرم بۆ نارد، ئەو لە عەرەفەدا لەسەر وشترەکەی بوو خواردییەوە)[١] .

(ابن عباس ـ رـ) گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژی عاشورا بەڕۆژووبوو فەرمانی کرد ئەو ڕۆژە بەڕۆژووبن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم ڕۆژە یەهودو مەسیحی بە گەورەی دادەنێن؟ فەرموی: گەر ساڵی داهاتوو هات بەویستی خوا نۆیەمیشی بەڕۆژوو دەبین. ساڵی داهاتوو نەهات کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد) [٢] .

**٤ـ ڕۆژووی زۆربەی مانگی موحەڕڕەم:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەورەترین ڕۆژوو دوای ڕەمەزان ڕۆژووی موحەڕڕەمە، گەورەترین نوێژیش دوای نوێژی فەرز شەونوێژە)[٣] .

**٥ـ ڕۆژووی زۆرینەی شەعبان:** عائیشە گێڕاویەوە: (نەم بینیوە پێغەمبەر (ﷺ) هیچ مانگێ وەکو مانگی ڕەمەزان تەواوبکاتو نەمبینیوە هیچ مانگێ ئەوەندەی شەعبان تێیدا بەڕۆژوبێت)[٤] .

**٦ـ ڕۆژوی دوشەممەو پێنج شەممە:** (اسامة بن زید) گێڕاویەوە:

(پێغەمبەر (ﷺ) ی خوا دوشەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو، لەڕاست ئەمە لێ پرسیارکرا؟ فەرموی: (ان اعمال العباد تعرض یوم الاثنین والخمیس)[٥] . واتە: کردەوەکانی بەندەکان دووشەممەو پێنج شەممان دەخرێتە ڕوو.

**٧ـ سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێ:** (عبدالله بن عمر) گێڕاویەوە:

(پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەموو مانگێ سێ ڕۆژان بەڕۆژو ببە چاکە یەك بە دەیە، ئەمە وەکو ڕۆژووی هەموو ساڵە)[٦] .

---

(١) متنفق علیە: (خ ١٩٨٨/٢٣٦/٤) م(١١٢٣/٧٩١/٢).
(٢) صحیح (ص.د ٢١٣٦/٧٩٧/٢).
(٣) صحیح (ص.د ٢١٢٢) م(١١٦٣/٨٢١/٢).
(٤) متفق علیە: خ(١٩٦٩/٢١٣/٤) م(١١٥٦/١٧٥ ـ ٨١٠/٢).
(٥) صحیح (ص.د ٢١٢٨) د(٢٤١٩/١٠٠/٧).
(٦) متفق علیە: خ(١٩٧٦/٢٢٠/٤) م(١١٥٩/٨١٢/٢).

**سوننەتە ڕۆژەکان: (١٣ـ ١٤ـ ١٥) بن:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەی ئەباذەر گەر سێ ڕۆژەکان بەڕۆژووبن سێزەو چواردەو پانزە بەڕۆژوو بن)[١] .

**٨ـ بەڕۆژووبونی ڕۆژێكو بەڕۆژو نەبوونی ڕۆژێك:** (ﷺ) فەرمویەتی: (خۆشەویسترین ڕۆژوو لای خوا ڕۆژووی داودە، ڕۆژێ بەڕۆژو دەبوو، ڕۆژێك بەڕۆژو نەدەبوو)[٢] .

**٩ـ (دەی زیلحەججە):** (هنیدە بن خالد) لەژنەکەیو ئەویش لە هەندێ ژنانی پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نۆی زیلحەجەو عاشوراو سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێو یەکەمو دووەم ڕۆژی مانگو پێنج شەممان بەڕۆژووبووە)[٣] .

## ئەو ڕۆژانەی قەدەغەیە بەڕۆژبوون تێیاندا:

**١ـ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو قوربان:**

(ابي عبيدة مولى ابن ازهر) گێڕاویەوە: (لەگەڵ عومە ردا ـ ر ـ لە جەژن دا ئامادەبوومو وتی: ئەم دوو ڕۆژانە پێغەمبەر (ﷺ) قەدغەی کردوون تێیاندا بەڕۆژووبن: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانتان، ڕۆژەکەی تر کە لە قوربانیەکەی دەخۆن)[٤] .

**٢ـ ڕۆژانی تەشریق (سێ ڕۆژی دوای جەژنی قوربان):**

(أبي مرة مولى أم هانی) گێڕاویەوە: (لەگەڵ (عبدالله بن عمرو)دا چووینە لای (عمرو بن العاص)ی باوکی دا، ئەنجا خواردنی لێ نزیك خستنەوە، وتی: بخۆ. عەمر وتی: بخۆ ئەمە ئەم ڕۆژانەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێ دەکردین تێیاندا بەڕۆژوو نەبین. (مالك) وتی: ئەمانە ڕۆژانی (تەشریقە)[٥] .

---

(١) صحيح (ص.ج ٧٨١٧) ت(٢/١٣٠/٧٥٨) (نس ٤/٢٢٢).

(٢) متفق عليه: (خ ٣/١٦/١١٣١) (١١٥٩ ـ ٢/٨١٦/١٨٩).

(٣) صحيح (ص.د ٢١٢٩).

(٤) متفق عليه: (خ ٤/٢٣٨/١٩٩٠) م(٢/٧٩٩/١١٣٧).

(٥) صحيح (ض.د ٢١١٣) د(٧/٦٣/٢٤٠١).

(عائیشە)و (ابن عمر) گێڕاویانەوە: (ڕووخسەت نەدراوە لەڕۆژانی تەشریقدا بەڕۆژووبوون هەبێ، مەگەر کەسێ فیدیەی دەست نەکەوێ)[1] .

**٣- ڕۆژی هەینی بەتەنیایی:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (با کەس ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو نەبێ، مەگەر ڕۆژێ بەر لە هەینیو ڕۆژێ دوای ئەو بەڕۆژوبێت)[2] .

**٤- ڕۆژی شەممە بە تەنیا:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ڕۆژی شەممان بەڕۆژوو مەبن، تەنیا ئەو ڕۆژانە نەبێ کە فەرزە تێیدا بەڕۆژوبن، گەر یەکێ لە ئێوە تەنیا توێکڵی ترێیەکتان دەست کەوت یان چیلکەی دارێ با بیجوێت)[3] .

**٥- نیوەی دووەمی شەعبان بۆ کەسێ خووی پێوە نەگرتبێ:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر نیوەی شەعبان بوو بەڕۆژوو مەبن)[4] .

(با کەس بە ڕۆژێكو دو ڕۆژوو لە ڕەمەزان نزیك نەکەوێ، مەگەر کەسێ ڕۆژووی تێدا گرتووە، با بەڕۆژو بێت)[5] .

**٧- ڕۆژووی گوماناوی (یوم الشك):**

عەمماری کوڕی یاسەر - ر- وتویەتی: (هەرکەسێ ئەو ڕۆژە بەڕۆژووبێ کە تێی دا دوودڵە، ئەو سەرپێچی (ئەبا لقاسم)ی کردووە (ﷺ))[6] .

**٧- چوار وەرزە بەڕۆژووبوون (صوم الدهر) ، هەر چەندە ڕۆژانی یاساغ کراویش بەڕۆژوونەبێت:**

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە منی فەرموو: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی

---

(١) صحيح (مختصر خ ٩٧٨) خ(١٩٩٧/٢٤٢/٤).

(٢) متفق عليه: خ(١٩٨٥/٢٣٢/٤) م(١١٤٤/٨٠١/٢).

(٣) صحيح (ص. ٢١١٦) (د: ٢٤٠٤/٦٦/٧) (ت ٢٣٢٠/٤٦٠/٦).

(٤) صحيح (ص.جه ١٣٣٩) د(٢٣٢٠/٤٦٠/٦) (ت ٧٣٥/١٢١/٢).

(٥) متفق عليه (خ ١٩١٤/١٢٧/٤) م(١٠٨٢/٧٦٢/٢).

(٦) صحيح (الارواء: ٩٦١) ت(٦٨١/٩٧/٢) د(٢٣١٧/٤٥٧/٦).

عومەر! تۆ هەموو ڕۆژ بەڕۆژوویت‌و شەوانە هەڵدەستیەوە بۆ شەونوێژ، گەر ئاوا بکەیت چاوت دەچنەوە ناویەك‌و شەکەت دەبی، ئەو کەسەی هەمو ڕۆژ بەڕۆژووبێ ڕۆژووی بۆ نییە)[1] .

(أبي قتادة) گێڕاویەوە: (پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: تۆ چۆن بەڕۆژوو دەبی؟ پێغەمبەر (ﷺ) بەم قسەی ئەو توڕەبو، کاتێ عومەر ئەمەی بینی وتی: (رضينا بالله ربا، وبالاسلام دينا، وبمحمد نبيا، نعوذ بالله من غضب الله وغضب رسوله). عومەر هەر ئەمەی دووبارە دەکردەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) ئارام بۆوە. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆنە ئەو کەسەی چوار وەرزە بەڕۆژووە؟ فەرموی: نە ڕۆژوی هەیە نە بەڕۆژو نەبون)[2] . قەدەغەی ڕۆژوو لە ژن گەر مێردی لە ماڵ بێ بەویستی ئەو نەبێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر مێرد لە ماڵەوەبوو با ژن بەڕۆژوو نەبێ مەگەر ئەو ڕێگای پێ بدات)[3] .

---

(١)متفق عليه: م(١١٥٩/١٨٧/٢/٨١٥) خ(١٩٧٩/٢٢٤/٤).

(٢) صحيح (ص.د ٢١١٩) (م ١١٦٢/٢/٨١٨).

(٣)متفق عليه: (خ ٥١٩٢/٢٩٣/٩) م(١٠٢٦/٢/٧١١).

# گۆشەگیری ( الاعتکاف )

گۆشەگیری لە دە ڕۆژی دوایی ڕەمەزانـدا سـوننەتە، بـۆ بەدەسـت هێنـانی چـاکەو دەسـت کەوتنی (لیلة القدر ـ شەوی بەڕێز). خوا فەرمویەتی: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ*وَمَا أَدْرَاكَ مَـا لَيْلَةُ الْقَدْرِ*لَيْلَةُ الْقَـدْرِ خَيْـرٌ مِّـنْ أَلْـفِ شَـهْرٍ*تَنَـزَّلُ الْمَلَائِكَـةُ وَالـرُّوحُ فِيهَـا بِـإِذْنِ رَبِّهِـم مِّـن كُـلِّ أَمْرٍ*سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾[1] .

واتە: ئێمە (قورئانمان) دابەزاندووە لە شەوێکی بەڕێزدا. تۆ چوونی ئەو شەوە بەڕێزە چییە؟ ئـەم شـەوە بـەڕێزە باشـترە لـە هـەزار مـانگ. تـێی دا دادەبـەزن فریـشتەو ڕۆح بەڕوخـسەتی پەروەردگاریان بە هەموو کاروبارێکەوە. ئاشتی یە ئەمە تا سپێدەی بەیان.

عائیشە گێڕاویەوە: پێغەمبـەر (ﷺ) لـە دە ڕۆژی کۆتـایی مـانگی ڕەمەزانـدا گۆشـەگیر دەبوو، دەیفەرموو: (لە دە ڕۆژی دوایی ڕەمەزاندا سۆراغی ـ لیلة القدرـ بکەن)[2] . هەر لە ئـەو گەڕاوەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لەتاقەکانی دە ڕۆژی دوایی ڕەمەزاندا سـۆراغی ـ لیلة القدر ـ بکەن)[3] .

پێغەمبەر (ﷺ) هانی خەڵکی داوە شەونوێژی تێدا بکەن.

(من قام لیلة القدر ایمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه)[4] .

واتە: هەرکەسێ شەوی ـ لیلة القـدر ـ هەڵسێتەوە بەبڕواو نیـازەوە لـەگوناهی پێـشووی لێ خۆشبون کراوە.

دەبێ گۆشەگیریو مانەوە لە مزگەوتدابێ: ﴿وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَـسَاجِدِ﴾[5]. چونکە شوێنی گۆشەگیری پێغەمبەر (ﷺ) بووە.

---

(١) سورة القدر..

(٢) صحيح (م خ ٩٨٧) خ(٤/٢٥٩/٢٠٢٠).

(٣) متفق عليه: خ(٤/٢٥٩/٢٠١٧)، م(٢/٦٢٨/١١٦٩)

(٤)متفق عليه: (خ ٤/٢٥٥/٢٠١٤) م(١/٥٢٣/٧٦٠).

(٥) البقرة: ١٨٧.

سوننەتە ئەو کەسەی ئەم گۆشەگیری‌و تەریکیە دەکات خۆی بەگوێڕایەڵی خوداو نوێژو قورئان خوێندن‌و تەسبیحات (سبحان الله)و (الحمد لله)و (لا الـه الا الله)و (الله اكبر)و (استغفر الله)و سەڵەوات لێدان‌و پاڕانەوەو دەوری زانستی یەوە خەریك بكات... هتد.

باش نییە خۆی بە شتێ وە سەرقاڵ بكات لە قسەو كردار كە پەیوەندی بە ئەوەوە نییە، دیسان باش نییە قسە نەكات، بەو مەبەستەی لەمە لە خوا نزیك دەبێتەوە)[1] . بۆی دروستە بۆ پێویستی لەماڵ بڕواتە دەرو بچێ قژی سەردابێنێ‌و سەربتاشێ‌و نینۆك بكات‌و لەش خاوێن بكاتەوە.

ئەم گۆشەگیریە بەوە بەتاڵ دەبێتەوە گەر بەبێ پێویستی بڕواتە دەر، یان كاری جووت بوون (الوطء) بكات.

(١) فقه السنة (١/٤٠٤) بە دەستكاریەوە

# ( باسی زەکات )

## پایەی زەکات لە ئاییندا! :

زەکات ڕوکنەکە لە روکنەکانی ئیسلامو فەرزەکە لە فەرزەکانی:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شەهادەی (لا الە الا الله ـ محمد رسول الله)و نوێژکردنو زەکات و حەجی کەعبەو ڕۆژووی ڕەمەزان). (رابردوو باسکرا). زەکات لە(٨٢) شوێن لەئایەتەکانی قورئاندا لەگەڵ نوێژدا بەیەکەوە باسکراوە.

## هاندان بۆ زەکات دان :

خودا فەرمویەتی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾[١] . واتە: زەکات لە دارایی ئەوان وەربگرە کە پێی پاکژو خاوێن دەبنەوە. خوا فەرمویەتی: ﴿وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ﴾ الروم/ ٣٩.

واتە: ئەوەی داوتانە بە زەکاتو خاتری خواتان دەوێ، ئەوانەن دارایی خۆیان زیاد دەکەن.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەسێ بە ئەندازەی قەسپێ لە ماڵەکی ڕەوا خەرج بکات ـ خوا تەنیا حەڵاڵ وەردەگرێ ـ خوا لێی وەردەگرێو زۆری دەکات بۆ خاوەنەکەی، وەکو چۆن یەکێ لە ئێوە جوانوەکەی (فلو ـ المهر) گەورە ئەکات، تا بە ئەندازەی یەك کێوی لێ دێت)[٢] .

## وشیاری دان لە زەکات نەدان :

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلِلّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ بِمَا

---

(١) التوبة: ١٠٣

(٢) متفق عليه: خ(١٤١٠/٢٧٨/٣) م(١٠١٤/٧٠٢/٢).

تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ [١] . واتە: ئەوانـەی ڕژدیو ڕەزیلـی دەکـەن بـەو سـامانەی خـوا پـێی داون، بـا وانەزانن ئەوە بۆ ئەوان باشە، بەڵکو ئەوە بۆ ئـەوان خراپـە، داهـاتوو ئـەو ماڵـەی ڕژدییـان پـێ کردووە لە گەردنیان دەهاڵێ، میراتی ئاسمانەکانو زەوی بۆ خوایـە، خـوا ئاگـادارە بـەو کارانـەی دەیکەن. (أبوهريرة) لە پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (کێ خوا ماڵی بـداتێو زەکـات نـەدات لەڕۆژی پەسڵاندا لەشێوەی مارێکی سـەر ڕووتـاوەی لێ دەهاڵـێ کـە دوو خـاڵی ڕەشـی لەسـەر هەردوو چاوەکانە، پاشان بە هەردوو شەوێلگەکانی قەپاڵی لێ دەداتو دەڵـێ: مـن مـاڵی تـۆم، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بما آتاهم الله من فضله﴾[٢] .

خوا فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِـزُونَ الـذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِـي سَبِيلِ اللّـهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ* يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهُـورُهُمْ هَـذَا مَـا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ [٣] .

واتە: ئەوانەی زێڕو زیو کۆدەکەنـەوەو لـەڕێگای خـوادا نایبەخـشن مـژدەیان پـێ بـدە بـە سزایەکی بەئازار. لەم ڕۆژەدا، سووردەکرێنەوە و بەوانـە ناوچـاوانیانو تەنیـشتیانو پـشتیان داخ دەکرێ ، (پێیان دەوترێ): ئەوەبوو خەزنتان کردبوو بۆ خۆتان، دەبـچێژن ئـازاری ئـەو شـتەی بـۆ خۆتان کۆدەکردەوە.

ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاویەوە: (هەرکەسێ خاوەن زێڕو زیوە مـافی خـۆی لێ نادات، گەر دواڕۆژ هات پلێتی ئاگرینی بۆ سوور دەکرێتەوە لە ئـاگری دۆزەخـدا لا تەنیـشتی و دووبارە ناوچەوانیو پشتی پێ داخ دەکرێ، هـەر کـە ساردبۆوە سـوور دەکرێتـەوە . لەڕۆژێکـدا ڕاددەکەی پەنجا هەزار ساڵە. تا دادوەری لەنێوان بەندەکاندا دەکرێو ڕێگای خۆیان دەبیـنن، یـان بۆ بەهەشت یاخود بۆ دۆزەخ. نەفەرێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! ئەی وشتر؟ فـەرموی: هەر خاوەن وشترێ مافی نادات ـ مافەکەی ئەوەیە کاتی هێنانی بۆ سـەر ئـاو بدۆشـرێو بەشـی هەژارانی لێ بدرێ ـ گەر نا لەڕۆژی پەسڵاندا خاوەنەکەی دەخرێتە ژێـر پێیانـەوە لـە دەشـتەکی فراواندا کە زۆر لەوە قەڵەوترەو بەچکەکانیشیان لێ دیار نییە، بەقاچـەکانیان پێیـان لێ دەنـێنو

---

(١) آل عمران: ١٨٠.

(٢) صحيح (ص.نس ٢٣٢٧) خ(١٤٠٣/٢٦٨/٣).

(٣) التوبة: ٣٤ ـ ٣٥.

بەدەمیان دەیانگەزن، هەر کە سەرەتاکان تەواودەبن ئەوانی تر دێن لەڕۆژێکدا درێژییەکەی پەنجا هەزارساڵە، تا حوکمی نێوان بەندەکان دەکرێ، یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ) .

## حوکمی زەکات نەدەر:

زەکات فەرزەکە لە فەرزەکان، کۆی ئوممەت یەك دەنگە لەسەری‌و دەنگی داوەتەوە کە پێویستییەکی ئایینەو کێ نکۆڵی واجب بوونی بکات، ئەوە موسڵمان نییەو بەکافری سزای کوشتنی بۆ دەردەکرێ، مەگەر تازە موسڵمان بووبێ بەرامبەر بە ئەحکامەکان پاساوی نەزانینی بۆ دەهێنرێتەوە. بەڵام گەر کەسێ بڕوای بە واجب بوونی هەبێ‌و نەیدات ئەوە بە زەکات نەدانەکە گوناهبار دەبێ‌و کافرنابێ‌و پێویستە کاربەدەست بەتۆبزی لێی وەربگرێت‌و وەکو سزایەك نیوەی ماڵەکەی لێ وەردەگیرێت .

(بهبز بن حکیم) لەباوکی‌و ئەویش لەباپیرەی گێڕاویەوە: لە پێغەمبەری (ﷺ) خوام بیستووە: (لە هەر وشترێکدا بەدەمی خۆی بلەوەڕێ، لە هەر چلێکدا وشترێکی دووساڵە هەیە کە پێی لە سێ ساڵە نابێ(ابنة لبون)، هەموو چلەکە حیساب دەکرێت، کێ بۆ وەرگرتنی کرێ بیدات کرێکەی بۆ هەیە، هەرکەسێ نەیدات ئێمە لێی وەردەگرین‌و نیوەی ماڵیشی وەکو مافێ لە مافەکانی خوای گەورەمان لێ وەردەگیرێت، هیچی بۆ وەجاخی پێغەمبەر - ئال - ڕەوانییە)[1].

(گەر گەلێ زەکات نەدات‌و بڕوایان بە واجب بوونی هەبوو، گەر هێزو توانایان هەبوو شەڕیان لەگەڵدا دەکرێ تا دەیدەن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (فەرمانم پێ کراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکی دا تا شاهیدی دەدەن خوا تاك‌و تەنیایەو موحەممەد پێغەمبەری خوایە (ﷺ) نوێژ دەکەن‌و زەکات دەدەن، گەر وایان کرد خوێن‌و سامانیان لە من حەرام دەبێ بە حەقی ئیسلام نەبێ‌و حیسابیان لەسەر خودایە)[2].

(أبوهريرة) دەڵێ: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردو ئەبوبکر کرا بە خەلیفە،

---

(١)حسن (ص. ٤٢٦٥) د(١٥٦٠/٤٥٢/٤) نس(٥/٢٥).

(٢) متفق عليه: خ(١/٧٥/٢٥) م(١/٥٣/٢٢).

هەندێ لە عەرەب بێ بڕوا بوونەوە، عومەر وتی: چۆن شەڕ لەگەڵ خەڵکی دا دەکەیت؟ وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فەرمانم پێ کراوە شەڕ لەگەڵ خەڵکی دا بکەم تا دەڵێن: (لا اله الا الله)، هەرکەسێ ئەوە بڵێ ئەوە ماڵو سەری ئەو لە من حەرامە بەحەقی خۆی نەبێو حیسابیان لەسەر خودایە. وتی: بەخوا شەڕ لەگەڵ کەسێکدا دەکەم کە جیاوازی لەنێوان نوێژو زەکاتدا دەکات، زەکات مافی دارایی یە، بەخوا گەر بزنە مێیەك(عناق) نەدەن کە ئەیاندایە پێغەمبەر (ﷺ) شەڕدەکەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: بەخوا زانیم خودا سنگی ئەبوبەکری بۆ جەنگ گوشاد کردووەو زانیم ئەمە حەقە)[١] .

## زەکات لەسەر کێ واجبە؟

لەسەر هەموو موسڵمانێ واجبە کە ئازادەو سامانەکەی گەیشتۆتە ڕادەی زەکات (النصاب)و ساڵی بەسەردا سووڕاوەتەوە، تەنیا کشتوکاڵ (الزرع) نەبێ، ئەوە لەکاتی دروونەوەی دا کاتێ گەیشتە ڕادەی زەکات ئەوە زەکاتی لێ دەدرێت، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾[٢] . واتە: لەکاتی دروونەوەی دا مافی ئەو بدەن.

زەکات لەم سامانەدا واجبە: زێڕو زیوو کشتوکاڵ (الزروع)و میوەجاتو مەڕوماڵو ڕەشەوڵاخو کانزا (الرکاز)دا:

## ١) زەکاتی هەردوو نەختەکان (زێڕو زیو):

ڕادەی زەکاتی زێڕ (٢٠) دیناری زێڕە، ڕادەی زەکاتی زیو (٢٠٠) درهەمی زیوە، زەکاتی هەردووکیان چارەکی دەیەکە (ربع العشر): پێشەوا عەلی (س) لە پێغەمبەری خوای (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (گەر دووسەد درهەمت هەبوو ساڵی بەسەردا سووڕایەوە ئەوە پێنج درهەمی زەکاتەو هیچی ترت لەسەر نییە، گەر بیست دینار زێڕت هەبوو ساڵی بەسەردا سوڕایەوە نیو دینار دەدەیت)[٣] .

---

(١) متفق علیه (خ ١٣٩٩/١٤٠٠/٣/٦٢٦) م(٢٠/٥١/١).

(٢) الأنعام: ١٤١.

(٣) صحیح (ص.د ١٣٩١) د(١٥٥٨/٤٤٧/٤).

**زەکاتی خشڵ (الحلی):**

زەکاتی خشڵ بەپێی ئەم ئایەتو فەرموودانە واجبەو ئەوانەی جیای دەکەنەوە بەڵگەیان بەدەستەوە نییە، سەرباری ئەوە دەقی تایبەتیشی لەسەر هەیە، لەوانە:

(أم سلمه (رضي الله عنها) من خشڵی درهەمم لەبەردابوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئەمە گەنجینەیە (کەنز)ە؟ فەرموی: گەر گەیشتە ئاستی زەکات ئەوە زەکاتی لێ بدە، ئەی ئەوە کەنز نییە؟)[١] .

عائیشە گێڕاویەوە: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوور چەند ئەنگوستیلەیەکی لەدەستدا بینیم، فەرموی عائیشە(رضي الله عنها) ئەمە چییە؟ وتم: دروستم کردون تا خۆیان پێ برازێنمەوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرموی: ئەی زەکاتیان لێ دەدەیت؟ وتم: نەء، یان گەر خوا حەز بکات، فەرمووی: ئەوەندە بەسیەتی پێی بچیە ناو ئاگرەوە)[٢] .

## ٢) زەکاتی کشتوکاڵو میوەکات (الزروع والثمار):

خودا فەرمویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ جَنَّاتٍ مَّعْرُوشَاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَاتٍ وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُتَشَابِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾[٣] .

واتە: خودا ئەو خودایەیە بۆی دروست کردوون باخچەکان کە هەرزاڵەیان بۆ هەڵبەستراوە (یان بالاّبەرزن)و هەرزاڵەیان بۆ نەکراوە (یان بالاّ بەرزنین)و خورماو کشتوکاڵ کە خواردنیان جۆراوجۆرەو زەیتونو هەنار کە هەیانە چون یەکەو هەیانە چون یەك نییە، بخۆن لە بەرەکانیان کاتێ پێ گەیشتنو مافی لێ بدەن لەکاتی دروونەوەیاندا، زیادەڕەوی مەکەن، خوا زیادەڕەوانی خۆش ناوێت.

---

(١)حسن (ص.ج ٥٥٨٢) الصحيحة ٥٥٩ (د: ٤/٤٢٦/١٥٤٩).

(٢)صحيح (ص.د ١٣٨٤) د(٤/٤٢٢٧/١٥٥٠). تێبینی: لای ئەبو حەنیفەو ئەبو حەزم زەکاتی خشڵ هەیە، بەڵام لای شافیعیو حەنەفیو مالیکی زەکاتی خشڵ نییە، گەر بشگاتە رادەی زەکات.

(٣) الأنعام: ١٤١.

## ئەو جۆرانەی زەکاتیان لێ وەردەگیرێت:

زەکات تەنیا لەو چوار جۆرانە وەردەگیرێت، کە لەم فەرمودەیەدا هاتووە: (أبي موسى)و (معاذ) گێڕاویانەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانی بۆ یەمەن نارد تا زانستە ئایینیەکان فێری خەڵکی بکەن، فەرمانی پێ کردن کە زەکات لەم چوار جۆرە ماددەیە وەربگرن: گەنم، جۆ، خورماو مێوژ)[1] .

## ڕاددەی زەکات ( النصاب ):

مەرجی واجبی زەکات لە کشتوکاڵو میوەکاندا، دەبی بگاتە ئەم ڕێژەیە کە لەم فەرمودەیەدا هاتووە:

(أبوسعيد الخدري) ـ د ـ گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(گەر لە پێنج وشتر کەمتربوو زەکاتی لەسەر نییە، لە پێنج وەقە کەمتر زەکات نییە، لە پێنج ویسق (شەست ڕبە) کەمتر زەکات نییە)[2] .

## بڕی واجب:

(جابر) لە پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (ئەو زەوییەی بە ڕوبارو باران ئاودراوە ئەوە دەیەکی زەکاتە، بەڵام ئەوەی بە وشتر ئاودراوە ئەوە نیوەی دەیەکی زەکاتە)[3] .

(ابن عمر) گێڕاویەوە (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەو زەوییەی ئاسمانو کانیاوەکانو گۆمو زۆلکاوەکان ئاوی بدات دەیەکی زەکاتە، ئەوەی بە ئامێر (النضح) ئاودەدرێ نیوەی دەیەکە)[4] .

---

(١) صحيح (الصحيحة ٨٧٩) كم(١/٤٠١) هق(٤/١٢٥).

(٢) متفق عليه خ(٣/٣١٠/١٤٤٧) م(٢/٦٧٣/٩٧٩). تێبینی: یەك وەقە چل درهەمە لەزیو. ویسق (٦٠) ربەیە (الصاع)ە لە(فتح البارى) دا (٥) ویسق دەگاتە (٧١٥كگم)، یان (٤٥) تەنە گەنمو جۆ.

(٣) (م ٢/٦٧٥/٩٨١).

(٤)صحيح: (ص.ج ٤٢٧). خ (٣/٣٤٧/١٤٨٣)

**قەرساندن (الخرص)ی خورماو تریّ:**

(أبي حامد الساعدي) گێڕاویەوە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشداری غەزای تەبوکمان کرد، کاتیّ هاتە (وادي القری) ژنێك لەناو باغێکی دابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: بیقرسێنن، پێغەمبەر (ﷺ) بە (١٠) ویسقی قرساند[١]، پیّی فەرموو: بەرهەمەکەی بقرسێنە... کاتیّ هاتە ـ وادي القری ـ بە ژنەکەی فەرمو: باغەکەت چەندی هێنا؟ وتی: (١٠) وەسق کە پێغەمبەر (ﷺ) قرساندبوی)[٢] . عائیشە گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) (عبدالله بن رواحة)ی دەنارد خورماکانی دەقرساند لەکاتی پیّ گەیشتندا بەر لەوەی لێیان بخوریّ، پاشان جولەکەکانی سەرپشك دەکرد بەو قرساندنە وەری بگرن، یان بەم قرساندنە بیدەن بە ئەوان، تا زەکاتەکە بپارێزریّ بەر لەوەی ئەم بەروبومە بخوریّ پەرتەوازە ببێت)[٣] .

**٣ـ زەکاتی گیانداران: گیانداران سیّ جۆرن: وشترو ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن:**

زەکاتی وشتر (الابل): ڕاددەی زەکاتی (النصاب):

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لیس فیما دون خمس ذود من الابل صدقة)[٤] . واتە: لە پێنج وشتر کەمتر زەکاتی لەسەر نییە.

**بڕی واجب لە زەکاتی دا:**

(أنس) دەڵیّ: ئەبوبەکر(ﷺ) لەکاتیّدا منی بۆ بەحرەین نارد ئەم نامەیەی لەگەڵ ناردم: (بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان، ئەمە زەکاتی فەرزە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر موسڵمانانی دا فەرزکردبوو خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمانیان پیّ داوە، کیّ لە موسڵمانان

---

(١) تێبینی: یەك ویسق یان وەسق =(٦٠) ربە (صاع) بە پێوانە. یەك ربە چوار مشتە (المد). وە یەك (مشت = المد)= ٥٤٤ گرام. (الأدلة الرضية على درر البهية / للشوكاني/ل: ١٢٣). وەرگێڕ.

(٢) صحيح (ص، د٢٤٦٣)خ (٣/٣٤٣/١٤٨١)(٣٠٧٩)

(٣) حسن لغيره (الارواء/ ٨٠٥) (د: ٩/٢٧٦/٣٣٩٦).

(٤) رابردوویاسکراوە.

بەوپێیە داوای کرد با بیدات، کێ لەمە پتری داواکرد با نەیدات، لە بیستوچوار وشترو لەمەش کەمتر لە مەڕو ماڵات کاوڕێکە(شاة)، گەر گەیشتە بیستوپێنج تا سیوپێنج دانەیەکی دەدات کە ساڵەکی تەواو کردبێو پێی لە دووساڵە نابێ کە مێیە بێ(بنت مخاض)، گەر گەیشتە سیوشەش بۆ چلوپێنج دانەیەکی مێیە دەدات پێی لە سێ ساڵەیی نابێ، گەر گەیشتە چلوشەش بۆ شەست ئەوە دانەیەکی دەدات پێی لە چوار ساڵە نابێو کەڵ وەردەگرێت (حقة)، گەر گەیشتە شەستویەك بۆ حەفتاوپێنج ئەوە وشترەکی دەدات پێنج ساڵە(جذعة) بێت، گەر گەیشتە حەفتاوشەش بۆ نەوەد ئەوە دوو دانە دەدات پێیان لە سێ ساڵە نابێ(بنت لبون)، گەر گەیشتە نەوەدو یەك بۆ سەدوبیست سەر، دووسەر دەدات کە پێیان لە چوار ساڵە نابێ(حقتان)و کەڵ وەربگرن، گەر لە سەدوبیست سەر زیاتربوون لە هەر چل سەرێ وشترە مێیەکی سێ ساڵە(بنت لبون) دەدات، لە هەر پەنجا سەرێکی وشترەکی چوار ساڵە(حقة) دەدات، گەر لە چوار سەر پتر نەبوون زەکاتی نییە مەگەر خاوەنەکەی بیەوێ، گەر گەیشتە پێنج وشتر کاوڕێك دەدات)[1] .

## هەرکەسێك لەو تەمەنانەی لا دەست نەکەوت:

(أنس) دەڵێ: ئەبوبەکر فەرزەی زەکاتی بۆ ڕەوانەکرد کە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمانییان پێ کردووە: (هەرکەسێ ڕاددەی زەکاتی وشتری گەیشتە وشترەکی پێنج ساڵە(جذعة)و نەیبوو تەنیا چوار ساڵەیەکی(حقة)ی لابوو ئەوە لەگەڵ دووکاوڕ(شاتان) یان بیست درهەمی لەگەڵدا وەردەگیرێ. هەرکەسێ زەکاتی وشتری بگاتە چوارساڵەیەك (حقة)و نەیبێ تەنیا پێنج ساڵەیەکی(جذعة) لابو ئەوە لێی وەردەگیرێو زەکات وەرگرەکە(المصدق) دو کاوڕ یان بیست دەرهەمی دەداتێ. کێ زەکاتی بگاتە وشترەکی سێساڵەیی (بنت لبون)و ئەو سێساڵەیەی نەبو تەنیا چوارساڵەیەکی لابو، ئەوە زەکات وەرگر لێی وەردەگرێو دوو کاوڕی دەداتێ یان بیست دەرهەمی دەداتێ، کێ زەکاتی گەیشتە سێ ساڵەیەکی مێیینە (بنت لبون)و تەنیا دووساڵەیەکی

(١)صحیح (ص.د ١٣٨٥) خ(٣/٣١٧/١٤٥٤) د(٤/٤٣١/١٥٥٢).

(بنت مخاض) لابوو، ئەوەی لێی وەردەگیرێ دوو دەرهەم یان دووکاوڕی لەسەر ڕا دەدرێتەوە)[١] .

## زەکاتی مانگاو گاو گامێش (زكاة البقر):

### بڕی ڕەشەوڵاخ لە زەکاتدا:

(معاذ بن جبل) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆ یەمەنی ناردم، فەرمانی پێ دام لە هەر چل ڕەشەوڵاخێ مینگونێ(مسنة) وەربگرم کە دووساڵەیی بێ‌و ددانی هاتبن، لە هەر سی ڕەشەوڵاخێ گوێرە پارەیەك مێ یان نێر وەربگرم کە ساڵێ بوو بێت(تبيع ـ تبيعة)[٢] .

## زەکاتی مەڕو بزن (زكاه الغنم):

### بڕی زەکاتی واجب تێیاندا (النصاب):

لە نامەی ئەبوبەکر بۆ ئەنەس دا کە تێیدا فەرمانی زەکاتی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) تێدا هاتووە: (لە زەکاتی مەڕو بزندا کە بەدەمی خۆیان بلەوەڕێن(السائمة) لە چل سەر تا سەدوبیست سەر کاوڕێ(شاة) هەیە، گەر لە سەدووبیست پتربون تا دووسەد سەر دو کاوڕ دەدات، گەر هاتوو لە دوسەد پتربو تا سێ سەد سەربوو ئەوە سێ کاوڕ دەدات، گەر لە سێ سەد پتربون، لە هەر سەد سەرێ کاوڕێ دەدات، گەر ڕانە مەڕی لەوە ڕاوی پیاو لە چل کەمتربون زەکاتی لەسەر نییە مەگەر خاوەنەکەی بیەوێ بەخۆشی خۆی زەکاتی لێ دەربکات)[٣] .

## مەرجەکانی واجب بوونی زەکات لە ئاژەڵان (المواشي)دا:

١) بڕی زەکاتی هەبێ (النصاب)، کە باسکرا.

٢) ساڵیان بەسەردا بسوڕێتەوە، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (زەکات لە ماڵێکدا

---

(١)صحيح (ص.د ١٣٨٥) ت(٦١٩/٦٨/٢) د(١٥٦١/٤٧٥/٤).

(٢) صحيح (ص.د ١٣٩٤) ت(٦١٩/٦٨/٢) د(١٥٦١/٤٥٧/٤).

(٣) رابردو باسکرا.

نییە سالّی بەسەردا نەسوڕابێتەوە)[١].

٣) بەدەمی خۆیان بلەوەڕێن (سائمة): واتە زۆربەی سالّ لە لەوەڕگا بلەوەڕێن، لەوەڕگاکەش حەلاّلّ بێت: (ﷺ) فەرمویەتی: (لە زەکاتی مەڕو بزندا لەوانەی بەدەمی خۆیان دەلەوەڕێن(سائمة) گەر لە چل سەر تا سەدوبیست بو کاوڕێ دەدەن)[٢].

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لە هەر وشترێ کە بەدەمی بلەوەڕێ لە چل سەردا وشترەکی سێ سالّە (بنت لبون) کە مێ بێ هەیە)[٣].

## ئەوەی بە زەکات وەرناگیرێت:

(ابن عباس) ـ ر ـ گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) مەعازی نارد بۆ یەمەن پێی فەرمو: نەکەی کامە سەرومالّی دانستەیە (کرائم الاموال)ە ئەوەیان لێ وەربگریت)[٤].

دیسان لە نامەکەی ئەبوبەکر بۆ ئەنەسدا هاتووە کە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمانیان پێ کردووە هاتووە:

(ئاژەلّی پیر ـ هرمة ـو کوێرو نێریەکە ـ تیس ـ وەرناگیرێ مەگەر زەکات دەر بیەوێ نێریەکە بدات)[٥].

## حوکمی برابەشیو پێکەوەیی ( حکم الخلطة ):

گەر دوو ڕان تێکەلّ کرانو لە زەکات پڕبوونو ئەو ڕانو مالاّتە لێك جیانەدەکرانەوە، گەر زەکاتیان کەوتەسەر یەك زەکاتیان لێ وەردەگیرێ: لە نامەکەی ئەبوبەکردا بۆ ئەنەس هاتووە: (لەترسا زەکات مالاّتەکان پەرتەوازەبون تێکەلّ ناکرێنو گەر پێکەوەبون جیاناکرێنەوە ئەوە

(١) صحيح (ص.ج ٧٤٩٧) جە(١/٥٧١/١٧٩٢).
(٢) رابردو باسکرا. لەنامەی ئەبوبەکردا (ﷺ).
(٣) رابردو باسکراوە.
(٤) رابردو باسکراوە
(٥) رابردو باسکراوە

هەردوو تێکەڵەکان لەلایەن خاوەنەکانیان بەپێی کەمی و زیادی بۆ یەکتری دەگەڕێننەوە)[١] .

## ٤- زەکاتی گەنجینەی کۆنی شاراوە (الركاز):

گەنجینە ئەو زێڕو زیوانەن بەر لەئیسلام شاراونەوەو بێ ماندوبوون دەدۆزرێنەوە. کاتێ ئەو کانزاو گەنجینانە دۆزرانەوە، گورج بێ ساڵ بەسەر دا سوڕانەوەو گەیشتنە رادەی زەکات (النصاب) زەکاتیان لێ دەدرێ بە رێژەی (١/٥) وەکو لەم فەرمودە گشتی یە دا هاتووە:

(وفي الركاز خُمس)[٢].

ئەوانەی زەکاتیان بۆ خەرج دەکرێت (مصارف الزكاة):

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[٣].

واتە: زەکات تەنیا بۆ هەژاران (الفقير)و دەست کورتانو(المسكين)و فەرمانبەرانی سەرزەکاتو ئەوانەی ئومێدی موسڵمان بوونیان لێ دەکرێو هۆگرن، کۆیلەکانو قەرزدارەکانو لەرێگای خوداو رێبواران. وەکو فەرزێ لەلایەن خواوە، خوداوەند زاناو کارزانە.

(ابن کثیر (ﷺ)) لەتەفسیری ئەم ئایەتە دا (٢/٣٦٤)دا دەڵێ: کاتێ خوای گەورە رەخنەو گازندەی دووڕوە نەزانەکانی باسکرد لەراست پێغەمبەردا (ﷺ) لەبارەی دابەشکردنی زەکاتدا، خوای گەورە دەری خست ئەو دابەشی کردووەو حوکمەکەی دەرخستووەو دابەشکردنەکەی بەکەس نەسپاردووەو خۆی بۆ ئەو ناوبراوانە کەرتی کردووە.

## ئایا واجبە گشت ئەم توخمانە لەخۆبگرێت:

(ابن کثیر (ﷺ))گێڕاویەوە: (زانایان لەسەر ئەم هەشت توخمو پۆلانەدا ناکۆکن، ئایا واجبە بدرێتە هەموویان، یان دەدرێ بەوانەی دەستیان پێ رادەگات؟

---

(١) متفق علیه: (خ: ١٤٩٩/٣٦٤/٣) (م: ١٧١٠/١٣٣٤/٣).

(٢) متفق علیه: خ(١٤٩٩/٣٦٤/٣) م(١٧١٠/١٣٣٤/٣).

(٣) التوبة: ٦٠.

**بۆ ئەمە دوو پۆلن:**

(١): واجبە بدرێتە هەموویان، ئەمە رای شافیعیو کۆمەڵێکیانە.

(٢): واجب نییە بدرێتە هەر هەموویان، بەڵکو دروستە بدرێتە یەکێکیان لەوانە، هەموو زەکات بدرێ لەگەڵ بوونی ئەوانی تردا، ئەمە قسەی مالیكو دەستەیەك پاشینەو پێشینەیە، لەوانە: (عومەر)و (حذیفة)و (ابن عباس)و (ابو العالیة)و (سعید بن جبیر)و (میمون بن مهران).

(ابن جریر) دەڵێ کە ڕای زۆربەی زانایانە: بۆیە ناوی ئەو توخمانە هاتووە تا روونی بکاتەوە زەکات بە کێ دەدرێ، نەك لەبەر ئەوەی دانەکە هەمووان بگرێتەوە، (ابن کثیر) دەڵێ: (چەند فەرمودەیەك دەگێڕینەوە دەربارەی هەر یەکێ لەو هەشت کەسانە هاتوون:

**(١) هەژارانو گەدایان (الفقراء):**

(ابن عمر) گێڕاویەوە: پێغەمبەر((ﷺ) فەرمویەتی: (لا تحل الصدقة لغني ولا لذي مرة سوي) [١].

واتە: زەکات حەڵاڵ نییە بۆ دەوڵەمەندو ئەو کەسەی بە توانایەو ساغە.

(عبیدالله بن عدی بن الخیار) گێڕاویەوە: دوو پیاو بۆیان گێڕاوەتەوە هاتوونە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)داوای زەکاتیان لێ کردووە، ئەویش چاوی لێ وەرگێڕاون، چونکە بینیویە دوو کەسی بە توانان، ئەنجا فەرمووی: (گەر دەتانەوێ زەکاتیان دەدەمێ‌و، بەشی دەوڵەمەندو ئەو کەسەی پێوەنییە بەهێزەو توانای کارکردنی هەیە) [٢].

**(٢) دەست کورت (المسکین) یان مسکینەکان:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (دەست کورت ئەو کەسە نییە دەگەڕێ بە سەر خەڵکی دا پارووێ دووپاروی دەدەنێ، یان قەسپێ یان دوو قەسپو رازی دەبێت.

وتیان ئەی (مسکین) کێیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرموی: (ئەو کەسەیە ئەوەندەی دەست

---

(١) صحیح: (ص.ج ٧٢٥١) ت(٢/٨١/٦٤٧)

(٢) صحیح (ص.د ١٤٣٨) د(٥/٤١/١٦١٧)ژ

ناکەویٚ بیٚ نیازی بکات‌و، پێی نازانریٚ خێری پیٚ بکریٚ‌و دەرۆزەش لەخەڵکی ناکات) [١].

**(٣) ئەو کەسانەی فەرمانبەری کۆکردنەوەی زەکاتن (العاملون عليها):**

ئەوانەن زەکات وەردەگرن، ئەوانەش شایانی ئەوەن بەشیٚ لەزەکاتیان پیٚ بدریٚ، دروست نییە ئەم زەکات وەرگرانە خزمی پێغەمبەر (ﷺ) بن، کە زەکاتیان لیٚ حەرامە، لە(صحیح مسلم)دا هاتووە: (عبدالمطلب بن ربيعة بن الحارث) گێڕاویەوە: (خۆی‌و (فضل بن العباس) چونکە لای پێغەمبەر (ﷺ) داوایان لیٚ کرد ببنە فەرمان بەر بەسەر زەکاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زەکات بۆ موحەممەدو ئالی موحەممەد ڕەوا نییە ئەمە چلکی خەڵکە) [٢].

**(٤) ئەوانەی هیوای موسڵمان بوونیان لیٚ دەکریٚ (المؤلفة قلوبهم):**

هەیە بۆیە زەکاتی پیٚ دەدریٚ تا موسڵمان بیٚ، وەکو چۆن پێغەمبەر (ﷺ) دەسکەوتی جەنگی حونەینی دایە (صفوان بن امية) کە بەبت پەرستی بەشداری کرد، دەڵیٚ: (بەردەوام ئەو دەسکەوتەی دامیٚ تاوام لیٚ هات لەهەموو کەس خۆشترم بویٚ، دوای ئەوەی لەهەموو کەس پتر ڕقم لیٚ ی دەبۆوە) [٣].

هەبوو بۆیە زەکاتی دەدایە تا دڵی دابمەزریٚ لەسەر ئیسلام‌و باشتر بیٚ، هەروەکو چۆن لەحونەیندا لەدەسکەوتی جەنگی (١٠٠) وشتری دایە سەرکردە ئازاد کراوەکان (الطلقاء)و فەرمووی: (من دەیدەم بە کەسیٚ کە من زیاتر لەخۆی خۆشم دەویٚ، لەترسی ئەوەی نەوەك خوا بیخاتە ناو دۆزەخەوە) [٤]. لە(صحیحین)دا هاتووە: (عەلی (س) هەندیٚ زێڕی لەیەمەنەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بردو ئەویش لەنێوان چوار کەسدا دابەشی کرد: (الأقرع بن حابس)و (عيينە بن بدر)و (علقمة بن علاثة)و (زيد الخير)و فەرموی: دڵیان رادەکێشم (اتألفهم) [٥].

هەبوو زەکاتی دەدرایە تا هاوشانەکانی موسڵمان بن.

---

(١) متفق عليه (م ٢/٧١٩/١٠٣٩) خ(٣/٣٤١/١٤٧٩).

(٢) صحيح (ص.ج ١٦٦٤) م(٢/٧٥٢/١٠٧٢)..

(٣) صحيح (مختصر م ١٥٨٨) (م ٢/٧٥٤/١٦٨/١٠٧٢).

(٤) متفق عليه (خ١/٧٩/٢٧) م(١/١٣٢/١٥٠).

(٥) متفق عليه: خ(٨/٦١٧/٤٣٥١) م(٢/٧٤١/١٠٦٤).

هەبوو بۆیە زەکاتی دەدرایە تا زەکاتی بۆ کۆبکاتەوە لەلایەن ئەوانەوە کە کردونی بە والی، یان بۆ ئەوەی زیان لەهەموو لایەکی ولآتدا لەموسلمانان دوور بخاتەوە.

ئایا دوای پێغەمبەر (ﷺ) زەکات بەوانە دەدرێ کە هیوای موسلمان بوونیان لێ دەکرێ؟

(ابن کثیر) دەڵێ: ناکۆکی تێدایە: لەعومەرو عامرو شەعبیو کۆمەڵێ گەڕاوەتەوە، کە دوای ئەو نەدراوە، چونکە خوا ئیسلامی سەرخستووە دەسەلآتی داوەتێو دنیای بۆ ژێربارکردووە بە خەڵکەوە.

کەسانی تر هەیە دەڵێن: هەر دەدرێ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دوای رزگاری مەککەشو شکانی هەوازن زەکاتی پێ داون، ئەمەش مەسەلەیەکە پێویستەو دەبێ پێیان بدرێت.

**(٥) کۆیلەکان(الرقاب):**

لە(حسن البصری)و (مقاتل بن حیان)و (عمر بن عبدالعزیز)و (سعید بن جبیر)و (النخعي)ء (الزهري)و (ابن زید) گەڕاوەتەوە، ئەمە ئەمانەن کە کۆیلەی (المکاتب)و لەلایەن ئاغاکانیەوە مامەڵەی خۆکڕینەوەیان لەگەڵداکراوە، ئەمە لە(ابي موسی الأشعري)و هی تر گەڕاوەتەوە، ئەمە قسەی (شافیعی)و (اللیث)ە.

(ابن عباس)و (حسن) دەڵێن: (قەیدی نییە کە کۆیلە بە زەکات ئازاد بکرێت. ئەمە مەزهەبی (احمد)و (مالك)و (اسحاق)ە. واتە: (الرقاب) لە(المکاتب) گشتی گر ترە لەوەی کە تەنیا بدرێ بە (المکاتب)، یان کۆیلەیێ بکرەڕێو ئازادبکرێت. لەراست ئازادکردنی کۆیلە فەرمودەی زۆر لەبارەی پاداشتی ئەمەدا هاتووە، خوا لەبەرامبەر ئازادکردنی هەر ئەندامێکی دا لەدۆزەخی ئازاد دەکات تا ئازادکردن بە ئازادکردن سەر بەسەر دەبێت. چونکە پاداشت لەرەگەزی کردەوەیە: ﴿وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[1].

**(٦) قەرزداری: ئەمانە چەند بەشێکن:**

هەیە تۆڵەیەکی خستۆتە سەر شانی خۆی، یان قەرزەکی خستۆتە سەر شانی خۆیو باری شانی قورس کردووە، یان لەدانەوەی قەرز دا غەرامە کراوە یان لەتاوانێکدا پاشان تۆبەی کردووە، ئەوانە زەکاتیان پێ دەدرێت.

---

(١) یس: ٥٤.

ئەم باسە لەفەرمودەی (قبيصة بن مخارق الهلالي) وەرگیراوە: (مـن تۆڵەیـەکم خـستە سـەر شانی خۆم، هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوام لێ کرد بۆم بداتـەوە، فـەرموی: بوەستە تازەکاتمان بۆدێ، فەرمان دەکەم پێت بدرێت).

وتی: پاشان فەرموی: (ئەی ـ قبيصە ـ داواکردنو دەرۆزە بۆ سێ کەس حەڵاڵە: پیاوێ تۆڵەو پێ ژماردنێ دەگرێتە خۆ، دەرۆزەی بۆ رەوایە تا پێ ی دەدرێو پاشان دەسـتی لـێ دەگێڕێتـەوە، پیاوێ سامانەکەی تووشی کارەساتێ دێ ئەو سواڵو دەرۆزەی بۆ دروستە، بـژێوی ژیـانی دەست ئەکەوێ، یـان پیـاوێ تووشـی هـەژاریو نـەبوونی یـەك دێ سـێ کـەس لـەداناپانی هۆزەکـەی هەڵدەستنو دەڵێن: فلان کەسە هەژاربووە سواڵو دەرۆزەی بـۆ دروسـتە تـا قـوتی ژیـانی دەست دەکەوێ، لەمە پتر ئەی ـ قبيصە ـ سواڵ کردن حەرامەو خاوەنەکەی حەرام دەخوات) [1].

## (٧) لەرێگای خوادا (في سبيل الله):

ئەو سەربازو غەزاچی یانەن لەدیوان مووچەو بەشیان نییە.

لای (احمد)و (حسن)و (اسحاق) حەج لەرێگای خوادایە، وەکو لەفـەرمودەدا هـاتووە: (وتم) مەبەستی پێ لەگێڕانەوەی (ابن عباس (رضي الله عنه)): (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویـستی حـەج بکـات، ژنێ بە مێردەکەی وت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەجم پێ بکە، وتی: وڵاخم نییـە لەگـەڵ ئەودا حەجت پێ بکەم، وتی: لەسەر فلان وشترت حەجم پێ بکـە، وتـی: ئەمـە لـەرێگای خـوای گەورەدا وەقفە ، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ژنەکەم سەلامی خوات لێ دەکاتو داوای لێ کردووم حەجت لەگەڵدا بکاتو وتی: لەگەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) حـەجم پـێ بکـە. وتم وڵاخم نییە حەجی پێ بکەیت. وتی: لەسەر فلان وشتر حەجم پێ بکە. وتم: لەرێگای خوادا کـراوە بە وەقف. فەرموی (ﷺ): (گەر حەجی پێ بکەی لەسەر ئەم وشترە ئەوە لەرێگای خوادایە) [2].

## (٧) رێبوار(ابن سبيل):

ئەو رەوەندو گەشتیارو سەفەرکەرەیە لەوڵاتی خۆی چۆتە دەر، هیچی پێ نییە ئەم سەفەرەی پێ تەواو بکات، ئەوەندەی زەکات پێ دەدرێ کە پێ ی بگاتەوە وڵاتی خۆی، با سـەرمایەداریش

(١) حسن صحيح: (ص.د ١٧٥٣) د(١٩٧٤/٤٦٥/٥) (كم ١٨٣/١) هق(٦/١٦٤).

(٢) صحيح (مختصر م٥٦٨)، م(٢/٧٢/١٠٤٤)

بێ. ئەم یاسایە بۆ ئەو کەسەیە دەستی بەسەفەرەکەی کردووەوکەوتۆتە رێو هیچی پێ نییە، بۆیە پارەی چوونو گەڕانەوەی لەزکات دەدرێتێ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بابای دەوڵەمەند لەپێنج حاڵەتدا زەکاتی پێ دەدرێ: فەرمانبەر بەسەریەوە، یان پیاوێ ئەو شتەی بە ماڵی خۆی کڕیوە. یان ئەو کەسەی قەرزدارە، یان غەزاچی یەك لەرێگای خوادا، یان هەژارێ بە زەکات پێ ی دەدرێو بە دیاری بە دەوڵەمەندەکەی دەدات)[1].

(١) صحيح (ص.ج ٧٢٥٠) د(١٦١٩/٤٤/٥) جه(١٨٤١/٥٩٠/١).

# زەکاتی (سەر فیترە) (زكاة الفطر)

## حیکمەتی سەرفیترە:

سەرچاکردنەوە لەسەر هەموو موسڵمانێ واجبە، (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خودا (ﷺ) زەکاتی سەرفیترەی فەرزکرد ڕبەیەك لەقەسپو خورما، یان ربەیەك (صاع) لەجۆ، لەسەر کۆیلەو ئازاددا و، لەسەر نێرومێ داو لەسەر گەورەو گچکەدا لەموسڵمانان، فەرمانی دا بەر لەچوونە نوێژەکە بدرێت) [١].

## حیکمەتی سەرفیترە:

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەکاتی سەرفیترەی بۆ پاکژبوونەوەی ڕۆژوەوان لەگوناهەکانیو قسەی ناشیرینو نابەجێ فەرزکرد، دیسان وەکو خۆراکێ بۆ هەژاران، هەر کەسێ بەر لەنوێژی جەژن بیدات ئەوە قبوڵە، هەر کەسێ دوای نوێژەکە بیدات خێرێکە لەخێرەکان) [٢].

## لەسەر کێ واجبو فەرزە؟

لەسەر هەموو موسڵمانەکی ئازاد واجبە کە زیاد لەبژێویو قووتی شەوو ڕۆژێکی خۆیو منداڵەکانی هەیە. پێویستە سەری خۆیو ئەو کەسانە چاك بکاتەوە ژیاندنی ئەوانی لەسەرە وەکو ژنەکەیو منداڵەکانو خزمەت کارەکانیەتی، مادام موسڵمانن. (ابن عمر) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا فەرمانی دا سەرفیترە بدرێ، سەری بچوكو گەورەو ئازادو کۆیلە چاك بکرێتەوە کە بژێوییان لەسەر ئەوە) [٣].

---

(١) متفق عليه: خ(٣/٣٦٥/١٥٠٣) م(٢/٦٧٩/٦٧٧/٩٨٦/٩٨٤).

(٢) حسن (ص.جه ١٤٨٠) جه(١/٥٨٥/١٨٢٧).

(٣) صحيح (الارواء ٨٣٥) (هق ٤/١٦١) تێبینی: ربە=صاع= ٤مشت = ٢,٠٤ کگم (كفايـه الاخيـار/ ل:٢٥٢، تحقيق: محمد عوض هيكل.

## برِەکەی:

لەسەر هەموو کەسێك واجبە بە نیو ربە گەنم، یان ربەیەك خورماو مێوژ، یان جۆ یان کەشك (اقط) چاك بکرێتەوە، یان شتێ کەجێگای ئەوان بگرێتەوە وەکو: برنجو گەنمە شامیو شتی تر کە بە قوتو بژێوی دادەنرێت.

نیو ربەی گەنم بۆ سەرفیترە وەکو واجب، لەگێرانەوەی (عروە بن زبیر) دا هاتووە: (اسماء بنت ابي بکر) لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لەبریتی خێزانی دا ئازادەکانو کۆیلەکان دوو مشتی گەنم دەدا، یان ربەیەك خورما بە مشت یان بەو ربەیەی قوتیان پێ دەپێوا) [1].

بەڵام واجب بوونی غەیری گەنم ربەیەك لەگێرانەوەی (ابی سعید الخدری) دا هاتووە: (ئێمە زەکاتی سەرفیترەمان دەدا ربەیەك لەخۆراك، یان ربەیەك لەجۆ یان ربەیەك لەخورما، یان ربەیەك لەکەشك، یان ربەیەك لەمێوژ) [2].

(زۆربەی فەقیهەکان ئەوە بە دروست نازانن کە بەهاو نرخی ئەو قوتو خواردنانە بدرێ تەنیا ئەبو حەنیفە نەبێ). (النووی) لە(شرح مسلم/ ٧/٦٠) دا باسی کردووە. وتم: قسەی (ابو حنیفة) رەت کراوەیەو ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ [3]. گەر بەهاو نرخ دروست بایە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) روونیان دەکردەوە، پێویستە لەبەردەم رواڵەتی دەقەکەدا هەڵوەستە بکرێ، بێ لادانو لێکدانەوە.

## کاتی دانی سەرفیترە:

(ابن عمر) گێراویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە کە سەرفیترە بەر لەچوون بۆ نوێژ بدرێت) [4].

دروستە بەر لەجەژنی رەمەزان رۆژێ دوو رۆژ بەر لەجەژن بدرێ:

---

(١) الطحاوي ٢/٤٣.

(٢) متفق عليه (خ ١٥٠٦/٣٧١/٣) م(٢/٦٧٨/٩٨٥).

(٣) مريم: ٦٤.

(٤) رابرد.

(نافع) دەڵێ: (ابن عمر): (زەکاتی سەرفیترەی بەر لەرۆژێ دوو رۆژێ لەجەژن دەدایە ئەوانەی وەری دەگرن) [١].

**حەرامە بە پاساو نەبێ، لەکاتی خۆی دوا بخرێت:**

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) زەکاتی سەرفیترەی بۆ خاوێن بونەوەی رۆژوەوان فەرزکرد لەقسەی نابەجێو بێ مانا، وە وەکو خۆراکێ بۆ هەژاران، کێ بەر لەنوێژ بیدات ئەوە زەکاتەکی قبوڵە، کێ دوای نوێژ بیدات ئەوە خێرێکە لەخێرەکان) [٢].

## خەرج کردنی:

سەر فیترە تەنیا بە هەژاران دەدرێ وەکو (ﷺ) فەرمویەتی: (وطعمة للمساكين).

---

(١) صحيح خ(٣/٣٧٥/١٥١١).

(٢) رابرد.

# بەخشینی سوننەت ( صدقة التطوع )

پێویستە خێرو چاکە کاری زۆر بکرێ وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾[1]. واتە: نمونەی ئەوانەی سامان دەبەخشن لەپێناوی خوادا وەکو دانەتۆیەکە حەوت گوڵ دەدات، هەر گوڵە سەد دانکی تێدایە، ئەو کەسەی خوا بیەوێ لەمەشی پتر بۆ زیاد دەکات، خوا فراوان گیرو زانایە.

لەفەرموودەدا هاتووە: (هەر کە بەندەکان بەیانی دەکەنەوە، دوو فریشتە دادەبەزنو یەکێ دەڵێ: خودایە ئەو کەسەی دەبەخشێ بیدەوە، ئەوەی تر دەڵێ: خودایە ئەو کەسەی نابەخشێو ڕەزیلە ماڵی لەناو بەرە)[2].

لەپێشترین کەس بۆ خێرو بەخشین خاوو خێزانو کەسو کاری خۆیەتی:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (خێر بە هەژار خێرە، خێر بە خزم دوو خێرە، چاکەو خێرەو بەجێ هێنانەی خزمایەتی یە)[3].

---

(١) البقرة: ٢٦١.

(٢) متفق عليه: خ(٣/٣٠٤/١٤٤٢) م(٢/٧٠٠/١٠١٠).

(٣) صحيح: (ص.ج ٣٨٥٨/) ت(٢/٨٤/٦٥٣).

# باسی حەج (كتاب الحج)

## گەورەیی حەج‌و عومرە:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (عەمرە بۆ عەمرە کەفارەتی گوناهی ئەو دوو نێوانەیە، و حەجی خاوێن‌و زولاڵ (المبرور) پاداشتی تەنیا بەهەشتە)[١].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (حەج‌و عومرە بە دوای یەکتری دا بکەن، ئەو دووانە گوناهو هەژاری دەسڕنەوە، وەکو چۆن کوورە (الکیر) پیسی ئاسن‌و زێڕو زیو لادەبات، حەجی خاوێن‌و زولاڵ پاداشتی بەهەشتە) [٢].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ حەجی خوای گەورەی کرد، کاری جووت بوون‌و کاری خراپەو فاسقەتی نەکرد، وەکو ئەو ڕۆژەیە دەگەڕێتەوە کە تازە لەدایکی خۆی بووە) [٣].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (سەربازی غەزاچی لەرێگای خواداو ئەو کەسەی حەج‌و عومرە دەکەن نوێنەر(وفد)ی خودان، بانگی کردوون‌و بەدەنگی یەوە چوون، ئەوان داوایان لێ کردووەو ئەویش پێ ی بەخشیون) [٤].

حەج‌و عومرە جارێك لەتەمەندا لەسەر هەموو موسڵمانێ فەرزە، کە باڵغەو خاوەن هزرو عاقڵەو ئازادەو توانای هەیە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ* فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾[٥].

---

(١) متفق عليه: خ(٣/٥٩٧/١٧٧٣) (م ٢/٩٨٣/١٣٤٩).

(٢) صحيح: (ص.ج ٢٩٠١) ت(٢/١٥٣/٨٠٧).

(٣) متفق عليه (خ ٣/٣٨٣/١٥٢١) م(٢/٩٨٣/١٣٥٠).

(٤) حسن (ص.جه ٢٣٣٩) جه (٢/٩٦٦/٢٨٩٣).

(٥) آل عمران: ٩٦ ـ ٩٧.

واتە: یەکەم بەیتولماله بۆ خەڵکی دانراوە لەبەککە (مەککە)دا پڕ پیتو فەڕەو ڕێنوێنی یە بۆ جیهانیەکان. چەند بەڵگەیەکی ڕۆشنی تێدایە، شوێنی ئیبراهیمە، کێ بڕواتە ناویەوە بێ ترسو باکە، بۆ خوا فەرزە لەسەر خەڵکی حەجی بەیت کێ بتوانێ، کێ نا سوپاس گوزار بێ ئەوە خوا بێ نیازە لەراست جیهانیەکاندا.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (خوا حەجی لەسەر فەرز کردوون حەج بکەن) پیاوێ وتی: ئایا هەموو ساڵی ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەنجا سێ جار ئەم پرسیارەی دووبارە کردەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی نەدایەوە، ئەنجا فەرمووی: (گەر بڵێم بەڵێ واجب دەبێو ئێوەش ناتوانن).

پاشان فەرموی: (ئەوەی بۆم بەجێ هێشتون بەسیەتی لەمن گەڕێن، خەڵکانی پێش ئێوە بەهۆی زۆری پرسیارو ناکۆکی لەراست پێغەمبەرانیاندا لەناو چوون، گەر فەرمانم پێ کردن بەشتێ ئەوەندەی توانیتان بیکەن، گەر لەشتێکم یاساغ کردن وازی لێ بێنن) [(١)].

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شەهادەی (لا الـه الا الله ـ محمد رسول الله)و نوێژ کردنو زەکاتدانو حەجی بەیتو ڕۆژووی ڕەمەزان) [(٢)].

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (ئەمە عومرەیە بە موتعەدامان بەستووە، کێ قوربانی نەبوو با لەهەموویان بێتە دەر، عومرە چووە سەر حەج تا قیامەت دێت) [(٣)].

(الصبی بن معبد) گێڕاویەوە: (هاتمە لای عومەر وتم: ئەی میری موسڵمانان من موسڵمان بووم، من دەبینم حەجو عومرە هەردووکم لەسەر فەرز بوون، ئێستا ئیحرامم بۆ هەردووکیان بەستووە، وتی: ڕێنومای سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بوویت)[(٤)].

---

(١) صحيح (مختصر م ٦٣٩) م(٢/٩٧٥/١٣٣٧).

(٢) رابردوو.

(٣) صحيح (الارواء: ٩٨٢) م(٢/٩١١/٢٤١).

(٤) صحيح الارواء: ٩٨٣) نس(٥/١٤٦) د(٥/٢٣٠/١٧٢٢)..

## حەجی منداڵو کۆییلە:

حەج لەسەر منداڵو شێت واجب نییە، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (قەڵەمو خامە لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: شێت تا چاك دەبێتەوە، خەوتوو تا بێدار دەبێتەوە، منداڵ تا باڵغو هەراش دەبێت)[1].

لەسەر کۆییلە واجب نییە، چونکە سەرقاڵە بە خزمەتی ئاغاکەیەوە:

گەر منداڵو کۆییلە حەجیان کرد، حەجیان دروستە بەڵام فەرزیان لەسەر لاناچێو گەر منداڵ باڵغ بوو یان کۆییلە ئازاد بوو دەبێ بیکەنەوە.

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (ژنێ منداڵەکی بەرەو رووی پێغەمبەر (ﷺ) بەرز کردەوە ئایا ئەمە حەجی لەسەرە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی بەڵێو تۆش پاداشتت هەیە)[2].

هەروەها (ابن عباس) (رضي الله عنه) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر منداڵێ حەجی کردو دواتر کە باڵغ بوو دەبێ حەجەکی تر بکاتەوە، هەر کۆییلەیێ حەجی کرد پاشان ئازاد بوو حەجەکی تری لەسەرە)[3].

## توانا (الإستطاعة) چی یە؟

توانا بە ساغیو دروستی ئەو برە پارەو ماڵەیە دێتە دی کە بەشی چوونو گەڕانەوە بکات، سەرباری ئەوە بەشی خۆیو ئەو ئەندامانەی خێزانی بکات کە خەرجی ئەوانی لەسەرە، ئەنجا رێگا بێ ترسو بیم بێت. بەڵام مەرجی ساغیو تەندروستی لەفەرمودەی (ابن عباس)دا هاتووە: (ژنێ لە(خثعم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باوکم کاتی هاتووە حەج بکات، بەڵام پیرە ناتوانێ لەسەر وڵاخ بوەستێ، ئایا حەجی لەجیاتی بکەم؟ فەرموی: (حەجی لەجیاتی دا بکە)[4].

لەراست ماڵو دارایی دا کە زیاد لەپێویستی خۆیو ئەوانە بکات کە بەخێوکردنیان لەسەر

---

(١) رابردوو باسکرا.

(٢) صحيح (مختصر م ٦٤٨) (م ٢/٩٧٤/١٣٣٦).

(٣) صحيح (الارواء: ٩٨٦) هق(٥/١٥٦).

(٤) متفق عليه : (خ ٤/٦٦/١٨٥٥) م(٢/٩٧٣/١٣٣٤).

شانی ئەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كفى بالمرء ان يضيع من يقوت)[1]. واتە: مرۆڤ ئەوەندە تاوانەی بەسە کە بژێوی ئەوانە نەدا کە خەرجی ئەوانی لەسەرە.
بوونی ئاسایش بۆیە مەرجە، گەر ئاسایش نەبێ زیانی هەیەو ئەمەش لەشەرعدا پەسەند نەکراوە.

**حەجی ژن:**

گەر مەرجەکانی رابردوی توانا لەئافرەتدا هەبوو، حەجی لەسەر واجب دەبێ وەکو پیاو، بەڵام مەرجەکی تری بۆ زیاد دەکرێت، ئەویش ئەوەیە کە دەبێ مێردی خۆی یان کەسێکی خۆیی (مەحرەم)ی لەگەڵ دا بێت، گەر کەسی نەبوو، ئەوە نەیتوانیوە. (ابن عباس (رضي الله عنه)) فەرمویەتی: لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (هیچ پیاوێ لەگەڵ ژنێکدا پێکەوە نابن مەگەر کەسێکی خۆیی لەگەڵدا نەبێ، لەگەڵ کەسێکی خۆیی دا نەبێ سەفەر ناکات). پیاوێ هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنەکەم بۆ حەج چووەو منیش بۆ فلان غەزاناوم نوسیوە. فەرموی: (برۆ حەج لەگەڵ ژنەکەتدا بکە)[2].

**حەجی زوویی و دوا نەخستنی:**

پێویستە پەلە لەکردنی حەج بکرێ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ دەیەوێ حەج بکات با پەلە بکات، چونکە هەندێ جار مرۆڤ نەخۆش دەبێ و پێویستی یە کەی لەدەست بدات یان هەژار بێت)[3].

---

(١) صحيح (الارواء: ٩٨٩) (د: ٥/١١١/١٦٧٦).
(٢) متفق عليه: خ(٦/١٤٢/٣٠٦) م(٢/٩٧٨/١٣٤١).
(٣) صحيح (ص.جه ٢٣٣١) جه(٢/٩٦٢/٢٨٨٣).
تێبینی: (١)فەرمودەی (ابن ماجة) لە(الزوند)دا (اسناده ضعيف)ە. دیسان لای شافیعی دروستە پەلە لەحەج نەکرێ وەکو لە(التاج الأصول/ج٢)دا هاتووە..

**کاتەکان ( المواقيت ) یان ( میقاتەکان ):**

کاتەکان دەبنە دووبەشەوە: کاتی زەمەنیو کاتی جێگایی[(١)].

**کاتەکانی زەمەنی (المواقيت الزمانية):**

خوای گەورە فەرمویەتی: يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ [(٢)]. واتە: دەربارەی مانگی یەك شەوە لێت دەپرسن؟ بڵێ: چەند کاتێکە بۆ خەڵکی بۆ حەج.

﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ﴾[(٣)]. واتە: حەج چەند مانگێکی دیاری کراوە.

(ابن عمر) دەڵێ: مانگەکانی حەج: شەووالو زولقەعیدەو دە رۆژ لەزیلحیجە) [(٤)]. (ابن عباس) دەڵێ: (سوننەتە لەمانگەکانی حەجدا نەبێ ئیحرام بۆ حەج نەبەسترێت) [(٥)].

جێگاکانی ئیحرام بەستن (المواقيت المكانية) یان (میقاتەکان):

(ابن عباس) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خەڵکی مەدینەی (ذو الحليفة)ی دانابو ئیحرامی لێ ببەستن، بۆ خەڵکی شام (الجحفة)ی دانابوو، بۆ نەجد (قرن المنازل)ی دانابوو، بۆ خەڵکی یەمەن (یەلەملەم)ی دانابوو، فەرموی: (ئەوە ئەو شوێنانەن کە بۆ ئەو وڵاتانەیەو بۆ ئەوانەیە بە ئەوێ دا رەت دەبنو خەڵکی ئەوێ نینەو حەجو عومرە دەکەن، هەر کەسێ لەنێوان میقاتو مەککە بێ لەشوێنی خۆیەوە ئیحرام دەبەستێ، تا دانیشتوانی مەککەو لەمەککە ئیحرام دەبەستن) [(٦)].

کێ بیەوێ بۆ مەناسیکێ بڕواتە مەککەوە نابێ لەو جێگایانەوە تێ بپەڕێ تا ئیحرام دەبەستێت. پەسەند نییە ئیحرام بەر لەم جێگایانە ببەسترێ (هەموو ئەو گێڕانەوانەی هاندەرن بۆ ئیحرام بەستن بەر لەجێگا ئەوە دەردەخەن، دروست نییە بەر لەم جێگایانە ئیحرام بپۆشرێت، بەڵکو پێچەوانەی ئەوە گەڕاوەتەوە، بۆ هۆیەکەی بگەڕێوە (سلسلة الاحاديث

---

(١) فقه السنة(١/٥٤٩).

(٢) البقرة: ١٨٩.

(٣) البقرة: ١٩٧.

(٤) صحيح الإسناد/مختصر خ ٣١١/ص٣٧٢) (خ ٣/٣١٩) تعليقا.

(٥) صحيح الإسناد/مختصر خ ٣١١/ص٣٧٢) (خ ٣/٣١٩) تعليقا.

(٦)متفق عليه: خ(٣/٣٨٤/١٥٢٤) م(٢/٨٣٨/١١٨١).

الضعيفة/٢١٠/٢١٢)[1]. ئەم گێڕانەوەی مالیك چەندە لەجێ ی خۆیەتی، کە بە پیاوێکی وت کاتێ دەیویست بەر لەمیقاتو جێگاکە ئیحرام ببەستێت: (ئەو کارە مەکە گەرنا لەوە دەترسم دووچاری زیان ببیت، وتی: چ زیانێ لەمەدا هەیە؟ ئەمە تەنیا چەند میلێکە زیاد تری دەکەم، وتی: لەم زیانە زۆرترە کە تۆ ببینرێ پێغەمبەر (ﷺ) چاکەیەکی نەکردبێ تۆ پێش ئەو کردبت، من گوێ بیستی خوا بووم فەرمویەتی: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[2]. واتە: با ئەو کەسانە وریابن کە پێچەوانەی فەرمانی ئەو دەکەن کە تووشی زیان دەبن یان تووشی ئازارەکی توند دەبن.

## تێ پەڕین بە میقاتدا (جێگای ئیحرام بەستن) دا بەبێ ئیحرام بەستن:

کێ لەمیقات تێ پەڕیو ئیحرام نەبەستێو مەبەستی کردنی حەجو عومرەش بوو، پاشان دوای تێ پەڕین ئیحرامی بەست ئەوە گوناهبار دەبێو تا نەگەڕێتەوە میقات ئیحرام لەئەوێوە نەبەستێ گوناهی لەسەر ناسڕێتەوە، پاشان مەناسیکەکانی تەواو دەکات، گەر نەشگەڕێتەوە مەناسیکەکانی دروست دەبن، بەس گوناهبار دەبێو خوێن رشتنو فیدیەی لەسەر نییە.

لەگێڕانەوەی (صفوان بن يعلي)دا هاتووە: (يعلى) بە (عمر)ی وت: (پێغەمبەر (ﷺ)م لەکاتی هاتنی سروش (وحی) پیشانم بدە، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لە(جعرانە) بوو دەستەیەك یاری لەگەڵدا بوون، ئەم پیاوە هاتە خزمەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێ کە ئیحرامی عومرەی دەبەستێو بۆنی خۆشی لەخۆیداوە چۆن دەبێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) ساتێ وەستاو سروش ـ وەحی ـ هات، پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ (يعلى) کرد، (يعلى) هات، پێغەمبەر (ﷺ) پارچە پەڕۆیەکی پێدا بوو سێبەری لێ کرد بوو، سەری بردە ژورەوە، بینی پێغەمبەر (ﷺ) سەری داپۆشیوەو پرخەی خەوی دێ، پاشان هاتەوە سەر خۆیو فەرمووی: کوانێ ئەو کەسەی پرسیاری لەراست عومرە کرد؟ پیاوەکە هێنرا، پێ ی فەرموو: سێ جار ئەم

(١) تێبینی (النووي) لە (منهاج) دا دەڵێ: (وا چاکە لەسەرەتای میقاتەوە ئیحرام ببەسترێ دروستە لەکۆتایی میقاتیش ئیحرام ببەسترێ). وەرگێڕ.

(٢) النور: ٦٤.

بۆنە بشۆرەوەو عەباکەت داڕنە، چیت بۆ حەجەکەت کردووە ئەوە بۆ عومرە بکە)[١].

(ئەم فەرمودەیە بە روونی ئەوە دەردەخات، کە هەر کەسێ کارێکی قەدەغەکراو بکات کە لەئیحرام دا کردنیان حەرامە، تەنیا ئەوەندەی لەسەرە وازی لێ بێنێ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) تەنیا فەرمانی ئەوەی بەو پیاوە کرد کە بۆنی ژنانی لەجبەی دەهات، لەبەر کرد بوو ـ کە لەگێڕانەوەیەکی تردا بە (خلوق) هاتووە، کە جبەو عەباکە دابنێو بۆنەکە بشواتەوە، لێرەدا فەرمانی نەکرد کوشتە بکات بۆ فیدیە، گەر واجب بوایە فەرمانی دەکرد، لەبەر ئەوەی دروست نییە لەکاتی پێویستی دا بەیانکردنەکە دوا بخرێو پێویستی یەکە دامەزراوە)[٢].

ئیحرام بەستن لەمیقات (جێگاکانی ئیحرام بەستن)دا:

(گەر ویستی ئیحرام) ببەستێ، گەر حەجو عومرە پێکەوە بکاتو قوربانی لەگەڵدا بوو با بڵێ: (لبيك بحجة وعمرة) گەر قوربانی پێ نەبوو، ئەوە وا باشترە بڵێ (لبيك بعمرة)و بەس. پێویستە بڵێ: (لبيك اللهم بعمرة) کە (لبيك)ی بۆ حەج کردو بەسو هەڵی وەشاندەوەو کردی بە عومرە هەر دەبێ وابڵێ)[٣]. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە هەمو یارانی کرد ئیحرام بشکێننو تەوافو سەعیان بکەن بە عومرە، مەگەر کەسێ قوربانی هێنا بێ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ)، لەو کەسانەش توڕەبوو بە دەنگی یەوە نەهاتن، پێغەمبەر (ﷺ) دووپاتی کردەوە کە (عومرە *تا قیامەت چووەتە سەر حەج کردن)*. ئەمەش دەقێکە کە عومرە بووە بەشێك لەحەجو لێك جیا نابنەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (لو استقبلت من امري ما استدبرت لم اسق الهدی). واتە: گەر ئەم رایەم بە بیردا هاتبایە کە لەئاخری دا بە بیرمدا هات، سەرەتا فەرمانم پێ دەکردنو قوربانیم نەدەهێنا. ئەمەش دروشمێ نییە تەنیا ئارەزوێ بێ لەدەستی چوو بێت، چونکە ئیحرامی قیرانی بەستووە، بەڵکو جارێکە لەئەوەوە کە (تمتع) لەحەجدا باشترە لە(قیران) لەحەجدا. پێویستە گشت حاجی یەك لەگەڵ حەجەکەی عومرە بکات(بە قیران)، یان لەبەر ئەوەی پێشی خستووە چونکە قوربانی نەهێناوە، ئەمەش (التمتع)ە، یان بۆیە (قیران)ی کردووە چونکە قوربانی هێناوە، ئەمەش (مقرون)ە، هەر کامێ بکات هەر سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام

(١) متفق عليه: خ(٣/٣٩٣/١٥٣٦) م(٢/٨٣٦/١١٨٠).

(٢) ارشاد الساري للوالد الشيخ محمد ابراهيم شقرة.

(٣) مناسك الحج والعمرة/للألباني.

(التمتع) باشترە وەکو ئێستاکە باسمانکرد. ئەوەی ماوە بیزانین، هەر چەندە واجبە لەسەر ئەو کەسەی حەجی بە تاك (المفرد) دەکات یان لەگەڵ عومرە (القران) دا قوربانی نەهێناوە کە ئیحرام بشکێنێ گەر تەواف‌و سەعی کردن ئیحرام پۆش ناتوانێ‌و کاتی بەش ناکات ئیحرامی تێدا هەڵوەشێنێتەوەو پاشان بەر لەدەرچون بۆ عەرەفە ئیحرام حەج ببەستێ، بۆیە دروستە ئەو کەسەی ئیحرامی بە تاك (المفرد) بەستووە، یان بۆ حەج‌و عومرە (القران)و قوربانی نەهێناوە بە ئیحرام پۆش بمێنێتەوە تا رەجمی (العقبة) دەکات لەرۆژی قوربان (النحر)دا ئیحرام نەشکێنێ، ئەگەر هاتوو کاتی نەبوو هەڵی وەشێنێ‌و ئیحرامەکی تر ببەستێتەوە.

نمونەی ئەوە: هەر کەسێ شەوی نۆیەم هاتە مەککەو لەوە ترسا وەستان لەعەرەفەی لەکیس بچێ، چونکە ماوەکە کەمەو بەرەبەیان نزیکە، ئەوە پێویستە هەوڵ بدات بۆ کێوی عەرەفە سەرکەوێ، تا ئەو روکنەی لەدەست نەچێ کە بە لەدەست چوونی هەموو حەج لەدەست دەدات، کە وەستانە لەعەرەفە، حەجی (المفرد) لەکاتی نەبوونی بواردا دروستە، گەر مرۆڤ حەجی کردو (التمتع)و (القران)ی نەکردن بەو مانایەی (الافراد)ی پێ باشترە لەوانە، ئەوە تاوان بار دەبێت، چونکە وەڵامی فەرمانی پێغەمبەری (ﷺ) نەداوەتەوە کاتی بە یارانی فەرموو حەجەکەیان بکەنە عومرە، بەڵام حەجەکەی دروست دەبێت [1].

رێگادان بە ئیحرام پۆش کە مەرجی ئیحرام هەڵوەشاندنەوە بگرێتە بەر بە هۆی پاساوی نەخۆشی‌و هۆکاری تر:

(عائیشە (رضي الله عنها) گێراویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) چووە لای (ضباعة)ی کچی (الزبير)و پێ ی فەرموو: (حەجت مەبەستە)؟ وتی: بەخوا ئازارم هەیەو نەخۆشم، پێ ی فەرموو: حەج بکەو مەرج‌و شەرت دابنێ بڵێ: (اللهم محلي حيث حبستني). واتە: شوێنی هەڵوەشاندنەوەی ئیحرامم لەو شوێنەیە کە رێگام لێ دەگرێت[2].

هەر کەسێ مەرجی دانا هەر کاتێ نەخۆشی یان دوژمن یان هەر شتەکی تر رێگای لێ بگرێ، ئەوە ئیحرام هەڵدەوەشێنێتەوەو خوێنی لەسەر نییە.

هەرکەسێ هەڵوەشاندنەوەی ئیحرام بە مەرج نەگرێ کاتێ رێگای لێ گیرا خوێنی دەکەوێتە

---

(١) ارشاد الساري للوالد الشيخ محمد ابراهيم شقرة.

(٢) متفق عليه : (خ ٥٠٨٩ /١٣٢/٩) م(٢/٨٦٧/١٢٠٧) نس(٥/١٦٨).

سەر، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾[١]. واتـە: گـەر قەدەغەکرانو ڕێگاتان لێ گیرا ئەوەی بۆتانی سازا دەیکەنە قوربـانی. قوربـانی یەکـەیان خـوێن ڕشتنە کە بە وشترو ڕەشە ولاٚخو مەڕو بزن دەبێت. گەر مـەڕێ سـازا دروسـتە، هەرچـی وشـترو ڕەشەولاٚخە لەپێشترە بۆ ئەم فیدیەو کەفارەتە، گـەر فیدیـەو خـوێن نـەبوو (١٠) ڕۆژان بـەڕۆژوو دەبن، ئەمەش لەگەڵ (التمتع)دا دەپێورێو قیاس دەکرێ، کاتێ فیدیەی دەست گیر نابێت.

---

(١) البقرة: ١٩٦.

# ( خذوا عني مناسككم )
# ( یاساکانی حەج لەمن وەربگرن )

## حەجی پێغەمبەر (ﷺ)

(مسلم) لەپێشەوا جەعفەری سادق (رضي الله عنه) ئەویش لەباوکی (رضي الله عنه) گێڕاویەوە: چووینە لای (جابر بن عبدالله) (رضي الله عنه)پرسیاری لەخەڵکەکە کرد تا سەرە گەیشتە مـن. وتم: مـن موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی حوسێنم (س)، دەستی بەسەر سەرمدا شۆڕکردەوە، ئەنجا قۆپچەی سەرەوەی کردمەوە، پاشان قۆپچەی خوارەوەی کردمەوەو دەستی خستە نێوان مەمکەکانمەوەو ئەو کاتە من هەرزەکارو گەنج بووم، پێ ی وتم: ئامۆزاکەم بەخێر هاتی، چیت دەوێ بپرسە، منیش پرسیارم لێ کرد، ئەو کوێر بوو، کاتی نوێژ هات، هەڵسا پێ پۆشاکەکی چنراوی (جبـە ـ نساجە)ی لەخۆی وەر پێچابوو.

هەر کە دەیخستەوە سەر شانەکانی لکەکانی شۆڕ دەبونەوە خوارەوە بۆ لای خۆی لەبەر بچوکی ، بەرماڵەکەی (الرداء) لەسەر هەرزاڵەی (المشجب) دانا بوو نوێژی بۆ کردین. منیش پێم وت: دەربارەی حەجی پێغەمبەر (ﷺ) زانیاریم بدەیە؟ بە دەستەکانی خۆی دیاری کردن‌و ئاماژەی پێ کردن، پاشان وتی: (پێغەمبەری خودا نۆ ساڵان مایەوە حەجی نەکرد، پاشان لەساڵی دەیەمدا جاڕی لەناو خەڵکی داکە پێغەمبەر (ﷺ) حەج دەکات، خەڵکەکی زۆر هاتنە مەدینە هەموویان مەبەستیان بوو شوێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵبگرن‌و وەکو ئەو کارەکانیان بکەن، لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) هاتینە (ذا الحليفة)، لەوێ (اسماء بنت عميس) موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری لێ پەیدا بوو، بەشوێن پێغەمبەری دا (ﷺ) نارد چی بکات؟ فەرموی: (خۆت بشۆو بە پۆشاکێ ئەندامی زاووزێ ببەستەو ئیحرام بپۆشە). ئەنجا پێغەمبەری خوا لەمزگەوت نوێژی کرد، پاشان سواری وشترەکەی بوو(القصواء) تا گەیاندینە (بەیداء)، ئەوەندەی چاو بڕ دەکات تەماشای خەڵکم کرد لەسوارو لەپیادە لەپێشەوەو لەلای راستو لای چەپ‌و پشتیەوە دەڕۆیشتن ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنێوانماندا تەشریفی ئامادە بوو، ئەو قورئانی بەسەردا دەهاتە خوارو

تەئویلەکەی دەزانی، هەرچی ئەو دەیکرد ئێمەش دەمان کردەوە، ئیحرامی بەم دوعایە بەست: (لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك). خەڵکی بەهەمان شێوە ئیحرامیان بەست، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچی لێ نەبڕین لەم گوتانە، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی پەیوەست بوو بە (لبيك)ی خۆیەوە.

(جابر (ﷺ)) دەفەرمووێ: (مەبەستو نیەتمان تەنیا حەج کردن بوو، عومرەمان نەدەزانی تا لەگەڵدا هاتینە بەیت دەستی پێکرد لەبەردە رەشەکەوە، سێ جار سوڕایەوە بە راکردنو چوار جاریش بە رۆیشتن، دوایی چوو بۆ مەقامی ئیبراهیم (س)و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾[1]. مەقامی خستە نێوان خۆیو کەعبەوە دوو رکەعەتی نوێژ کرد. (باوکم وتی) پێم وایە ئەمەی هەر لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) باسی کردووە. لەرکەعەتی یەکەمدا ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ی دەخوێندەوە لەرکەعەتی دووەمدا ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ی دەخوێندەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ (روکن) دەستی لێ ی دا، دوایی چووە (سەفا)، کاتێ لەسەفا نزیک کەوتەوە ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ﴾[2]ی خوێندەوە. خوا بەچی دەست پێ کردووە بەوە دەستی پێ کرد، بە سەفا دەستی پێکردو سەری کەوت تا بەیتی لەوێ دەبینی، ئەنجا رووی لەقیبلە کردو خوای بە تاك داناو گەورەی ناوزەد کردو فەرمویی: (لا اله الا الله، انجز وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده). سێ جار ئەمەی وەکو سروود وتەوەو لەنێوانیشیاندا دوعای کردو پاڕایەوە، پاشان بەرەو (مەڕوە) شۆڕبۆوە تا کەوتە قوڵایی دۆڵەکەوە، ئەنجا سەعی کردو رۆیشت، کاتێ سەرکەوتین رۆیشت تا هاتە (مەڕوە)و لەسەفا چی کرد لەمەڕوەش ئەمەی دووبارە کردەوە.

هەتا کاتێ دوا تەوافو سوڕانەوەی لەسەر مەڕوە بوو فەرمویی: (ئەگەر رابردوو بیری ئێستام هەبوایە قوربانیم نەدەهێناو ئەمەم دەکردە عومرە، کێ لەئێوە قوربانی (الهدي)ی پێ نییە با بیکات بە عومرە). (سراقە بن مالك بن جعشم) وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە بۆ ئەم ساڵمانە یان بۆ هەتا سەرە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنجەکانی تێك هەڵکێش کردو دووجار فەرمویی: (ئەمە بۆ هەمیشەیی یە).

---

(١) البقرة: ١٢٥.

(٢) البقرة: ١٥٨.

پێشەوا عەلی (ﷺ) لەیەمەن هاتبۆوە قوربانیەکانی پێغەمبەری (ﷺ) هێنا بۆوە، فاتیمەی (رضي الله عنها) بینی ئیحرامی شکاندووەو بەرگی ڕەنگ کراوی کردۆتەوەو کلی کردووە، ئەمەی بە باش نەزانی بۆ ئەو، فەرموی: (باوکم فەرمانی ئەمەی پێ کردوم). عەلی (ﷺ) لە(عێراق) دەیفەرموو: (چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەراست ئەم کارەی فاتیمە کردبوی ناڕەزاییم دەربڕی، دەربارەی ئەو باسی کرد پرسیارم لەپێغەمبەری خودا (ﷺ) کرد، وتم: من ئەوەم پێ خۆش نەبووە، فەرموی: (راست دەکەی راست دەکەیت، تۆ کاتێ نیەتی فەرزەی حەجت هێنا، چیت وت؟ فەرموی: وتم: (من بەو نیەتە ئیحرامم پۆشیوە کە پێغەمبەرەکەت (ﷺ) نیەتی لێ هێناوە). پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (من قوربانیم پێ یە تۆش ئیحرام مەشکێنە).

فەرموی" ژمارەی ئاژەڵانی قوربانی کە عەلی (ﷺ) لەیەمەن هاوردبوونی سەد سەر بوو، وتی: خەڵکی هەموویان ئیحرامیان شکاندو سەریان کورت کردەوە تەنیا پێغەمبەر (ﷺ) نەبێ کەقوربانی پێ بوو، لەرۆژی (تەروییە)دا روویان لە(مینا) کردو ئیحرامی حەجیان پۆشی، پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆو ئێوارەو شێوانو خەوتنانو بەیانی بۆ کردن، ئەنجا کەمێ مایەوە تا تاو هەڵات، ئەنجا فەرمانی دا رەشماڵو تاوڵێکی لەمووی بۆ هەڵبدرێ، قورەیش وایان دەزانی وەکو سەردەمی نەزانی لە(مشعر الحرام)ەوە دەست پێ دەکات، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) هاتە عەرەفەو بینی تاوڵی بۆ هەڵدراوە دابەزی تا خۆر لایدا، فەرمانی دا وشترەکەی بۆ بێننو بۆی هێنرا، هاتە ناو جەرگەی دۆڵەکەوەو وتاری بۆ خەڵکی داو فەرموی: (بێگومان خوێنی ئێوەو سامانی ئێوە وەکو ئەم رۆژەیەو لەم مانگەتانداو لەناو ئەم وڵاتەتاندا لەسەر یەکتری ناڕەوایە، بەراستی هەموو شتەکی سەردەمی نەزانی ئێوەم لەژێر پێ داداناوە، خوێنی سەردەمی نەزانی کە رژاوە لەفیڕۆچووە، یەکەم خوێن کە کۆتایی بە تۆڵەکەی دەهێنم خوێنی (ابن ربیعة بن الحارث)ە کە شیرە خۆرەبوو لەناو (بنی سعد)دا (هذیل) کوشتی، سوو (الربا)ی سەردەمی نەزانی بەفیڕۆچووەو نادرێتەوە، یەکەم سوو کە بە فیڕۆی دەدەم سووی عەبباسی کوڕی (عبدالمطلب)ە، ئەوە هەمووی بەفیڕۆچووە، لەخوا بترسن لەراست ژناندا، ئێوە بە راسپاردەی خوا بردوتانن بۆ لای خۆتانو بە وشەی خودا داوێنی ئەوانتان بۆ خۆتان حەڵاڵ کردوون، مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە

کە کەسێ نەهێننە ماڵی خۆتان، ئێوە پێ ی رازی نین، گەر ئەمەیان کردن بەلێدانەکی سووك لێیان بدەن بۆ تەمبێ کردن، مافی ئەوانیش بەسەر ئێوەی پیاوەوە ئەوەیە کە بژێوی‌و پۆشاکیان بە چاکی بۆ دابین بکەن. لەناو ئێوەدا شتەکم بۆ بەجێهێشتون گەر دەستی پێوە بگرن قەت گومڕا نابن کە کتێبی خودایە، ئێوە لەراست منەوە لێتان پرسیار دەکرێ، ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان: بەراستی ئێمە گەواهی دەدەین تۆ پەیامەکەت راگەیاندو ئەرکەکەت بەجێ هێناودڵسۆزیت ئەنجام دا، ئەویش دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو بە قامکی شەهادە ئاماژە کردووی لەخەڵکەکەکردو سێ جاران فەرموی: (خوایە شاهید بە).

دوایی بانگدراو قامەت کرا، نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان قامەت کراو نوێژی عەسری کردو نوێژی تری لەنێواندا نەکردن. پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوار بوەوە تا گەیشتە (الموقف) لەعەرەفەو لەوێ وەستا سکی وشترەکەی (القصواء) لەسەر ئەو تاوێرانە دانا کە لەخوار ئەم چیایەوە راخرابون‌و جلەوی وشترەکەی بەدەستەوە گرتبوو، تا خۆر ئاوابوو زەردەپەڵە نەما ئاوا بە وەستاوی مایەوە. ئوسامەی لەپشت خۆیەوە سوار کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) جلەوی وشترەکەی ئەوەندە توند کرد سەری لەکۆپانی وشترەکەی دەداو بە دەستی راستی ئاماژەی دەکرد: (خەڵکینە هێواش بن، هێواش بن). هەر تەپۆلکە لمێکی بەسەری دا سەردەکەوت جلەوەکەی بۆ شل دەکردەوە، تا گەیشتە (موزدەلیفە)و نوێژی شێوان‌و خەوتنانی لەوێ پێکەوە کرد بە یەك بانگ‌و بە دوو قامەت. تەسبیحاتی هیچی لەمیاندا نەکردن، ئەنجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا سپێدە بوو راکشاو درێژبوو، ئەنجا کە نوێژی بەیانی بوو بە بانگ‌و قامەتێ نوێژەکەی کرد.

سواری وشترەکەی بۆوە، تا گەیشتە (المشعر الحرام)و رووی لەقیبلە کردو پاڕایەوەو (الله اکبر)و (لا اله الا الله وحده)ی کرد، ئاوا بە وەستاوی مایەوە تا دنیا روناك بۆوە، بەر لەوەی تاو هەڵێ وشترەکەی تاوداو (فضل بن عباس)ی لەدوای خۆیەوە سوار کرد، کوڕەکی قژ جوان‌و سپی‌و سۆڵ‌و شەنگە بوو، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وشترەکەی لێ خوڕی کۆمەڵە ژنێ رەت بوون لەناو کەژاوەدابوون، (فضل) تێ ی دەڕوانین، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی لەسەر چاوی داناو ملی بە دەستەکەی تر سوڕاند، تا گەیشتە ناو جەرگەی (موحەسسیر بەر لەمونا)، تۆزێ جولاّ پاشان رێگای ناوەڕاستی گرت، کە بەسەر (الجمرة الکبری)دا دەڕوات تا گەیشتە ئەو (جمرە)یە کە

دەکەوێتە تەك درەختەکەوەو حەوت بەردی هاوێشتن، لەگەڵ هەر بەرد هاوێشتنێ دا کە لەناو دۆڵەکە دەیهاوێشتن (الله اکبر)ی دەگوت، بەردەکان لەدەنکی پاقلەیەك گەورەتر بوون، لەناو جەرگەی دۆڵەکەوە هاوێشتنی، پاشان چووە شوێنی قوربانیگە (المنحر)و سیو سێ دانەی بەدەستی خۆی سەر بڕین، ئەوەی مایەوە دانی بە عەلی سەریان ببڕێو لەقوربانیەکەدا بەشداری کرد، لەهەر وشترێك فەرمانی دا پارچەیەك تاو بدرێتیو بخرێتە ناو مەنجەڵەوە لەگۆشتو چەلاوی سەرو پێ یەکەی خورا.

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) سواربۆوە چووە کەعبەو تەواوی (الإفاضة)ی ئەنجام دا، نوێژی نیوەڕۆی لەئەوێ کرد، ئەنجا چووە لای کوڕانی (عبدالمطلب) کە ئاوی زمزمیان دەگێڕاو فەرموی: (ئەی کوڕانی (عبدالمطلب) ئاو بگێڕن گەر من نەبومایەتە قەرەباڵغی ئێوە لەگەڵ ئێوە ئاوم دەگێڕا). ئەنجا ستڵە ئاوێکیان دایە لێی خواردەوە).

(النووي) (رضي الله عنه)لە(شرح مسلم/ ٨/١٧٠)دا دەڵێ:

(ئەمە فەرمودەیەکی مەزنەو زۆر سوودی تێ دایە، زۆرێ ڕێسای گرنگی تێ دایە، (القاضي) وتویەتی: خەڵکی زۆرێ مەسەلەی فیقهی یان لەبارەوە باسکردووە، (ابوبکر بن المنذر) بەشێکی گەورەی فیقهی تێ دا پۆلێن کردووەو سەدو پەنجاو قسور جۆر مەسەلەی فیقهی لێ هەڵێنجاوە، گەر سۆراغ بکەی هەندەی تری لێ هەڵدێنجرێت).

<u>**حەج بەشێکە لەخوا پەرستی یەکانو چەند روکنو واجیباتو سوننەتێکی هەیە:**</u>

## یەکەم: سوننەتەکانی حەج:

### (أ) سوننەتەکانی ئیحرام:

**(١) خۆشوشتن لەکاتی ئیحرامدا:** (زید بن ثابت) دەڵێ: (ئەو پێغەمبەری (ﷺ) بینیوە بەرگی ئیحرامی پۆشیوەو خۆی شوشتووە)[1].

**(٢) بۆن لەخۆدان بەر لەئیحرام پۆشین:** عائیشە گێڕاویەوە: (من پێغەمبەری خوا (ﷺ)م کاتێ

---

(١) صحيح (ص.ت ٦٦٤) ت(٢/١٦٣/٨٣١).

ئیحرامی دەبەست بۆنم لێ دەدا، هەروەها کاتێ ئیحرامی هەڵدەوەشاندەوە بەر لەتەوافی کەعبەدا) [١].

**(٣) ئیحرام پۆشین بە پەشتەماڵ(الإزار)ەكو عەبایەكی (الرداء) سپی:** (ابن عباس) دەفەرموێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمەدینەوە کەوتە ڕێ دوای ئەوەی سەری شانەو چەورکردو پەشتەماڵو عەبایەكی پۆشی لەگەڵ هاوەڵانی دا) [٢].

ئەم دوو پۆشاکە سوننەتە سپی بن، وەکو (ابن عباس (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بەرگی سپی ڕەنگ بکەنە بەر، باشترین بەرگی ئێوەیە، مردووان بەو بەرگە کفن بکەن) [٣].

**(٤) نوێژ کردن لەدۆڵی (العقیق) بۆ کەسێ بەوێ دا ڕەت ببێت:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی کە عومەر لێ ی دەگێڕێتەوە لە(وادی العقیق)دا: (ئەم شەو لەلایەن پەروەردگارمەوە کەسێکم هاتە لا وتی:

لەم دۆڵە پیرۆزو موبارەکە دا نوێژ بکەو بڵێ: عومرەیەکە لەحەجدا) [٤].

**(٥) بەرزکردنەوەی دەنگ بە (لبیك اللهم لبیك):** (سائب بن خلاد) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (جبریلم هاتە لا، فەرمانی دامێ بە یارانم بڵێم لەکاتی ئیحرام بەستنو (لبیك) وتندا دەنگیان بەرز بکەنەوە)[٥].

بۆیە یارانی پێغەمبەر (ﷺ) هاواریان دەکرد، (ابو حازم) دەڵێ: (لەکاتێ دا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئیحرامیان دەبەست نەدەگەیشتنە ـ الروحاء ـ تا دەنگیان دەنووسا) [٦].

**(٦) وتنی (الحمد لله) و (سبحان الله)و (الله اكبر) بەر لەئیحرام بەستن (الإهلال) دا:** (انس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمەدینە بو ئێمەی لەگەڵدا بووین، نوێژی نیوەڕۆی

---

(١) متفق علیه: (خ ٣/٣٩٦/١٥٣٩) م(١١٨٩ ـ ٢/٨٤٦/٣٣).

(٢) صحیح: خ(٣/٤٠٥/١٥٤٥).

(٣) رابردو باسکرا.

(٤) صحیح: (ص.جه ٢٤١٠) خ(٣/٣٩٢/٥٣٤) جه (٢/٩٩١/٢٩٧٦).

(٥) صحیح: (ص.ت ٦٦٣) ت(٢/١٦٣/٨٣٠).

(٦) صحیح الإسناد. رواه ابن شیبة باسناد صحیح.

چوار رکەعەت کرد، ئەنجا لە(ذي الحليفة) دا دوو رکەعەتی نوێژی ئێوارە کرد. پاشان شەوی پێ کردەوە تا سبەینە داهات، دوایی سوار بۆوە، تا گەیشتە (بەیداء)و حەمدو سەناو سوبحانەللّاو ئەللّاهو ئەکبەری ، پاشان ئیحرامی حەج‌و عومرەی پۆشی) [١].

**(٧) ئیحرام بەستن بەرەو رووی قیبلە:** (النافع) دەڵێ: (ابن عمر) کاتێ سەر لەبەیانی نوێژی لە(ذي الحليفة) دەکرد داوای وشترەکەی دەکرد، وشترەکەیان دەهێناو سواری دەبوو، کاتێ دەگەیشتە ئەوێ رووی لەقیبلە دەکرد بە وەستاوی، پاشان (لبيك)ی گوت، پاشان شەو لە(ذي طوى) دەمایەوە، پاشان نوێژی بەیانی لەوێ دەکردو خۆی دەشوشت، دەیگێڕایەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاوای دەکرد)[٢].

**ب- سوننەتەکانی چوونە ناو مەککەوە:**

**(٨ ـ ٩ ـ ١٠): شەو مانەوە لە(ذي طوى)و خۆشوشتن بۆ چوونە ناو مەککەو چوونە ناوی لەرۆژدا:**

(نافع) گێڕاویەوە: (ابن عمر) کاتێ دەچووە نزیکترینی حەرەم (لبيك)ی نەدە گوت، پاشان لە(ذي طوى) شەو دەمایەوە، نوێژی بەیانی لەوێ دەکردو خۆی دەشوشت، دەیگێڕاوە پێغەمبەر (ﷺ) ئاوای کردووە) [٣].

**(١١) چوونە مەککەوە لە(الثنية العليا)وە:** (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە(الثنية العليا)وە دەچووە ناو مەککەوەو لە(الثنية السفلى)وە دەچووە دەر) [٤].

**(١٢) کاتی چوونە ناو مزگەوت پێی راست پێش بخات‌و بڵێ:** (اعوذ بالله العظيم، وبوجهه الكريم، وسلطانه القديم من الشيطان الرجيم. بسم الله، اللهم صل على محمد وسلم، اللهم افتح لي ابواب رحمتك) [٥].

---

(١) صحيح: (ص.د ١٥٥٨) خ(٣/٤١١/٥٥١).

(٢) صحيح (خ٣/٤١١/١٥٥١).

(٣) متفق عليه:خ(٣/٤٣٥/١٥٧٣)م(٢/٩١٩/١٢٥٩).

(٤) متفق عليه خ(٢/٤٣٦/١٥٧٥). م(٢/٩١٨/١٢٥٧).

(٥) صحيح (الكلم الطيب/٦٥).

**(١٣) ئەگەر کەعبەی بینی ویستی با دەستی بەرزبکاتەوە،** وەکو لە(ابن عباس)ەوە دامەزراوە[١]. با بپاڕێتەوە چۆنی بۆ ئاسان بوو، گەر بە دوعای عومەریش بپاڕێتەوە خراپ نییە، وەکو لەئەوەوە دامەزراوە:
(اللهم انت السلام، ومنك السلام، فحيّنا ربنا بالسلام) [٢].

**ج- سوننەتەکانی تەواف (سوڕانەوە):**

**(١٤) دەرهێنانی دەستی لەژێر بن هەنگڵی لای راستی بەرگی ئیحرامەوەو قولینچکەکەی هەڵدەدرێتەوە سەر شانی چەپی‌و شانی راستی بەدەرەوە دەبێت:** (يعلى بن امية) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) بەشێوەی ـ الإضطباع ـ تەوافی کرد) [٣].

**(١٥) دەست دان لەبەردە رەشەکە (الحجر الأسود):** (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی کاتێ چووە مەککە دەستی لەبەردە رەشەکەدا لەیەکەم سوڕانی داو سێ سوڕانان بە خێرایی دەڕۆیشت لەم حەوت تەواف‌و سوڕانەوانەدا). متفق عليه.

**(١٦) ماچ کردنی بەردە رەشە:** (زيد بن اسلم) لەباوکی گێڕاویەوە: (عومەری کوڕی خەتتابم بینی بەردە رەشەکەی ماچ کردو وتی: گەر من پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەبینایە تۆی ماچ کردووە ماچم نەدەکردیت). متفق عليه.

**(١٧) کوڕنوش بردن لەسەر بەردە رەشەکە[٤]:** (ابن عمر) دەڵێ: (عومەری خەتتابم بینی بەردەکەی ماچ کردو کوڕنوشی لەسەر برد، پاشان وتی: پێغەمبەری خوام (ﷺ) ئاوا

---

(١) اسناده صحيح/ مناسك الحج/٢٠)، ش ٣/٩٦).
(٢) اسناده حسن (مناسك الحج/٢٠) هق (٥/٧٢).
(٣) حسن (ص.جه ٢٣٩١) د(١٨٦٦/٣٣٦/٥) (ت ٢/١٧٥/١٦١).
(٤) (ابن حجر) لە(فتح الباري/ج٣/ح١٥٩٧)دا دەنوسێ: کاتێ عومەر (رضي الله عنه) وتی: (انی اعلم انك حجر لا تضر و لا تنفع) واتە: من دەزانم تۆ بەردێکی زەرەرو قازانجت نییە. لەم کاتەدا پێشەوا (عەلی ـ ر ـ) پێ ی وت: (انه يضر وينفع) واتە: ئەو سوودو قازانجی هەیە، لەپێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) لەقیامەتدا دێ زمانی هەیە شاهیدی بۆ ئەو کەسە دەدات بە یەکتاپەرستی دەستی لێ داوە.

بینیوە)[(١)].

**(١٨) وتنی (الله اکبر) لای روکن:** (ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) بە دەوری کەعبەدا دەسوڕایەوە سواری وشتر ببوو، کە دەگەیشتە روکن بەشتێ ئاماژەی بۆ دەکردو (الله اکبر)ی دەگوت)[(٢)].

**(١٩) راکردن (الرمل) لەسێ هەنگاوەکانی یەکەمدا لەتەوافی یەکەمدا:** (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ تەوافی یەکەمی دەکرد لەسێ تەوافدا رای دەکردو لەچوار تەوافدا دەڕۆیشت)[(٣)].

**(٢٠) دەستدان لەروکنی یەمەنی:** (ابن عمر) دەڵێ: (نەمبینیوە پێغەمبەر (ﷺ) لەکەعبەدا جگە لەروکنی یەمانی دەست لەهیچی تر بدات)[(٤)].

**(٢١) لەنێوان هەردوو روکنەکاندا ئەم پاڕانەوەیە بکات:** ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[(٥)].

**(٢٢) دوو رکەعەت دوای تەواف لەدوای مەقامەوە:** (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ)حەوت جار تەوافی بە دەوری کەعبەدا کرد ، پاشان دوای مەقامی ئیبراهیم دوو رکەعەتی کردو لەنێوان سەفاو مەروەدا تەوافی کردو سوڕایەوە). وتی:﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[(٦)].

**(٢٣) لای مەقام بەر لەنوێژ ئەم ئایەتە بخوێنی:** ﴿وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾[(٧)]. لەهەردوو رکەعەتەکاندا (الکافرون)و (الاخلاص) بخوێنێت. جابر گێڕاویەوە: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە (مەقامی ئیبراهیم (س) فەرمووی: ﴿وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ

---

(١) حسن الارواء: (٤/٣١٢) (البزار(٢/٢٣/١١١٤).

(٢) صحيح (الارواء: ١١١٤) خ(٣/٤٧٦/١٦١٣).

(٣) صحيح (ص.جه ٢٣٨٧) جه(٢/٩٨٣/٢٩٥٠).

(٤) متفق عليه: (خ ٣/٤٧٣/١٦٠٩) م(٢/٩٢٤/١٢٦٧).

(٥) البقرة: ٢٠١. حسن (ص.د ١٦٦٤) د(٥/٣٤٤/١٨٧٥).

(٦) الأحزاب: ٢١. صحيح (ص.جه ٢٣٩٤) خ(٣/٤٨٧/١٦٢٧) جه (٢/٩٨٦/١٩٥٩).

(٧) البقرة: ١٢٥.

مُـصَلًّى﴾ واتە: لەشوێن پیێ ی ئیبراهیم دا نوێژ بکەن. پاشان دوو رکەعەت نوێژی کردو﴿قُـلْ هُوَ اللّهُ أَحَدٌ﴾و ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ی تێدا خوێند.

**(٢٤) پەیوەست بوون بە سوونەتی نێوان روکن‌و دەرگاکە، کە سنگ‌و دەم‌و چـاوو باسـکەکانی لەسەر دابنێت:** (عمرو بن شعیب) لەباوکی ئەویش لەباپیرەی ئەوی گێڕاوەتەوە: (من لەگەڵ (ابن عمر) دا تەوافم کرد، کاتیێ حەوت خولەکەمان تەواو کرد، لەپشتەوەی کەعبە نوێژمان کرد، وتم: ئەی داوای پاراستن (تعویذ)ی لەئاگر ناکـەیت؟ وتـی: (اعـوذ بـالله مـن النـار). پاشان رۆیشت دەستی لەروکن (بەردە رەشەکە)دا، پاشان لەدوای (حجر)و دەرگاکەوە وەسـتا سنگ‌و دەست‌و کۆڵمی پێوە لکاند، وتی: (پێغەمبەری خوام (ﷺ) ئاوای کرد).

**(٢٥) خواردنەوە لەئاوی زمزم‌و شوشتنی سەر بەم ئاوە،** وەکو لەفەرمودەی جابردا هاتووە. پێغەمبەر (ﷺ) وای کردووە.

**دـ سوننەتەکانی سەعی (رۆیشتن):**

(٢٦) دەستدان لەروکن وەکو باسکرا.

(٢٧) خوێندنی ئایەتی ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْـتَ أَوِ اعْتَمَـرَ فَـلاَ جُنَـاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ البقرە/١٥٨ وەکـو لەفـەرمودەی رابردووی جابردا هاتووە. پاشان کاتیێ لەسەفا نزیك دەبێتەوە بۆ سەعی دەڵـیێ: (بەکامـەیان دەستی پیێ کردووە بەمە دەست پیێ دەکەین.

(٢٨) لەقیبلە کردن لەسەر سەفاو وتنی: (الله اکبر. الله اکبر. الله اکبر ـ سـیێ جـار ـ لا الـە الا الله وحدە لا شريك لە، لە الملك ولە الحمد وهو علی كل شیءقدير. لا الە الا الله وحدە، انجز وعدە ونصر عبدە، وهزم الاحزاب وحدە) پاشان بە ویـستی خـۆی دەپاڕێتـەوە، سـیێ جـاران دووبارەی دەکاتەوە.

(٢٩) سەعی‌و رۆیشتن لەنێوان ئەو دوو کێوە سەوزە دا بە خێرایی زۆر.

(٣٠) لەسەر (صفا) چی کردووە لەسەر مەڕوەش ئاوا بکات. لەرووکردنە قیبلەو یادو پاڕانەوە.

هـ ـ سوننەتەکانی دەرچوون بۆ (منی):

(٣١) ئیحڕام بەستن بە حەج لەرۆژی (الترویة)دا لەجێگای خۆیەوە.

(٣٢) نوێژی نیوەڕۆو ئێوارەو شێوانو خەوتنان لەمینا (المنی) دەکرێ لە(التروية)يەداو شەو لەوێ دەمێنێتەوە تا نوێژی بەیانی دەکاتو خۆر هەڵدێت.

(٣٣) لەرۆژی عەرەفەدا نوێژی نیوەڕۆو ئێوارە بە کۆکردنەوەو کورت کردنەوە (قصرو جمع لەنەمیرە) دەکرێت).

(٣٤) نابێ لەعەرەفە بڕوات تا خۆر ئاوا نەبێت.

**روکنەکانی ( پایەکانی ) حەج:**

**(١) نیاز(نیەت):** وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ﴾[١]. لەفەرمودەدا هاتووە: (انما الأعمال بالنيات) [٢].

**(٢) وەستان لەکێوی عەرەفە:** وەکو لەفەرمودەدا هاتووە: (الحج عرفة) حەج عەرەفەیە[٣].

(عروة الطائي) دەڵێ: (هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لە(مزدلفە) کاتێ چوو بو نوێژ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لەچیای (طيء) هاتوم وڵاخەکەم ماندوو بووە خۆشم شەکەت بووم، لەسەر هەموو چیاکان ، وەستاوم ئایا حەجم بۆ هەیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێ لەم نوێژەی ئێمەدا بەشداری کردو تا دەڕۆین لەگەڵماندا وەستاو بەر لەوە شەو یان رۆژ لەعەرەفە وەستا ئەو حەجی تەواو بووەو مەناسیکەکانی تەواو کردووە) [٤].

**(٣) مانەوە لەموزدەلیفە تا سپێدەی بەیانو کردنی نوێژی بەیانی لەئەوێ وەکو لەفەرمودەی رابردودا پێغەمبەر(ﷺ) بە(عروة)ی فەرموو:** (کێ ئەو نوێژەی ئێمە ببینێو لەگەڵماندا بوەستێ تا دەڕۆین، بەر لەئەوەش لەعەرەفە وەستا شەو یان رۆژ، ئەوە حەجو مەناسیکەکانی تەواو کردووە) [٥].

---

(١) البينة: ٥.
(٢) رابردو باسکراوە.
(٣) صحيح (ص.جە ٢٤٤١) جە(٢/١٠٠٣/٣٠١٥) ت(٢/١٨٨/٨٩٠).
(٤) صحيح (ص.جە ٢٤٤٢) جە(٢/١٠٠٤/٣٠١٦) ت(٢/١٨٨/٨٩٢).
(٥) صحيح (ص.جە ٤٢٤٢) ت(٢/١٨٨/٨٩٢) جە (٢/١٠٠٤/٣٠١٦).

**(٤) تەوافی (الإفاضـة):** وەکو خوا دەفـەرمووێ: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾[١]. **عائیشە گێڕاویەوە: (صفیە بنت حیی) کەوتە بێ نوێژییەوە، (دوای الإفاضة)دا، وتی بۆ پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **باسم کرد، ئەویش فەرموی: (ئایا ئەو ئێمەی راگرتووە). وتم: ئاخر ئەو تەوافی (الإفاضة)ی کردووەو تەوافی بەیتی کردووەو دوای (الإفاضة) بێ نوێژ بووە. فەرموی: (فلتنفر اذن)** [٢]. واتە: کەواتە با دەربچێ لەمەککە. ئەم فەرمایشتەی ئەو (ﷺ) **(احابستنا هی؟)** مانای وایە ئەم تەوافە واجیبەو ئەوە بۆ کەسێ دەمێنێتەوە کە نەیکردووە.

**(٥) سەعی کردن لەنێوان سەفاو مەروەدا:** چونکە پێغەمبەر (ﷺ) سەعی کردووەو ئەنجا فەرمویەتی: (سەعی بکەن چونکە خوا سەعی ـ رۆیشتن ـ ی لەسەر فەرز کردوون) [٣].

## واجبەکانی حەج:

**(١)ئیحرام پۆشین لەمیقات:** جلو بەرگی خۆی دابنێو جلو بەرگی ئیحرام بپۆشێ، پاشان نیەت بێنێو بڵێ: (لبیك اللهم بعمرة، او لبیك اللهم حجة وعمرة).

**(٢) مانەوە لە(منی) لەشەوانی (تەشریق)دا:** چونکە پێغەمبەر (ﷺ) تێ یدا ماوەتەوەو پێغەمبەر (ﷺ) رێگای بە وشترەوانەکان داوە کە لە(مینا) شەو دەمێننەوە لەرۆژی قوربانیدا شەیتان رەجم بکەن، پاشان دوای رۆژی قوربانی، دوو رۆژ پێکەوە کۆبکەنەوە لەرۆژێکی دا لەو دوو رۆژانە شەیتان رەجم بکەن، دوایی لەرۆژی دەرچون لە(مینا)دا رەجم بکەن) [٤].

رێگادانی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەوان، مانای وایە لەسەر ئەوانی تر واجبە.

**(٣) رەجمو بەردباران کردن بە ریزبەندی (الترتیب):** واتە: رۆژی قوربانی رەجمی (العقبة) بە حەوت بەرد دەکەن، رەجمی (جیمار) سێ جاران دەکەن لەرۆژانی تەشریقدا لەدوای لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان (زەوال)دا، هەر جارە حەوت بەرد دەهاوێن، لەجەمەرەی یەکەم ئەنجا

---

(١) الحج: ٢٩.

(٢) متفق عایە: (ص.جە ٢٤٦٣) جە (٢/١٠١٠/٣٠٣٧) .

(٣) صحیح: (الارواء: ١٠٧٢) أ(١٢/٧٦/٢٧٧)..

(٤) صحیح (ص. جە ٢٤٦٣) جە (٢/١٠١٠/٣٠٣٧).

ناوەڕاستەوە دەست پێ دەکات، پاشان جەمەرەی عەقەبە دێت.

**(٤) حەجی ماڵ ئاوایی (الوداع):** (ابن عباس) گێڕاویەوە: (فەرمان بە خەڵکی کراوە ماڵ ئاوایی یان بە کەعبە بێ، بەڵام ئەو ئەرکە لەسەر ژنی بێ نوێژ سووك کراوە)[1].

**(٥) سەرتاشین یان قژ کورتکردنەوە:** سەرتاشین‌و کورتکردنەوە بە ئایەت‌و فەرموودەو کۆی دەنگی زانایان دامەزراوە: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ﴾[2]. واتە: خەونی پێغەمبەر (ﷺ)، خودا بەراستی گێڕاوە بە حەق‌و دەچنە مزگەوتی (حەرام)ەوە بە ویستی خودا بێ باکن‌و سەرتان تاشیوە یان کورت کردۆتەوەو ناترسن.

(ابن عمر) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (اللهم ارحم المحلقين) واتە: خوایە روحم بەوانە بکە سەریان دەتاشن. وتمان: ئەی (المقصرين) ئەوانەی کورتی دەکەنەوە؟ فەرموی: (اللهم ارحم المحلقين) وتمان: ئەی (المقصرين)؟ فەرموی: (والمقصرين) ئەوانەی کورتیشی دەکەنەوە.

زانایان لەحوکمی دا ناکۆکن، زۆربەیان بە واجبی دەزانن، دەبێ نەکردنی خوێن رشتنی تێ دابێ، بەلای شافیعی یەکێکە لەروکنەکان.

هۆی جیاوازییان کامەیە نەبوونی بەڵگەیە، کە لەسەر ئەمە کامیانە، وەکو (الألباني) مامۆستام خوا بیپارێزێ پێ ی وتم.

## مەرجەکانی تەواف (سوڕانەوە)[3]:

(ابن عباس) لەپێغەمبەری (ﷺ)گێڕاوەتەوە:

(سوڕانەوە بە دەوری کەعبەدا وەکو نوێژ وایە، بەڵام ئێوە قسەی تێدا دەکەن، بەڵام کێ قسەی کرد با قسەی چاك بکات)[4].

گەر تەوافی کەعبە نوێژ بێ چەند مەرجەکی هەیە:

---

(١) متفق عليه (خ ٣/٥٨٥/١٧٥٥) م(٢/٩٦٣/١٣٢٨)..

(٢) الفتح: ٢٧.

(٣) فقه السنة (١/٥٨٨) منار السبيل (١/٢٦٣).

(٤) صحيح (الارواء: ١٢١) ت(٢/٢١٧/٩٦٧).

**(١) پاكژی لەلەش پیسیو بێ دەست نوێژی،** وەكو لەفەرموودەی رابردوودا هاتووە: (لا یقبل الله صلاة بغیر طهور).

عائیشە گێڕاویەوە: كاتێ تووشی بێ نوێژی (مەهك) دەبێ، پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی دەفەرمێ: (ئەوەی حاجی دەیكەن تۆش وابكە، بەڵام تا خۆت دەشۆیەوە تەواف مەكە) [١].

**(٢) داپۆشینی شەرمگە:** ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾[٢]. واتە: ئەی ئادەمیزاد لەتەك هەموو مزگەوتێكدا خۆتان جوانو لەبار بكەن.

پێغەمبەر لەپێشحەجی ماڵ ئاوایی دا رۆژی قوربانی فەرمووی: (دوای ئەم ساڵ بت پەرستان حەج ناكەنو بە رووتی بە دەوری كەعبەدا تەواف ناكەن) [٣].

**(٣) حەوت جاری تەواو بێت:** چونكە پێغەمبەر (ﷺ) حەوت جار تەوافی كردووە، (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات حەوت جار تەوافی كردوو دوای مەقامی ئیبراهیم (س) دوو ركەعەتی نوێژ كرد، لەنێوان سەفاو مەڕوەی حەوت جار سەعی كردووە، لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) سەرمەشقی باش هەیە بۆ ئێوە.

ئەم كارەی پێغەمبەر (ﷺ) راڤەو تەئویلی ئەم ئایەتەی خوایە: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾[٤]. گەر شتێ لەم حەوت شتە نەكات گەر كەمیش بێ دانامەزرێ، گەر كەوتە گومان لەمانە لای كەمی بنیاتی دەنێتەوە تا دڵنیا دەبێت.

**(٤ ـ ٥): لەبەردە رەشەكەوە تەواف دەست پێ بكاتو لەوێ وە كۆتایی پێ بێنێت،** كەعبە بكەوێتە لای چەپیەوە، (جابر) گێڕاویەوە: (كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە مەككە هاتە تەك بەردە رەشەكە، دەستی لێ داو لەلای راستی یەوە رۆیشت، سێ خولان رای كردو سێ خولەكەی تر بەرۆیشتن ئەنجامی دا).

گەر تەواف بكاتو كەعبە لەلای راستی یەوە بێ تەوافەكە دروست نابێت.

**(٦) دەبێ تەوافەكە لەدەرەوەی بەیتەوە بێ:** چونكە ئەم فەرمایشتەی خودا ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا

---

(١) متفق علیه: خ(١/٤٧٧/٣٩٩) م(٢/٩٨٢/١٣٤٧).

(٢) الأعراف: ٣١.

(٣) متفق علیه: خ(١/٤٧٧/٣٦٩) م(٢/٩٨٢/١٣٤٧).

(٤) الحج: ٢٩.

بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾[١]. مەبەستی تەوافە بە هەموو بەشەکانیەوە. گەر بە (الحجر) دا بخولێتەوە تەوافەکە دروست نابێ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الحجر) بەشێکە لەکەعبە).

**(٧) بەشوێن یەکتری داهێنان (الموالاة):** چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئاوا تەوافی کردووەو فەرمویەتی: (خذوا عني مناسككم). گەر بۆ دەست نوێژ گرتن برِی، یان نوێژەکی فەرز بکات، یان تا کەمێ پشوو بدات، لەو شوێنەوە دایدەمەزرێنێ کەرابردووە، گەر ماوەکە زۆر بوو دەستی پێ دەکاتەوە.

## مەرجەکانی سەعی (رۆیشتن):

**چەند مەرجێ بۆ دروستی سەعی هەیە:**

(١) دەبێ حەوت هەنگاو بێت. (٢) بە سەفا دەست پێ بکاتو بەمەروە کۆتایی پێ بێنێت. (٣) سەعیو رۆیشتنەکە لەو شوێنەوە بێ کە سەعیو رۆیشتنی لێوە دەکرێت، کە ئەو رێگایەیە لەنێوان سەفاو مەروەدایە. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) وای کردووەو فەرموویەتی (مەناسیکی حەج لەمن وەربگرن).

## ئەو شتانەی لەئیحرامدا بۆ ئیحرام پۆش حەرامو قەدەغەن:

**(١) پۆشینی بەرگێ بە دروومان دروا بێ:** (ابن عمر) گێراویەوە پیاوێ لەپێغەمبەری (ﷺ) پرسی: (ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیحرام پۆش کام بەرگە دەکاتە بەری؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کراسو مێزەرو شرِوالّو کلاووخوف (الخف) مەپۆشن، مەگەر کەسێ پێلاوی نەبێ با خوف (الخف) بپۆشێو لەگوێزنگەوە بیانبرِی، هیچ بەرگی مەکەنە بەر کە (زەعفەران) یان (وەرەسی) بەرکە وتبێت[٢].

رێگا دراوە کەسێ جگە لەشروالّو دەرپێو خوف (الخف) هیچی تری دەست ناکەوێ کەبەبێ لێ برِینیان بەکاریان بێنێ: (ابن عباس) گێراویەوە: (بیستم لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعەرەفات وتاری دەدا: کێ پێلاوی دەست ناکەوێ با خوف بکاتە پێ یو کێ پەشتەماڵی نییە

---

(١) الحج: ٢٩.

(٢) متفق عليه: (خ ١٥٤٢/٤٠١/٣) م(١١٧٧/٨٣٨/٢).

با شرواڵ بپۆشیّ، واتە بۆ ئەو کەسەی ئیحرامی پۆشیوە)[١].

**(٢) گەر ئافرەت دەمو چاوو دەستی داپۆشێت:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ژنی ئیحرام پۆش دەمامك ناكاتو دەست كێش ناكاتە دەستی)[٢].

بەڵام دروستە گەر پیاویان بەلادا رەت بن دەمو چاویان داپۆشن، وەکو (هشام بن عروە) گێڕاویەوە: (فاطمة بنت المنذر) گێڕاویەوە: (ئێمە لەکاتی ئیحرامداو دەمو چاومان دەمامك دەكرد ئێمە لەگەڵ ئەسمای کچی ئەبوبەکری سەدیق دابووین)[٣].

**(٣) داپۆشینی سەری پیاو بە مێزەرو شەدەو جەمەدانیو هەر شتەکی تر،** وەکو (ابن عمر) گێڕاویەوە (ﷺ) فەرمویەتی: (کراسو مێزەر ناپۆشرێت)[٤].

دروستە بە چادرو رەشماڵ سێبەر لەخۆ بکریّ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) (فەرمانی کرد لەنەمیرە چادرێکی بۆ هەڵبدریّو بڕواتە ناویەوە).

**(٤) بۆنو بەرامەی خۆش: پێغەمبەر** (ﷺ) فەرمویەتی: (بەرگیّ مەکەنە بەر زەعفەرانو وەرەسی بەرکەوتبێت)[٥].

پێغەمبەر (ﷺ) بەو ئیحرام پۆشەی وشترەکەی کوشتبوی، لەراستی ئەودا فەرموی: (بۆنی لیّ مەدەنو سەری دامەپۆشن، ئەو لەقیامەتدا لەبارێکدا زیندو دەبێتەوە کە (لبیك) دەکات)[٦].

**(٥ ـ ٦) نینۆك کردنو لابردنی قژو موو بە تاشینو کورتکردنەوەو شتی تر:** خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾[٧]. واتە: سەرتان مەتاشن تا

---

(١) متفق عليه: خ(٣/٤٠١/١٥٤٢) م(٢/٨٣٤/١١٧٧).

(٢) صحيح (الارواء ١٠٢٢) (خ ٤/٥٢/١٨٣٨).

(٣) صحيح(الارواء: ١٠٢٣) ما(٢٢٤/٧٢٤)

(٤) صحيح (الارواء ١٠١٢). تێبینی: وەکو (ابن تيمية) لە(حجاب المرأة)دا (ل:٦) باسی کردووە دروستە بە ناشەهوەتی سەیری روخسارو دەستی ژن بکریّ لەمەزهەبی ئەبو حەنیفەو شافیعیو رایەکی مەزهەبی ئەحمەددا. بەڵام لای مالیکی تا نینۆکەکانیشی شەرمگەیە)

(٥) متفق عليه: خ(٣/٤٠١/١٥٤٢) م(٢/٨٣٤/١١٧).

(٦) متفق عليه: خ(٣/١٣٥/١٢٦٥) م(٢/٨٦٥/١٢٠٦).

(٧) البقرة: ١٩٦.

قوربانیەکە دەگاتە جێگای خۆی (قوربانیگـە). زانایـان کـۆکن لەسـەر ئـەوە کـە نینـۆك کـردن بۆئیحرام پۆش حەرامە[(١)].

دروستە قژ تاشین بۆ کەسێ ئازاری هەبێو دەبێ کـەفارەت بـدات (الفديـة)، وەکـو قورئـان دەفـەرمووێ: ﴿فَمَـن كَـانَ مِـنكُم مَّرِيـضاً أَوْ بِـهِ أَذًى مِّـن رَّأْسِـهِ فَفِدْيَـةٌ مِّـن صِـيَامٍ أَوْ صَـدَقَةٍ أَوْ نُـسُكٍ﴾[(٢)]. واتە: کێ لەئێوە نەخۆش بوو یان ئازاری لەسەردا هەبوو، با کەفارەت بـدات بـە رۆژو یان بە چاکەو خێر، یان بە قوربانی کردن.(کعب بن عجرە) گێڕاویـەوە: (ئـەو لەحودەیبیـەدا بـەر لەوەی بڕواتە ناو مەککەوە ئیحرامی پۆشی بوو، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـە لایـدا رەت بـوو، بینی ئەو ئاگر لەژێر مەنجەڵدا دەکاتەوەو ئەسپێ بە دەمو چاویەوە هەڵگـەڕاوە، ئـەنجا فـەرموی: ئایا ئەو زیندەوەرانە ئازارت نادەن؟ وتی: بەڵێ. فەرموی: سەرت بتاشەو یەك (فەرق ـ سێ ربـە) خۆراك بدە شەش کەس لە هەژاران، یان سێ رۆژ بە رۆژوو بە، یان قوربانی یەك بکە) [(٣)].

**(٧) کردارەکانی جووت بوونو هۆکارەکانی.**

**(٨) گوناهو تاوان کردن.**

**(٩) شەڕە قسەو دەمە قاڵی.**

حەرام بوونی ئەو سێ شتانە لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ فَمَن فَـرَضَ فِـيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾[(٤)]. واتە: حەج چەند مـانگێکی دیـاری کراوە،کـێ حەجی تێ دا کردن، نابێ کاری جوت بوونو گوناهو دەمە قاڵی بکات لەحەجدا.

**(١٠ ـ ١١) ژن مارەکردنو هاوسەرگیری:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کەسـی ئیحـڕام پۆش ژن مارە ناکاتو ژن مێرد ناکاتو داخوازی ناکرێت) [(٥)].

**(١٢) نابێ راوبکرێ لەوشکانی دا بە کوشتنو کوشتنەوە، یان بە ئامـاژەو رێنوێنی کـردن:**

---

(١) الإجماع/ ابن المنذر.

(٢) البقرة: ١٩٦.

(٣) متفق عليه: (م: ١٢٠١ ـ ٢/٨٦١/٨٣) م(ح/١٨١٤/١٢/٤)..

(٤) البقرة/١٩٧.

(٥) صحيح (مختصر م ٨١٤) م(١٤٠٩/١٠٣٠/٢).

خودا دەفەرمووێ ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾[(١)]. واتە: راوکردنتان لەسەر حەرامە تا ئیحرام پۆش بن.

هەروەها کاتێ لەراست ئەو کەرە کێوی یە مێ یەیەیان لەپێغەمبەری خودا (ﷺ) پرسی بەر لەحەرام کردنی کە (ابو قتادە) راوی کردبوو،کە ئایا بۆیان حەلاڵە لەکاتی ئیحرامدا؟ فەرموی (ﷺ): (ئایا کەس لەئێوە ناچاری کردووە، یان ئاماژەی بۆ کردووە؟ وتیان: نەء، ئەنجافەرموی: بخۆن)[(٢)].

**(١٣) خواردن لەو نێچیرەی کە لەبەر ئەو کوژراوە، یان بە ئاماژەو یارمەتی ئەو راوکراوە،** وەکو لەو فەرمودەیەدا ئەمە دەردەکەوێ: (ئایا کەس لەئێوە فەرمانی پێ کرد رامالی بۆ ببات، یان ئاماژەی بۆ کرد..)[(٣)].

## ئەو شتانەی حەج بەتاڵ دەکەنەوە[(٤)]:

بەیەکێ لەم دووشتانەی خوارەوە حەج بەتاڵ دەبێتەوە:

**(١) جووت بون(الجماع):** بەلاّم گەر دوای (جمرة العقبة)بێ و پێش تەوافی (الإفاضة)بێ، حەجەکە بەتاڵ نابێ، هەرچەندە تاوانبار دەبێت.

بەلاّم هەندێ کەس دەڵێن: حەج بە کاری جووت بوون بەتاڵ نابێ، چونکە هیچ بەڵگەیەکی رۆنی لەسەر نەهاتووە.

**(٢) ئەنجام نەدانی روکنێ لەروکنەکانی حەج :** گەر حەج بە یەکێ لەو دوو خالانە بەتاڵ بۆوە، پێویستە ساڵی داهاتوو گەر توانی دووبارەی بکاتەوە، وەکو لەمانای توانین (الإستطاعة)دا باسمان کرد، چونکە واجب بوونی پەیوەستە بە تواناوە.

ئەم کارانەی نابێ لەهەردوو حەرەمی مەککەو مەدینە دا بکرێن[(٥)]:

---

**(١) المائدة: ٩٦.**

**(٢) متفق عليه: (خ: ١٨٢٤/٢٨/٥) م(١١٩٦ ـ ٢/٨٥٣/٦٠).**

**(٣) هەمان سەرچاوە .**

**(٤) ارشاد الساري/ الشيخ محمد ابراهيم شقرة.**

**(٥) هـ.س.**

لەهەردوو (صحیح)ەکانداو غەیری ئەواندا لە(عباد بن تمیم)ەوە هاتووە، ئەویش لەمامی گێڕاوەتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (ئیبراهیم مەککەی کردووە بە حەرەمو نزای بۆ کردووە، منیش مەدینەم کردووە بە حەرەم، چۆن ئیبراهیم مەککەی کردووە بە حەرەم).

دیارە کردنی مەککەو مەدینە بە حەرەم بەسرووش بووە بۆ هەردوو پێغەمبەرە بەڕێزەکانی (علیهم الصلاه والسلام). مەبەست لەهەردوو حەرەمەکان مەککەو مەدینەیە.

لەشەرعدا دروست نییە بە(المسجد الأقصی) بگوترێ حەرەم، نە بەمزگەوتی ئیبراهیم خەلیل (س)، چونکە سرووشی خوا تەنیا مەککەو مەدینەی کردووە بە حەرەم، ئەمە تەشریعە جێگای هزری مرۆڤی تێدا نابێتەوە.

لەمەککەو مەدینەدا قەدەغەیە ئەم کارانە ئەنجام بدرێ، نە بۆ نیشتەجێیەکانیو نە بۆ ئەوانەی بۆسەردانی حەجو عومرەو شتی تر دێن، کە ئەمانەن:

(١) راوکردنی گیاندارانو باڵندەو پەلەوەر راونانیانو کۆمەکی کردن بۆ ئەو کارانە.

(٢) بڕینی دارو درەختو دڕك، مەگەر لەبەر پێویستی نەبێت.

(٣) هەڵگرتنی چەك.

(٤) هەڵگرتنەوەی شتی کەوتوو لەحەرەمی مەککەدا بۆ حاجی، بەڵام گەر کەسێ لەشاری مەککەدا دەژیاو شتەکی هەڵگرتەوەو ناوو نیشانی بۆ خەڵکی باس کرد قەیدی نییە، جیاوازی نێوان کەسی نیشتەجێو حاجی لەوێ دا بە ئاشکرا دیارە. (تەواو).

وتم: بەڵگەمان لەسەر قەدەغەکردنی ئەم دیاردانە لەحەرەمی مەککەدا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە (ﷺ) لەرۆژی رزگاری مەککەدا: (ئەم وڵاتە هەر لەو ساتەوە خوا ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووە کردویەتی بە حەرەم، بە حورمەتی خوا تا پەسڵان کراوە بە حەرەم، بۆ کەس رێگا نەدراوە بەر لەمندا جەنگی تێدا بکات، بۆ من حەڵاڵ نەکراوە سەعاتێ نەبێ لەرۆژدا، بە حورمەتی خوا تا قیامەت کراوە بە حەرەم، دڕکەکانی ناشکێنرێتەوەو نێچیرەکانی راونانرێ، شتە کەوتووەکان (اللقطة) هەڵناگیرێتەوە مەگەر کەسێ بیناسێنێ، دارو درەختی تەڕی نابڕدرێ).

(العباس) فەرموی (ﷺ): ئەی پیغەمبەری خودا (ﷺ) تەنیا گیای (الإذخر) نەبێ،

ئەمەیان بۆ حوشترو خانوەکانیان بە کاری دێنن؟ فەرموی: تەنیا (الاذخر) کای وشتر نەبێت[١].

(جابر) دەفەرمووێ: لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە: (بۆ کەس رەوا نییە لەمەککەدا چەك هەڵبگرێت)[٢].

پێشەوا عەلی (ﷺ) فەرموی: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (لەمەدینەدا: دارو درەختی تەڕ نابڕەرێ، راوی نێچیر ناکرێ، شتە کەوتوەکانی هەڵناگیرێتەوە، مەگەر کەسێ ناوو نیشانەکانی بڵێ، دروست نییە پیاو چەکی بۆ جەنگ تێدا هەڵبگرێ، دروست نییە پیاو درەختێ ببڕێ مەگەر کەسێ ئالیکی وشترەکەی بدات)[٣].

شیخ (الشقرە) دەڵێ: (هەر کەسێ یەکێ لەم دیاردە قەدەغە کراوانە بکات، گوناهبار دەبێو دەبێ تۆبەو داوای لێ بووردن لەخوا بکات، تەنیا راوینێچیر نەبێ ئەوە دەبێ، ئیحرام پۆش سەرباری تۆبەکردن کەفارەتیش بدات. (تەواو بوو).

## تۆڵەی ئەو کەسەی نێچیرێ دەکوژێت:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَو عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ﴾[٤].

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەکاتی ئیحرامدا نێچیر مەکوژن، هەر کەسێ بە ئەنقەست بیانکوژێ، چی بکوژێ لەبەرامبەری دا دەبێ تۆڵە بێ لەئاژەڵان بیدات (لەقوربانی) دوو کەسی دادوەر بڕیاری تێ دا دەداتو دەبێ قوربانیەکە بگاتە کەعبە، یان کەفارەتەکەی دەبێ خۆراك بە هەژاران بدات، یان ئەندازەی ئەوە بەرۆژو بێ، تا سزای گوناهی خۆی بچێژێ، خوا لەوە بووراوە کە رابردوو کراوە،کێ دووبارەی بکاتەوە خودا تۆڵەی لێ دەکاتەوەو خوا سەربڵندو خاوەن تۆڵەیە.

---

(١) متفق علیه: خ(٤/٤٦/١٨٣٤) م(٢/٩٨٦/١٣٥٣).

(٢) صحیح (ص.ج ٧٦٤٥) م(٢/٩٨٩/١٣٥٦).

(٣) صحیح (ص.د ١٧٩٠) (د: ٦/٢٠/٢٠١٨).

(٤) المائدة: ٩٥.

(ابن كثير ـ ر ـ) لەتەفسیرەكەیدا (٢/٩٨) دا دەنووسێت:

ئەم حەرامكردنەی خودای گەورە بۆ كوشتنی نێچیر لەحاڵەتی ئیحرامدایە، ئەمە بۆ ئەو گیاندارانەیە دەخورێنو بێچوەكانیشیان، بەڵام ئەوانەی ناخورێن دروستە ئیحرام پۆش بیانكوژێ، بەڵام جەماوەری زانایان كۆكن كە حەرامە كوشتنی ئەوانیش، تەنیا ئەوانە نەبێ لە(متفق علیه)دا هاتوون لەرێگای (الزهري)یەوە: (پێنج گیاندار خراپكارن لەكاتی ئیحرام داو دوای ئەوە دەكوژرێن: قەلەڕەشە (الغراب)و كۆللارە (الحدأة)و دووپشكو مشكو سەگی هار) [1]. ئەوانە حەلاڵە لەكاتی ئیحرامو دوای شكاندنی ئیحرام بكوژرێن.

وتویەتی: ئەوەی جەماوەری لەسەر هەیە، ئەو كەسەی بە ئەنقەست ئەو گوناهە دەكاتو یان لەیادی نییە وەكو یەك كەفارەتیان لەسەرە.

(الزهري) دەڵێ: قورئان دەقی هەیە لەسەر ئەو كەسەی بە ئەنقەست ئەو كارە دەكات، سوننەتیش دەقی لەسەر ئەو كەسەیە كە ئەو كارەی دەكاتو لەیادی نییە، قورئان ئەوە دەردەخات ئەو كەسەی ئەو كارە دەكات بە ئەنقەست گوناهبارەو سزای لەسەر واجبە﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ﴾ [2]. لەفەرمودەكانداو لەحوكمەكانی پێغەمبەردا (ﷺ)و سەحابەكاندا هاتووە كە تۆڵە هەیە لەسەر ئەو كەسەی بەهەڵە ئەم كارە دەكات، وەكو چۆن دەقی قورئان هەیە ئەو كەسەی بە ئەنقەست ئەم كارە دەكات تۆڵەی لەسەر هەیە.

دیسان كوشتنی نێچیر لەناوبردنەو لەناو بردنیش زەمانەتو گرنتی تێدایە بە ئەنقەست بێ یان بە هۆی لەیاد كردن بێ، بەڵام بەئەنقەستی تاوانی تێدایە، بەهەڵە چوون سەر زەنشتی بۆ نییە.

وتویەتی: خوا فەرمویەتی: ﴿فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ﴾ [3]. بەڵگەیە لەسەر راستی رای مالیكیو شافیعیو ئەحمەدو جەماوەری زانایان كە ئەو كەسەی نێچیرێ دەكوژێ، دەبێ

---

(١) متفق علیه: (خ ٤/٣٤/١٨٢٩) م(٢/٨٥٦/١١٩٨).

(٢) المائدة: ٩٥.

(٣) المائدة: ٩٥.

هاوشێوەی ئەو لەگیاندارانی ماڵی بکاتە فیدیە، گەر نەبوو، دەبێ پارەی ئەو نێچیرە چەندە بیدات کە (ابن عباس) بڕیاری تێداوەو بۆ مەککەی هەڵدەگرێت.

(بەیهەقی) گێڕاویەوە[١]: (واتە: دەدرێتە هەژارانی شاری مەککە) وەکو (عکرمە) لە(ابن عباس) گێڕاویەوە (تفسیر ابن کثیر/٩٩ ـ ٢).

چەند نمونەیەك لەحکومەتی پێغەمبەر (ﷺ)و یارانی لە(سەربەسەری) دا (المثلی):

(جابر) دەفەرمووێ: لەراست کەمتیار (الضبع) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)م پرسی؟ فەرمووی: نێچیرێکە گەر ئیحرام پۆش راوی کرد دەبێ بەرانێکی بۆ بکرێتە فیدیە)[٢]. (جابر) گێڕاویەوە عومەر لەراست کەمتیار دا بەرانی داناو، لەبەرامبەر مامز(الغزال)دا بزنە مێ یەکی(العنز) داناو لەبەرامبەر کەروێشکدا کارێکی یەك ساڵی (العناق) داناو لەبەرامبەر گۆڕ هەڵکەنە (الیربوع)دا کاریلەیەکی چوار مانگی (الجفرة) دانا)[٣].

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (ئەو لەبەرامبەر هەر کۆترێکی حەرەمدا لەسەر بابای ئیحرام پۆشو ئیحرام هەڵوەشێن مەڕێیکدانا)[٤].

(ابن کثیر) وتویەتی (١٠٠/٢): (گەر خوا فەرمویەتی: ﴿هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ﴾[٥]. واتە: دەبێ قوربانیەکە بگەیەنرێتە حەرەمو لەوێ بکوژرێتەوەو گۆشتەکە بەسەر هەژارانی حەرەمدا دابەش بکرێتو ببەشرێتەوەو ئەمەش یەك دەنگی لەسەر کراوە. گەر دەفەرمووێ: ﴿أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَو عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا﴾[٦]. واتە: ئەگەر ئیحرام پۆش ئەو گیاندارەی دەست نەکەوت کە هاوشێوەی نێچیرەکەی بێ، یان نێچیرەکە هاوتای نەبوو لەماڵیەکاندا، ئەوە سەرپشکە بە پێ ی وشەی (او) کە بەرامبەر ئەو نێچیرە پارە بقرسێنێ، یان هاوشێوەی ئەو بقرسێنێ، یان خۆراکی پێ بکڕێ بکرێتە خێرو هەر هەژارە مشتەکی بدرێتێ، گەر ئەمە نەبوو یان دەتوانێ لەجیاتی

(١) تفسير القرآن العظيم ٢/٩٩.
(٢) صحيح (ص.د ٣٢٢٦) د(١٠/٢٧٤/٣٧٨٣).
(٣) الارواء: ١٠٥١) ما(٢٨٥/٩٤١) هق(٥/١٨٣).
(٤) صحيح الإسناد (الارواء: ١٠٥٦) هق(٥/٢٠٥).
(٥) المائدة: ٩٥.
(٦) المائدة: ٩٥.

خۆراکدان بە هەر هەژارێ، رۆژێك بەرۆژو بێت. (کۆتایی بە دەستکارییەوە).

تۆڵەی کاری جووت بوون (الوطأ) لەحەجدا:

هەر کەسێ کاری جووت بوون لەحەجدا بکات بەر لەهەڵوەشاندنەوەی یەکەمدا، حەجی بەتاڵ بۆتەوە، دەبێ وشترێ بکاتە قوربانی، گەر دوای ئیحرام هەڵوەشاندنەوەی یەکەمو بەر هی دووەم کاری جووت بوونی کرد لەگەڵ ژنیدا، حەجی بەتاڵ نابێو دەبێ مەڕێك بکاتە قوربانی.

(ابن عباس) گێڕاویەوە کە (ئەو لەراست پیاوێ پرسیاری لێ کرا کە لەکاتی ئیحرامدا سەر جێگای لەگەڵ ژنیدا کردووەو ئەو لەمینا بووە بەر لەوەی تەوافی (الإفاضة) بکات دەبێ وشترێ سەرببڕێت)[1].

(عمرو بن شعیب) لەباوکی گێڕاویەوە: (پیاوێ هاتە لای (ابن عمر) لەراست پیاوێ لێی پرسی کە لەکاتی ئیحرام دا سەر جێگا لەگەڵ ژنی دا دەکات، ئەویش وتی: برۆ لای (عبیدالله بن عمر)و لێ ی بپرسە، وتی: پیاوە کە نەیدەناسی بۆیە من لەگەڵدا چووم، لێ ی پرسی، ئەویش وتی: حەجەکەت بەتاڵە. پیاوەکە وتی: چی بکەم؟ وتی: برۆ لەگەڵ خەڵکی ئەوان چی یان کرد تۆش وابکە، گەر ساڵی داهاتوو توانیت حەج بکەو قوربانی بدە. گەڕایەوە لای (ابن عمر)و خۆشم لەگەڵی دا بووم، بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، وتی: بچۆ لای (ابن عباس) پرسیاری لێ بکە. (شعیب) دەڵێ: منیش لەگەڵی چوومە لای (ابن عباس)و پرسیاری لێ کرد، هەمان قسەی (ابن عمر)ی کرد. ئەنجا گەڕاوە لای (ابن عمر)و خۆشم لەگەڵیو یاوەری بوومو بەسەر هاتی (ابن عباس)ی باس کرد. پاشان وتی: تۆ چی دەڵێی: وتی: قسەی منیش وەکو قسەی ئەم دووانەیە)[2].

سەعیدی کوڕی جوبەیر(ﷺ) دەفەرموێ: (پیاوێ لەگەڵ هاوسەرەکەی ئیحرامی عومرە دەپۆشن، مەناسیکەکان تەواو دەکەن جگە لەقژ کورت کردنەوە نەبێ، بەر لەقژ کورتکردنەوە کاری جووتبوونی لەگەڵدا کرد، لەراست ئەمە لە(ابن عباس)ی پرسیار کردو وتی: (ئەم ژە فرە ئارەزوویی (الشبق)هەیە. نەفەرێ پێ ی وت: ژنەکەی گوێ ی لێ یە، بۆیە شەرمی کرد لەوە،

---

(١) صحیح موقوف: (الارواء: ١٠٤٤) هق(٥/١٧١).

(٢) صحیح: (الارواء: ٤/٢٣٤) هق(٥/١٦٧).

وتی: بۆ ئاگادارت نەکردم!؟؟ وتی: خوێن برێژە، وتی: چی؟ وشترێ یان مانگایێ یان مەڕێ بکوژەوە. وتی: کامەیان لەوانە باشترە؟ وتی: وشتر) [١].

هەر کەسێ وشتر یان مەڕ ی دەست نەکەوت، دەبێ سێ ڕۆژان بەرۆژوو بێ لەحەج و حەوت ڕۆژان کاتێ گەڕایەوە. وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ [٢].

واتە: (کێ حەجی (تمتع)ی کرد بە عومرە بۆ حەج، ئەوەی بۆ گونجا با بیکات بە قوربانی، هەر کەسێ ئەوەی دەستگیر نەبوو با سێ ڕۆژان لەحەج و حەوتیان کاتێ گەڕایەوە بەرۆژوو بێت). واچاکە بەر لەعەرەفە سێ ڕۆژەکان بەرۆژووبێ، گەر نا ڕۆژانی (التشریق) بۆی دروستە بەرۆژووبێ، وەکو لەوتەی (ابن عمر)و (عائیشە) دا هاتووە: (ڕێگا نەدراوە بەرۆژووبون لەرۆژانی (التشریق)دا مەگەر کەسێ قوربانی بەردەست نەکەوێت) [٣].

**ئاگاداری یەك:** ژن و پیاو لەمەدا یەکسانن، بەڵام گەر ناچار بکرێ ئەوە قوربانی لەسەر نی یە، دیسان حەجی دروستە، پێچەوانەی حەجی مێردەکەی، کە سەر جێگای لەگەڵدا کردووە) [٤].

(سعید بن جبیر) دەڵێ: (پیاوێ هاتە لای (ابن عباس)و وتی: (بەر لەوەی زیارەت بکەم کاری سەر جێگام لەگەڵ ژنمدا کردووە، فەرموی: گەر ئەویش یارمەتی دابی، لەسەر هەر یەکێکتان وشترەکی جوان واجبە. گەر یارمەتی نەدابیت ئەوە وشترەکی جوان لەسەر تۆ واجبە) [٥].

## خوێنەکان لەحەجدا [٦]:

(١) **خوێنی حەجی (التمتع)و (القران):** ئەو خوێنەیە لەسەر ئەو حاجی یە واجب دەبێ کە (لبیك) بە عومرە دەکات بەمەبەستی (تمتع الحج)، یان (لبیك) بە حەج و عومرە دەکات بە

---

(١) صحیح الارواء: ٤/٢٣٣) هق(٥/١٧٢).
(٢) البقرة: ١٩٦.
(٣) صحیح: الارواء: ١٠٤٢) خ(٤/٢٤٢/١٩٩٧).
(٤) ارشاد الساري.
(٥) صحیح: الارواء ١٠٤٤) هق (٥/١٦٨).
(٦) (ارشاد الساري) لەگەڵ زیادکردنی ئایەتەکان.

مەبەستی (القران)و پێکەوە کردنیان، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَمَن تَمَتَّعَ...﴾[(١)]. وەکو باسکرا.

**(٢) خوێنی فیدیە،** کە واجبە لەسەر حاجی لەکاتێ دا قژی تاشی لەبەر نەخۆشی یەك یان شتەکی بە ئازاردا وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾[(٢)].

**(٣) خوێنی سزا:** ئەو خوێنەیە کە پێویستە ئیحڕام پۆش بیدات، کاتێ نێچیرەکی وشکانی راوکرد، بەڵام نێچیری دەریایی هیچی لەسەر نییە. لەرابردوو باس لەو خوێنە کرا.

**(٤) خوێنی رێگا لێ گیران (الإحصار):** کە رێگای لێ بگیرێ لەتەواو کردنی مەناسیکەکاندا، لەبەر نەخۆشێ یەك یان دوژمن‌و هۆکاری ترو لەکاتی ئیحڕامدا مەرجی دانەنابێت، ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾[(٣)].

**(٥) خوێنی کرداری جووت بوون،** ئەو خوێنەیە حاجی دەیدات لەکاتێ دا حەج دەکات، کرداری جووت بوون ئەنجام دەدات، لەمێژ نییە باسمان کرد.

---

(١) البقرة: ١٩٦.

(٢) البقرة: ١٩٦.

(٣) البقرة: ١٩٦.

## عومرە (العمرة)

عومرە بەرزترین خوا پەرستیو عیبادەتە بۆ لەخوا نزیک بوونەوە، کە خودا پایەی بەندەکانی پێ بەرز دەکاتەوەو گوناهەکانیان پێ رەش دەکاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بە قسەو کردار هانی داوەو فەرمویەتی: (عومرە بۆ عومرە کەفارەتە بۆ گوناهەکانی نێوانیان) [١]. (ﷺ) فەرموویەتی: (حەجو عومرە بە شوێن یەکتری دا ئەنجام بدەن، ئەو دوانە هەژاریو تاوان بنەبڕ دەکەن وەکو چۆن (موشەدەمەو کوورە) ژەنگی ئاسنو زێڕو زیو لادەبات[٢].

پێغەمبەر (ﷺ) عومرەی کردووە، سەحابەکان سەردەمی ئەوو دوای وەفاتی ئەو عومرەیان کردووە[٣].

### روکنەکانی عومرە:

**(١) ئیحرام بەستن:** نیەتی چوونە ناو عومرەیە، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (انما الأعمال بالنیات). وەکو باسکرا.

**(٢ ـ ٣) تەوافو سەعی کردنە:** ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ [٤]. ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ﴾ [٥].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (اسعوا فان الله کتب علیکم السعی) [٦].

واتە: سەعی بکەن، خوا سەعی لەسەر فەرز کردوون.

**(٤) سەرتاشینو کورتکردنەوە پێغەمبەر:** (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ قوربانی پێ نەبوو، با تەوافی کەعبە بکات، هەروەها لەنێوان سەفاو مەروەداو قژی کورت بکاتەوە، ئەنجا ئیحرام

---

(١) متفق علیه: خ(٣/٥٩٧/١٧٧٣) م(٢/٩٨٣/١٣٩٤).

(٢) صحیح (ص.ج ٢٨٩٩) (ت ٢/١٥٣/٨٠٧).

(٣) ارشاد الساري.

(٤) الحج: ٢٩.

(٥) البقرة: ١٥٨.

(٦) رابردو باسکرا.

بشكێنێت)[١].

## واجیباتەكانی عومرە:

پێویستە لەسەر ئەوەی عومرە دەكات لەمیقاتەوە نیەتی عومرە بێنێ، بەو مەرجەی بەر لەوە نیشتەجێ بووبێ، گەر دوای میقات نیشتەجێ بووبێ ئەوە لەجێگای خۆیەوە ئیحرام دەبەستێ. بەڵام ئەو كەسەی لەمەككە نیشتەجێ بووە، پێویستە بڕواتە دەرەوەی مەككەو لەوێ وە ئیحرام ببەستێ، وەكو چۆن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە عائیشە كرد لە(التنعیم) ئیحرام ببەستێت) [٢].

## كاتەكەی:

هەموو رۆژەكانی ساڵ كاتن بۆ عەمرە، بەڵام لەرەمەزاندا خێرترە، وەكو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (عومرە لەرەمەزاندا بە ئەندازەی حەجێكە) [٣].

## دروستی عومرە بەر لەحەج كردن:

(عكرمە بن خالد) دەڵێ: (لە ـ ابن عمر ـ م پرسیار كرد لەراست عومرە بەر لەحەجدا وتی: قەیدی نییە. (ابن عمر) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش حەج كردن عومرەی كردووە)[٤].

## دووبارە كردنەوەی عومرە[٥]:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوار عومرەی كرد لەچوار ساڵدا، هەر جارەی یەك عومرەی ئەنجامداوە، هەروەها یارانیشی، نەمان زانیوە كەس دوو عومرەی ئەنجام دابن لەیەك سەفەردا،

---

(١) متفق علیه: خ(٣/٥٣٩/١٦٩١).

(٢) متفق علیه: خ(٣/٦٠٦/١٧٨٤) م(٢/٨٨٠/١٢١٢).

(٣) صحیح (ص.ج ٤٠٩٧) (ت ٢/٢٠٨/٩٤٣).

(٤) صحیح (مختصر خ ٨٦٢) خ(٣/٥٩٨/١٧٧٤).

(٥) ارشاد الساري.

لەسەردەمی تەمەنی ئەودا یان دوای وەفاتکردنی (ﷺ)، تەنیا عائیشە نەبێ کە دەکەوێتە بێ نوێژییەوە لەحەجەکەی دا لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نەبێ، کە فەرمان بە (عبدالرحمن)ی برای دەکات بیباتە (التنعیم) تا ئیحرام بە عومرە ببەستێ، وای زانی عومرەکەی کە هاو جووتی حەجەکەی کردبوو بەتاڵ بۆتەوەو گریا، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر دڵی ئەو ڕێگای پێ دا عومرە بکات.

ئەم عومرەیەی عائیشە کردوویەتی پەیوەستە بە ئەمەوە، بە بەڵگەی ئەوەی نەزانراوە هیچ کامێ لەسەحابەکان لەژنانو پیاوانیان دوای حەجکردنی لە(التنعیم)ەوە حەجی کردبێت وەکو عائیشە، گەر سەحابە ئەوەیان زانیبایە کە ئەم کارەی عائیشە بۆ ئەوان حەڵاڵە دوای حەجکردنیان زۆر بەسەر هاتیان لێ دەگەڕایەوە. (الشوکاني) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدەرەوەی مەککەوە بۆ (الحل) عومرەی نەکردووە، پاشان بە عومرەوە بڕواتە ناو مەککەوە، وەکو خەڵکی ئیمڕۆ وادەکەنو لەهیچ کام لەسەحابە ئەمە دانەمەزراوە).

دیسان لەهیچ کام لەئەسحاب دانەمەزراوە دوای حەج عومرەیان دووبارە کردبێتەوە، لەهیچ ڕۆژانی ساڵدا دووبارەکردنەوەی نەچەسپاوە. بە تاکو کۆمەڵ دەهاتنە ناو مەککەوەو دەیانزانی عومرە زیارەتی تەوافو سەعی یە لەنێوان سەفاو مەڕوەدا، تەواف لەسەعی گەورەترە، لەجیاتی خۆ سەرقاڵ کردن بە ڕۆیشتن بۆ (التنعیم) عومرەیەکی نوێو بە دوای عومرەی یەکەمدا دەچوون، ئەنجا لەپێشتر بوو تەوافی کەعبە بکەن، زانراوە تا مرۆڤ دەڕوا بۆ (التنعیم) بۆ عومرەیەکی نوێ، دەتوانێ لەو ماوەیەدا کە لەدەستی دەدا بۆ عومرەیەکی نوێ سەدان تەواف ئەنجام بدات. (طاوس) دەڵێ: (ئەوانەی عومرە لەتەنعیمەوە دەکەن نازانم پاداشتیان هەیە، یان سزا دەدرێن!! نەفەرێ وتی: سزا دەدرێن؟ طاوس وتی: چونکە واز لەتەوافی بەیت دێنێو چوار میل دەڕواتو دەگەڕێتەوە، تا لەو چوار میلە دەگەڕێتەوە ئەو دوو سەد تەوافی کردووە، تا زیاتر تەواف بکات خێری پترە کە بۆ شتی تر دەڕوات).

سوننەتی کرداری پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە نیشان دەدات، دیسان کاری یارەکان دروست نییە عومرە دووبارە بکرێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (علیکم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدین المهدیین من بعدي، عضوا علیها بالنواجذ).

# سەردانی مەدینەی پیرۆز

**لە(ارشاد الساري)دا هاتووە:**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (خوای گەورە نـاوی مەدینـەی نـاوە ـ الطابـة ـ پاکـژ) [١].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (مەدینە وەکـو کوورەیـە پیـسی لادەبـات، قیامـەت نایـەت تـا خراپکارانی دەردەکات وەکو چۆن کوورە ژەنگی ئاسن لادەبات) [٢].

## گەورەیی مزگەوتی مەدینەو گەورەیی نوێژ تێدا کردنی:

ئەبو هورەیرە گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لەناو مزگەوتەکاندا تـەنیا سـەفەر بۆ سێ مزگەوت دەکرێ: مزگەوتی منو، مزگەوتی حەرامو مزگەوتی قودس) [٣].

پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: (نوێـژ کـردن لـەم مزگەوتـەی منـدا لەهـەزار نوێـژی مزگەوتەکانی تر خێرترە، تەنیا مزگەوتی حەرام نەبێت) [٤].

هەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: (نێـوان مـاڵی مـنو مینبـەری مـن باخـچەیەکە لەباخچەکانی بەهەشت) [٥].

## نەریتەکانی سەردانی مزگەوتو گۆڕی پێغەمبەری پیرۆز:

خوای گەورە رێزی بەم سـێ مزگەوتـە داوە، خێـری نوێـژکردنی تێیانـدا ئەوەنـدەی فـراوان کردووە، هەر کەسێ بڕواتە ئەم سێ مزگەوتـە بـۆ ئەوەیـە پاداشـتی پـێ بگـاتو وەڵامـی ئـەم بانگەوازەیە بداتەوە کە سوننەتە سەردانیان بکاتو سەفەریان بۆ بکات.

---

(١) صحيح (ص.ج ١٧٧٥) (م ٢/١٠٠٧/١٣٨٥).

(٢) صحيح (م ٢/١٠٠٥/١٣٨١).

(٣)متفق عليه: (خ: ٣/٦٣/١١٨٩) م(٢/١٠١٤/١٣٩٧).

(٤) متفق عليه: خ(٣/٦٣/١١٩٠) م(٢/١٠١٢/١٣٩٤).

(٥) متفق عليه: (خ ٣/٧٠/١١٩٥) م(٢/١٠١٠/١٣٩٠).

ئەم سیٚ مزگەوتە نەریتەکانیان وەکو نەریتی مزگەوتەکانی ترە، نەك وەکو هەندیٚ خەڵك کە نەریتی تایبەتی یان بۆدادەنێن، ئەم جیاوازییە لەبەر بوونی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرە(ﷺ) لەناو ئەو مزگەوتەدا.

تا موسڵمان شارەزای هەبیٚ کاتیٚ چووە مەدینەو سەردانی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بکات ئەمە نەریتەکانیەتی:

(١)گەر چووە ژوور با قاچی راست پێش بخاتو بڵیٚ: (اللهم صل علی محمد وسلم، اللهم افتح لی ابواب رحمتك) [1]. یان: (اعوذ بالله العظیم، وبوجهه الكريم وسلطانه القديم من الشيطان الرجيم) [2].

(٢) بەر لەوەی دابنیشیٚ نوێژی سڵاوی مزگەوت (تحية المسجد) دەکات.

(٣) نابیٚ نوێژەکە بە رووی گۆڕەکە بکاتو لەکاتی پاڕانەوە روو لەو بکات.

(٤) دەڕواتە: سەر گۆڕی پیرۆزی ئەوو سەلامی لیٚ دەکات.

دەبیٚ خۆی بپارێزیٚ لەوە دەستی لەسەر سنگی دابنیٚو ملی بۆ خوار بکاتەوە، ئەو مل کەچی یەی تەنیا بۆ خوایە، یان پەنا ببرێتە بەر پێغەمبەر(ﷺ)و هاواری بکرێتیٚ. سەلام لەپێغەمبەر (ﷺ) دەکات، بەو وشانەی کە لە(بەقیع)دا دەیڵیٚ. زۆر شێواز لەپێغەمبەر (ﷺ) بیستراوە، لەوانە: (السلام علی اهل الديار المؤمنين والمسلمين ويرحم الله المستقدمين منا والمستأخرين، وانا ان شاء الله بكم للاحقون). ئەنجا سەلام لەئەبوبەکرو عومەر دەکات.

(٥) رێزو رەوشتەکی جوانە کە لەتەك مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ)دا یان گۆڕی پیرۆزی دا دەنگ بەرزنەکرێتەوە، چونکە ئەدەب نواندن لەکاتی وەفاتی ئەودا وەکو ئەدەب نواندنی ئەوە لەکاتی زیندوەتی دا.

(٦) دەبیٚ نوێژی بە کۆمەڵەکەی لەڕیزی یەکەمدا بیٚ، چونکە پاداشتی زۆری تیٚ دایە.

(٧) نابیٚ سووربیٚ نوێژ لەتەك مەرقەدەکە دا بکات، چونکە لەهەر کویٚ ی مزگەوتەکە نوێژ بکریٚ خێرەکەی وەکو یەکە.

---

(١) رابردوو باسکراوە.

(٢) رابردوو باسکراوە.

(٨) سوننەت نییە کە پێ دابگرێ چل نوێژ لەسەر یەك بکات لەو مزگەوتەدا بە پێ ی فەرمودەی: (من صلی في مسجدي اربعین صلاة لا یفوته صلاة کتبت له براءة من النار ونجا من العذاب وبريء من النفاق). ئەم فەرمودەیە لاوازەو دروست نییە.

واتە: هەر کەسێ لەمزگەوتی من چل نوێژ بکاتو نوێژێ نەچوێنێ ئەوە پارێزرانی لەئاگر بۆ دەنوسریێو لەسزا رزگاری بووەو لەدوو روویی دوور کەوتۆتەوە).

(٩) دروست نییە زۆر لەسەر گۆڕ قسە بکات بۆ سەلام کردن لەپێغەمبەر (ﷺ) لەهەر کوێ بێ سەلامی ئەوی پێ دەگات، گەر لەو پەڕی دنیاش بێو لەپاداشتی سەلاوەت وەکو یەك پاداشتی دەگاتێ، دوورو نزیکی لەگۆڕی وەکو یەکە.

(١٠) گەر چووە دەر پاشەو پاش نایەتە دەر، قاچی چەپ دوادەخاتو دەڵێ: (اللهم صل علی محمد، اللهم اني اسألك من فضلك). وەکو باسکرا.

مزگەوتی (قباء):

سوننەتە بۆ کەسێ بڕواتە مەدینە نوێژی تێدابکاتو سوننەتی ئەو پێغەمبەر (ﷺ) ڕەچاو بکات، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) (بە سواریو پیادەیی سەردانی کردووەو دوو رکەعەتیی نوێژ تێ دا کردووە). وەکو موسلیمو بوخاری گێڕاویانەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من تطهر في بیته ثم اتی مسجد قباء فصلی فیه کان له کأجر عمرة). واتە: هەر کەسێ بە پاکی لەماڵی بڕواتە دەر بڕواتە مزگەوتی قوباء، نوێژی تێ دا بکات پاداشتی عومرە یەکی پێ دەگات)[1].

## گۆڕستانی بەقیعو ئوحود:

بەقیع گۆڕستانی موسڵمانانە لەمەدینە داو سەحابەیەکی زۆری تێدا نێژراوە، بەردەوام موسڵمانان تا ئیمرۆ لەوێ دا بە خاك دەسپێردرێن، زۆربەی ئەوانەی هاتوونە مەدینە بەو نیازە لەوێ بمرنو لەوێ دا بنێژرێن.

(١) صحیح (ص.جه ١١٦٠) جه(١٤١٢/٤٥٣/١).

لەفەرموودەی (متفق علیه)دا هاتووە: (أحد جبل یحبنا ونحبه). واتە: ئوحود چیایێکە خۆشی دەوێین‌و خۆشمان دەوێت. زیاتر لەحەفتا شەهیدی لەباوەش گرتووە، لەو شەهیدانەی لەباوەشی ئەودا شەهید بوون‌و ناوی شەڕەکەش بووە شەڕی ئوحد. هەر کەسێ چووە مەدینە قەیدی نییە سەردانی گۆڕەکانی بەقیع‌و شەهیدانی ئوحود بکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرەتا سەردانی گۆڕەکانی قەدەغە کرد، پاشان بۆ بیرەوەری ڕێگای پێ داوە، تا مرۆڤ سوود لەچارەنوسی ئەوانەی ناوی وەربگرێت. بەڵام دەبێ خۆ پەنا بدات لەتەبەڕوك وەرگرتن لەگۆڕەکان‌و داوای فریاکەوتن‌و شەفاعەت لێیان‌و تەوەسسول کردن لێیان بۆ خوای بەندەکان.

دروستە کەسێ هاتە ئوحود بە مەبەستی ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەو قەد پاڵە نوێژی کردووە نوێژ بکات، یان بۆ تەبەڕوك سەر ئوحود بکەوێ، یان سەر چیای تیراندازەکان بکەوێ بۆ شوێن کەوتنی شوێنەواری سەحابەکان، شتی تریش جگە لەسەلام‌و دوعا بۆ شەهیدەکان دروست نییەو سوننەت نییە، بەڵکو بیدعەی داهێنراون، عومەر دەڵێ: (کەسانی بەر لەئێوە بەهۆی شوێن کەوتنی شوێنەواری پێغەمبەرانیان بە هیلاك چوون).

با قسەی عومەر قەناعەتی تەواومان پێ بکات[1].

## مەزارگەکان:

لەمەدینەدا شوێنی تریش هەیە بە مەزارگە ناسراون، وەکو مزگەوتەکانی نزیك لەشوێنی غەزای کەعبەو مزگەوتی (القبلتین)و هەندێ لەبیرەکان‌و مزگەوتی (الغمامة)و مزگەوتی ئەبوبەکرو عوسمان‌و عائیشە، هەموو ئەو شوێنانە نابێ بۆ زیارەت دیاری بکرێن، نابێ زیارەت چی وابزانێ بەمە پاداشتی پێ دەگات، شوێن کەوتنی شوێنەواری پێغەمبەران هۆی بە فەتارەت چوونە بەر لەئێمە، چاك نییە بۆ موسڵمانان لەرێو شوێنی پێغەمبەر (ﷺ)و یارانی لابدەن‌و چاکە هەموی لەرێنومای ئەو دایەو زیان هەمووی لەوەدایە پێچەوانەی ڕێنومای ئەو بێت یان ئەوان بێت.

---

(١) بێگومان عومەر (رضي الله عنه) زۆر لەخەڵکی ترساوە کە تازە بوون بە ئیسلام، جارەکی تر بت پەرستی کاریان تێ بکاتەوە.

**دوو ئاگاداری زۆر گرنگ:**

(١) زۆر لەحاجیەکان سوور دەبن لەمەدینە بمێننەوە چەند ڕۆژێ پتر لەوەی لەمەککە ماونەوە، کەچی نوێژ لە(مسجد الحرام)دا (١٠٠) هەزار ئەوەندەی نوێژی مزگەوتەکانی تر خێرترە. بەڵام نوێژ لەمزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) بە هەزار نوێژی مزگەوتی ترە.

کەواتە: مانەوە لەمەککە خێرترە نەك لەمەدینەو پێویستە زیاتر لەمەککە بمێننەوە نەك لەمەدینە.

(٢) زۆر حاجی وادەزانن زیارەتی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) مەناسیکەکی حەجە، بۆیە وەکو مەناسیکی حەج پێ ی لەسەر دادەگرن، تا حاجی وادەزانن کاتێ حەجیان کردو نەهاتنە مەدینە حەجیان ناتەواوە.

لەم بارەوە گێڕانەوەی هەڵبەستراو دەگێڕنەوە وەکو: (من حج ولم يزرني فقد جفاني) [1].
ئەمە پێچەوانەی گومانی ئەوانەیە، سەردانی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)و نوێژ تێ کردنی سوننەتەکی پێغەمبەرە (ﷺ)، بەڵام جیاوازی هەیە لەنێوان زیارەتو حەجدا، زیارەتی ئەم مزگەوتە مەرجی دروستی حەج نییەو نە حەج کامڵ دەکات، چونکە سەردانی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) مەناسیکی حەج نییە بەڵکو خۆی ڕێگا پێ دراوە.

---

(١) (من حج ولم يزرني فقد جفاني) رواه ابن عدي في الكامل والدارقطني. (شيخ الإسلام السبكي)لە(شفاء السقام في زيارة خير الأنام بە(صحيح)ی داناوە.

# باسی ژن مارەکردن و هاوسەرگیری
# (کتاب النکاح).

حوکمی ئەمە: سوننەتەکی موئەککەدی پێغەمبەرانە، خوا فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً﴾[1]. واتە: بەراستی رەوانەمان کردووە بەر لەتۆ رەوانەکراوان خێزانو وەچەیان بۆ دروست کردن. دروست نییە بیٚ پاساو هاوسەرگیری نەکرێت، (انس بن مالك) گێڕاویەوە: (سیٚ کەس هاتنە ماڵەکانی خێزانانی پێغەمبەر (ﷺ) لەراست خواپەرستی ئەو پرسیاریان کرد، کاتیٚ باسیان کرد وەك بڵێی ئەوان بە کەمیان زانیو وتیان: ئێمە لەچاو پێغەمبەری (ﷺ) لەکوێین، خوا لەگوناهی پێشوو و داهاتوی خۆش بووە. نەفەرێکیان وتی: من هەموو شەو بەردەوام شەو نوێژ دەکەم، ئەوەکەی تریان وتی: هەمو رۆژەکانی ساڵ بەرۆژوو دەبم و، بەربانگ ناکەمەوە، ئەوەکەی تریان وتی: من توخنی ژنان ناکەومو قەت ژن ناهێنم. پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتو فەرموی: ئێوەن ئاواو ئاواتان وتووە؟ بەڵام سوێند بەخوای من لەهەمووتان زیاتر لەخوا دەترسمو بە تەقواترم، بەڵام من رۆژوو دەگرمو بەربانگ دەکەمەوەو نوێژ دەکەمو دەخەومو ژن دەهێنم، کیٚ لەریٚو شوێنی من لابدات لەمن نییە)[2].

پێویستە مرۆڤیٚ گەر بتوانیٚ هاوسەرگیری بکاتو لەخۆشی دەترسا تووشی بە فەتارەت چوون ببیٚ ژن بهێنێت. چونکە داوێن پیسی حەرامە، هەروەها ئەو هۆیانەی سەر بۆ ئەوە دەکێشنو دەبنە دەسپێك بۆ زینا، کیٚ لەوە ترسا تووشی زینا ببیٚ واجبە لەکۆڵ خۆی لابدات، گەر بە هاوسەرگیری چارەبکریٚ ئەوە پێویستە ئەنجامی بدات[3].

هەر کەسیٚ نەیتوانی ژن بێنیٚو ئارەزوشی هەبوو، پێویستە بەرۆژوو بیٚ، پێغەمبەر (ﷺ) پێمانی فەرموو: (ئەی لاوان کیٚ توانای هەبوو هاوسەرگیری بکات، ئەوە باشترە بۆ پاراستنی

---

(١) الرعد: ٣٨.

(٢) متفق علیه: (خ: ٥٠٦٦/٩/١١٢) م(١٤٠٠/١٠١٨/٢).

(٣) السیل الجرار(٢/٢٤٣).

چاوو پاراستنی داوێن، کێ نەیتوانی با بەرۆژوو بێ ئەوە بۆ ئەو دەبێ بە پارێزەر) [١].

## کام ژنان شیاوترن بۆ هێنان؟

**کێ ویستی ژن بێنێ با ئەم سیفاتانە لەئافرەتەکەدا هەبێت:**

**(١) ئاین پەروەر بێتو بەدین بێت،** (ﷺ) فەرمویەتی: (ژن بۆ چوار مەبەست دەکرێتە هاوسەر: لەبەر سامانی، لەبەر بنەماڵەی، لەبەر جوانیو، لەبەر دینداری، تۆ دیندارەکە بێنە، دەستت خۆش بێت) [٢].

**(٢) کچ بێ،** نەك بێوەژن مەگەر بەرژەوەندی لەمەدابێت: (جابر) گێڕاویەوە: (لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ژنم هێنا، بە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتمو فەرمووی: ئەی جابر ژنت هێناوە؟ وتم: بەڵێ. فەرموی: کچە یان بێوەژنە؟ وتم: بێوەژنە. فەرمووی: بۆ کچت نەدەهێنا گەمەی لەگەڵدا بکەیت؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من خوشکم هەیە ترسام نێوانی منو ئەوان تێك بچێ. فەرموو: ژن بۆ چوار مەبەست لەبەر بنەماڵە لەبەر دینو لەبەر ماڵو لەبەر جوانی هاوسەرگیری لەگەڵدا دەکرێ، ژنی دیندار هەڵبژێرە دەستەکانت خۆش بێت) [٣].

**(٣) ژنەکە نەزۆك نەبێ،** وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەو ژنانە بێنن کە بە سۆزو ئەویندارن (الودود)و منداڵیان ببێ، من شانازی بە زۆریتانەوە دەکەم[٤].

## کام پیاوان باشن:

کە پێویستە بۆ پیاوان سۆراغی ژنی باش بکەن وەکو باسمان کردن، پێویستە سەرپەرشتیاری ئافرەتیش سۆراغی پیاوی باش بۆ کچەکەی بکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (گەر کەسێ هاتە خوازبێنی لەئاینو رەوشتی رازی بوون، بیدەنێو لێ ی مارە ببڕن، گەر وانەکەن ئاژاوەو

(١) متفق علیه: (خ ٥٠٦٦/١١٢/٩) م(١٤٠٠/١٠٨/٢).

(٢) متفق علیه: خ(٥٠٩٠/١٣٢/٩) م(١٤٦٦/١٠٨٦/٢).

(٣) متفق علیه: خ(٥٠٩٠/١٣٢/٩) م(١٤٦٦/١٠٨٦/٢)

(٤) متفق علیه: م(٧١٥/١٠٨٧/٢).

خراپەکاریو گەندەڵی یەکی زۆر لەزەوی دا پەیدا دەبێت)[١].

قەیدی نییە پیاو کچی خۆی یان خوشکی خۆی پێشنیاز بکات بۆ خەڵکانی باش، (ابن عمر) گێڕاویەوە: (کاتێ حەفصەی کچی عومەر مێردی (خنیس بن حذافة السهمي) مردو بوبە بێوەژنو سەحابی یەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو لەمەدینەدا مرد، عومەر دەڵێ: هاتمە لای عوسمان کوڕی عەففان حەفصەم پێشنیاز کرد، وتی: دوایی بیری لێ دەکەمەوە، ڕۆژانێ مامەوە، دوایی بینیمەوە، وتی: جارێ ژن ناهێنم.

ئەبوبەکری سیددیق تووش هاتم، وتم: گەر مەبەستتە حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەبڕم، ئەبوبەکر قسەی نەکردو وەڵامی نەدامەوە، زیاتر لەئەبوبەکر رقم داگرت نەك لەعوسمان، چەند ڕۆژانێ مامەوە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) داخوازی کردو لێم مارە بڕی، پاشان ئەبوبەکرم تووش هاتو وتی: ڕەنگە کاتێ حەفصەت پێشنیازی من کردوو منیش وەڵامم لەدەست نەنایت تووڕە بووبی؟ عومەر وتی: بەڵێ. ئەبوبەکر وتی: بۆیە وەڵامم نەدایەوە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم مەسەلەیەی لای من باس کردبوو، نەم ویست نهێنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاشکرا بکەم، گەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی لێ هەڵگرتبایە داخوازیم دەکرد)[٢].

## سەیرکردنی داخوازی کراو (المخطوبة):

گەر کەسێ ویستی ژنێ داخواز بکات، شەریعەت ڕێگای داوە سەیری بکات بەر لەمارەکردنی دا، (محمد بن مسلمه) دەڵێ: (ژنەکم داخواز کرد، خۆم بۆ مەڵاس دەدا تا لەناو دارخورماکانی دا بیبینم، نەفەرێ وتی: چۆن کاری ئاوا دەکەیو تۆ یاری پێغەمبەری خوا بیت (ﷺ)؟ وتی: لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە: (گەر کەسێ کەڵکەڵەی ژنەکی چووە داڵغەوە داخوازی بکات قەیدی نییە گەر سەیری بکات)[٣].

---

(١) (ص.ت ٨٦٦) ت(٢/٢٧٤/١٠٩١).

(٢) صحيح (ص. نس ٣٠٤٧) خ(٩/١٧٥/٥١٢٢) نس(٦/٧٧).

(٣) صحيح (ص.جة ١٥١٠) جة(١/٥٩٩/١٨٦٤).

موغیرەی کوڕی شوعبە دەڵێ: (هاتمە لای پێغەمبەر (ﷺ) باسی ژنەکم لا درکاند کە بە نیازم داوای بکەم، فەرمووی: (بڕۆ سەیری بکە، ئەوە باشترە کە خۆشەویستیو لەنێواندا پەیدا بکات)[1].

## داخوازی کردن (الخطبة):

داخوازی کردن: داواکردنی ئافرەتە بەو نەریتەی لەنێوان خەڵکی دا باوە، گەر رازی بوون ئەوە تەنیا بەڵێنەکە رووتە بە هاوسەرگیری، دروست نییە داخوازیکار هیچ لەگەڵ داخوازیکراودا بکات، چونکە تا مارەی نەکاو نەبێ بەدەستگیرانی هەر بێگانەیە لەراست ئەودا. نابێ گەر کچێ داخوازی کرا کەسێکی تر بە سەر ئەودا داخوازی بکات لەفەرموودەدا هاتووە (پێغەمبەر (ﷺ) رێگای نەداوە کڕینو فرۆشتن لەسەر کڕینو فرۆشتنی یەکتری دا بکەن، پیاو نابێ بە سەر داواکردنی براکەیدا بۆ ئافرەتێ ئەویش داوای بکات تا بەر لەئەو وازی لێ دێنێ یان ئەو داخوازیکارە رێگای پێ دەدات)[2].

هەروەها رەوانیە بۆ پیاو داخوازی ژنێ بکات کە لەعیددەی تەڵاقی رەجعی دایە، چونکە هێشتا ژنی کابرایە، دیسان دروست نییە بە ئاشکراییو روونی داخوازی لەرووی ژنێ بدرێ کە تەڵاقەکەی بائینەیە، یان لەعیددەی مێرد مردندایە، بەڵام پەلارو ناراستەوخۆ لەروودانی یان (التعریض) قەیدی نییە، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاء أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ﴾[3]. واتە: گوناهتان ناگاتێ لەوەدا کە ناڕاستەوخۆ داخوازی لەرووی ژنان بدەن، یان لەدڵی خۆتاندا شاردبێتەوە.

## گرێ بەستی مارە بڕین( عقد النكاح ):

روکنەکانی مارە بڕین (الإيجاب والقبول)ە. مەرجەکانی دامەزرانی ئەمانەن:

(١) رێگا پێدانی سەرپەرشتیاری(الولي): عائیشە گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

---

(١) (ص.ت ٨٦٨) ت(١٠٩٣/٢/٢٧٥) نس(٦/٦٩).

(٢) صحيح (ص. نس ٣٠٣٧) خ(٥١٤٢/٩/١٩٨) نس(٦/٧٣).

(٣) البقرة: ٢٣٥.

(هەر ژنێ سەرپەرشتیار مارەی نەکات مارە بڕینی بەتاڵە، مارەکردنی بەتاڵە، مارە کردنی بەتاڵە، گەر کاری جووت بونی لەگەڵ دا کرد ئەو کاتە مارەیی بەو هۆیە حەڵاڵ دەکات، گەر سەرپەرشتیاران لەمارەکردنی دا بە داوا هاتن فەرمانڕەوا سەرپەرشتیاری ئەو کەسەیە بێ سەرپەرشتیارە) [(١)].

(٢) ئامادەبونی دوو شاهێد(گەواهیدەر): پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا نكاح الا بولي وشاهدي عدل). واتە: مارەبڕین دانامەزرێ بەسەرپەرشتیارو دوو شاهیدی دادگەر نەبێت.

واجبی وەرگرتنی پرس لەئافرەت بەر لەهاوسەرگیری:

گەر مارەبڕین بەسەرپەرشتیار نەبێ دانەمەزرێ، ئەوە واجبە ئەو سەرپەرشتیارەی ئەو کچەی یان ئەو ئافرەتەی لەبازنەی سەرپەرشتیاری دایە بەر لەمارەبڕینی پرسی پێ بکات، دروست نییە ناچاری بکات گەر رازی نەبێ، گەر ئەو نارازی بێ و مارەی بڕەرێ بۆی هەیە مارەکردنەکە هەڵوەشێنێتەوە:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تنكح الأيم حتى تستأمر، ولا تنكح البكر حتى تستأذن). واتە: بێوەژن مارە ناکرێ تا فەرمانی لێ وەرنەگیرێ، کچیش مارە ناکرێ تا روخسەتی لێ وەرنەگیرێ.

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) روخسەت لێ وەرگرتنی چۆنە؟

فەرموی: (گەر دەنگی نەکرد) [(٢)].

(خنساء بن خدام الأنصاري) دەڵێ: (باوکی ئەوی بە مێرد دەدات بێوەژن دەبێ، پێ ی ناخۆش دەبێ، دێتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش مارەکردنەکەی رەت کردەوە) [(٣)].

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (کچێ هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) باسی کرد، کە باوکی ئەوی بە شوو داوە، خۆشی حەز ناکات، پێغەمبەر (ﷺ) سەرپشکی کرد) [(٤)].

---

(١) صحيح: (ص.جه ١٥٢٤) جة (١/٦٠٥/١٨٧٩).

(٢) متفق عليه: خ(٩/١٩١/٥١٣٦) م(٢/١٠٣٦/١٤١٩).

(٣) صحيح: (الارواء: ١٨٣٠) (خ ٩/١٩٤/٥١٣٨).

(٤) صحيح (ص.جه ١٥٢٠) د(٦/١٢٠/٢٠٨٢) جه(١/٦٠٣/١٨٧٥).

## وتاری ژن مارەبڕین

لەکاتی مارەبڕیندا سوننەتە وتارێ بدرێ کە بە وتاری (الحاجة) ناسراوە کە شێوازەکەی ئاوایە: (ان الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيآت اعمالنا،من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾[1]. ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾[2]. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا﴾[3].

(اما بعد: فان اصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار) [4].

## سوننەتە پیرۆزبایی لەهاوسەرگیریەکە بکرێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ پیرۆزبایی دەکرد دەیفەرمو: (بارك الله لكم، وبارك عليكم وجمع بينكما فى خير) [5]. واتە: خوا پیرۆزی بکات، بەرەکەت برژێنێت بەسەرتاندا ژیانەکی خۆش پێکەوە بەسەر ببەن.

## مارەیی( الصداق ):

﴿وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا﴾[6].
واتە: مارەیی بدەن بە ژنەکان وەکو دیاری یەك، گەر دڵنیان بۆ ئێوە لەبەشێ لەو مارەیی یە بۆوە.

---

(١) آل عمران: ١٠٢.
(٢) النساء: ١.
(٣) الأحزاب: ٧٠.
(٤) رابردو لەوتاری هەینی دا باسکرا.
(٥) صحيح (ص.جه١٥٤٦) جه(١٩٠٥/٦١٤/١)..
(٦) النساء: ٤.

**بە تێرو تەسەلی بیخۆن.**

مارەیی مافی ژنە لەسەر پیاوو ماڵی ژنە، کەس بۆی نییە دەستی بۆ ببات، چونکە حەرامە، هەتا باوكو کەسانی تریش، مەگەر ئافرەت، خۆی دڵی لەو برەیە ببێتەوە بۆ دانی بە ئەوان. شەریعەت سنووری بۆ کەمو زۆری مارەیی دا نەناوە، بەڵام هاندانی تێدایە کە ئەو مارەیی یە کەم بێو گران نەکرێ، تا کاری هاوسەرگیری ئاسان بێو گەنجان دووچاری ئەوە نەبن بۆیان هەڵنەستێت.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئًا﴾[1]. واتە: گەر ویستتان ژن تەڵاقبدەنو ژنەکی تر بێننو یەك قینتار زێڕتان پێ دا بێ هیچی وەرمەگرنەوە. (عبدالرحمن بن عوف) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) شوێنەواری زەرد هەڵگەڕانی پێوەبوو (وەکو زەعفەرانو بۆنی تر) پێغەمبەر (ﷺ) لێی پرسی ئەوە چییە؟ وتی: ژنەکی ئەنصارم خواستووە، فەرمووی: (چەندت زێڕ بۆ کردووە؟ وتی: کێشی ناوکێ (النواة). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أولم ولو بشاة)[2].

(سهل بن سعد) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) لەناو خەڵکی دا بوو منیش لەوێ بووم، ژنێ هەڵساو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم ژنە خۆی پێشکەش بە تۆ کردووە، رات چی یە؟ هیچی وەڵام نەدایەوە، پاشان هەڵساوە پێو وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم ژنە خۆی پێشکەش بە تۆ کردووە، رات چی یە؟ جاری سێ یەم هەڵساوە سەر پێو وتی: ئەم ژنە خۆی پێشکەش بە تۆ کردووە رات چی یە؟ پیاوێ هەڵسا پێو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەمنی مارە ببڕە. فەرمووی (ﷺ) چیت هەیە؟ وتی: نەء. فەرمووی: بچۆ گەر ئەنگوستیلەیێ ئاسن هەبوو دەستت کەوت بیهێنە، ئەویش چوو، پاشان هاتەوەو وتی: هیچم دەست نەکەوت هەتا ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش. فەرمووی: ئایا هیچت قورئان لەبەرە؟ وتی: فلان سورەتو سورەتم دەرخە؟ فەرمووی: برۆ

---

(١) النساء: ٢٠.

(٢) متفق عليه: (خ ٥١٥٣/٢٢١/٩) م(١٤٢٧/١٠٤٢/٢). تێبینی: (نواة من الذهب) پێنج دیرهەمە، هەم پێ ی دەوترێ (٤٠) وەقە. (الوليمه) خواردنی شاییو زەماوەندی بوكو زاوایە. (وەرگێڕ).

بەو ئایەتانەم مارە بڕی لەتۆ کە لەقورئاندا دەرخت کردون فێری ئەویان بکەیت)[1].

دروستە مارەیی یەکە هەمووی پێش بخرێ یان دوا بخرێ، یان هەندێ زوو بکرێو هەندێ دوا بخرێ، گەر چووە لایو هیچی بۆ نەکرد دروست دەبێ، بەڵام دەبێ مارەیی هاو وێنەی (المهر المثل)ی بۆ بکات، مادام هیچ مارەیی بۆ بڕیار نەدابێت، بەڵام گەر مارەیی بۆ بڕیار دابێ ئەوە ئەو بڕەیەی پێ دەدات، هۆشیاری توند دراوە لەمەڕ ئەو کەسەدا مەرجەکە جێبەجێ ناکات، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (احق ما اوتیتم من الشروط ان توفوا بە ما استحللتم بە الفروج)[2]. لەهەمو مەرجێ لەپێشتر کە پێویستە جێبەجێ بکرێ ئەو مارەیی یە داوێنەکانی پێ ڕەواکراوە.

گەر مێردەکە مرد دوای مارە کردنەو بەر لەوەی سەر جێگای لەگەڵ ژنەکەدا بکات ئەو ژنە مارەیی تەواو دەکەوێت:

(علقمە) گێڕاویەوە: (عبدالله) ژنەکی هێنا، کە پێش وی مێردی بە پیاوێ کرد بوو دەمرێو هیچ مارەیی یەکی بۆ بڕیار نەدابوو ژنەکەی نەگواستبۆوەو نەچوو بوو لای، وتی: لەسەر ئەم مەسەلەیە ناکۆکی یان بۆ پەیدابوو. وتی: من پێموایە مارەیی هاو وێنەی (المثل)ی هەیەو میرات دەگرێو عیددەی لەسەرە، (معقل بن سنان الأشجعي) شاهیدی بۆ دا، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەراست (بروع بن واشق) هەمان فتوای دا)[3].

## کەی سوننەتە ژن بگوازرێتەوە؟

عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) منی لە مانگی شەووال مارەکردو لەشەووالدا منی گواستەوە: کام ژنانەی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو من ئەو شانسەیان هەبوو؟ ئەو حەزی دەکرد لەشەووالدا بڕواتە لای ژنەکانی)[4].

(١) متفق علیە: خ(٩/٢١٧/٥١٤٩) م(٢/١٠٣٥/١٤١٨).

(٢) متفق علیە: خ(٩/٢١٧/٥١٥١) م(٢/١٠٣٥/١٤١٨).

(٣) صحیح (الارواء: ١٩٣٩) (ت ٢/٣٠٦/١١٥٤).

(٤) صحیح جە (١٦١٩) م(٢/١٠٣٩/١٤٢٣) (نس ٦/١٣٠) جە (١/٦٤١/١٩٩٠).

## كاتێ زاوا چووە لای بوك سوننەتە چی بكات:

سوننەتە قسەی نەرمو خۆشی لەگەڵدا بكات، وەك ئەوەی شەربەتو شتێ خواردنەوەی پێشكەش بكات. (اسماء بنت يزيد) دەڵێ: (من عائیشەم بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) كرد بە بووكو جوانم كرد، پاشان هاتمە لایو بانگم كردو بۆ شیرینی دان بە بووك، هات لەتەنیشت بووكدا دانیشت ستڵەكی شیر هێنا لێ ی نۆشی پاشان دایە دەست بووك، ئەویش سەری داخستو شەرمی كرد، ئەسماء دەڵێ من پێ ی هەڵشاخامو وتم: لەدەستی پێغەمبەری (ﷺ) وەربگرە، ئەنجا لێ ی وەرگرتو خواردیەوە)[1]. سوننەتە دەستی لەسەر پێشە سەری دابنێو ناوی خوا بێنێو دوعای پیرۆزیو فەڕ بكات، (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر یەكێ لەئێوە ژنی هێنا، یان خزمەتكارێكی كڕی با پێشە سەری بگرێو ناوی خوای گەورە بێنێو دوعای بەرەكەت بكاتو بڵێ: (اللهم اني اسألك من خيرها وخير ما جبلتها عليه، واعوذ بك من شرها وشر ما جبلتها عليه)[2]. سوننەتە دوو ركەعەت نوێژ بكرێ، چونكە لەپێشینەكانەوە دوو بەسەرهات هەیە:

(١): (ابي سعيد) مەولای (ابی اسید) گێڕاویەوە: (من ژنم هێناو كۆیلە بووم، بانگێشەی كۆمەڵێ لەئەسحابی پێغەمبەرم (ﷺ) كرد، لەوانە (ابن مسعود)و (ابو ذر)و (ابو حذيفة)، كاتی نوێژ هات، ئەبو زەڕ چوو پێش بكەوێ، ئەوان وتیان: ئەوە بۆ تۆیە! وتی: ئەوە ئاوایە؟ وتیان: بەڵێ. دەڵێ: من پێش كەوتمو هەر چەندە كۆیلەش بوم، فێریان كردمو وتیان: گەر خێزانت هاتە ژوور، دوو ركەعەت نوێژ بكە، پاشان داوا لەخوا بكە كە هاتنە ژووری خێری هێنا بێ، داوای پەنا گرتن بكە لەخوا لەزیانەكانی ئەو پاشان دەست بە خۆتو خێزانتەوە بگرە)[3].

(٢): (شقيق) گێڕاویەوە: پیاوێ هات پێ ی دەوترا (ابو حريز)و وتی: من كەنێزەیەكی لاوو كچم كردووە بە هاوسەرم، من لەوە دەترسم تورەم بكاتو بمرەنجێنێت.

(عبدالله بن مسعود) فەرموی: (ئولفەت لەلایەن خواوەیەو رەنجان لەلایەن شەیتانەوەیە، كە دەیەوێ ئەوەی خوا بۆی حەڵاڵ كردبن لەبەر چاوان رەشو ناشیرین بكات، گەر هاتە ژوانت: داوای

---

(١) احمد (٦/٤٣٨و ٤٥٢/٤٥٣، ٤٥٨) بة دريَذي. آداب الزفاف للألباني.

(٢) حسن (ص.جه ١٥٥٧) جه(١٩١٨/٦١٧/١:).

(٣) سنده صحيح (آداب الزفاف) ٢٣/ ابن ابي شيبة/٣١٢/٤.

لێ بکە دوو رکەعەتت لەپشتەوە بکات). (ابن مسعود) دەڵێ: بڵێ: (اللهم بارك لي في اهلي وبارك لهم فيّ، اللهم اجمع بيننا ما جمعت بخير وفرق بيننا اذا فرقت الى خير).

پێویستە لەکاتی کرداری جوت بوون بڵێ: (بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان، وجنب الشيطان ما رزقتنا). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (گەر منداڵیان لەنێواندا بڕیاردرا هەرگیز شەیتان زیانی لێ نادات) [١].

بۆی دروستە لەهەموو جێگایەکەوە بۆ زێ ی ژن بچێ، لەپێشەوەوە یان لەدواوە: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾[٢].

(جابر -ر-) دەفەرمێ: (گەر جولەکەکان لەپشتەوە چووبانە لای ژنیان بۆ زێیان دەیانوت منداڵەکە خێل دەبێت، ئەنجا خودا ئایەتی: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾ی دابەزاندەوە خوارەوە.

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (ئەم دانیشتوانەی ئەنصار کە بت پەرست بوون لەگەڵ ئەم جولەکەیە کە ئەهلی کیتاب بون، ئەوان پێیان وابوو ئەوان رێزی زانستیان بەسەر ئەوانەوە هەیە، بۆیە لەزۆر لەکارەکانیاندا لاسایی ئەوانیان دەکردەوە، ئەهلی کیتاب لەتەنیشتەوە نەبا نەدەچونە لای ژنان، چونکە ئەوە بۆ ژنان پارێزەرترە، ئەم دانیشتوانو گەڕەکەی ئەنصارەکان ئەم نەریتەی ئەوانیان رەچاوکردبوو، بەڵام دانیشتوانی قوڕەیش ژنەکانیان پان رادەکرد بە راکشاوی یەکی نابەجێ لەپێشەوەو دواوەو بە راکشاوی چێژیان لێیان دەبینی، کاتێ کۆچکەران چوونە مەدینە، یەکێ لەوانە ژنەکی ئەنصاری یان یارمەتی دەرانی خواست، چوو تاوا لەگەڵی دا جووت بێ، ئەویش پەسەندی نەکرد، وتی: ئێمە لەسەر لاتەنیشت ئەم کارە دەکەین، گەر وادەکەی باشە گەر نا دەستم لێ مەدە، تا ئەم هەواڵە بڵاوبۆوە، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بیستەوە، خوای گەورە ئایەتی: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾[٣]. دابەزاند، واتە: هەر چۆنێکتان بوێ لەزێوە بۆ ژنتان بچن لەپێشەوەو دواوەو بە راکشاوی[٤].

---

(١) متفق عليه: خ(٨/١٨٩/٤٥٢٨) م(٢/١٠٥٨/١٤٣٥).

(٢) البقرة: ٢٢٣.

(٣) البقرة: ٢٢٣.

(٤) سنده حسن (ابو داود ٢/٢٠٤/٢١٥٠) (آداب الزفاف ٢٨).

وحەرامە لەکۆمەوە توخنی ژن بکەویّ: (من أتى حائضا او امرأة في دبرها او كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما انزل على محمد) [(١)].

واتە: هەر کەسێ توخنی ژنی بێ نوێژ بکەویّ یان لەکۆمەوە بڕواتە لای، یان بڕوا کاهینێ بەقسەکانی بکات ئەوە بڕوای بەوە نییە دابەزیوەتە سەر موحەممەد(ﷺ)).

دیسان پێویستە مەبەستی لەمارەکردنو ژن هێنانو شووکردن خۆپاراستن بێ لەتاوانە جنسی یەکانو شەرواڵ پیسی کە خوا حەرامی کردووە، ئەو کاتە کاری جووت بونیان بۆ بەچاکە دەنوسرێ: (ابو ذر) گێڕاویەوە: (دەستەیەك لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەوڵەمەندان هەمو پاداشتەکیان بۆ خۆیان بردوە، وەکو ئێمە نوێژ دەکەنو رۆژو دەگرنو بەهۆی دەوڵەمەندی خێری زۆر دەکەن، فەرموی: (ئەوە نیە خودا شتی وای بە ئێوەش داوە چاکەی پێ بکەن؟ هەر (سبحان الله) یەك خێرێکەو هەر (الله اكبر)ێ چاکەیەکەو هەر (لا اله الا الله) یەك چاکەیەکە هەر (الحمد لله)یەك چاکەیەکە، فەرمان کردن بە چاکە چاکەیەکە قەدەغە کردنی خراپەیەك چاکەیەکەو، کاری ژنو مێردایەتی ئێوە چاکەیەکە، وتیان: ئایا لەئارەزوو هەوەسی ئێمەش دا کاتێ وەلامی دەدەینەوە پاداشتی هەیە؟ فەرموی: (ئایا ئەگەر ئەو ئاوە لەحەرامدا دابنێ تاوانی ناکەوێتە سەر؟ هەر ئاواش گەر لەحەلاڵدا دابنرێ پاداشتی پێ دەگات) [(٢)].

## پێویستی شایی و زەماوەند (الوليمة):

پێویستە دوای چوونە لای، زەماوەندو خواردن (الوليمة) هەبێ، وەکو فەرمودەی رابردوی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ بە (عبدالرحمن ابن عوف)ی دەفەرمێت.

(بريده بن الحصيب) گێڕاویەوە: (کاتێ عەلی (س) فاطیمە ی (س) داخوازی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: پێویستە بووك زەماوەندی هەبێت) [(٣)].

---

(١) صحيح (الارواء/ ٢٠٠٦) جه(٦٣٩/٢٠٩/١) ت(١٣٥/١٩٠) (د: ٣٨٨٦/٣٨٩/١٠).

(٢) صحيح: (ص.ج ٢٥٨٨) م(١٠٠/٦٩٧/٢).

(٣) (ص.ج ٢٤١٩). أ(١٧٥/٢٠٥/١٦).

پێویستە ئەم داوەتو زەماوەندە چەند فەرمانەکی تێدا بێتە دی:

(١) دوای چوونە لا سێ ڕۆژ زەماوەند بێ، (پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ سەفی یەی کردە هاوسەر ئازادکردنی کردە مارەیی‌و سێ ڕۆژان زەماوەندو داوەت بوو)[١].

(٢) پیاوچاکان بانگی سەر داوەتو شایی بکات لەهەژارانو دەوڵەمەندان:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

(لا تصاحب الا مؤمنا، ولا يأكل طعامك الا تقي)[٢].

واتە: تەنیا هاوڕێیەتی بڕوادار بکەو با تەنیا مرۆڤی تەقواکار نانت بخوات.

(٣) شاییو داوەتەکەی بە مەڕێ یان زیاتر بێ، گەر تواني، (پێغەمبەر (ﷺ) بە (ابن عوف)ی فەرمو: (اولم ولو بشاة) وەکو باسکرا.

(انس) دەڵێ: نەمبینیوە پێغەمبەر (ﷺ) داوەتو زەماوەند بۆ ژنەکانی بکات جگە لەزەینەب نەبێ، بۆ ئەو مەڕێکی کردە زەماوەندو کوشتە)[٣].

دروستە داوەتو زەماوەند بەهەموو خواردنێ ببێ کە بگونجێ، با گۆشتیشی تێدا نەبێ، (انس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوان خەیبەرو مەدینەدا سێ ڕۆژ مایەوە (صفية بنت حيي) گواستەوەو موسڵمانانی بانگی داوەتو زەماوەندی کرد، کە نانو گۆشتی تێدا نەبوو، فەرمانی کرد سفرەی کەوڵیان ڕاخست خورماو کەشكو ڕۆنی لەسەر دانرا، ئەمە زەماوەندی ئەو بو)[٤]. دروست نییە تەنیا دەوڵەمەندان بانگ بکرێن، بێ لەهەژاران، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (خراپترین داوەتو شایی ئەو داوەتەیە کە ئەوانەی دێن بانگیان ناکرێو ئەوانەی نایەن بانگ دەکرێن، کێ نەچێ بۆ زەماوەندو داوەتەکە ئەوە سەرپێچی خواو پێغەمبەری (ﷺ) کردووە)[٥].

---

(١) سنده صحيح (آداب الزفاف ٧٤) اخرجه ابو يعلي سنده حسن كما في الفتح (٩/١٩٩).

(٢) حسن (ص.ج ٧٣٤١) د(١٣/١٧٨/٤٨١١).

(٣) متفق عليه: (م ١٤٢٨/٩٠/١٠٤٩/٢) خ(٥١٧١/٢٣٢/٩).

(٤) متفق عليه: (خ ٥١٥٩/٢٢٤/٩) م(١٣٦٥/١٠٤٣/٢).

(٥) متفق عليه: (م ١٤٣٢/١١٠/١٠٥٥/٢) خ(٥١٧٧/٢٤٤/٩).

وه‌كو له‌فه‌رموده‌ی رابردودا هاتووه‌ به‌ ده‌نگه‌وه‌هاتن واجبه‌، دیسان پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمویه‌تی: (كێ بانگ كرا بۆ داوه‌تو زه‌ماوه‌ند با وه‌ڵام بداته‌وه‌) [١].

گه‌ر به‌رۆژوش بێ ده‌بێ بۆ سه‌ر داوه‌تو زه‌ماوه‌نده‌كه‌ بچێ، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمویه‌تی: (اذا دعي احدكم الى الطعام فليجب، فان كان مفطرا فليطعم، وان كان صائما فليصل يعني الدعاء) [٢]. واته‌: گه‌ر یه‌كێ له‌ئێوه‌ بانگ كرا بۆ داوه‌ت با بچێ، گه‌ر به‌رۆژوو نه‌بوو با بخوات، گه‌ر به‌رۆژوو بو با دوعاو نزا بكات).

ده‌توانێ گه‌ر رۆژووه‌كه‌ سوننه‌ت بوو خاوه‌ن داوه‌ت زۆری لێ كرد رۆژوه‌كه‌ بشكێنێ، وه‌كو (ﷺ) فه‌رمویه‌تی: (گه‌ر یه‌كێ له‌ئێوه‌ بانگی داوه‌تو شیوخواردن كرا با بچێ، گه‌ر ویستی با بخوات، گه‌ر نا با وازی لێ بێنێت) [٣].

ئه‌و كه‌سه‌ی ئاماده‌ی داوه‌تو شایی ده‌بێ دوو شتی له‌سه‌ر ئه‌ركه‌: (١) دوای داوه‌ت كردنه‌كه‌ بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی بپارێته‌وه‌ (أ): (اللهم اغفر لهم، وارحمهم، وبارك لهم فيما رزقتهم ـ خوا لێی ببوره‌و روحمیان پێ بكه‌و رۆزییان زیاتر بكه‌) [٤]. (ب): (اللهم اطعم من اطعمني، واسق من سقاني) [٥]. (ج): (أكل طعامكم الأبرار، وصلت عليكم الملائكة، وأفطر عليكم الصائمون) [٦].

(٢): بۆ هه‌ردوو هاوسه‌ره‌كه‌ نزای خێر بكات وه‌كو له‌پیرۆزبایی ماره‌كردن باسكرا. دروست نییه‌ گه‌ر داوه‌ته‌كه‌و ئاهه‌نگه‌كه‌ كاری بێ شه‌رعی تێدا بوو ئاماده‌ی بێ مه‌گه‌ر بیه‌وێ هه‌وڵبدات بێ شه‌رعی یه‌كه‌ لابدات، گه‌ر نا ده‌بێ بگه‌رێته‌وه‌، ده‌رباره‌ی ئه‌مه‌ چه‌ند فه‌رموده‌یه‌ك هه‌یه‌:

(١) له‌عه‌لی گه‌ڕاوه‌ته‌وه‌ (س): (خواردنم دروست كردو پێغه‌مبه‌ری خوام (ﷺ) بانگ كرد، هات وێنه‌ی له‌ماڵدا بینی گه‌ڕایه‌وه‌، وتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) به‌ دایكو باوكه‌وه‌ به‌ قوربانت بم، بۆچی گه‌ڕایه‌وه‌؟ فه‌رموی:له‌ماڵدا په‌رده‌یه‌ك هه‌یه‌ وێنه‌ی تێ دایه‌، فریشته‌ ناچنه‌

---

(١) متفق عليه: (خ ٥١٧٣/٢٤٠/٩) م(٢/١٠٥٢/١٤٢٩).
(٢) صحيح (ج ٥٣٩) (م ٢/١٠٥٤/١٤٣١).
(٣) صحيح (الارواء: ١٩٥٥) م(٢/١٠٥٤/١٤٣٠).
(٤) صحيح (مختصر م ١٣١٦) م(٣/١٦١٥/٢٠٤٢).
(٥) صحيح م (٣/١٦٢٥/٢٠٥٥).
(٦) صحيح (ص.ج ١٢٢٦) د(١٠/٣٣٣/٣٨٣٦).

مالێ وێنەی تێ دا هەبێت)[١].

کاری پێشینەکان لەسەر ئەمە رۆیشتووە: (ابي مسعود ـ عقبة بن عمرو) گێڕاویانەوە: (پیاوێ خواردنی ئامادەکرد بوو بانگی کردووە، وتی: ئایا لەماڵدا وێنە هەیە؟ وتی: بەڵێ. نەچووە داوەت تا وێنەکە شکێنرا ئەنجا چوو)[٢].

(بوخاری) گێڕاویەوە: (ابن عمر) (ابا ایوب) بانگ دەکات، لەماڵەوەیدا پەردەیەك دەبینێ لەسەر دیوار دانراوە وێنەیەکی تێ دایە، (ابن عمر) وتی: ژنەکانمان لەراست ئەوەدا دەستیان بەسەر دا رۆیشتین. وتی: ئەو کەسەی من لێ ی دەترسم ئەوەندەی تۆ لێ ی ناترسم، بە خوا خواردنی ئێوە ناخۆم، بۆیە رۆیشت). دروستە رێگا بەژنان بدرێ لەبووك کە هاوسەرگیریەکە جاڕ بدەن بە دەف لێدانو گۆرانی رەوا، کە وەسفی جوانیو باسی خراپی تێ دانەبێ، لەراست ئەوەشدا چەند فەرمودە هەیە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (اعلنوا النكاح)[٣]. واتە: هاوسەرگیریەکە جاڕ بدەن.

(ئەوەی حەڵاڵو حەرام لێك جیا دەکاتەوە دەفو دەنگە لەمارەبڕینو هاوسەرگیری)دا.

(خالد بن زكوان) گێڕاویەوە: (الرُّبيع بنت معوِّذ بن عفراء) گێڕاویەوە: (کاتێ من گوازرامەوە پێغەمبەر (ﷺ) هات، پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر جێگا دانیشت چۆن تۆ دانیشتووی، منداڵی کەنیزەمان هەبوو دەفیان لێ دەدا باسی کوژراوانی بابو باپیرانی ئێمەیان دەکرد کە لەبەدر کوژران، یەکێ وتی: پێغەمبەرێکمان هەیە لەناودا دەزانێ چی سبەی دەبێ، فەرموی: لەوە گەڕێ، ئەوەی دەتگوت ئەوە بڵێ)[٤].

سوننەتە گەر کچ بەسەر بێوەژن بێنێ حەوت رۆژ لای بمێنێتەوە ئەنجا رۆژان بەش بکات، گەر بێوەژنی بەسەر کچ هێنا سێ رۆژ لای بمێنێتەوە، پاشان رۆژەکان بەش بکات، (ابو قلابە) لە(انس) گێڕاویەوە. وە دەڵێ: (گەر بمەوێ دەڵێم: ئەنەس ئەوەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

(١) صحيح (٢٧٠٨) جه(٢/١١١٤/٣٣٥٩).
(٢) سنده صحيح (آداب الزفاف ٩٣) هق (٧/٢٦٨).
(٣) حسن (ص.جه ١٥٣٧) حب(٣١٣/١٢٨٥).
(٤) صحيح (الزفاف ١٠٨) خ(٩/٢٠٢/٥١٤٧).

گێڕاوەتەوە[١].

پێویستە بەرەوشتی جوانو حەلال مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بە تایبەتی گەر کچەکە تەمەنی کەم بێ، وەکو لەفەرمودەدا هاتووە: (خیرکم خیرکم لأهله وانا خیرکم لأهلي)[٢]. باشترینتان ئەو کەسەیە لەگەڵ خێزانی دا باش بێ، من لەهەمووکەس زیاتر لەگەڵ خێزانی خۆمدا باشم. (ئەوەی لەهەمو کەس رەوشت جوانترە لەهەمو کەس بڕوای پترە، باشترینتان ئەو کەسەیە لەگەڵ خێزانی خۆیدا باشە)[٣]. (پیاوی موسڵمان لەژنی موسڵمان تورە نابێ، گەر ناکارەکی ئەوی بە دڵ نەبێ لەئاکارەکی تری رازی دەبێت)[٤]. لەوتاری حەجیماڵئاوایی دا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (راتان دەسپێرم لەگەڵ ژناندا چاك بن، ئەوان لەگەڵ ئێوەدا یەخسیری ئێوەن، تەنیا خاوەنی ئەوەندەن لەئەوان، گەر خراپەیەکی ئاشکرا بکەن، گەر ئەوەیان کرد سەر جێگایان لەگەڵدا مەکەن، لێیان بدەن بێ ئەوەی ئازاریان پێ بگەیەنی، گەر بە گوێیان کردن پەیوەندیتان بەسەر ئەوانەوە نامێنیو وازیان لێ دێنن، بێگومان ئێوە چەند مافێکتان بەسەر ژنەکانەوە هەیەو ژنەکانیشتان چەند مافی بەسەرتانەوە هەیە، مافی ئێوە بەسەر ئەوانەوە ئەوەیە کەسێ خۆشیتان پێ نەیەت نەیهێننە ناو خانوو ماڵتانو رێگاش بە کەسێ نەدەن بێنە ماڵتان کە ئێوە حەز بە چارەی ناکەن، مافی ئەوانیش بەسەرتانەوە ئەوەیە خواردنو پۆشاکی یان بە تەواویو چاکی بۆ دابین بکەن)[٥].

پێویستە ئەو پیاوە فرە ژنە لەخواردنو خانوبەرەو پۆشاكو شەو مانەوەدا لایان دادگەر بێ، لەهەموو شتەکی تری ماددی دا، گەر یەکێ لەو ژنانە چاکتر خزمەت بکات لەئەوی تریانو خولیای پتری بێ ئەم هەڕەشەیەی پێغەمبەری (ﷺ) دەگرێتەوە: (هەر کەسێ دووژنی هەبێ مەیلی یەکێکیان پتر بکات، لەرۆژی پەسڵاندا لێویکی کەوتووە)[٦].

(١) صحيح (الزفاف ١٠٨) خ(٥١٤٧/٢٠٢/٩).
(٢) متفق علية خ(٥٢١٤/٣١٤/٩) م(١٤٦١/١٠٨٤/٢).
(٣) صحيح (ص.ج ٣٢٦٦) ت(٣٩٨٥/٣٦٩/٥).
(٤) صحيح (ص.ج ٣٢٦٥) ت(١١٧٢/٣١٥/٢).
(٥) حسن: (ص.جه ١٥٠١) ت(١١٧٣/٣١٥/٢).
(٦) صحيح (ص. جه ١٦٠٣) جه (١٩٦٩/٦٣٣/١).

بەڵام ئارەزووی دڵی ناکرێ کۆنترۆڵ بکرێ بۆیە گوناهی تێدا نییە:

﴿وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلاَ تَمِيلُواْ كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ﴾[1]. واتە: قەت ناتوانن یەکسانی لەنێوان ژنەکانتاندا بکەن گەر سووریش بن لەسەری. بە تەواوی مەیل مەکەن کە وەکو شتێکە هەڵواسراو دەست بەرداری بن.

پێغەمبەر (ﷺ) لەروانگەی ماددییەوە، جیاوازی نەکردووە لەگەڵ ژنەکانی دا بەڵام عائیشەی لەهەموان خۆشتر ویستووە:

عەمری کوڕی عاس گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر سوپای (ذات السلاسل)دا ڕەوانەی کرد، هاتمە لای‌و پێیم وت: کێت لەهەمو کەس خۆشتر دەوێ؟ وتی: عائیشە. وتم لەپیاوان؟ وتی: باوکی. وتم: دوایی کێ؟ وتی: عومەرو چەند ناوێکی ژمارد)[2]. تا چەند ژن بۆت هەیە بیانکەیتە هاوسەر؟

خوای گەورە لەسورەتی (النساء/٣)دا فەرمویەتی: ﴿فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ﴾.

## ئەو ژنانەی بۆتان ڕەوان مارە ببڕن دوو یان سێ یان چوار.

کاتێ (غیلان بن سلمه) موسڵمان بوو (١٠) ژنی هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی فەرموو: (امسك اربعا وفارق سائرهن)[3]. واتە: چواریان دەست پێوە بگرەو ئەوانی تر واز لێ بێنە.

(قیس بن حارث) گێڕاویەوە: (کاتێ موسڵمان بووم (٨) ژنم هەبوو هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەم لا باس کرد، فەرموی: (اختر منهن اربعا)[4]. واتە: چواریان لێ هەڵبژێرە.

---

(١) النساء: ١٢٩.

(٢) صحيح (ص.ت ٣٠٤٦) ت(٥/٣٦٤/٣٩٧٢).

(٣) صحيح (ص. جه ١٥٨٨) جه(٢/٦٢٨/١٩٥٢).

(٤) حسن صحيح (ص. جه ١٥٨٨) جه(١/٦٢٨/١٩٥٢).

**ئەو ژنانەی حەرامن بۆ هاوسەرگیری:**

**خودای مەزن دەفەرمووێ:** ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاء سَبِيلاً * حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا * وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُمْ أَن تَبْتَغُواْ بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ﴾النساء: ٢٢ ـ ٢٤.

واتە: مەکەن بە هاوسەر ئەو ژنانەی باوکانتان هێناویەتی، مەگەر لەرابردودا کرابێ، ئەمە گوناهەکی زلەو ناپەسەندەو ڕێگایەکی خراپە. لێتان حەرام کراوە دایکانتانو کچانتانو خوشکانتانو پلکتان (خوشکی باوك)و پلکتان (خوشکی دایکتان)و کچانی براو کچانی خوشكو دایکانی شیریتانو خوشکانی شیریتانو دایکانی خێزانتان (خەسو)و ئەو زڕ کچانەی لەماڵی ئێوەنو چوونە لای دایکتان، بەڵام گەر نەچووبنە لای دایکتان قەیدی نییە، ژنی کوڕەکانتان (بووك) کوڕی پشتنو هێنانی دوو خوشك پێکەوە مەگەر رابردو کرابێ، خودا لێ بوردەو بە بەزەیی یە. ئەو ژنانەی مێردیان هەیە، مەگەر کەنیزەکانتان.

**لەم ئایەتانەدا لەراست ژنە حەرامەکاندا دوو چەشن حەرامی بەدی دەکەین:**

(١) حەرامی هەمیشەیی: لەهەموو کاتەکاندا وەکو هاوسەر لەپیاو حەرامن.

(٢) حەرامی کاتی: تا ئەو کاتە حەرامن کە لەم بارە تایبەتە دانو گەر بارەکە نەما حەرام نامێنن.

هۆکارەکانی حەرامی هەمیشەیی: (پشتو خزمایەتی ژنان ـ المصاهرە ـ و شیردانە).

ئەوانەی بە پشت بە (النسب) حەرام دەبن:

(دایکان، کچان، پوورەکان لەباوکەوە، پوورەکان لەدایکەوە. کچانی براو کچانی خوشك).ئەو ژنانەی بە تێکەڵاوی ژنان (المصاهرە) حەرام دەبن: (١) خەسوو: مەرج نییە کچەی

چووبیە لای هەر بە مارەکردنی کچەکانی لەتۆ لەحەرام دەبن.

(٢) زڕ کچ کە چووبیە لای دایکی، گەر دایکەکەی مارە کرابیێو نەچووبیە لای کچەکەی حەلاڵ دەبێت: ﴿فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾[1].

(٣) ژنی کوڕ (بووك) بە مارەکردنێکی حەرام دەبێت.

(٤) زڕ دایك: هەر بە مارەکردنی لەلایەن باوکەوە لەکوڕەکەی حەرام دەبێت.

سێ یەم: ئەو ژنانەی بە هۆی شیردان (الرضاع) حەرام دەبن. ﴿وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ﴾[2].

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (الرضاعة تحرم ما تحرم الولادة) [3]. واتە: منداڵ بون چی حەرام دەکات شیردان حەرامی دەکات.

ئەو کەسەی شیر لەژنەکی تر دەخوات بۆی نییە ئەم ئافرەتە بخوازێ:

(١) دایکی شیریی.

(٢) دایکی شیردەر.

(٣) دایکی مێردی ژنە شیردەرەکە.

(٤)خوشکی شیردەرەکە.

(٥) خوشکی مێردی شیردەرەکە.

(٦) کچانی کوڕانو کچانی.

(٧) خوشکی شیریی.

---

(١) النساء: ٢٣.

(٢) النساء: ٢٣.

(٣) متفق عليه: (خ ٥٠٩٩/١٣٩/٩) م(١٤٤٤/١٠٦٨/٢).

## ئەو بڕە شیرەی حەرام بوونی پێ دادەمەزرێت:

عائیشە(رضي الله عنها) گێڕاویەوە: (لا تحرم المصة او المصتان) [١]. واتە: قومێكو دوو قوم (یان مژینەكو دوو مژین) حەرامی ناكات.

(لا تحرم الرضعة او الرضعتان، او المصة او المصتان) [٢].

واتە: ژەمێ یان دوو ژەم، یان مژینەك یان دوو مژین حەرام ناكەن.

عائیشە دەڵێ: (كاتێ قورئان دابەزی دە ژەمی زانراو بوو حەرامی دەكرد، پاشان بە (پێنج ژەم) نەسخ بۆوەو كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی كرد، ئەوانە لەقورئاندا دەخوێنرانەوە) [٣].

یەكێ لەمەرجەكانی حەرام كردن ئەوەیە شیردانەكە لەدوو ساڵەكەی دابێ:

﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾[٤]. واتە: دایكان دوو ساڵی رەبەق شیر بە منداڵیان دەدەن بۆ كەسێ بیەوێ ماوەی شیردانەكە تەواو بكات. (ام سلمە) گێڕاویەوە: (لا يحرم من الرضاع الا ما فتق الأمعاء في الثدي وكان قبل الفطام) [٥]. واتە: شیردان نابێ بە حەرام كەر تا نەڕواتە ناو ریخۆڵەكانەوەو بەر لەشیر كردنەوەی منداڵ بێت. (كە دوو ساڵە/ وەرگێڕ).

ئەو ژنانەی بە كاتی حەرام دەبن:

(١) **دوو خوشك پێكەوە:** ﴿وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾[٦]. وەكو باسكرا.

---

(١) صحيح (ص: ١٥٧٧) م(١٤٥٠/١٠٧٣/٢).

(٢) صحيح (مختصر مسلم ٨٧٨) (م١٤٥١ ـ٢٠ /١٠٧٤/٢).

(٣) صحيح: مختصر (م ٨٧٨) م(١٤٥٢/١٠٧٥/٢)..

(٤) البقرە: ٢٣٣. تێبینی: شیری دایك لەم دوو ساڵە دا زۆر سوودی دەروونیو دروستی بۆ كوڕو دایك هەیە، كە لەشیری قتودا بەدی ناكرێن، خواردنەكی تەواوەو ئەگەری پیس بوونی كەمەو لەهەموو جێگایەك ئامادەیەو پێویستی بە كوڵاندنو شوشەو ئامادەكردن نییە. زوو هۆڕمۆنەكانی دایك منداڵدان دەخاتەوە جێگای خۆیو ئەگەری تووش هاتنی دایك بە شێرپەنجەی مەمك كەمتر دەكاتەوە. ئەو منداڵەی شیری دایكی دەخوات تووشی سك چوون نابێت. بڕوانە (دلیل المرأة الطبي/ دیڤید رورفیك/ ل: ١٤٧) بە كورت كردنەوە. (وەرگێڕ).

(٥) صحيح (الارواء: ٢١٥٠) ت(١١٦٢/٣١١/٢).

(٦) النساء: ٢٣.

**(٢) ژن لەگەڵ پووری (پلکی)دا پێغەمبەر:** (ﷺ) فەرمویەتی: (نابێ ژن لەگەڵ خوشکی باوکی دا یان خوشکی دایکی دا پێکەوە کۆبکرێنەوە)[١].

**(٣) ژنی بە مێردو ئەوەی لەعیددەی دایە:**﴿ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا مَلَكَتْ﴾[٢].

واتە: ژنانی بە مێرد لەئێوە حەرامن تەنیا کەنیزەکان نەبێ کە دوای (الإستبراء) گەر بە مێردیش بن حەڵاڵ دەبن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپایەکی ناردە سەر (ئەوتاس)و تووشی دوژمن هاتن‌و لەگەڵی دا کەوتنە شەڕەوەو بەسەریاندا زاڵ بوون‌و منداڵ‌و ژنیان لێ بە دیل گرتن، چونکە ژنەکان بە مێرد بوون، هەندێ لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ) شەرمیان کرد نزیکی ئەو ژنانە بکەون چونکە مێردیان هەبوو کە بت پەرست بوون، ئەنجا خوا ئایەتی نارد: ﴿ والمحصنات من النساء إلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾[٣]. واتە: ئەوانە دوای تەواو کردنی عیددەیان بۆ ئێوە حەڵاڵ دەبن)[٤].

**(٤) ژنی تەڵاقدراو سێ بەسێ:** بۆی نییە بە مێردی یەکەم شوو بکاتەوە تا بە مارەکردنەکی دروست مێردەکی تر نەکاتەوە: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا﴾[٥].

**(٥) هاوسەرگیری کردن لەگەڵ ژنێ لەش فرۆش‌و داوێن پیس دا:** حەڵاڵ نییە مەگەر هەردولا تۆبە بکەن: ﴿الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾[٦].

واتە: (پیاوی زیناکار ژنەکی زیناکار یان موشریك نەبێ مارە ناکات، ژنی زیناکاریش مێرد بە پیاوەکی زیناکارو موشریك نەبێ ناکات، ئەمە لەسەر بڕواداران حەرامە). (عمرو بن شعیب) لەباوکی ئەویش لەباوکی گێڕاویەوە: ((مرثد بن ابي مرثد الغنوي) دیلەکانی هەڵدەگرت

---

(١) متفق عليه: (خ ٥١٠٩/١٦٠/٩) م(١٤٠٨/١٠٢٨/٢).

(٢) النساء: ٢٥.

(٣) النساء: ٢٤.

(٤) صحيح (مختصر م ٨٣٧) (م ١٤٥٦/١٠٧٩/٢)..

(٥) البقرة: ٢٣٠.

(٦) النور: ٣.

لەمەککەوە، لەمەککەدا لەش فرۆشێ هەبوو بە ناوی (عەناق) دۆستی ئەو بوو. وتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا عەناق مارە ببڕم؟ وتی: بێ دەنگ بوو. ئەنجا ئایەت لەشانی من دابەزی ﴿وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ﴾، ئەنجا بانگی کردمو بۆی خوێندمەوەو فەرموی: مارەی مەکە) [١].

## ئەو مارەکردنانەی بەتاڵن:

**(١) ژن بە ژن (نكاح الشغار):** ژن بەژن ئەوەیە کە پیاو کچی خۆی یان خوشکی بدات، یان کەسێکی تر بدات کە سەرپەرشتە بەسەریەوە بدات بە کەسێ، لەبەرامبەر ئەوەدا ئەویش کچی خۆی یان خوشکی یان کچی خوشکیو هی تر بکاتە هاوسەری خۆی یان کوڕی یان کوڕی برای. ئەم مارەبڕینە بەو پێو دانگە بەتاڵە، چ مارەیی تێدا بێ، یان نەبێت[٢].

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نکۆڵی لێ کردووەو هۆشیاری لێ داوە: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾[٣]. (ابن عمر) گێڕاویەوە: (ان النبی (ﷺ) نهی عن الشغار). واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ژن بە ژنی قەدەغە کردووە. لە(صحیح مسلم)دا هاتووە لە(ابو هریرە)وە پێغەمبەر (ﷺ) ژن بە ژنی حەرام کردووە، ژن بە ژن ئەوەیە پیاو بە پیاو بڵێ: (کچی خۆتم بدەیە من کچی خۆمت دەکەمە هاوسەر، یان خوشکی خۆت بکە هاوسەرم، منیش خوشکی خۆم دەکەمە هاوسەری تۆ) [٤].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ژن بە ژن لەئیسلامدا نییە) [٥].

ئەم فەرمودانە کە راستن ئەوە دەردەخەن ژن بە ژن بەتاڵەو پێچەوانەی شەریعەتی خوایە، پێغەمبەر (ﷺ) جیاوازی نەکردووە لەنێوان ئەو ژن بە ژنەی مارەیی تێدایە یان مارەیی

---

(١) حسن الإسناد (ص. نس ٣٠٢٧) نس(٦/٦٦) ت(٣٢٢٧/١٠/٥).

(٢) تێبینی: بەڵام لای هەندێ زانایان ژن بە ژن مادام هەر چوار دڵ رازی بن دروستە،

() الحشر: ٣.

(٤) صحيح (مختصر م ٨٠٨) م(١٤١٦/١٠٣٥/٢).

(٥) صحيح (ص.ج ٧٥٠١) م(١٤١٥ ـ ٦٠ /١٠٣٥/٢).

تێدانییە.

بەڵام لێکدانەوەی (ابن عمر) لەلێکدانەوەی ژن بە ژن: (ئەوەیە پیاو کچی خۆی بدات بە کەسێ تا کچی خۆی لێ مارە بکات، بێ ئەوەی مارەیی تێدا بێ) زانایان دەڵێن: ئەمە قسەی (نافع)ە لە(ابن عمر)ەوەو قسەی پێغەمبەر (ﷺ) نییە. پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەی رابردوی ئەبو هورەیرەدا لێکی داوەتەوە، ئەمەیە پیاو کچی یان خوشکی خۆی دەکاتە هاوسەری کەسێ، لەبەرامبەر ئەوەدا ئەویش کچی یان خوشکی خۆی بداتێ‌و باسی مارەیی نەکردووە. کەواتە: بوونی مارەیی لەمەدا هیچ ئاسەوارێکی نییە[1].

ئەوەی لێرەدا مارەکردن بەتاڵ دەکاتەوە ئاڵوگۆڕکردنەو لەمەشدا خراپەیەکی زۆر هەیە، چونکە دەبێتە هۆی ناچارکردنی ژنان بە هاوسەرگیری کردن لەگەڵ کەسانێ دا کە ئارەزوویان ناکەن، کە بەرژەوەندی سەرپەرشتیاران دەخاتە پێش بەرژەوەندی ژنانەوە، ئەمەش پەسەند نی یەو ستەمێکە لەژنان، دیسان ژنان بێ بەش دەکات لەمارەیی هاو وێنەی خۆیان، وەکو چۆن لەناو ئەو خەڵکانەدا رودەدات کە ئەم مارەکردنە خراپەیە ئەنجام دەدەن، مەگەر خوا حەز نەکات، دیسان دوای هاوسەرگیرییەکە کێشەو دوژمنایەتی زۆر پەیدا دەکات‌و ئەو کەسانەی پێچەوانەی شەرع دەجولێنەوە، خوا زووتر توشی سزایان دەکات).

**(٢) مارە بەجاش (نكاح المحلل):** ئەوەیە هەڵدەستێ ژنێکی لەخۆ مارە دەبڕی، سێ بەسێ تەڵاقدراوەو عیددەی تەواو کردووە، پاشان تەڵاقی دەداتەوە تا بۆ مێردی یەکەم حەڵاڵ بکرێتەوە. ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە گوناهەکی گەورەیەو دروست نییە، ئەگەر بە مەرج دابنرێ لەمارەکردنەکەدا یان بەر لەمارەکردنەکەدا بە مەرج دابنرێ، یان بکرێ بە نیاز لەدڵدا ئەوە بکەرەکەی نەفرین لێ کراوە.

لەعەلی (ﷺ) گەڕاوەتەوە: (لعن رسول الله (ﷺ) المحلّل والمحلَّل له)[2]. واتە: پێغەمبەری

---

(١) تێبینی: بەڵام زۆربەی مەزهەبەکانی ئیسلام بەم مانایە وەسفی ژن بە ژن دەکەن کە ژن بە ژنەکە مارەیی تێدا بڕیار نەدرێ، دیارە کە (ابن عمر) زاناتر بووە.

(٢) صحيح (ص.ج ٥١٠١) د(٢٠٦٢/٨٨/٦) جە (١٩٣٥/٦٢٢/١).

خوا (ﷺ) نەفرینی کردووە لەو کەسەی مارە بە جاش دەکاتو ئەو کەسەی مارە بە جاشی بۆ دەکرێت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (پێتان بڵێم نێریی(بزن) داخوازی کراو چیە؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرموی: مارە بە جاشکەرە، خودا نەفرینی لەبابای مارە بەجاش کەرو مارە بە جاش بۆکراو کردووە) [1].

(پیاوێ هاتە لای (ابن عمر) لەراست ژنێ پرسیاری لێ کرد کە سێ جار ژنەکەی تەڵاقداوە، برایەکی ئەو بەبێ قسەی مارەی دەکاتەوە تا بۆ برایەکەی حەڵاڵ بکاتەوە، ئایا بۆ مێردی یەکەم دروست دەبێتەوە؟ وتی: نەء دەبێ مارەکردنەکە بە ئارەزوو بێ، ئەوەمان لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بە ـ سیفاح ـ ناودەبرد) [2]. واتە: داوێن پیسی.

**(٣) سیغە (المتعة):** پێشی دەوترێ ژن هێنانی کاتی، یان پچڕاو، ئەو ژن هێنانەیە کە بۆ ماوەی ڕۆژێ یان هەفتەیەك یان مانگێ، یان ماوەیەکی تری دیاری کراو ژنەکە دەکرێتە هاوسەر[3] . ئەم هاوسەرگیرییە لای ئەهلی سوننە نەسخ کراوەیەو گەر مارەکرا بەتاڵە. (سبرة) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) لە گرتنی مەککەدا سیغەی بۆ حەڵاڵ کردین، بەڵام لێی نەچووینە دەر تا قەدەغەی کرد)[4] .

## ژن هێنان بە نیازی تەڵاقدان:

(سید سابق) لە (فقه السنة/ ٢/٣٨)دا دەڵێ:

زانایان کۆکن گەر کەسێ ژنێ بخوازێو کات دەست نیشان نەکاتو لە نیازی دابێ دوای ماوەیەك تەڵاقی بداتەوە، یان دوای ئەوەی لە شارەکەدا پێویستی خۆی تەواوکرد کە تێیدا

(١) صحيح (ص.ج ٥١٠١) (د ٦/٨٨/٢٠٦٢) ت(٢/٢٩٤/١١٢٨).

(٢) حسن (ص.جه ١٥٧٢) (جه ١/٦٢٣/١٩٣٦).

(٣) فقه السنة(٢/٣٥).

(٤) (مختصر مسلم ٨١٢/م (٢/١٠٢٣/١٤٦)..

نیشتەجێ بووە ژن هێنانەکە دادەمەزرێت.

بەڵام (الاوزاعي) ناکۆکەو دەڵێ: وەکو سیغەیە. (الشیخ رشید رضا) لەتەفسیری (المنار) وەکو لەسەر نووسین لەم بارەوە دەڵێ: (توندی زانایانی پێشینو پاشین بۆ سیغە لەبەرئەوە بووە کە ژن هێنانەکە بەنیازی تەڵاقە، هەرچەندە فەقیهەکان دەڵێن: مارەبڕینەکە ڕەوایەو دروستە مادام مێردەکە نیازی کات دانان نییەو لە مارەکردنەکەدا ناکرێتە مەرج. بەڵام شاردنەوەکە فێڵو تەڵەکەبازییە. ئەمە شایانی بە پترە لەو مارەبڕینەی کاتی تێدا دیاری دەکرێ کە بە ڕەزامەندی ژنو مێردو سەرپەرشتیار دەبێت. خراپیەکەشی ئەوەیە کە گاڵتەکردنی تێدایە بەو شێرازە گەورەیە کە گەورەترین پەیوەندی مرۆیی یە، لەپێشتر دانانی زو گۆڕینی ژنە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە زو ژن دێننو زوو تەڵاقی دەدەن بۆ ئارەزوبازیو خراپەی تر. سەرباری فێڵ دوژمنایەتیو کینەشی لێ دەکەوێتەوە. تا گومانی متمانە بون دروست دەبێ لەڕاست ئەو کەسانەی ژن هێنانی ڕاستیان مەبەستە، کە پاراستنو دڵسۆزیو هاری کاری ژنو مێردی تێدایە بۆ بنیاتنانی خێزانەکی باش لەناو خانەکانی میللەتدا (تەواو).

(وتم): ئەم ڕایەی (رشید رضا) ـ ر ـ پشتگیری لە ڕای (عمر بن نافع) دەکات کە لەباوکی گێڕاویەوە: (پیاوێ هاتە لای (ابن عمر) لەڕاست پیاوێ لێ ی پرسی ژنی سێ بەسێ تەڵاقداوەو بێ پرسی ئەو مارەی دەکاتەوە تا بۆ برایەکەی حەڵاڵی بکاتەوە، ئایا بۆ مێردی یەکەم حەڵاڵ دەبێتەوە، وتی: نەء. تەنیا مارەکردنەکی ئارەزومەندانە نەبێ، ئەمەمان لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەداوێن پیسی دادەنا)[1] .

## مافی هاوسەری:

خێزان بناغەی یەکەمە لە کۆمەڵگادا، گەر باش بوو کۆمەڵگاش باش دەبێ، گەر کۆمەڵگاش خراپ بوو هەموو کۆمەڵگاش خراپ دەبێت، بۆیە ئیسلام بایەخەکی گەورەی بە خێزان داوەو ئەو شتانەی بۆ دابین کردووە کە ساغیو کامەرانی پێ دەدەن. ئیسلام خێزان بە دەزگایەك دادەنێ کە لەنێوان دو هاوسەردا دادەمەزرێ، ئەرکی هەرە قورس تێیدا لەسەر پیاوە.

---

(١) رابردو باسکرا..

﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ﴾[1] . واتە: پیاو بەکارەکان هەڵدەستن بەسەر ژنانەوە، کە خودا زێدە چاکەیی هەندێکی داوە بەسەر هەندێکیاندا، وە بەهۆی ئەوەی خەرجیان دەکێشن لەماڵیان، ئەو ژنانەی چاکەکارنو گوێڕایەڵن(بۆ مێردیان) نهێنی دەپارێزن کە خوا پاراستویەتی(لە نهێنی ژنو مێردایەتی).

ئیسلام بۆ هەریەکە لەو دوو هاوسەرە ئەرکی داناوە لەسەر ئەوی تریان، کە دامەزرانی ئەم دەزگایەو دەوامی تی ئەمە بە ئەرکی هەڵدەستێ، هەردوو هاوسەر هاندەدات کە ئەرکی سەرشانیان ئەنجام بدەنو دەبێ گەر ناتەواوی هەبوو لە مافەکانیاندا لە هەندێ دۆخدا پێویستە چاوپۆشی لە یەکتری بکەن.

## مافی ژن بەسەر پیاوەوە:

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾

واتە: لەنیشانەکی خودا ئەوەیە لەخودی خۆتان ژنی بۆ دروست کردونو سۆزو بەزەیی لەنێواندا داناون. ئەوەندەی سۆز هەیە لەنێوان ژنو مێردا لەنێوان کەسی تردا نییە. خوای گەورە دەیەوێ ئەم سۆزو بەزەیی یە بەردەوام بێو لەناو نەچێ، بۆیە ئەرکی لەسەرشان داناون کە سۆزو بەزەیی بیان پارێزن، ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾. ئەم ئایەتە ڕێسایەکی گشتی یە ئەوە دەردەخات ژنو پیاو لە هەمو مافەکاندا یەکسانن لەیەك شتدا نەبێ کە خوا فەرمویەتی: ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾. لێرەدا ئەم وشە قورئانیانە ناسینی ئەرکەکانی سەریانو ئەو مافانەی بۆیان هەیە بەستویەتەوە بەو تێکەڵاویو نەریتو مامەڵانەی لەناو خاوو خێزانیان دا هەیە، نەریتی خەڵکیش سەر بە شەریعەتو بڕواو نەریتو کلتوری ئەوانە. ئەم ڕستەیە تەرازوێك دەدات بەپیاو کە مامەڵەی خۆی بۆ هاوسەرەکەی پێ بکێشێ لە هەمو کاروبارەکاندا، گەر هەر داخوازیەکی کرد لە هەر کارێکدا ئەوە پێویستە بزانێ هاوسەرەکەشی ئەم مافەی هەیە. بۆیە

(١) النساء/ ٣٤.

(ابن عباس) وتویەتی: (چۆن ژنەکەم خۆم بۆ جوان دەکات منیش ئاوا خۆی بۆ جوان دەکەم)[١] .
پێویستە مرۆڤی موسڵمان دان بە مافەکانی ژنەکەی دابنێ وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾. واتە: ئەو ژنانە چ مافێکیان لەسەرە ئەوانیش هەمان مافیان هەیە بەچاکە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ژنەکانتان مافیان بەسەر ئێوە هەیە، چۆن ئێوە مافتان لەسەر ئەوان هەیە)[٢] .

موسڵمانی ڕۆشنبیر هەمیشە هەوڵ دەدات مافی هاوسەرەکەی بداتو چاو لەوە ناکات ئایا ئەو مافی ئەوی داوە یان نەء، چونکە سورە لەسەر هەمیشەیی سۆزو بەزەیی نێوانیان، دیسان پێ داگرە لەسەر ئەوەی هەل لە دەستی شەیتان بدات کە پێکیان دەپرژێنێ تا لێك جیا ببنەوە.

لەم ڕوانگەوە کە ئاین ئامۆژگارییە مافی ژن بەسەر پیاوەوە باس دەکەین، پاشان مافی پیاو بەسەر ژنەوە، تا هاوسەران سوودی لێ وەربگرنو ئامۆژگاری یەکتری بکەن بۆ سەر ڕاستیو ئارام گرتن.

(ان لنسائکم علیکم حقا)، یەکەم ماف ئەوەیە پیاو بەچاکی لەگەڵ ژنەکەی دا هاوڕێتی بکات، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[٣] . لەکاتی برسێتیو بێ جلوبەرگی دا تێری بکاتو بە جلوبەرگی بکات، گەر زانی لاساریو یاخی بون دەکات تەمبێی بکات، بە ئامۆژگاری باش، بێ جنێودانو قسەی دزێو، گەر بە قسەی کرد، گەر نا سەرجێگای لەگەڵدا ناکات، گەر گوێڕایەڵی کرد ئەوە باشە گەر نا لێ ی دەدات بێ ئازاردانو سزادان، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾[٤] .

لە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیارکرا مافی ژنمان چییە بەسەرمانەوە؟ فەرموی: (ان تطعمها اذا

---

(١) رواه ابن جرير.
(٢) حسن (ص.جه ١٥٠١) ت(٢/٣١٥/١١٧٣) (جه ١/٥٩٤/١٨٥١).
(٣) النساء/ ١٩.
(٤) النساء: ٣٤.

طعمت وتكسوها اذا كسيت، ولا تضرب الوجه ولا تقبح ولا تهجر الا في البيت)[١] . واتـە: گـەر خۆراكت خوارد بیدەی بە ئەویش، گەر خۆت پۆشتەكرد ئەویش پۆشتە بكەیت، زەبر لە دەموچاوی نەدەیت‌و جنێوی پێ نەڵێ‌و سوكایەتی پـێ نەكـەیت‌و لەچوارچـێوەی ماڵـەوەش دا سـەرجێگایی لەگەڵ نەكەیت. بەشێ لە ڕواڵەتەكانی تەواوكردنی ڕەوشت‌و گەشەی بڕوا ئەوەیە كە پیاو هاوڕێ‌و نەرم بێ لەگەڵ خێزانی دا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەوكەسەی لە هـەموو كەسـێ بـڕوای تەواوترە ئەوكەسەیە كە باشترین ڕەوشتی هەیە، باشترینتان ئەوكەسەیە لە هەمووتان پـتر لەگـەڵ ژنانیاندا باشن)[٢] .

ڕێزگرتن لە ئافرەت نیشانەی كەسایەتی یەكی تۆكمەیـەو بـێ ڕێـزی پـێ كردنـی نیـشانەی سوك‌و ڕیسوایی یە.

بەشێ لە ڕێزەكانی ئەوەیە نەرمی لەگەڵدا بكرێ‌و گەمەی لەگەڵدا بكرێ، ئەوەتا پێغەمبـەر (ﷺ) پێشبڕكێ‌و غاردانی لەگەڵدا دەكات، تا وتی: (پێغەمبەر (ﷺ) پێشبڕكێی لەگەڵدا كردم پێشی كەوتمەوە، كاتێ قەڵەوبوم جارەكی تـر پێـشبڕكێمان كـردەوە ئـەو پێـشم كەوتـەوە، ئـەمجا فەرموی: ئەوە سەربەسەر)[٣] . پێغەمبـەر (ﷺ) گاڵتەو گەپی بەبێ سوود داناوە، تـەنیا گاڵتـەو گەپ نەبێ لەگەڵ خێزاندا (كل شيء يلـهو بـه ابـن آدم فهـو باطـل الا ثلاثـا: رميـه عـن قوسـه، وتأديبه فرسه، وملاعبته أهله، فانهن من الحق)[٤] . واتـە: هـەموو شـتێ كـە مـرۆڤ یـاری پـێ دەكات بەتاڵە تەنیا سێ شت نەبێ: تیرهاوێشتنی بە كەوان، ڕاهێنانی ئەسـپەكەی‌و، گەمـەكردن لەگەڵ ژنی دا، ئەوانە حەقن).

٢ـ مافی ژنە بەسەر پیاوەوە كە لەڕاست ئازارەكانی ئارام بگرێ‌و لـە هەڵـەكانی چاوپۆشـی بكات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لايفرك مـؤمن مؤمنـة، ان كـره منهـا خلقـا رضـي منهـا

---

(١) حسن (ص. جه ١٥٠٠) د(٢١٢٨/١٨٠/٦).

(٢) حسن صحيح (ص. ت ٩٢٨) ت(١١٧٢/ ٣١٥/ ٢).

(٣) صحيح (الزفاف ٢٠٠) (د: ٢٥٦١/٢٤٣/٧).

(٤) صحيح (ص. ج ٤٥٣٤) النسائي في العشرة (ق ٢/٧٤) (الطبراني (المعجم الكبير (٢/٨٩/١).

آخر)[١] . واتە: بڕواداری پیاو لە بڕواداری ژن ڕق داناگرێ، گەر ڕەوشتەکیشی لێ ببینێ حەزی پێ نەکات، ڕەوشتەکی تری لێ دەبینێ لێ ی ڕازی بێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (استوصوا بالنساء خيرا فانهن خلقن من الضلع وان اعوج ما في الضلع اعلاه، فان ذهبت تقيمه كسرته، وان تركته لم يزل اعوج، فاستوصوا بالنساء خيرا)[٢] . واتە: ڕاتان دەسپێرم لەگەڵ ژناندا باش بن، ئەوان لە پەرسو دروست کراون، پەراسوی سەرەوەیان لە هەموی خوارترە، گەر بتەوێ ڕاستی بکەیەوە دەیشکێنی، گەر لێ ی گەڕێ ئاوا خوار دەمێنێتەوە، بۆیە ڕاتان دەسپێرم باش بن لەگەڵ ژناندا). هەندێ پێشینان وتویانە: (ڕەوشت جوانی لەگەڵ ژندا هەر ئەوە نییە کە ئازاری نەدەیت، بەڵکو پێویستە بەرگەی ئازارەکانیشی بگریتو، لەگەڵ هەڵچونو تورەبونی دا ئارام بگریو، چاو لە پێغەمبەر (ﷺ) بکرێ، جار هەبوو هەندێ ژنی دەهاتنە لا، هەبوو ئەو ڕۆژە تا شەو لێ ی دوور دەکەوتەوە).

٣ـ حەقێکی تری ژن بەسەر پیاوەوە ئەوەیە کە لە هەموو ئەو شتانەی بپارێزێ کە ئابڕوو شەرەفو ناموسی لەکەدار دەکەنو، ڕێگا نەدات خۆی سفور بکاتو جوانی خۆی بەدەر بخاتو ڕێگا نەدات بەبێ کەسانی خۆی تێکەڵاوی پیاوی بێگانە ببێت، دیسان پێویستە چاو دێریەکی تەواوی بۆ دەستەبەر بکاتو ڕێگای پێ نەدات دینو ڕەوشتی تێك بداتو لە فەرمانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) لابدات، پیاو ئەرکی سەرشانیەتی بیپارێزێ، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾[٣] . پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (پیاو شوانی ناو خێزانیەتیو بەرپرسیارە لە شوانیەکەیدا)[٤] .

٤ـ مافی ئافرەتە بەسەر پیاوەوە فەرمانە پێویستەکانی ئایینی فێر بکات، یان ڕێگای پێ بدات لە کۆڕی زانستیو خوێندندا بەشداربێ، پێویست بوونی بە چاککردنی دینیو پاکژکردنەوەی دەروونی لە پێویست بونی بە خواردنو خواردنەوە کەمتر نییە کە پێویستە لەبەر خاتری ئەو

(١) صحيح (الزفاف ١٩٩) م(٤٦٩/١٠٩١/٢).
(٢) متفق عليه خ(٥١٨٦/٢٥٣/٩ (م ١٤٦٨ـ ٧٠/١٠٩١/٢)..
(٣) النساء/ ٣٤.
(٤) متفق عليه: خ(٨٩٣/٣٨٠/٢) م(١٨٢٩/١٤٥٩/٣).

هەوڵیان بۆ بدرێت. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾[١] . واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خۆتانو خێزانتان لە دۆزەخێ بپارێزن، کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤو ئاگرە. ژن بەشێکە لە خێزان، پاراستنی لە ئاگر بە بڕواو کاری باشە، کاری باشیش دەبێ زانستی لەگەڵدابێ، تا بەچاکیو شەرعی جێبەجێ بکرێت.

٥ـ ئەرکە بەسەر پیاوەوە فەرمان بە ژنەکەی بکات کاروبارەکانی دین جێبەجێ بکات، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾[٢] . واتە: فەرمان بەخێزانت بکە بەنوێژو خۆی لەسەر ڕابگرە.

٦ـ مافی ژنە پیاو ڕێگای پێ بدات لەماڵ بڕواتە دەرەوە بۆ پێویستی، وەکو بۆ شاهێدی دانو سەردانی خزمو کەسوکارو دراوسێ، بەمەرجی خۆداپۆشینو دوور لەخۆ دەرخستنو بۆنو لە تێکەڵاوی پیاوو تۆقە لەگەڵ کردنیان دەپارێزێ، دیسان دەپارێزێ لە بینینی تەلەفزیۆنو گوێ گرتن لە گۆرانی.

٧ـ مافی ژنە بەسەر پیاوەوە نهێنی یەکانی ئاشکرا نەکاتو نەنگی یەکانی باس نەکات، چونکە ئەمینداره بەسەریەوەو دەبێ چاودێری بکاتو بەرگری لێ بکات، ترسناکترینیان باسی سەرجێگا کردنە، بۆیە وەکو (أسماء بنت یزید) گێڕاویەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) هۆشیاری داوە: کۆمەڵێ ژنو پیاو لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (دەبێ پیاو هەبێ ئەو شتانە باس کە لەگەڵ ژنی دا شەوانە کردویەتی، ؟ دەبێ ژن هەبێ ئەوەی لەگەڵ مێردی دا کردویەتی باس بکات؟ خەڵکەکە بێ دەنگ بوون، منیش وتم: (ئەرێ بەخوای ئەی پێغەمبەری خوا! ژنو پیاو هەردوولا وادەکەن)، فەرموی: (وامەکەن، ئەمە وەکو شەیتان وایە کە توشی شەیتانەمێیەکەی دەبێ لە ڕێگادا کاری جوت بوونی لەگەڵدا دەکاتو خەڵکی سەیری دەکەن)[٣] .

٨ـ مافەکی تری ژن بەسەر پیاوەوە ئەوەیە ڕاوێژی پێ بکات، بەتایبەتی بەرامبەر

---

(١) تحريم/ ٦.

(٢) طه/ ١٢٣.

(٣) صحيح (آداب الزفاف/٧٢).

منداڵەکانیەوە، لای پێغەمبەر (ﷺ) بکاتەوە، کە ڕاوێژی بە ژنەکانی کردووە، ڕاکانی پەسەند کردون، بۆ نمونە لە حودەیبیەدا کاتێ نامەی ئاشتەوایی (الصلح)ی تەواوکرد، بەیارانی فەرموو: (هەستن قوربانی بدەن، پاشان سەر بتاشن)، بەخوا تا سێ جاران وایفەرمو کەس بەقسەی نەکرد، کاتێ کەس هەڵنەستا، چووە لای (أم سلمة ـ رـ)، ئەوەی خەڵکی لەڕاستی دا کردیان باسی کرد، فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەت پێ خۆشە، فەرمو بچۆ قسە لەگەڵ کەسدا مەکە تا وشترەکەت دەکوژیەوە و بانگی سەرتاشەکەت دەکەی سەرت بتاشێ. ئەنجا دەرچو قسەی لەگەڵ کەسدا نەکرد تا وای کرد، کاتێ وای کرد، ئەنجا خەڵکی هەڵسان قوربانیان کردو سەری یەکتریان تاشی، تا خەریك بو لە خەمان یەکتری بکوژن[١] .

بەم شێوەیە بەم ڕاوێژەی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئوم سەلەمە خێرەکی زۆری دەست کەوت، پێچەوانەی هەندێ لەو پەندو وتانەی هۆشیاری دەدەن نەکەن ڕاوێژ بە ژنان بکەن، وەکو گوتراوە: (گەر ڕاوێژی ژن سوودیشی هەبێ زیانی ساڵەکی هەیە) یان (گەر سوودیشی نەبێ تەمەن وێران دەکات)[٢] .

٩ـ مافەکی تری ژن ئەوەیە دوای شێوان بگەڕێتەوە لای، شەوانە تا درەنگ لە دەرەوەی ماڵدا شەونخونی نەکات، ئەمە ژن تووشی خەمۆکی دەکاتو خەوی دەزڕێنێ، دوودڵی بۆ دروست دەبێ لەڕاست ئەو شەونخونیە درێژو بەردەوامانە، بەڵکو مافی ژنە لەدەرەوەی ماڵدا شەونخونی نەکرێ با لە نوێژیش دابێ، تا مافی ئەو نەدات، پێغەمبەر (ﷺ) نکۆڵی لە (ابن عمر) کردووە کە گۆشەگیری لە ژن دەکاتو شەونخونی دەکاتو پێی فەرموو: (ژنت مافی بەسەرتەوە هەیە)[٣].

١٠ـ پێویستە پیاو لەنێوان هەوێیەکاندا لە خواردنو خواردنەوەو پۆشاکداو، لە خانوبەرەو مانەوەی شەوو جێگادا دادگەرییەکان لەگەڵدا بکات، نابێ لەم شتانەدا ستەمیان لێ بکاتو خوا حەرامی کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەسێ دوو ژنی هەبێ زیاتر مەیلی

(١) صحيح/ خ(٢٧٣١ و٢٧٣٢/ ٥/٣٢٩).
(٢) لە کوردەواری دا دەڵێن: پرس بە ژن بکە بەڵام بەقسەی مەکە. (وەرگێڕ)
(٣) متفق عليه: خ ٢١٧/١٩٧٥ و٢١٨/٤) م(١١٥٩ـ ١٨٢/٨١٣/٤).

یەکێکیان بکات ئەگەر قیامەت گەر هات لێوێکی خوارە)[١] .

برایانی موسڵمان ئەمانە مافی ژنەکانتانە بەسەرتانەوە، ئەرکە بەسەرتانەوە خۆتان ماندو بکەن ئەو ئەرکانە جێبەجێ بکەن، کەمتەرخەمی نەکەن لە ئەنجامدانیاندا، هەڵسانتان بەو ئەرکانە هۆکاری بەختەوەری ئێوەن لەژیانی هاوسەریتاندا، هۆکارێکیش بۆ ساغی ماڵەکانتان لە ناثارامیو ئەو کێشانەی خەوتان لێ دەزڕێنێو پشوو ئارامو سۆزو بەزەییتان لەدەست دەدات. ئامۆژگاری ژنان دەکەین لە بەرامبەر کەمو کوڕی مێردەکانیان لەڕاست مافەکانیاندا چاوپۆشیان هەبێو لەجیاتی ئەوە خۆ ماندو بکەن بۆ خزمەتیان، بەوە بەختەوەری خێزانی دەوام دەکات.

## مافی پیاو لەسەر ژن:

١- مافی پیاو لەسەر ژن مەزنە، پێغەمبەر (ﷺ) بەم فەرمایشتەی مەزنی ئەوەی دەرخستووە: (حاکم)و هی تر گێڕاویانەوە: (حق الرجل علی زوجته ان لو کانت به قرحة فلحستها ما ادت حقه)[٢] . واتە: مافی پیاو بەسەر ژنەوە ئەوەندەیە گەر برینەکی لێ بێو بچێ بیلیسێتەوە مافی ئەو تەواو ناکات. ژنی ژیر ئەو ژنەیە ئەوەی خوا بە مەزنی داناوە ئەویش بە مەزنی دادەنێ، ئەوەی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە مەزنی داناوە ئەویش بە مەزنی دادەنێت، بەتەواوی ڕێزی مێردی دەگرێو بەگوێی دەکات، چونکە سەردەکێشێ بۆ بەهەشت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (گەر ژن پێنج نوێژەکانی کردو بەڕۆژو بوو، داوێنی پاراستو بەگوێی مێردی کرد، پێی دەوترێ لە کام دەرگاوە دەتەوێ بچۆ بەهەشتەوە)[٣]. مەبەستی خودایە ئەی ئافرەتی موسڵمان بڕوانە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) گوێڕایەڵی مێردی وەکو نوێژو ڕۆژوو کردووە بەهۆکارێ بۆ چوونە ناو بەهەشت، کەواتە: پەیوەست ببە بەگوێڕایەڵی مێردەوەو لە سەرپێچی مێرد دووربکەوەوە، سەرپێچی مێرد مایەی خەشمی خودای بێ گەردە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (سوێند بەوەی گیانی منە بەدەستە هەر ژنێ لەلایەن مێردەوە بانگی سەرجێگا

---

(١) صحیح (الارواء ٢٠١٧) (ص(جه ١٦٠٣) (جة ١/٦٣٣/١٩٦٩).
(٢) صحیح (ص. ج ٣١٤٨) أ(١٦/٢٢٧/٢٤٧).
(٣) صحیح (ص. ج ٦٦٠) أ(١٦/٢٢٨/٢٥٠).

بکرێو وەڵام نەداتەوە، ئەوی لەئاسمانە لێی تورە دەبێ تا ڕازی دەکات)[١] . مەبەستی خودایە ئەی ئافرەتی موسڵمان پێویستە گوێ ڕایەڵی مێردەکەت بکەی لە هەمو فەرمانێکدا، مادام پێچەوانەی شەرع نەبێ، نەکەی زیادەڕەوی بکەی لە گوناهەکانیشدا بەگوێی بکەیت تۆش گوناهبار ببیت. بۆ نمونە: فەرمانت پێ بکات بۆ جوانکاری مووی دەمو چاوت لاببەیت، پێغەمبەر (ﷺ) نەفرینی کردووە لە (النامصة والمتنمصة)[٢] .

یان: لەوەدا بەگوێی بکەیت بەبێ لێك لەماڵ بڕۆیەدەرو جوانیت لە بەرامبەر خەڵکی دا والاّ بکەیت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (دوو کۆمەڵ هەیە لە ئومەتم دۆزەخینو من نەم بینیون: کۆمەڵێ لەوانە قامچی یان پێیە وەکو کلکی مانگایە پێی لە خەڵکی دەدەن، ژنانێ هەیە جلوبەرگیان پۆشیوەو ڕووتن، لایانداوەو خەڵکیش لادەدەن، سەریان وەکو پشتی وشترە خواربۆتەوە، ناچنە بەهەشتەوەو بۆنی ناکەن، هەرچەندە ئەوەندەو ئەوەندە بۆنی دەڕوات)[٣] .

یان لەکاتیدا لە بێ نوێژی دایە، لە زێوە ڕێگا بە مێرد بدات کاری جووت بونی لەگەڵدا بکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (کێ لەکاتی حەیزدا بڕواتە لای ژن یان لە کۆمەوە، یان بڕوا بە کاهینێ بکات ئەوە بڕوای بەوە نییە دابەزیوەتە سەر موحەممەد)[٤] . یان بە قسەی بکەی خۆ بۆ پیاوان دەربخەیو تێکەڵاویان بکەیو تەوقەیان لەگەڵدا بکەیت: ﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ﴾[٥] . (ﷺ) فەرمویەتی: (نەکەن بچنە ژووری ژنان، نەفەرێ وتی: ئەی گەر خزمی مێردبێ (وەکو شوبراو ئامۆزاو مامیو کوڕە مامو کوڕی برای)؟ فەرموی: (خزمی مێرد مردنە)[٦] . هەمو ئەو شتانەی پێچەوانەی شەریعەتن بەمەی بپێوە، بەوە

---

(١) صحيح (ص. ج ٧٠٨٠) م(١٤٣٦ـ١٢١/١٠٦٠/٢).

(٢) متفق عليه: (خ ٤٨٨٦/٦٣٠/٨) م(٢١٢٥/١٦٧٨/٣). تێبینی: بەڵام (أبوداود) لە (سنن)ەکەیدا دەڵێ: (النامصة ئەو ئافرەتەیە برۆکانی نەخش تێدا دروست دەکاتو باریکیان دەکاتەوەو لابردنی مووی دەمو چاو ناگرێتەوە.

(٣) صحيح (ص. ج ٣٧٩٩) م(٢١٢٨/١٦٨٠/٣).

(٤) (آداب الزفاف ٣١) (جه ٦٣٩/٢٠٩/١).

(٥) سورة الاحزاب/ ٥٣.

(٦) متفق عليه. باسکراوە. بڕوانە کتێبی خۆمان: (ڕێنمایی سێکسی ئیسلامی)، (جینس لەژیانی هەمو کەسێکدا)و (پەند وەربگرە لە بەسەرهاتی قوربانیانی خۆشەویستیو شەیتان). (وەرگێڕ)

نەفرێوێیت کە دەبێ لەکاری ناشەرعیشدا بەگوێی مێـرد بکـەیت، بـەڵکو گـوێ ڕایـەڵی کـردن لەکاری باشدایە نەك لەو کارانەی سەرپێچی کردگاریان تێدایە.

٢ـ دیسان ژن مافی بەسەرەوەیە ناموس و شەرەفی مێردی بپارێزێت و ناپاکی پـێ نـەکات و چاودێری سامان و مندالّی بکات و کاروباری ماڵەوەشی بپارێزێت: ﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ﴾ وەکو باسمان کرد.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها)[1] . واتە: ژن لەماڵی مێردی دا چاودێرو شوانەو بەرپرسە لە شوانیەکەیدا.

٣ـ ژن ئەرکە بەسەریەوە خۆی بۆ مێرد جوان و ئارایش بکات و هەمیشە لەگـەڵی دا دەم بـە خەندە بێ و ڕوی گرژنەکات و، وێنە ناشـیرین لەبـەردەمی دا نـەنوێنێ، وەکـو پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویەتی: (باشترین ژن ئەو ژنەیە گەر سەیرت کرد دڵت شاد بکات و گـەر فـەرمانت پـێ کـرد بەگوێت بکات، لەکاتی نادیاری تۆدا داوێنی خۆی و ماڵی تۆ بپارێزێت)[2].

بەڕاستی زۆر سەیرە کە ژن لەماڵەوەدا لەبەرامبەر مێرددا گرنگـی بـەخۆی نـادات، کەچـی لەکاتی چوونەدەردا بەوپەڕی جـوانی خـۆی دەنوێنـێ، وەکـو گـوتراوە: لەماڵـەوەدا خـۆی وەکـو (مەیمون) لێ دەکات و گەر چووە دەر بۆ سەر شەقام وەکو ئاسکە، ئەی بەنـدەی خـوا لەبەرامبـەر خۆت و مێردتدا لەخوا بترسە، چونکە مێردت لە هەموو کەس لەپێشترە خۆتی بۆ جوان بکـەیت، نەك بۆ کەسانێ کە بێگانەن و ئەمە سفورێکی حەرامەو ڕەوا نییە.

٤ـ نابێ ژن بۆ دەرەوەی ماڵ بڕوات هەتا بۆ مزگەوتیش بـەبێ پـرس کـردن بەمێردەکـەی، ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾[3] . واتە: لەماڵەوە ئارام بگرن.

٥ـ مافە بەسەر ژنەوە بەڕوخسەتی مێردی نەبێ ڕێگـا بـە کـەس نـەدات بێتـە ماڵـەوەی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (مافی ئێوە بەسەر ژنانەوە ئەوەیە کە کەس نەیەننە ماڵی ئێوە کە حەز بە چارەیان ناکەن، ڕێگا نەدەن ئەو کەسانە بێتە ماڵتان کە حەز بە چـارەیان ناکـەن). وەکـو

---

(١) ڕابردو.

(٢) صحيح (ص. ج ٣٢٩٩).

(٣) الاحزاب/ ٣٣.

باسکرا.

٦ـ مافی پیاوە بەسەر ژنەوە سامانی پیاو بپارێزێو بێ ئیزنی ئەو خەرجی نەکات، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (نابێ ژن بەبێ ڕوخسەتی مێردی لە سامانەکەی خەرج بکات) نەفەرێ وتی: ئەی خواردەمەنی؟ فەرموی: (ذلك افضل اموالنا)(١) .

واتە: ئەمە چاکترینی ماڵی ئێمەیە. دیسان گەر ژن ماڵەکەی هی خۆشی بێ نابێ بەبێ پرسی مێردەکەی خەرجی بکات. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (نابێ ژن بێ پرسی مێردەکەی لەماڵی خۆشی خەرج بکات)(٢) .

٧ـ حەقی پیاوە بەسەر ژنەوە، گەر بەڕوخسەتی ئەو نەبێ ڕۆژووی سوننەت نەگرێ، وەکو لە فەرمودەی (متفق علیه)دا هاتووە: پێغەمبەر (ﷺ) (ڕەوا نیە بۆ ژن کە کاتێ مێرد لەماڵەوەیە بەڕۆژووبێ بەڕوخسەتی ئەو نەبێت).

٨ـ نابێ ژن گەر شتێ لەسامانی خۆی بۆ ماڵەوە خەرج بکات، نابێ منەت بەسەر مێردەکەی بکات، چونکە منەت بەسەرداکردن پاداشتی خوایی بەتاڵ دەکاتەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى﴾. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە چاکەی خۆتان بەمنەت بەسەرداکردنو ئازاردان بەتاڵ مەکەنەوە(٣) .

١٠ـ مافە بەسەر ژنەوە کە قەناعەت بە کەم بکاتو ئەوەی خوا پێی داوەو هەیە پێی ڕازی بێ، خەرجی لەتوانا بەدەر نەخاتە سەر مێردەکەی: ﴿ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴾(٤) . واتە: دەوڵەمەند بەپێی توانای خۆی خەرج بکات، کێ هەژارە لەوەی خوا پێی داوە با خەرج بکات، خودا بەپێی ئەوەندەی خوا پێی داوە ئەرك دەخاتە سەرشان، خودا دوای هەژاری دەوڵەمەندیش دێنێتە پێش.

---

(١) حسن (ص. جه ١٨٥٩) ت(٣/٢٩٣/٢٢٠٣).

(٢) أخرجه الألباني في صحيحه (٧٧٥) وقال اسناده ضعيف

(٣) البقرة/ ٢٦٤.

(٤) الطلاق/ ٧.

١١ـ بەسەر ژنەوە مافە کە بەباشی منداڵەکان پەروەردەو بەخێو بکاتو بەئارامەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکاتو لەبەرچاوی مێردی لێیان تووڕە نەبێو دوعایان لێ نەکاتو جنێویان پێ نەدات، چونکە ئازاری دڵی پیاو دەدات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر ژنێ ئازاری مێردی بدات لەدنیادا مسۆگەر ژنە حۆریەکەی دەڵێ: خوا بت کوژێ ئازاری مەدە ئەو لای تۆ میوانە زۆری نەماوە لێت دابڕێت بەرەو لای ئێمە بێت)[1] .

١٢ـ پێویستە ژن لەگەڵ دایكو باوکی مێرددا (خەزورو خەسوو)و خزمەکانی مێرد هەڵسو کەوتی جوان بێ، ئازاردانی ئەوان ئازاردانی مێردە.

١٣ـ پێویستە لە هەموو دۆخێکدا گەر مێرد داوای سەرجێگای لە ژن کرد ئەو وەڵامی بداتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر پیاو بانگی ژنی کرد بۆ سەرجێگایەکەیو نەچوو لێ ی زویربوو، تا سبەی فریشتە نەفرینی لێ دەکەن)[2] . پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): (گەر پیاو داوای پێویستی (جووت بونی) لە ژنەکەی کرد با وەڵام بداتەوە گەر لەسەر تەنووریش بوو)[3] .

١٤ـ مافە بەسەر ژنەوە نهێنی مێردو ماڵەوە هەڵبگرێو نەیباتە دەرەوە، لە هەموو نهێنی یەکان ترسناکتر نهێنی سەرجێگایە، وەکو لە فەرمودەی ڕابردودا باسکرا: (لعل رجلا يقول ما يفعل بأهله ولعل إمراة تخبر بما فعلت مع زوجها)[4] .

١٥ـ مافە بەسەر ژنەوە سووربێ لەسەر مێردو ژیانی پێکەوەیی بپارێزێو بێ هۆکار داوای جیابونەوە نەکات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (أيما امرأة سألت زوجها الطلاق من غير بأس فحرام عليه رائحة الجنة)[5] . واتە: هەر ژنێ بێ هۆکار داوای تەلاق لەمێردەکەی بکات بۆنی بەهەشتی لێ حەرامە. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (المختلعات هن المنافقات) .

---

(١) ت(١١٨٤/٣٢٠/٢).

(٢) متفق عليه: خ(٥١٩٤/٢٩٤/٩) م(١٤٣٦/١٠٦٠/٢).

(٣) صحيح (ص. ج ٥٣٤) ت(١١٦٠/٣١٤/٢).

(٤) صحيح (آداب الزفاف ٧٢) (أ ٢٣٧/٢٢٣/١٦).

(٥) صحيح (الارواء ٢٠٣٥) ت(١١٩٩/٣٢٩/٢) (د ٢٢٠٩/٣٠٨/٦).

واتە: ئەو ژنانەی داوای تەلاق‌و خولع دەکەن دووڕوون.

ئەی ئافرەتی موسڵمان مافەکانی مێردت بەسەرەوەیە، پێویستە بەتەواوی ڕایان پەڕێنی‌و چاو لە ناتەواویەکانی مێردت بپۆشیت، بەمەش سۆزو بەزەیی بەردەوام دەبێ‌و ماڵ‌و خێزان چاك دەبن، ئەمەش بۆ چاکی کۆمەڵگا سەردەکێشێت. پێویستە دایکان ئاگاداری ئەوە بن، کە کچەکانیان فێری ئەو مافانە بکەن کە لەڕاست مێردیان لەسەر شانیانەو بەر لە مێردکردنیان فێریان بکەن، ئەمەش سوننەتی ژنانی پێشین بووە، (عەمری کوڕی حیجر) پادشای (کیندە) هەڵسا چوو (أم یاس بنت عوف الشیباني) داخواز کرد کاتێ سەروبەری بە بووك چونی هات دایکی دانیشتنەکی دوو بەدوویی لەگەڵدا کرد (امامة بنت الحارث)و ئەو ڕاسپاردانەی دایە کە بناغەن بۆ دامەزراندنی خێزانەکی بەختیارو ئەرکن بەسەر ژنەوە بۆ مێردی: (کچەکەم: گەر ئامۆژگاری‌و ڕاسپاردە لەبەر بەرزی ڕەوشت وازی لێ بێنرابایە من ئەم ئامۆژگاریە لێ دەگەڕام بۆ تۆ.

بەڵام کەسانی بێ ئاگا وریا دەکاتەوەو یاریدەی مرۆڤی هۆشیار دەدات، ئەگەر کچ لەبەر دەوڵەمەندی باوکی‌و دایکی‌و لەبەرئەوەی پێویستی یان بەو کچە هەیە پێویستی یان بەمێرد نەبوایە من لە هەموو کەسێ لەپێشتر بووم بۆ ئەوە، بەڵام ژنان بۆ پیاوان‌و پیاوان بۆ ژنان دروستکراون.

کچەکەم: لەم کەش‌و هەوایە چوویەدەر لەناوی دابویت‌و ئەو لانەیەت بەجێ هێشت کە تێیدا ڕەنێو هێنرایت، چویتە ئەو لانەیە کە ئاشنایەتیت لەگەڵی دا نییە، بویە دۆستی کەسێ نایناسیت، ئەو بەهۆی دەست ڕۆیشتنی بەسەر تۆدا بۆتە پادشاو چاودێرت، تۆ ببە خزمەتکاری ئەوو ئەویش دەبی بە نۆکەرەکی نزیکی تۆ. ئەم (١٠) شتانە هەڵگرەوە بۆ تۆ زەخیرەیەك دەبن:

یەکەم‌و دووەم : بەڕازی بوونەوە ملی بۆ کەچ بکە، چاك بەگوێی بکە.

سێ یەم‌و چوارەم: هەمیشە لە چاوو لووتی ڕابمێنەو سەیری بکە، با قەت شتی دزێوو ناشیرین لە تۆ نەبینێ‌و با تەنیا بۆنی خۆش لە تۆ بکات.

پێنجەم‌و شەشەم: ئاگاداربوون لەکاتی نوستن‌و خواردنی دا، چونکە زۆر برسی بوون‌و زۆر خەو هاتن مرۆڤ تورە دەکات.

حەوتەم‌و هەشتەم: پاراستنی دارایی‌و چاوبوون لە خێزانی، کۆڵەگەی فەرمان لـە دارایـی دا چاك دیاری کردنەو لەخێزان باش بەڕێوەبردن‌و ڕێك کردنە.

نۆیەم‌و دەیەم: سەرپێچی هیچ فەرمانەکی مەکەو نهێنی یەکانی ئاشکرا مەکە، چونکە گەر لە دڵی بدەیت ئەوە دڵی کرمێ دەکەیت، گەر نهێنی ئەو بدرکێنی لە پەیمان شکێنی ئەو بێ بـاك مەکە، پاشان گەر خەمباربوو تۆ خۆت خۆشحاڵ پیشان مەدە، گەر دڵخۆش بـوو خـۆت خـەمبار دەرمەخە)[1] .

﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ .

## ناکۆکی خێزانی:

هیچ خێزانێ نییە کێشەو ناکۆکی نەبێ، بەڵام خێزانـەکان بـەپێی قـەبارەی کێـشانەکانی و جۆری ناکۆکیەکان دەگۆڕێن. ئیسلام ژن‌و مێرد هاندەدات کێشەکانی نێوانیان بنەبڕ بکەن، ڕێگـا چارەی پیـشانی هـەردووکیان داوە لەگـەڵ یـەکتری دا، پاشـان هـانی داون لەگـەڵ سـەرهەڵدانی ناکۆکی‌و دیاردەکانی دا دەست پێشخەری بکەن لـە چـارەکردنی دا، خـوای گـەورە فەرمویـەتی: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ﴾[2] . واتە: ئەوانـەی لـە یاخی بونی ژنیان دەترسن با ئامۆژگارییان بکەن‌و سـەرجێگایان لەگەڵـدا نەکـەن‌و لێیـان بـدەن. ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِـن بَعْلِهَـا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًـا فَـلاَ جُنَـاْحَ عَلَيْهِمَـا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَـا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾[3] . واتە: ئەو ژنەی لە یـاخی بـون لـە مێردەکـەی ترسـا یـان لـە ڕوو وەرگێـڕان گوناهیان ناگاتێ کە ئاشتەوایی یان لەنێواندا بکرێ‌و ئاشتەوایی یەکە چاکترە.

ڕێبازی ئیسلامی چـاوەڕێ ناکـا تـا بـەکردار یـاخی بـوون ڕونـەدات‌و ئـاڵای یـاخی بـوون ڕانەگەیەنرێ، بەڕێوەبردن‌و بەکار هەڵسانی پیاو (القوامـة) شکۆی خـۆی لەدەسـت نـەدابێ‌و دام‌و دەزگاکە بۆ دوو سەربازگە دابەش نەبوبێ، گەر کارەکە سـەری بەمـە گەیـشت کـەم وایـە چـارە

(١) فقه السنة/ سيد سابق/ ٢/٢٠٠.

(٢) النساء/ ٣٤.

(٣) النساء/ ١٢٨.

بکرێ، دەبێ بەر لەوەی یاخی بوونەکە گەورەبێ چارەسەری سەرەتایی بۆ بکرێ، چونکە سەرکێشانی گەندەڵی بۆ ناو ئەم سیستەمە ترسناکە دەبێ بەهۆی نائارام بونیو پەروەردەی چاکی لێوە سەرهەڵنادات‌و پەروەردەی منداڵ لەو دایەنگەیە ترسناکەدا ناشێت، پاشان سەردەکێشێ بۆ لێك ترازان‌و هەرەس هێنانی تەواوی ئەم دام‌و دەزگایە بەو ئەو منداڵانەی بەخێوکران لەناویدا ئاوارە دەبن یان پەروەردەبوون لەناو ئەو هۆکارە ڕوخێنەرانەدا دەبنە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشیە دەروونی‌و دەماری جەستەیی یەکان‌و لاساری‌و لادان (الشذوذ). کەواتە: ئەم کارە مەترسیدارەو پێویستە هەنگاوی یەك بەدوای یەکی بۆ بهاوێژرێ، بۆ چارەکردنی ئەم یاخی بوون‌و لادانانە پێش سەرهەڵدانی.

## نیشانەکانی لادان‌و یاخی بوونی ژنان (النشوز) یان دوورکەوتنەوەیان:

﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾[1] . لێرەدا (فعظوهن) ئەمە هەوڵی یەکەمە، کە ئامۆژگاری کردنەو یەکەم ئەرکە لەلایەن خاوەن خێزانەوەو کارەکی بەهادارو پەروەردەیی یە، لە هەمو دۆخێکدا داخوازی دەکرێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾[2] . بەلاّم لێرەدا قورئان ئاراستەیەکی دیاری کراو دەگرێ بۆ ئامانجەکی دیاری کراو، کە چارەکردنی یاخی بوونی ژنە بەر لە گەورەبوونی کێشەکە. بەلاّم هەندێ جار ئامۆژگاری دادی نادات، چونکە زۆر هەواو ئارەزو کەللەی پڕ کردووە، یان بەجوانی‌و دەوڵەمەندی‌و پایەی بەرزی‌و پایەی تر فیز بەسەر مێردەوە لێ دەدات، لەبیری چووە ئەم مێردە هاوبەشی ئەوە لەم دەزگایەدا نەك هاوتایەکی بێ بۆ ملبەملانە یان بوارێ بۆ پۆز لێ دان. لێرەدا تەقەلاّی دووەم دەست پێ دەکات، پیاو شانی خۆی دەنوێنێ لەبەرامبەر هەر نازێکی ئافرەت کە لەڕوی جوانی‌و سەرنج ڕاکێشی‌و بەهای ترەوە دەینوێنێ زاتی خۆی لە زاتی ئەو بەرزتر دەکاتەوە، یان بریتی هاوبەشەکەی دا کە پایەی بەڕێوەبردن (القوامة) هەیە. ﴿وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ﴾ سەرجێگایان لەگەڵدا مەکەن. سەرجێگا

(١) النساء/ ٣٤.

(٢) التحريم/٦.

شوێنی فریودانو سەرنج ڕاکێشانە کە ژنی یاخی ئەوپەڕی پۆزی پێ لێ دەداتو دەگاتە لوتکەی دەسەڵاتی تێیدا. گەر پیاو توانی هاندەرەکەی لەڕاست ئەو فریودەرو سەرنج ڕاکێشە تێ بشکێنێ، ئەو گەورەترین چەك کە ژن شانازی پێوە دەکات دەکەوێنێتە خوارەوە. چونکە لێرەدا ئەدەبەکی دیاری کراو هەیە لەو تەقەلایەدا، تەقەلای جیاکردنەوەی سەرجێگاو جلەو لێ کردنی، کە نابێ سەرجێگایەکی بەدیارەوەبێ لەشوێنەکی جیا لەشوێنی ژنو مێردایەتی، نابێ لەبەرچاوی منداڵەکان بێ، کە خراپەو تێك چون لە دەروونیاندا پەیدا بکات، جیاکردنەوەی جێگا نییە لەبەردەم بێگانەدا کە ژنەکەی پێ سوكو لەکەدار بکات، مەبەست تێك دانی منداڵەکان نییە. هەردو ڕێگایەکە وا دەردەخەن کە مەبەست ئەمەیە. بەڵام هەموو جار ئەم ڕێگایە سەرکەوتو نابێ... ئایا لێ بگەڕێ ئەم دەزگایە کە خێزانە وێران ببێ، هەرچەندە توندو تیژی پتری تێدایە بەڵام لە وێران بوونی خێزان کەمترە، کە یاخی بوونو لاساری تێکی دەدات: (واضربوهن) لێیان بدەن.

ئەم مانایانەی ڕابردوو ئامانج لەم ڕێو شوێنانە هەموو ئەوانە ئەوە بەدوور دەخەنەوە کە مەبەست لەم لێدانانە سزایەك بن بۆ تۆڵەکردنەوە، یان سوکایەتی کردن بێ بە ژنانو ناچارکردنی ژنان نییە کە بە ژیانێ ڕازی بێ کە حەزی پێ ناکات، بەڵکو لێدانەکی تەمبێ کردنە، کە سۆزەکی پەروەردەیی تێدایە، چۆن باوك لەگەڵ منداڵ یان مامۆستا لەگەڵ قوتابی دا مامەڵە دەکات.

ئەم هەوڵانە ڕێگایان پێ دراوە بۆ چارەکردنی دیاردەکانی یاخی بوون بەر لەوەی گەورە ببێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئاگادارییان تێدایە لە خراپ بەکارهێنانی دا، پێغەمبەر (ﷺ) بە سوننەتی کرداری لەماڵەوەی داو بەئامۆژگاری وتەیی چارەی زیادەڕەویەکەی کردووەو چەمکەکانی لە زۆر فەرمودەدا ڕاست کردونەوە:

(معاوية ابن حيدة) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەپرسێ: مافی ژن بەسەرمانەوە چییە؟ فەرموی: (گەر نانت خوارد خواردنی پێ بدەی، گەر خۆت پۆشتە کرد ئەویش پۆشتە بکەی، لە دەمو چاوی نەدەیو جنێوی ناشیرینی پێ نەڵێیو لە سنووری ماڵەوە نەبێ سەرجێگای جیا نەکەیەوە)[1].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لاتضربوا اماء الله) واتە: لەژنانی بەندەی خوا مەدەن. عومەر هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ژنان یاخی بوون لە مێردانیان. پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای

---

(١) ڕابردوو باسکرا.

دا لێیان بدەن. ئەنجا هاتن سکالاّیان لە دژی لێدانی مێردەکانیان لای ئالی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن، ژنەکان زۆر بوون. ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ولقد اطاف بآل بيت محمد نساء كثير يشكون ازواجهن، ليس اولئك بخياركم)[1] . واتە: (ژنانەکی زۆر بە بنەماڵەی موحەممەددا خولاونەوە سکالاّیان لە مێردیان دەکرد، ئەوانە پیاوچاکانی هەرە باشی ئێوە نین). (ﷺ) فەرمویەتی: (هەیە لە ئێوە هەڵدەستێ وەکو کۆیلەیێ لە ژنەکەی دەدات لەکۆتایی ئەو ڕۆژەشدا سەرجێگای لەگەڵدا دەکات)[2] .

بەهەر حاڵ لێرەدا سنورێ هەیە بۆ ئەو تەقەلایانە کە مرۆڤ ئیستۆپی لێ دەکات، هەرکاتێ مەبەستەکە هاتەدی لە هەریەکێ لەو سێ قۆناغەدا نابێ سەربکێشێ بۆ بەکارهێنانی قۆناغی دوای ئەو ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾. لەکاتی بە مەبەست گەیشتن دا هۆکارەکە ڕادەگیرێ، دیارە مەبەستە بەگوێ کردنی ژنە، نەك بەگوێ کردنی ناچاری، ئەم جۆرە بەگوێ کردنە بەکەڵکی دامەزراندنی ئەم دەزگایەی خێزان نایەت، کە بناغەی کۆمەڵگایە.

دەقەکە ئاماژە دەکات کە جوڵان بۆ ئەم تەقەلایانە دوای ئەوە ژنەکە گوێ ڕایەڵ دەبێ ئەوە ستەمە، ﴿فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾. پاشان خوای بەتوانات دەخاتەوە یاد تا دڵان ئارام بن‌و سەران مل دانوێنن‌و هەستی ستەم‌و خۆ بەزلزانی لابچێ، لەسەر ڕێگای قورئان لە دڵخۆش کردن‌و ترساندن دا) .

## چارەکردنی یاخی بوونی (النشوز) پیاو یان دورکەوتنەوە لێ ی:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾. (مانا کراوە).

(ڕابردوو ئەم ڕێبازە حاڵەتی یاخی بوونی ژنی باسکردووە، هەروەها گرتنەبەری ئەو تەقەلایانەی قەوارەی خێزان دەپارێزن، لێرەدا حاڵەتی یاخی پیاو باس دەکات کە لەلایەن ژنەوە دیاردەکانی سەرەتایی لەودا سەریان هەڵداو لەوەتر یاخی بوونەکە ڕوودات، کە ئاسایش‌و ڕێزی

---

(١) حسن صحيح (ص. جه ١٦١٥) (جه ١٩٨٥/١/٦٣٨).

(٢) متفق عليه: خ(٨/٧٠٥/٤٩٤٢) م(٤/٢٠٩١/٢٨٥٥). تێبینی: لە (ابن عباس) پرسیارکرا لێدانی ژن کە نازاری نەدابە چی یە؟ وتی: بەسیواك‌و شتی تر). وەرگێر.

ژنو ئاسایشی خێزان بەتەواوی دەخاتە هەڕەشەوە. دڵەکانو هەڵوێستەکان دەگۆڕێن. ئیسلام ڕێبازی ژیانە، هەموو بەشێکی ئەوە چارەسەر دەکات، هەرشتێ لەڕاستی یەوە دێ لەبازنەی پرەنسیبەکانی دا دەچێتە ڕوووی، کۆمەڵگاش لەسەر ئەو پلانە دادەڕێژێت. گەر ژن لەوە ترسا گەر مێردی لێ ی دووردەکەوێتەوە، دوورکەوتنەوەکەش سەردەکێشێ بۆ تەڵاقدان، کە (لە حەڵاڵەکان خودا لە هەمو شتێ زیاتر ڕقی لێ یەتی)[1] ، یان ئەوەتا هەڵی دەپەسێرێ نە ئەوەیە دەستی لێ بکاتەوە، نەئەوەیە ژنی بێ، ئەوکاتە گوناه نییە سازش لەگەڵ مێردەکەی دا بکات دەست بەرداری هەندێ خەرجی دارایی یان خەرجی ژیانی ببێ، بۆ نمونە واز لە هەندێ خەرج یان هەمو خەرجی بێنێ، یان گەر ژنەکی تری هەبوو بۆی واز لە بەشە شەوی خۆی بێنێ، مادام ئەوی بەدڵترە لە ئەوو ئەو زیندەگیو سەرنج ڕاکێشی هاوسەری لەدەستداوە. گەر ئەمانەی بینی بە ڕەچاوکردنی هەموو بارودۆخەکەی بەتەواوی ئازادی خۆیەوە ئەوەی بۆ باشترەو بەڕێزترە لە جیابوونەوە ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾. ئەمە ئاشتەوایین کە ئامانجەمان بۆ کردن. پاشان بڕیار دەدات کە ئاشتەوایی بەڕەهایی باشترە لە دووبەرەکیو یاخی بوونو تەلاق ﴿وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾[2] .

پاشان پیاو هاندەدات کە چاکە لەڕاست ئەم ژنە بکات کە ئەوی خۆش دەوێو لەبەر خاتری ئەو وازی لە هەندێ مافی خۆی هێناوە تا لەسایەی ئەودا بمێنێتەوەو خوا ئەوە ئاشکرا دەکات کە ئەو ئاگاداری چاکەی ئەوەو پاداشتی دەداتەوەو دەفەرمووێ: ﴿وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾. واتە: وە ڕژدی لە دەروونداندا دانراوە، گەر چاکەو تەقوا بکەن، خودا ئاگادارە بەوەی دەیکەین.

(أبوداود) هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەی لە (هشام بن عروة) ئەویش لەباوکی گێڕاوە: عائیشە وتی: (ئەی کوڕی خوشکم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مانەوە لەلامان لە بەشکردنەکەدا وەکو یەك مامەڵەی لەگەڵدا دەکردین، کەم ڕۆژ وابو سەر لە هەمومان نەداتو بێ دەست لێدان لە هەموو ژنەکان نزیك دەبۆوە. تا دەگەیشتە ئەو ژنەی سەرەی بو لەلای بمێنێتەوە لە شەوداو ئەنجا لای دەمایەوە، (سودة بنت زمعة) کاتێ بە تەمەن بوو ترسا پێغەمبەر (ﷺ) لێ ی

---

(١) في ظلال القرآن (٢/٥٣٩).

(٢) النساء/١٢٨.

جیابێتەوە، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ڕۆژی خۆم داوەتە عائیشە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی لێ قبولْ کرد. وتی: خوا لەڕاست ئەمەو هاوشێوەی ئەوە خوا ئایەتی دابەزاند). وابزانم وتی: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا﴾[1].

## گەر ناكۆكی نێوان ژن و مێرد زۆربوو چی دەكرێت؟

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾[2] . واتە: گەر لەوە ترسان ناكۆكی بكەوێتە نێوانیان ناوبژییەك لە خزمی پیاوەكەو ناوبژییەك لە خزمی ژنەكە بنێرن، گەر ویستیان چاكیان بكەنەوە خوا نێوانیان چاك دەكاتەوە، خوا زاناو كارزانە[3] .

(ئەوەی باسمان كرد لەڕاست یاخی بوونی ژنو پیاو (النشوز) ئەوە لەكاتێ دابوو كە لادانەكەو یاخی بوونەكە ڕانەگەیەنراوە، بەڵكو دوورەپەرێزی لە سەرەتاكانی دەكرێ، بەڵام گەر لادانو یاخی بوونەكە ئاشكرابوو ئەو هەوڵانەی ڕابردو نادرێنو بێ سودە، بەڵكو ئەوكاتە دەبێتە كێشەو شەڕ لەنێوان دوو نەیاردا تا یەكێكیان سەری ئەویتر بخوات، ئەمە مەبەستو خوازراو نییە، دیسان گەر بینرا ئەو هەوڵانە بێ سوودن ئەو ناكۆكیو یاخی بوونە بەرز دەبێتەوەو ئەو

---

(١) حسن صحيح (ص. د ١٨٦٨) د(٢١٢١/١٧٢/٦). تێبینی: بەڵام لەسەر ئەم گێڕانەوە چەند تێبینی یەك هەیە: (١) ئەم ڕەوشتە (نشوز) یان دوركەوتنەوە لە ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر (ﷺ) ناوەشێتەوە كە مامۆستای دادگەریو ڕەوشتە بەرزەكانە. (٢) ئەم گێڕانەوەیە لای (ترمذي) پلەی (حسن غريب) هەیە. (٣) (سماك بن حرب)ی تێدایە كە قسەی لەسەر گوتراوە. (٤) (البيهقي)و (الواحدي) گێڕاویانەوە كە لە شانی (رافع بن خريج) دابەزیوە كە (خولة ابنة محمد بن مسلمة)ی ژن دەبێ، حەزی پێ ناكات لەبەر پیری بێ یان هۆكاری تر، ویستی تەڵاقی بدات، ئەویش وتی: تەڵاقم مەدە بەشەكەی خۆم چۆنت حەز لێ یە ئاوا بەشی بكە، ئەمە بو بە نەریتو ئایەتی ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا﴾ دابەزی. (تفسير القرطبي/ج٥/ تحقيق عبدالرزاق المهدي/ دار الكتاب العربي/ ل: ٣٨٤/ ٢٠٠٨م) سەیربكە. وەرگێڕ

(٢) النساء/٣٥.

(٣) تێبینی: (احمدو مالكیو شافعی)لەرایەك دا دەڵێن: ئەو دووانە بێ ئیزنی مێرد ناتوانن ژنەكە تەڵاق بدەن، بەڵام مالیكیو شافیعی لەرایەكی تر دەڵێن: ئەم دووانە ناو بژن نەك وەكیل بڕیاری تەڵاقو خولع بە دەست ئەوانە بەبێ گەڕانەوە بۆ رای مێرد ناكرێتو نابێت. (فقه السنة/سيد سابق/ج٢/ل: ٢٩٠). سەیر بكە. وەرگێڕ.

ڕایەڵانەش دەپچڕین کە هێشتا بەستراون یان گەر بەکارهێنانی ئەو هۆکارانە بێ ئاکام بوون. لەم دۆخانەدا ڕێبازی لێ زانی ئیسلامی ئاماژە بەدوا تەقەلا دەکات تا ئەو خێزانە کە دەزگایەکی مەزنە لە ڕمان ڕزگار بکرێ، بەر لەوەی دەستی لێ بتەکێنرێو برمێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا...﴾ وەکو باسکرا. بەم چەشنە ئیسلام لێ ناگەرێ مل بۆ سەرەتاکانی یاخی بوونو دورکەوتنەوە کەچ بکرێ، وە نە پەلە بکرێ لە هەڵوەشاندنەوەی ئەم هاوسەرگیرییەو خێزان بەسەر سەری گەورەو بچوکدا وێران ببێت، کە بێ دەستەڵاتو بەستەزمانو گوناهیان نییە، دامەزراوەی خێزان لای ئیسلام گەورەیە، بەو ئەندازەیەی مەترسی هەیە لە بنیاتنانی کۆمەڵگاداو لە یارمەتی دانی دا بەخشتی تازەی پێویست بۆ گەشەو درێژە پێ دانی. لەکاتێدا پەنا دەباتە بەر ئەم دوا هۆکارە کە لەوە دەترسا دووبەرەکیو ناکۆکی (الشقاق) دروست دەبێ، ناوبژیکەرێ لە خزمانی مێردەکە پێی ڕازی دەبنو لە خزمانی ژنێ ناوبژییەك کە پێی ڕازی دەبن ڕەوانە دەکەن، بەهێوریو دوور لە هەڵچوونی دەروونیو خلتەکانی، هەستو شڵەژانەکانی ژیاندا، کە پەیوەندی نێوان ژنو مێردی لێك کردووە، لە سۆنەی ئەو کارتێکەرانەوە دەردەچن کە ژیان تێك دەدەنو کارەکان لەبەر نزیکی یان لە دڵی ژنو مێرد زۆر گەورەنو هەمو خۆشیەکانی تری ژیانیان دادەگرێت. ئەنجا هەردو ناوبژیوانەکان سوردەبن لەسەر ئابڕوی ئەو دو خێزانە ڕەسەنە. بزەیی یان بە منداڵەکاندا دێتەوە کە وردن، لەو ئارەزوەیە دوردەکەونەوە کە یەکێ لەو ژنو مێردەیە بەسەری ئەویتردا زاڵ بکەن ـ وەکو هەندێ جار لەم بارودۆخەدا حاڵەتەکە لەگەڵ ژنو مێردا ئاوا دەبێ ـ خێرو خۆشی یان بۆ ئەو ژنو مێردو منداڵو خێزانە دەوێ کە هەڕەشەی لەناوچونی لەسەرە. هەمیسانە ئەم دوانە ئەمیندارن بەسەر نهێنی یەکانی هەردو خێزانەوە، چونکە خزمی هەردوکیانو مەترسی نییە ڕازەکانیان لای ئەوان باس بکەن، چونکە هیچ بەرژەوەندی یان لەوەدا نییە بڵاوی بکەنەوە، بەڵکو بەرژەوەندی یان لەوەدایە بیانشارنەوە.

هەردوو ناوبژیو بۆ چاك کردنوئاشتەوایی کۆدەبنەوە، گەر ئەو ژنو مێردە خوازیاربوون چاك ببنەوە. تەنیا توڕەبوون ئەم ئارەزووە دادەپۆشێ، بەیارمەتی ئارەزووی توندی هەردوو ناوبژەکە خوا دەتوانێ ئاشتەوایی بخاتە نێوانیانەوە: ﴿إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا﴾. ئەگەر ئەم دووانە ئاشتەوایی یان مەبەستەو خوداش وەڵامیان دەداتەوەو یارمەتییان دەدا ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ

عَلِيمًا خَبِيرًا﴾[١] .

## بۆچی شتێ حەرام دەکەیت خودا بۆی حەڵاڵ کردویت؟

(أنس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەنیزەکی هەبوو کاری سەرجێگای لەگەڵدا دەکرد، عائیشەو حەفصە وازیان لێ نەهێنا تا ئەو کەنیزەی لەخۆی حەرام کرد، خوای گەورە دژی ئەمە ئایەتی نارد: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ...﴾[٢] . واتە: ئەی پێغەمبەر بۆ شتێ لەخۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت، ڕازی بوونی ژنەکانت دەوێت؟ (ابن عباس) دەڵێ: (گەر پیاو ژنەکەی لەخۆی حەرام کرد ئەوە سوێندە با کەفارەتی بدات.... پاشان وتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[٣] .

هەرکەسێ بەژنەکەی بڵێ: تۆ لە من حەرامی، ئەوە دەبێ کەفارەتی سوێند بدات، لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ﴾[٤] . واتە: خودا بەسوێندی بێ مەبەست ناتان گرێ، بەڵکو لەو سوێندانە دەتانگرێ کە سوێندتان لەسەر دامەزراندووەو کەفارەتەکەی خۆراکدانە بە دە هەژار لەو خۆراکە مام ناوەندەی دەیدا بە منداڵەکانی خۆی، یان پۆشاك بۆ کردنیان، یان ئازادکردنی کۆیلەیەك، کێ نەیتوانێ با سێ ڕۆژان بەڕۆژوو بێ، ئەوە کەفارەتی سوێندەکانتانە کاتێ سوێندتان خوارد.

## سوێند خواردن (الایلاء):

هەرکەسێ سوێندی لەژنەکەی خوارد کە کاری جووت بوون لەگەڵ ژنەکەیدا نەکاتو ماوەکە کەمتربێ لە چوار مانگ، باشتر وایە کەفارەتی سوێندی بدات ئەنجا سەرجێگای لەگەڵدا بکات،

---

(١) في ظلال القرآن (٢٦٣، ٢/٢٦٤).

(٢) صحيح الاسناد (ص. نس ٣٦٩٥) نس(٧/٧١).

(٣) متفق عليه: (م١٤٧٣/٠٠/٢٨١٠) خ(٥٢٦٦/٣٧٤/٩).

(٤) المائدة/٨٩.

وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ سوێندەکی خوارد لەسەر شتێو پاشان بینی غەیری ئەوە باشترە لەو، با کامە کارە باشە ئەوەیان بکاتو کەفارەتی سوێندەکەی بدات)[١] . گەر کەفارەتی نەدا دەبێ ئارام بگرێ تا ئەو کاتە تەواودەکات کە باسی کردووە، (پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێندی لە ژنەکانی خوارد، جیابۆوەو لە ژوورەکیدا بیستو نۆ ڕۆژ نیشتەجێ بوو، پاشان دابەزی، پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا سوێندی مانگەکت خواردووە؟ فەرموی: مانگ بیستو نۆ ڕۆژە)[٢] . بەڵام گەر سوێندی خوارد قەت توخنی ژنەکەی نەکەوێو یان ماوەیەکی دابنێ لە چوار مانگ بەسەرەوەبێ، گەر کەفارەتی داو جووت بوو لەگەڵی دا ئەوە باشە، یان چاوەڕێ دەکات تا چوار مانگ تەواودەکات، دوای ئەوە داوای سەرجێگای لێ دەکات یان تەڵاقدانی، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ* وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[٣] . ئەوانەی سوێند لە ژنەکانیان دەخۆن چوار مانگ چاوەڕێ دەکەن، گەر گەڕانەوە ئەوە خوا لێ بوردەو بە بەزەیی یە، گەر نیازیان بوو جیا ببنەوە ئەوە خوا بیسەرو زانایە.

(نافع) لە (ابن عمر) گێڕاویەوە: ئەو لەڕاست ئەو سوێندە دەیوت کە خودا باسی کردووە: (دوای ئەو ماوەیە بۆ کەس ڕەوا نییە لەم دوو کارە زیاتر بکات، یان بەچاکی ژنەکە بگێڕێتەوە ژێر باڵی، یان نیازی تەڵاقدان بێت، وەکو خوای گەورە فەرمانی کردوە)[٤] .

## زیهار (الظهار):

هەرکەسێ بە ژنەکەی بڵێ: (أنت علي كظهر أمي) واتە: تۆ بۆ من وەکو پشتی دایکم وایت، ئەوە زیهاری کردووە، ژنەکەی لێ حەرام دەبێ تا کەفارەت دەدات وەکو خوای گەورە لە کتێبی خۆیدا ناوی بردووە: ﴿ وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ * فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ

(١) صحيح (ص ج٦٢٠٨) م(٣/١٢٧١/١٦٥٠) نس (٧/١١) جة (١/٦٨١/٢١٠٨).
(٢) صحيح (ص. نس ٣٢٣٣) خ(٤٢٥/٥٢٨٩) ت(٢/٩٩/٦٨٥).
(٣) البقرة: ٢٢٦/٢٢٧.
(٤) صحيح الارواء (٢٠٨٠) خ(٩/٤٢٦/٥٢٩٠).

مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[1] . واتە: ئەوانەی زیهار لەگەڵ ژنەکانیاندا دەکەن، پاشان لەوەی گوتویانە دەگەڕێنەوە، دەبێ بەرئەوەی دەست لە ژنەکەیان بدەن کۆیلەیێ ئازاد بکەن، ئا بەوە ئامۆژگاری دەکرێن، خوا ئاگادارە بەو کارانەی دەیکەن. گەر کەسێ کۆیلەی دەست نەکەوت بەر لە دەست دان لە ژنەکەی دەبێ دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژووبێ، کێ نەیتوانی با شەست هەژار نان بدات، ئەوە بۆ ئەوەیە بڕوا بەخواو پێغەمبەرەکەی بێنن‌و ئەوە سنوری خودایەو بێ بڕوایان سزایەکی بەچێژیان هەیە.

(خويلة بنت مالك بن ثعلبة) گێڕاویەوە: (مێردەکەم (أوس بن الصامت) زیهاری لەگەڵدا کردم، هاتمە لای پێغەمبەر (ﷺ) سکالاّم لای کرد، پێغەمبەر (ﷺ) لەڕاست ئەودا ئاخاوتنی لەگەڵدا کردم‌و دەیفەرمو: ئەو ئامۆزاتەو لەخوا بترسە، نەڕۆیشتم تا خوا ئایەتی دابەزاند: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ﴾ بۆ فەرز. فەرموی: کۆیلەیێ ئازاد دەکات، وتی: دەستی ناکەوێ، فەرمووی: دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو دەبێ، وتی: ئەو پیربووە لەتوانایدا نیی بەڕۆژوبێ، فەرموی: با شەست هەژار نان بدات. وتی: هیچی نی یە بیکات بی خێر، پێغەمبەر (ﷺ) سەبەتەیەك (العرق)ی لەوکاتەدا هێنا خورمای تێ دابوو. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا منیش بە سەبەتەیەکی تر یارمەتی دەدەم. فەرموی: چاك دەکەیت. بڕۆ دەرخواردی شەست هەژاری بدەو بگەڕێوە لای ئامۆزایەکەت. وتی: سەبەتە (العرق) شەست ڕبە (الصاع) دەبوو)[2] . (عروة بن الزبير) گێڕاویەوە: (عائیشە) وتی: (خوای گەورە گوێ بیستی هەمو شتێکە، من گوێم لە (خولة بنت ثعلبة) بوو هەندەکم گوێ لێ نەبوو، ئەو سکالاّی لای پێغەمبەر (ﷺ) دەکردو دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا مێردەکەم گەنجیی بەبا بردم، منداڵی زۆرم بۆ ئەو هێنایە دنیاوە، تا پیر بووم‌و لە منداڵبوون کەوتم، ئەوجا زیهاری لەگەڵدا کردم، خوایە سکالاّ بۆ تۆ دەکەم. نەڕۆیشت تا جبریل ئەم ئایەتانەی دابەزاند ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ ....﴾[3] .

هەرکەسێ بۆ یەك ڕۆژ یان مانگێ زیهار لەگەڵ ژنی دا بکات‌و بڵێ: (تۆ بۆ من یەك مانگ

---

(١) المجادلة: ٣/٤.

(٢) حسن (ص. ٢ ١٩٣٤) د(٦/٣٠١/٢١٩٩).

(٣) صحيح (ص. جه ١٦٧٨) جه(١/٦٦٦/٢٠٦٣).

پشتت وەکو پشتی دایکمە، ئەوە زیهاری کردووە، گەر کەفارەتی سوێند بدات ئەوە هیچی لەسەر نییەو گەر بەر لە ماوەکە چووە لای ژنی ئەوە دەبێ کەفارەت بدات. (سلمة بن صخر البیاضی) گێڕاویەوە: (من ئارەزووی ژنانم زۆربوو کە کەس وانەبێ، کاتێ ڕەمەزان هات (ترسام بچمە لای خێزانم) زیهارم لەگەڵ ژنم دا کرد تا ڕەمەزان تەواودەبێ، شەوێکیان قسەی لەگەڵ کردمو هەندێ لەشی خۆی بۆ دەرخستم منیش سەرجێگام لەگەڵدا کرد. گەر بەیانی بۆوە بە خزمانم وت: ئەم پرسیارەم بۆ لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن. وتیان: (ئەم کارە ناکەین، ئەوکاتە خوا ئایەتمان لەشاندا دادەبەزێنێ، یا پێغەمبەر (ﷺ) قسەیەك دەکات ئابڕومان دەڕوات. بەڵام داهاتوو ئێمە بەهۆی گوناهەکەت تەسلیمت دەکەین، بڕۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) باسی خۆتی لا باسبکە. منیش ڕۆیشتم تا گەیشتمە خزمەتیو هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ ئەم کارەت کردوە؟ وتم: بەڵێ من وام کردووەو ئەوەتا خۆڕاگرم بۆ حوکمی خوا بەسەرمدا. فەرمووی: کۆیلەیێ ئازاد بکە. وتم بەخوا تەنیا ئەم گەردنەی خۆم هەیە. فەرمووی: دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژو ببە. وتم: باشە تەنیا بەڕۆژو ئەم بەڵایەم توش نەبووە؟ فەرمووی: خۆراکی شەست هەژار بدە. وتی: سوێند بەوەی تۆی ناردووە ئێمە ئەو شەومان بێ خواردنی ئێوارە بردۆتە سەر. فەرمووی: بڕۆ لای زەکات کۆکەرەوەی بەنی زورەیق پێی بڵێ با پێت بداتو بیدە شەست کەسو ئەوەی مایەوە با بۆ خۆت بێت)[1] . لێرەدا ئەمە دەردەخات پێغەمبەر (ﷺ) زیهارەکە نکوڵی لێ ناکات، بەڵکو ئەوەی پێ ناخۆش دەبێ بەر لە ماوەکە دەست لە ژنەکەی دەدات.

حوکمی زیهار: زیهار حەرامە، چونکە خوا بە بوختانو درۆی وەسف کردووە: ﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾[2] . واتە: ئەوانەی زیهار دەکەن لەگەڵ ژنەکانیاندا ئەوانە دایکی ئەوان نین، دایکی ئەوان تەنیا ئەوانەن کە ئەوان لێیان پەیدابوون، ئەوان قسەیەکی خراپو درۆ دەکەن، خودا لێ بوردەو چاوپۆشی دەکات.

❊ ❊ ❊

(١) صحيح (ص. جه ١٦٧٧) جه(٢٠٦٢/٦٦٥/١).

(٢) المجادلة: ٢.

# جیابوونەوە ( الطلاق = تەڵاق )

ڕابردو بینیمان ئیسلام چەندە سوورە لەسەر خێزانی موسڵمانو دروستیەکەیو بەرقەراربونی ژیانی تێیداو ئەو ڕێگا چارەیەم بینی، ئەو چارەسەریانەت بینی کە ئیسلام داینـاوە بـۆ ئـەو ناکۆکی یەی لەخێزانی موسڵماندا دروست دەبێ، ئەنجا تاوانی یەکێکیان بێ یان تـاوانی هـەردولا بێت.

هەندێ جار لەبەر گەورەیی ناکۆکیو دەبەڕێکرا چونەکەدا ئەم چارەسەریانە بێ هودە دەبـن، بۆیە چارەسەری بەهێزتر هەیە کە جیابونەوەو تەڵاقە. ئەوکەسەی لە یاساکانی تـەڵاق ڕادەمێنـێ دەبینی ئیسلام ئـەو کاتـەش سـوورە لەسـەر دامـەزراوەی خێـزانو خولیـای مانـەوەی ئـەو دوو هاوسەرەیە، کاتێ ئیسلام تەڵاقی حەڵاڵ کـردووە نـەیکردووە بـە یـەك جـار ، بەشـێوەیەك ئـەم پەیوەندییە بەیەکجاری لەنێوان ژنو مێرد بپچڕێ، بە ڕەنگێ گەر پیاو ژنـی تەڵاقـدا قـەت پـێی شاد نابێتەوە، بەڵکو کاتێ ڕێگای بە تەڵاقداوە، فەرمانی داوە کە بە چەند جارێ ئـەنجام بـدرێت: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[1] . واتە: تـەڵاق دوو جـارە، ئـەنجا ژنەکـە بەباشی ڕادەگرێ یان بەباشی دەستی لێ بەردەدرێت. کاتێ پیاو ژنـی تەڵاقـدا، تـەڵاقی یەکـەمو دووەمی بوو تا عیددەی تەواو نەکات مافی نییە لەماڵەوە دەری بکـات، بـەڵکو دەرچـوونی بـۆ نییە، کە مەبەست ئەوەیە ئەو توڕەبوونە بنیشێتەوە کە بۆتە هۆی تەڵاقدان، پاشان هانیان دەدات بگەڕێنەوە دۆخی جاران، پەروەردگارمان لێرەدا ئەمەی دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾[2] . واتە: (ئەی پێغەمبەر کاتێ ژنتان تەڵاقـدا لـە عیددەیانـدا تـەڵاقیان بدەنو عیددەکە بژمێرنو تەقوای خوا بکەن کە پەروەردگارتانە، لەماڵەوە دەریان مەکەن، مەگەر

(١) البقرة: ٢٢٩.

(٢) الطلاق: ١.

بە تاوانەکی ئاشکرا هەڵسن لە ماڵ دەرناکرێن ئەمە سنوری خوایە، کێ سنووری خوا بشکێنێ ئەوە ستەمی لە خۆی کردووە، نازانێ لەوانەیە خوا دوای ئەوە فەرمانەکی تر بڕیار بدات). واتە: مێرد لە تەڵاقی پەشیمان بێتەوەو خوا گێڕانەوەی بخاتە ناو دڵو ئەمە ئاسانترە.

## بەشەکانی تەڵاق (جیابونەوە):

### ١ـ لەڕووی وشەوە: تەڵاق دەبێ بە دوو بەشەوە:

### ڕاستو ڕەوان (الصريح)و ناڕاستەوخۆ (الكناية):

ڕستەی ڕاستەوخۆ ئەوەیە کە لەکاتی وتنی دا مرۆڤ تێی دەگاتو هیچ مانایەکی تر هەڵناگرێت، وەکو: تۆم تەڵاقدا، یان تەڵاقدراویت، هەر وشەیەك لە وشەی تەڵاق جیابۆتەوە. ئەمەش بەڕاستی بێ لێ یان بەگاڵتە بێ تەڵاقی پێ دەکەوێت، (ابوهريرة) گێڕاویەوە: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی (ﷺ): (سێ شت بەڕاستی بگوترێن یان بەگاڵتە بگوترێ دادەمەزرێن: مارەکردن، تەڵاق، ڕەجعەت)[1].

قسەی ناڕاستەوخۆ وەکو: (بڕۆوە ماڵی باوکت)و شتی تر. ئەمەیان بێ نیەت تەڵاقی پێ ناکەوێت، گەر مەبەستی تەڵاق بوو، تەڵاقی دەکەوێت. عائیشە گێڕاویەوە: (ابنة الجون) کاتێ چووە ژووری پێغەمبەر (ﷺ)و لێ ی نزیك کەوتەوە وتی: (اعوذ بالله منك) فەرموی: خۆت بە کەسێکی مەزن پەنادا (الحقي بأهلك) بگەڕێوە بۆ ماڵی خانەوەداکەت[2] .

لەگێڕانەوەی (کعب)دا هاتووە: کاتێ بەهۆی دواکەوتنی لە تەبوك لەگەڵ دوو لە برادەرانی پێغەمبەر (ﷺ) دووری دەخاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی بۆ نارد (لە ژنەکەت دوور بکەوە، وتی: ئایا تەڵاقی بدەم چی بکەم؟ فەرموی: با لێ ی دووربکەوێتەوەو توخنی نەکەوێت. بە ژنەکەی وت: (الحقي بأهلك) بڕۆوە ماڵی خانەوادەکەت)[3] .

---

(١) حسن (الارواء/١٨٢٦) د(٢١٨٠/٢٦٢/٦) (ت ١١٩٥/٣٢٨/٢).

(٢) صحيح (ص.نس ٣١٩٩) خ(٥٢٥٤/٣٥٦/٩).

(٣) متفق عليه: خ(٤٤١٨/١١٣/١٣) م(٢٧٦٩/٢١٢٠/٤).

**٢ـ تەڵاق لەڕووی تالۆق کردن (التعليق)و تەڵاقی دەست بەجێ (التنجيز)دا:**

تەڵاقی ژن بە دوو شێوەیە یان دەست بەجێیە، یان تالۆقە واتە بەستنەوە بـە مەرجێکـەوە. دەست بەجێ وەکو دەڵێی: تۆ تەڵاق دراوی. تالۆقو پەیوەست کردن وەکو: ئافرەت گەر تۆ چوویە فلان شوێنە تەڵاق دراویت. گەر ئەمەی مەبەست تەلاق بێ ئەوە دەکـەوێ، بـەڵام لـە مەزهـەبی (ابن تيمية ـ رـ) وەکو لە (مجموع الفتاوى: ٤٤ـ ٤٦ـ ٥٨ــ ٦٠ــ ٦٤ــ ٣٣/٦٦) ئامـاژەی بـۆ کردووە گەر مەبەستی هاندانی کارێ بێ یـان قەدەغـەکردنی بـێ لـەکاری ئـەوە سـوێندە، گـەر کارەکەی نەکرد ئەوە هیچی ناکەوێتە سەر، گەر نا دەبێ کەفارەتی سوێند بدات[1].

**سێ یەم: تەڵاق لەڕووی سوننەو بیدعەوە:**

تەڵاق لەڕووی سوننیو بیدعەوە دەبن بە دوو بەشـەوە: تـەڵاقی سـوننیو تـەڵاقی بیـدعی.

تەڵاقی سوننی یان سوننەتی ئەوەیە کە پیاو ژنەکەی لـە پـاکی دا بەیـەك تـەڵاق تـەڵاق بـداتو نەچوبێتە لای. خوا فەرمویەتی: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[2]. ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[3].

پێغەمبەر (ﷺ) لە تەڵاقی ژنی (ابن عمر)دا ئایەتەکەی ڕون کردۆتەوە کاتـێ لـە حـەیزدا دەبێ، (عمر) لەڕاست ئەمە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیار دەکات؟ ئەویش (ﷺ) فەرموی: (فەرمانی پێ بکە بیگێڕێتەوە، پاشان دەستی پێوە بگرێ تا پاکژ دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە بـێ نوێژییەوە، پاشان پاکژ دەبێتەوە، پاشان گەر ویستی لای خۆی دەیهێڵێتەوەو گەر ویستی تـەڵاقی دەدات بەر لەوەی دەستی لێ بدات، ئەمە ئەو عیددەیەیە کە خوا فەرمانی داوە ژنی تێدا تـەڵاق بدرێت)[4].

بەڵام تەڵاقی بیدعەیی: ئەو تەڵاقەیە پێچەوانەی شەرعە، وەکو تەڵاقدانی لەکاتی بێ نوێژی

---

(١) مالك له (الموطأ)دا (١١٩٦)

(٢) البقرة: ٢٢٩.

(٣) الطلاق:١.

(٤) متفق عليه: خ(٩/٤٨٢/٥٣٣٢) م(٢/١٠٩٣/١٤٧١).

دا یان پاکی دا کە جووت دەبێ تێی دا، یان ژن بە یەك وشە سێبەسێ تەلاّق دەدات، یان لە یەك دانیشتندا، بۆ نمونە گەر بڵێ: تۆ سێبەسێ تەلاّقت کەوتووە، یان (تۆ تەلاّق دراوی، تۆ تەلاّقدراوی، تۆ تەلاّقدراویت). ئەم جۆرە تەلاّقە حەرامەو بکەرەکەی گوناهبارە. گەر تەلاّقی داو لە بێ نوێژی دابوو ئەوە تەلاّقێکی کەوتووە، گەر ڕەجعی بوو فەرمان بە گەڕانەوەی دەکرێ، پاشان دەیگێڕێتەوە تا پاکژ دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە حەیزەوە، پاشان پاکژ دەبێتەوە، پاشان گەر مەبەستی بو دەیهێڵێتەوە، گەر مەبەستی نەبوو بەر لە دەست لێدانو جووت بونی تەلاّقی دەدات، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) بە (ابن عمر)ی فەرموو. بەڵگە لەسەر تەلاّق کەوتن ئەم گێڕانەوەیە کە (ابن عمر) دەڵێ: (حسبت علي بتطليقه)[1] . واتە: یەك تەلاّق بۆم حیساب کرا.

(الحافظ ابن حجر) لە (فتح الباري)دا (٩/٣٥٣)دا وتویەتی: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە بەگێڕانەوەو ئەو ڕابەری (ابن عمر)ە لەوکارانەدا ئەو دەیکات، گەر ویستی دوای ئەوە تەلاّقی بداتەوە، گەر بە (ابن عمر)ی وترابێ ئەوە یەك تەلاّقت کەوتووە ئەگەری ئەو قسەیەی کە دەڵێ: غەیری پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی پێ وتووە زۆر دوورە، لەگەڵ بوونی بەڵگەی توند لەو بەسەرهاتەدا. چۆن ئەم گومانە دەبرێ لەم بەسەرهاتەدا (ابن عمر) شتێکی بە بۆچونی خۆی کردووە؟ لەکاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەو کارەی ئەو تورەو زویر دەبێ؟ چۆن لە بەسەرهاتی ڕابردودا لە کارەکەیدا ڕاوێژی پێ ناکات؟ (الحافظ) دەڵێ: (ابن وهب) لە (مسند)ەکەی دا لە (ابن أبي ذئب)ی گێڕاوەتەوە: (نافع) بۆی گێڕاوەتەوە: (ابن عمر) ژنەکەی لەکاتی حەیزدا تەلاّقدا، (عمر) لەڕاست ئەوەی لە پێغەمبەری خوای (ﷺ) پرسی؟ فەرموی: (پێی بڵێ بیگێڕێتەوە، پاشان دەستی پێوە بگرێ تا پاکژدەبێتەوە) .

(ابن أبي ذئب) لە پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (وهي واحدة) ئەمە تەلاّقێکە. (ابن ابي ذئب) دەڵێ: (حنظلة بن أبي سفيان) لە (سالم) ئەو لە باوکیو باوکی لە پێغەمبەری ـ دخ گێڕاوەتەوە.

(الحافظ) دەڵێ: (الدارقطني) لەڕێگای (يزيد بن هارون) لە (ابن أبي ذئب)و (ابن اسحاق) هەموویان گێڕاویانەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە ئەمە یەك تەلاّق بووە (هي واحدة). ئەمەیە دەقەکە لە بابەتی ناکۆکی یەکەدا کە پێویستە بۆی بچین. (تەواوبوو).

---

(١) (صحيح الارواء ١٢٨) خ(٩/٣٥١/٥٢٥٣).

## تەلاقی سێ بەسێ

بەڵام گەر ژنی سێبەسێ بەیەك وشەو لەیەك دانیشتندا تەلاقدا ئەوە یەك تەلاق دەكەوێ، (مسلم) لە (ابن عباس)ی گێڕاوەتەوە: (تەلاق لە سەردەمی پێغەمبەرو (ﷺ) ئەبوبەكرو چەند ساڵەكی عومەردا تەلاقی سێبەسێ یەك دانەبوو، عومەر وتی: خەڵكی داوای پەلەی لەكارێدا كرد كە هێواشی تێدا هەبوو، ئەگەر بیچەسپێنین لەسەریان؟ ئەوەبو چەسپاندمان بەسەریاندا).

ئەم ڕایەی عومەر ئیجتیهادەكی ئەوبوو، مەبەستی ئاسانكاری بوو بۆ بەرژەوەندییەك كە خۆی پێی وا باش بووە، دروست نییە فتوای پێغەمبەر (ﷺ) تەرك بكرێ، كە سەحابەو خەلیفەكانی دوای ئەو پەیڕەوییان لێ كردووە.

## چوارەم: لەڕووی گێڕانەوە (الرجعة)و نەگێڕانەوە:

تەلاق یان ڕەجعی یە یان بائینەیە، بائینەش یان بائینەی گەورەیە یان بچوكە. تەلاقی ڕەجعی ئەو تەلاقەیە ژنەكەی گواستبێتەوەو چووبێتە لای بەبێ بەرامبەری دارایی‌و پێشدا تەلاقی نەداوە، یان یەك تەلاقی داوە. خوا فەرمویەتی: ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾. وەكو باسكرا. ئەو ژنەی بە تەلاقی ڕەجعی تەلاق دەدرێ تا لە عیددە دابێ هەر ژنی ئەوە، هەركاتێ ویستی دەتوانێ بیگێڕێتەوە سەرپەرشتیارو ڕازی بوونی ژنی ناوێ، قورئان دەفەرمێ: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا﴾[1] واتە: ئەو ژنانەی تەلاق دەدرێن سێ پاكی چاوەڕێ دەكەنو بۆیان ڕەوا نی یە ئەوەی خوا لەمنداڵدانیاندا دروستی كردووە بیشارنەوە، مادام بڕوایان بە خواو پەسڵان (قیامەت) هەیە، مێردەكەی لەپێشترە بگەڕێتەوە لای گەر ئاشتەواییان ویست.

---

(١) البقرة: ٢٢٨.

# ( خولع ) یان خۆکڕینەوە

(پێناسەی): (الخلع) لە دارنینەوە هاتووە، لەوەوە هاتووە کە پۆشاکێ دادەڕنێت، چونکە ژنو مێرد پۆشاکن بۆ یەکتری. ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾[١] . لە زاراوەی فیقهی زانایاندا: جیابونەوەی پیاوە لە ژن لە بەرامبەرێکدا کە لە ژنەکەی وەردەگرێتو خۆی دەکڕێتەوە بە خۆکڕینەوە (الفدية) ناسراوە[٢] .

## لەڕووی ڕێپێدانی شەرعەوە :

کاتێ ناکۆکی نێوان ژنو مێرد زۆربوو نەتوانرا پێك بهێنرێنەوەو ژنەکە حەزی لێ بوو خۆی بکڕێتەوە، دەتوانێ خۆی بکڕێتەوەو لە بەرامبەردا بە دارایی یەك تا قەرەبوی ئەو زیانەی بکاتەوە بەهۆی جیابونەوەی پێی دەگات. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾[٣] . واتە: حەڵاڵ نییە بۆتان لەوەی پێتان داوە شتەکیان لێ بستێنن، مەگەر لەوە ترسان کە سنووری خوا نەپارێزرێ، گەر ترسان لەوەی سنوری نەپارێزرێ گوناهیان لەسەر نییە کە خۆی بکڕێتەوە.

(ابن عباس) گێڕاویەوە: ژنی (ثابت بن قیس بن شماس) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وتی: من لاریم لە ڕەوشتو ئاینی (ثابت) نییە، بەڵام لە ناسوپاسگوزاری دەترسم (واتە: مافی مێرد نەدەم). پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئایا باخچەکەی دەدەیەوە؟ وتی: بەڵێ. ئەو دایەوەو فەرمانی بە ئەویش کرد تەڵاقی بدات)[٤] .

---

(١) فقه السنة (٢/٢٥٣). فتح الباري (٩/٣٩٥).

(٢) البقرة: ٢٢٩.

(٣) البقرة: ٢٢٩.

(٤) صحيح الارواء (٢٠٣٦) خ(٥٢٧٦/٩/٣٩٥).

**ترساندن لە داواکردنی جیابوونەوە:**

(ثوبان) ڕەزای خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

(هەر ژنێ لەخۆوە داوای تەڵاق بکات ئەوە بۆنی بەهەشتی لێ حەرامە)[١] .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ئەوانەی داوای خولع دەکەن ژنانی دووڕوون)[٢] .

**ترساندنی پیاوان لە لەمپەردانان لەبەردەم ژناندا:**

گەر پیاو ئافرەتێکی قبوڵ نەبوو لەبەر هەر هۆیێ بو لێ ی دورکەوتەوە، ئەوە پێویستە بەچاکی وازی لێ بێنێ، وەکو خوا فەرمویەتیو نابێ بەندی بکاتو ئازاری بدات تا خۆی بکڕێتەوە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء...﴾[٣] . واتە: گەر ژنتان تەڵاقدانو ماوەی خۆیان تەواوکرد یان بەچاکی ڕایان بگرن یان بەچاکی لێیان جیاببنەوەو بۆ زیان مەیان هێڵنەوە تا دەست درێژییان بکەنە سەر، کێ وا بکات ئەوە ستەمی لەخۆی گرتووەو ئایەتەکانی خوا بە گاڵتە مەگرنو یادی بەهرەکانی خوا بکەن بەسەرتانەوە، ئەو ئایەتانەی بەسەرتاندا دابەزیوە لە دەستورو کارزانی ئامۆژگاریتان دەکاتو تەقوای خوا بکەن، بزانن خوا بە هەمو شتێ زانایە).

خوا فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لايحل لكم ترثوا النساء﴾[٤] . واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بۆتان حەڵاڵ نییە بەتۆبزی ژنان بەمیرات بگرنو ڕێگایان پێ مەگرن، تا هەندێ لەو مارەیی یەی پێتان داون لێیان بستێننەوە، مەگەر خراپکاری یەکی ئاشکرا بکەن، بەچاکە کۆبونەوەیان لەگەڵدا بکەن، گەر حەزتان پێیان نەکرد لەوانەیە حەزیش بە شتێ نەکەن بەڵام خوای گەورە خێرو بێرەکی زۆری بۆ ئێوە تێدا دابنێت.

**( خولع ) یان خۆکڕینەوە، هەڵوەشاندنەوەی مارەکردنەکەیە نەك تەڵاق دان بێت:**

گەر ژن خۆی کڕییەوەو مێرد خۆی لێ جیا کردەوە جڵەوی خۆی لەبەردەستی خۆی دایەو بۆ خۆی نییە بێ ڕازی بوونی ژنەکە بیگێڕێتەوە ژێر باری خۆی، ئەم جیابونەوە هەرچەندە بە وشەی

(١) صحيح (ص. جه ١٦٧٢) جه (١/٦٦٢/٢٠٥٥).

(٢) صحيح. ص. ج ٦٦٨١) ت(٢/٣٢٩/١١٩٨)

(٣) البقرة: ٢٣١.

(٤) النساء: ١٩.

تەڵاق ڕوودەدات، بەڵکو هەڵوەشاندنەوەی مارەکردنەکەیە لە بەرژەوەندی ژنەکەدا لە بەرامبەر ئەو بڕەی خۆی پێ دەکڕێتەوە. (ابن القیم) دەڵێ: (بەڵگەمان بۆ خولع کە تەڵاق نییە ئەوەیە، خوای گەورە سێ ئەحکامی دوای چوونە لای ژن دامەزراندوە کە پێچەوانەی خولعە:

(١) مێرد لەپێشترە بۆ گەڕانەوە. (٢) تەڵاق سێ دانەیە دوای تەواوبوون بۆی نییە مارەی بکاتەوە تا مێردەکی تر نەکاتەوەو لەگەڵی دا جووت نەبێت.

(٣) عیددەکەی سێ پاکی (القروء) یە. بە دەقو کۆی دەنگ لە خولع دا ڕەجعەتو گێڕانەوە نییە. بە سوننەتو قسەی ئەسحاب سەلماوە عیددەکەی یەك حەیزە. بە دەق سەلماوە دوای دوو تەڵاق دروستەو سێ یەم تەڵاقی دوای ئەوە بدرێت. زۆر بە ئاشکرا دیارە کە خولع تەڵاق نییە، ئەوەتا خوای بێ گەرد فەرمویەتی: ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ...﴾[1] . وەکو ڕابردوو مانا کراوە. بەم شێوەیە هەرچەندە ئەمە تایبەت نییە بە تەڵاقدراوێك دووجار تەڵاقدرابێ، بەڵام بۆ ئەمەو بۆ غەیری ئەمەش بەکاری دێنێت. ناشێ ڕاناوەکە (الضمير) بۆ کەسێ بگەڕێتەوە کە ناوی نەدرابێو ناوبراوەکە بەلاوە بنرێت، بەڵکو یان تایبەت دەبێ بە ڕابردووەو یان بۆ ئەوو غەیری ئەو بەکاری دێنێت، پاشان فەرمویەتی: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ﴾[2] . ئەمە بەکاردێ بۆ کەسێ دوای خۆکڕینەوەو دوو تەڵاق، تەڵاق دەدری بەیەکجاری، چونکە ئەمە باسکراوەو پێویستە لەژێر ئەو پەیڤەدا مرۆڤ بڕواتە ناویەوە، (ابن عباس) کە ئەو تەفسیرزانەبوو پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بۆ کرد فێری (تەئویل) ببێ ئاوا لێکی داوەتەوە، ئەمە پاڕانەوەیەکە ڕەت بونەوەی نییە. گەر ئەحکامەکانی خۆکڕینەوە لە ئەحکامەکانی تەڵاق جیایە، کەواتە بەڵگەیەکە، لە ڕەگەزی ئەو نییە، ئەمەش خواستی دەقو قیاسو وتەی سەحابەکانە)[3] .

---

(١) البقرة: ٢٢٩.

(٢) البقرة: ٢٣٠.

(٣) زاد المعاد/ ابن القیم/١٩٩/٥. تێبینی: بەڵام هەندێ زانای تر دەڵێن، وەکو (النووي) خولع تەڵاقەو وەکو وشەی تەڵاق ژمارەکە کەم دەکاتەوە، چونکە خوا لەنێوان دوو تەڵاقدا باسی کردووە (الطلاق مرتان). (مغني المحتاج/ للشربيني/ج٢/ل: ٣٥٤). دیسان وەکو (القرطبي) لە (تفسیر)ەکەی باسی کردووە (خولع) تەڵاقە (فان طلقها) مەبەست لە تەڵاقی سێ یەمە. ﴿حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾ مەبەست لە کاری جووت بونە نەك هاوسەرگیری، تا مێردی دووەم لەگەڵی دا جووت نەبێ بۆ مێردی یەکەم حەڵاڵ نابێتەوە

# عیددە (العدة)

پێناسە: وشەی (العـدة): لە ژماردن (العدد)ەوە هاتووە، واتـە: ژمـاردنی ڕۆژان و پاکیـەکان لەلایەن ژنەوە. لە (فیقهدا) ئەو ماوەیەی ژن دەیژمێرێ، دوای مردنی مێـردی یـان تـەڵاقی، بـە منداڵ بون یان بە پاکی یان بەمانگ.

## جۆرەکانی:

هەر ژنی مێردەکەی مرد عیددەکەی چوار مـانگ و دە ڕۆژە، چـووبێتە لای یـان نەچـوبێتە لای، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾[1] . واتە: ئەوانەی دەمرن لەئێوەو ژنیان بەجێ دێڵن، دوای ئەوان چـوار مـانگ و دە ڕۆژ چاوەڕێ دەکەن، بەڵام گەر ئەم ژنەی مێردی چـووبێتە لای و دووگیـان بـێ عیددەکـەی بـەدانانی منداڵەکە تەواو دەبێت: ﴿وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[2] . (المسور بـن مخرمـة) گێڕاویەوە: (سبيعة الاسلمية) دوای مردنی مێردی بە چەند شەوێ بووە زەیستانی، هاتە خزمـەت پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێ کرد ڕێگای مێردکردنەوەی پێ بدات، ئەویش ڕێگای پـێ دا، ئـەوەبو مێردی کردەوە)[3] . ئەو ژنەی هەر دەزگیران بووەو نەگوازراوەتەوەو مێردی نەچـۆتە لا عیـددەی نییە لەدوای تەڵاقداندا: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾[4] . واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە گەر ژنـانی بڕوادارتان مارە بڕین و پاشان تەڵاقتان دان بەر لەوەی توخنی یان بکەون عیددەیان لەسەر نییە).

ئەو ژنەی تەڵاق دراوەو مێردی چۆتە لاو دووگیان بووە ئـەوە عیددەکـەی بـە منـداڵ بـوون

---

(١) البقرة: ٢٣٤.

(٢) الطلاق: ٤.

(٣) متفق عليه: خ(٥٣٢٠/٩/٤٧٠). (م ١٤٨٥/١١٢٢/٢).

(٤) الاحزاب: ٤٩.

تەواو دەبێت، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَأُوْلَـاتُ الْأَحْمَـالِ أَجَلُهُـنَّ أَن يَـضَعْنَ حَمْلَهُـنَّ﴾ . واتـە: دووگیانەکان ماوەیان تا ئەو کاتەیە منداڵیان دەبێت. (زبیر بن العوام) دەڵێ: (ئەو (ام کلثوم بنت عقبة)ی لابووە، ئەو پێی دەڵێ لەکاتێدا دووگیان دەبێ پێی دەڵێ: بە تـەلاقێ دڵـم شـاد بکـە، ئەویش تەلاقی دەدات، دوایی دەڕواتە نوێژ، کاتێ گەڕایەوە بینی منداڵی بـووە، ئـەنجا وتـی بـۆ فریوی دام خوا فریوی بدات؟! پاشان هاتە خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەویش فـەرموی: (سـبق الکتاب اجله، اخطبها الی نفسها)[1] . واتە: کاتێ عیددەکـە بەسەرچـووەو (بـووە بـە بائینـەی گەورە) داوای مارەکردنەکی تازە لەو بکەوە.

گەر سوڕی بێ نوێژی هەبوو عیددەکەی سێ بێ نوێژی یە: ﴿وَالْمُطَلَّقَـاتُ يَتَرَبَّـصْنَ بِأَنفُـسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوَءٍ﴾[2] . واتە: ژنانی تەلاقدراو سی حەیز (یان پـاکی) چـاوەڕێ دەکـەن. (القـرء) واتـە: (حەیز): (عائیشە) گێڕاویەوە: (أم حبیبـة دەکەوێتە حەیزەوە، لەم بارەوە لـە پێغەمبـەری (ﷺ) پرسیار کرد، فەرمانی دایە (ان تدع الصلاة ایام اقراءها)[3] . واتە: ڕۆژانی حەیز نوێژ نەکات.

گەر ژنەکە بچوك بوو نەدەکەوتە حەیزەوە، یان نائومێد بووبـوو نەدەکەوتـە حـەیزەوە ئـەوە عیددەکەی سێ مانگە. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِـيضِ مِـن نِّـسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ﴾[4] . واتە: ئەو ژنانەی ئێوە کە لـە حـەیز دەکـەون گەر کەوتنە گومانەوە عیددەیان سێ مانگە، وە ئەوانەی حەیزیان نەبینیوە.

## ئەو ژنەی مێردی دەمرێ چی لەسەر واجبە:

ئەو ژنەی لە پرسەی مێردی کۆچکردووی دایە (الاحداد) دەبێ تا عیددە تەواو دەکات تـێی بێنێتەوە. پرسەو ماتەمینی یە (الاحداد) بریتی یە لەمە: ژنەکە واز لـە جـوانیو بـۆنی خـۆشو خشڵو جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگو بۆیەو کلو چاو ڕەش کردن بێنێـت. (أم عطیـة) دەڵـێ: (ئێمـە

---

(١) صحیح: (ص. جه ١٦٤٦) جه (٢٠٢٦/١/٦٥٣).

(٢) البقرة: ٢٢٨.

(٣) صحیح لغیره (ص. د ٢٥٢) د(١/٤٦٣/٢٧٨).

(٤) الطلاق/ ٤.

قەدەغەمان دەکرد پرسەو سەرەخۆشی لە سێ ڕۆژ پتر دابنرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد نەبێ، کە چوار مانگ‌و دە ڕۆژ ڕۆنراوە، کلمان لە چاو نەدەکردو بۆنمان لەخۆ نەدەداو بەرگی بۆیاغ کراومان نەدەکردە بەر تەنیا کراسی (عصب) نەبێ، گەر یەکێ لە حەیز پاك بونەوە خۆی دەشوشت ڕێگای پێ درابوو هەندێ بۆنی (کوست) لەخۆی بدات، یاساغ کرابووین شوێن جەنازە بکەوین)[1] . (أم سلمة) گێڕاویەوە: (ئەو ژنەی مێردی مردووە جلوبەرگی بۆیەکراو بە زەرتك (المعصفر) و بەرگی بۆیەکراو (المشق)و خشڵ‌و بۆیە لەخۆدان (التخضب)و کلدان لە چاو)[2] .

## ئەوەی پێویستە لەسەر ژنێکی لە تەلاقی ڕەجعیدا لە عیددە دایە ئەنجامی بدات:

پێویستە لە ماڵی مێردی بمێنێتەوە تا عیددە تەواودەکات، نابێ بڕواتە دەرەوەو ڕەوا نییە بۆ مێرد دەری بکات، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾[3] . ڕابردوو مانا کراوە.

## ئەو ژنەی تەلاقی بائینە (یەکجاری) دەدرێت:

ئەو ژنەی سێ‌بەسێ تەلاق دەدرێ لەسەر پیاو فەرز نییە جێگاو خەرجی بۆ دابین بکات، (فاطمة بنت قيس) لەڕاست ژنەکی پرسیار لێ کرا کە سێ‌بەسێ تەلاق دەدرێ؟ فەرموی: (ليس لها سكنى ولا نفقة)[4] .

پێویستە لە ماڵی خزم‌و کەس‌وکاری عیددە تەواو بکات‌و ئێرەو ئەوێ نەکات بۆ پێویستی نەبێت. (جابر بن عبدالله ـ رـ) فەرمویەتی: (پلکم تەلاق درابوو، ویستی خورماکەی بڕنێتەوە، بەڵام پیاوێ سەرکۆنەی کرد کە نابێ پێ بنێتە دەرەوە، چووە خزمەت پێغەمبەرو (ﷺ) ئەویش

(١) متفق عليه: (خ ٥٣٤١/٤٩١/٩). (م ٩٣٨/٦٧/١١٢٨/٢).

(٢) د(٢٢٨٧/٤١٣/٦) صحيح (ص. د ٢٠٢٠).

(٣) الطلاق: ١.

(٤) صحيح (م ١٤٨٠ـ ٤٤/١١١٨/٢) مختصر (م ٨٨٨).

فەرموی: (بەڵێ خورماکانت بچنەوە، بەڵکو خێریان پێ بکەی یان کارێکی باش بکەیت)[١] .

## (الاستبراء) یان (منداڵ پاکژکردنەوە):

گەر پیاوێ کەنیزەکی دەست کەوت حەرامە توخنی بکەوێ تا دەزانێ دووگیانە یان نەء. گەر حەیزی هەبوو بەیەك حەیز دادەمەزرێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من کان یؤمن بالله والیوم الآخر فلا یسقی ماءه ولد غیره)[٢] . واتە: کێ بڕوای بەخواو پەسڵان هەبێ ئاو ناکاتە منداڵی کەسێکی ترەوە. پێغەمبەر (ﷺ) لە ناو دیلەکانی ئەتاسدا فەرموی: (نابێ توخنی ژنێ بکەون تا سکی دادەنێ، نەچنە لای ژنەکی غەیرە دووگیان تا حەیزێ نەبینێت)[٣] . (ابن عمر) دەڵێ: (گەر ئەو کەنیزەیەی توخنی دەکەوی بەخشرا یان فرۆشرا، یان ئازادکرا، بەیەك حەیز منداڵدانی پاکژ دەکرێتەوە، بەڵام کچ منداڵدانی پاکژ ناکرێتەوە)[٤] .

## شیردان بە منداڵ و بەخێوکردنی (الحضانة)

وشەی (الحضانة - کۆشگری) واتە پاراستنی منداڵ لە هەمو زیانێو هەڵسان بە بەرژەوەندییەکانی ئەو[٥] .

کاتێ پیاو ژنەکەی تەڵاقداو منداڵی لێ هەبوو ژنەکە تا تەمەنی (٧) ساڵی لەپێشترە لە باوك بۆ بەخێوکردنی، مادام مێرد نەکاتەوە، گەر بوو بە (٧) ساڵە سەرپشك دەکرێ ئایا دایك یان باوکی هەڵبژێرێت.

(عمرو بن شعیب) لەباوکی ئەویش لە باپیرەی گێڕاویەوە: (ژنێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم منداڵەی من سکی من بۆی دەفرێ بووە، مەمکەکانی من بۆی کوندەیەك بووە بۆی‌و

---

(١) صحیح (الارواء ٢١٣٤) م(٢/١١٢١/١٤٨٣).

(٢) حسن (ص. د ١٨٩٠) د(٦/١٩٥/٢١٤٤).

(٣) صحیح (ص. د ١٨٨٩) د(٦/١٩٤/٢١٤٣).

(٤) صحیح الارواء (٢١٣٩) خ(٤/٤٢٣) تعلیقا..

(٥) منار السبیل (٢/٣١٠).

باوەشی من بۆی لەخۆگری ئەوە، باوکیشی منی تەڵاقداوەو دەیەوێ منداڵەکەم لێ بستێنێتەوە، پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ): (انت احق به ما لم تنکحي). واتە: تۆ لەپێشتری لەو مادام مێرد نەکەیەوە)[1] .

(أبو هريرة) گێڕاویەوە: (ژنێ هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: مێردم دەیەوێ منداڵەکەم ببات، ئەو لە بیری (ابي غبة) ئاوی بۆ کێشاوم‌و سوودی بۆم هەبووە، پێغەمبەر (ﷺ) بە منداڵەکەی فەرموو: ئەمە باوکتەو ئەوەش دایکتە، سەرپشك بە کامیان هەڵدەبژێریت، ئەویش دەستی دایکی گرت، ئەنجا بردی)[2] .

(١) (حسن الارواء ٢١٨٧) د(٦/٣٧١/٢٢٥٩).

(٢) صحيح (ص. د ١٩٩٢) (د: ٦/٣٧١/٢٢٦٠).

# باسی کڕین و فرۆشتن‌و سەودا (کتاب البیوع)

## پێناسەی:

وشەی (البیوع) کۆی (البیع) واتە: کڕین‌و فرۆشتن، لەبەر جیاوازی جۆرەکانی بەکۆ هاتووە.

(البیع) یان (فرۆشتن): گواستنەوەی ماڵەکە بۆ کەسێکی تر بە بڕە پارەیەك.

(الشراء) یان (کڕین): پەسەندکردنیەتی. هەریەکەیان بۆ هەردووکیان بەکاردێت، واتە کڕیارو فرۆشیار

## ڕێگە پێ درانی (مشروعيتها):

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾[1] . واتە: خوا کڕین‌و فرۆشتنی ڕەوا (حلال) کردووەو سووی ناڕەوای (حرام) کردووە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾[2] . واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە سامانی خۆتان لەناو خۆتاندا بەناڕەوایی مەخۆن، مەگەر بە بازرگانی یەکی ئارەزوومەندانە بێ لەناو خۆتاندا.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (البيعان بالخيار مالم يتفرقا)[3] .

واتە: فرۆشیارو کڕیار سەرپشکن لە پەشیمان بوونەوەو ڕازی بوندا تا لەیەکتری جیانەبوونەوە. موسڵمانان کۆکن لەسەر دروستی کڕین‌و فرۆشتن، چونکە لۆژیك‌و کارزانی پەسەندی دەکات، چونکە بەزۆری مرۆڤ پێویستی بەو شتە هەیە کە لەبەردەستی برای خۆی دایەو خاوەنەکەی زۆرجار پێی نادات، لە تەشریعی کڕین‌و فرۆشتن دا هۆکارێ هەیە بۆ گەیشتن بە مەبەست بێ تەریق بوونەوەو شەرم کردن).

---

(١) البقرة: ١٧٥.

(٢) النساء:

(٣) متفق عليه: خ(٢١١٠/٣٢٨/٩) م(١٥٣٢/١١٦٤/٣).

## هاندان بۆ کارکردن:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (باشترین خواردن ئەوەیە کە مرۆڤ بەکاری دەستی خۆی بیخوات، داود پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرهەمی کاری دەستی خۆی دەخوارد)[1] . دەفەرمێ: (گەر یەکێ لەئێوە بارە چیکلەیەکی وشك بێنێ بەپشتی خۆی باشترە لەوەی بێ دەرۆزە بکات لە کەسێ کە ڕەنگە بیداتێ یان نەیداتێ)[2] .

بۆ مرۆڤی تەقواکار دەوڵەمەندی قەیدی نییە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لابأس بالغنى لمن اتقى والصحة لمن اتقى خير من الغنى وطيب النفس من النعيم) . واتە: دەوڵەمەندی بۆ کەسی تەقواکار قەیدی نییە، تەندروستی بۆ تەقواکار لە دەوڵەمەندی باشترەو دەروون پاکی بەشێکە لە بەهرەکان.

هاندان بۆ مام ناوەندی لە داواکردنی بژێوی (المعيشة)دا:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەی خەڵکینە لەخوا بترسنو لە داواکردندا (الطلب)، چاك داوا بکەن کەس نامرێ تا ڕۆزیی تەواو نەبێت، تا گەر سستی لێ بکات، لەخوا بترسن لە داواکردندا، ئەوەی حەڵاڵە وەری بگرنو ئەوەی حەرامە لێ ی گەڕێن) .

## هاندان بۆ ڕاست گۆیی و ترساندن لەدرۆ:

پیغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (کڕیارو فروشیار سەر پشکن لەپەشیمان بونەوە مادام دانەبڕا بن لە یەکتری، گەر هەر دوو ڕاستگۆ بوونو شتیان ڕون کردەوە خوا فەڕو بەرەکەت دەخاتە سەوداکەیانەوە، گەر شتیان شاردەوەو درۆیان کرد بەرەکەتەکە لەسەوداکەیاندا نامێنیت)[3].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (موسڵمان برای موسڵمانە، ڕەوانییە بۆ موسڵمان کە

---

(١) خ(٢٠٧٢/٣٠٣/٤).

(٢) صحيح (ص. ج ٧٠٦٩) خ(٢٠٧٤/٣٠٣/٤). تێبینی: ئایەت زۆرە بۆ هاندانی کارو نەهێشتنی بێ کاری کە هۆکاری سەرەکی هەژارییە:

(٣) ڕابردو باسکرا.

شتەکی بە برای خۆی فروشتو نەنگیو عەیبی تێ دابوو بۆی باس نەکات)[١].

## هاندان بۆ مامەڵە خۆشی لە کڕینو فرۆشتندا :

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (رەحمەتی خوا لەو کەسە بێ کە لەکڕینداو لەفرۆشتن داو لەدادوەریدا ڕووخۆشەو سنگ فراوانە)[٢].

(گەورەیی چاو بون لە هەژارو نەداران):

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (بازرگانێ هەبوو قەرزی دەدایە خەڵکی، گەر کەسێکی دەستکورتی دەبینی بە خزمەتکارەکانی دەوت: لێی گەڕێن، شایەد خودا لێمان گەڕیو لێمان خوش بێ، پاشان خوا لێ ی خوش بوو)[٣].

## قەدەغە کردن لەفرتو فێڵ :

(ابو هریرە) گێراویەوە: پیغەمبەر (ﷺ) بە لای کابرایەکدا ڕەت بوو خواردەمەنی دەفرۆشت، ئەویش (ﷺ) دەستی خستە ناوەوە بینی فێڵی تێ داکراوە، فەرمویی: (لیس منا من غش)[٤]. واتە: کێ فێڵ بکات لەئێمە نییە.

## هاندان بۆ بەیانی زووچوون بۆ پەیداکردنی ڕۆزیی :

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (اللهم بارك لأمتي في بكورها)[٥]. واتە: خوایە فەڕ بخەیە ناو رۆزی ئومەتم لەبەرەبەیانیەکەیدا.

گەر مرۆڤ چووە ناو بازاڕ (بازێڕ) چی دەڵێ؟:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ چووە ناو بازاڕاوە وتی: (لا الـه الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو حي لا يموت بيده الخير وهو على كل شيء قدير)

(١) صحيح (ص، ج ٦٧٠٥) (جه٢٢٤٦/٢/٧٥٥)

(٢) صحيح (ص،ج ٤٤٥٤) خ (٢٠٧٦/٢٠٦/٤).

(٣) صحيح (ص،ج ٣٤٩٥) خ (٢٠٧٨/٣٠٨/٤).

(٤) صحيح (الارواء ١٣١٩) (ص. جه ١٨٠٩) جه(٢٢٢٤/٧٤٩/٢).

(٥) صحيح (ص.جه ١٨١٨) جه(٢٢٣٦/٧٥٢/٢٩.

ئەوە خودا ملیۆنی چاکەی بۆ دەنوسیێو ملیۆنێ (هەزار هەزار) خراپـەی لەسـەر رەش دەکاتـەوەو کۆشکەکی بۆ لەبەهەشت دا بەرزدەکاتەوە) [١].

## خوا کڕینو فرۆشتنی رەوا کردووە:

(بنەماکەی دروستی فرۆشتنی هەرشتێکە فرۆشتنەکەی هـەر چـۆنێ بـێ مـادام فرۆشـیارو کڕیارەکە رازیو بن شەرع قەدەغەی نەکردبێت.

## ئەو شتانەی شەرع قەدەغەی کردون کڕینو فرۆشتنیان بکرێت:

(١) کڕینو فرۆشتنی شتێ فریودانی تێدا بێ (بیع الغـرر): بـە هـەمو کـڕینو فرۆشـتنەکی نادیار کە بە گۆترە بێو فریودانی تێ دابێ دەوتری: (الغرر).

(ابو هريرة) گێڕاویەوە: (نهـی رسـول الله (ﷺ) عـن بيـع الحـصاة وبيـع الغـرر)[٢]. واتـە: پێغەمبەر (ﷺ) فرۆشتنی هاوێشتنی بەردی قەدەغە کردووە، هەروەها فرۆشتنێ فریـودانی تـێ هەبێت.

(النووي) لە(شرح مسلم/١٥٦/١٠)دا دەنوسێت: (قەدەغەکردنی شـتی شـاراوەو فریـودەری (الغرر) بنەمایەکی گەورەی بابەتی کڕینو فرۆشتنە، بۆیە (موسلیم) لەپێشەوەی دا باسـکردووەو زۆر مەسەلەی تری بێ شومار لەخۆ دەگرێ، وەکو فرۆشتنی کۆیلەی هەڵاتو(الآبق)و شتی نـەبوو (المعدوم)و نادیار(المجهول)و ئەو شتەی ناتوانی تەسلیمی بکەیو ئـەو شـتەی هێـشتا بـە تـەواوی نەبۆتە موڵکی فرۆشیارو فرۆشتنی لەئاوی زۆرداو شـیر لەگوانـەکان(الـضرع)داو فرۆشـتنی کـاوڕ لەسك داو فرۆشتنی هەندێ لەگەنمی (الـصبرة) بە نادیاریو فرۆشتنی بەرگێ لەبەرگەکانو کـاوڕی لەکاوڕەکانو هاوشێوەی ئەم شتانەو کە لەگۆترەیەو بۆت نییە تەماشایان بکـەیو بیـان بینیـت، هەموو ئەوانە فرۆشتنیان بەتاڵەو بەپێی پێویستی پێ بون فرۆشتنەکی نادیارە. وتی: گـەر مـرۆڤ ناچاربو ئەم کڕینە نادیارە بکاتو زۆر بە دژواری خـۆی لـێ دوورە پـەرێز دەکـراو ئـەم فرۆشـتنە نادیارەش ئەوەندە نەبوو ئەو کاتە فرۆشتنەکە دروستو جائیز دەبێت.

---

(١) حسن: (ص.جه ١٨١٧) جه(٢/٧٥٢/٢٢٣٦).

(٢) حسن (ص. جه ١٨١٧) جه(٢/٧٥٢/٢٢٣٥).

موسڵمانان کۆکن کە فرۆشتنی جبەی پڕ لەلۆکە دروستە بفرۆشرێ هەر چەندە ناواخنەکەی نەبینرابێ‌و گەر ناواخنەکەی بەتەنیا بفرۆشرێ دروست نابێت. چاك بزانە کڕین‌و فرۆشتنی دەست لێدان (الملامسە)و بۆ یەکتر هەڵدان (المنابذة)و فرۆشتنی بەرهەمی بەرهەمەکی تر یان بێچووەی بێچووەکی تر (حبل الحبلە)و فرۆشتنی بە وردە بەردو (الحصاە)و پەڕینی نێرەی ئاژەڵ(عسب الفحل)و شتی تر کە دەقی تایبەتی یان لەسەر هەیەو ئەوانە لەبازنەی کڕین‌و فرۆشتنی گۆترەکاری‌و فرۆشتنی شاراوەو فریودەر (الغرر) دان، بەڵام بە تەنیا باسکراون‌و قەدەغە کراون، ئەم جۆرە کڕین‌و فرۆشتنە بەر لەئیسلامدا هەبون (خوا زاناترە). بەهەندێ دەستکارییەوە.

کڕین‌و فرۆشتنی (الملامسة)و (المنابذة):

(ابو هريرە) گێڕاویەوە: (نهی عن البیعتین: الملامسة والمنابذة). واتە: دوو چەشن کڕین‌و فرۆشتن قەدەغە کراون: بە دەست لێ دان‌و بە فڕێدان. (الملامسە ـ دەست لێدان) ئەوەیە بەبێ ورد بونەوە هەر یەکە لەم دووکەسە دەست لەپۆشاکی برادەرەکەی بدات. (المنابذة ـ پێکەوە فڕێدان): ئەوەیە هەریەکە لەم دوو کەسە جلەکانی فڕێ بداتە پێش ئەوەی تریان بێ سەیرکردنیان)[1].

بەڵام (ابو سعید الخدري) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەدوو کڕین‌و فرۆشتن قەدەغەی کردین‌و دوو پۆشاك: لەکڕین‌و فرۆشتندا لەبەدەست لێدان‌و بەفڕێدان قەدەغەی کردین. بە دەست لێ دان ئەوەیە: کە پیاو دەست لەپۆشاکێ بدات بەشەو یان بە ڕۆژو ئاڵوگۆڕی نەکات. بەفڕێدان ئەوەیە: هەردوو کەسەکە پۆشاك هەڵبدەنە پێش یەکتری‌و سەودایەکەیان بێ ڕوانین‌و ڕازی بوون بێت)[2].

## کڕین‌و فرۆشتنی بێچووەی بێچووەکان (بیع الحبل الحبلة):

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (خەڵکی بەر لەئیسلام گۆشتی وشتریان بۆ بێچووەی بێچوە کڕین‌و فرۆشتنی پێ دەکرد. (حبل الحبلة ـ بێچووەی بێچوە) ئەوەیە: وشترەکە بزێ، پاشان ئەو بێچووەیە بزێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم کڕین‌و فرۆشتنەی قەدەغە کرد)[3].

---

(١) صحيح / مختصر م ٩٣٨) م(١٥١١/٢، ١١٥٢/٣).

(٢) متفق عليه: (م ١٥١٢//٣) خ(٤٤، ٢١٤٤/٣٥٨/٤).

(٣) متفق عليه: (٢١٤٣/٣٥٦/٤) م(١٥١٤/١١٥٣/٣).

کڕین‌و فرۆشتنی بە وردە بەرد (بیع الحصاه):

(ابو هریره) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) کڕین‌و فرۆشتنی بەبەردی ورد قەدەغە کردووە، هەروەها کڕین‌و فرۆشتنی فریودەر[1].

(النووی ـ ر ـ) لە(شرح مسلم (١٠/١٥٦) دا وتویەتی:

فرۆشتنی کاڵاکان بە وردە بەرد سێ لێکدانەوەی هەیە:

(١): ئەو پۆشاکەم فرۆشتە تۆ کە ئەو وردە بەردەی بۆی دەهاوێژم بیکەوێتە سەری، یان ئەم پارچە زەوییەم لێرەوە پێ فرۆشتی تا ئەو شوێنەی ئەم بەردەی دەگاتێ.

(٢) ئەم شتەم پێ فرۆشتی، تۆ ئەو کاتە دەتوانی پەشیمان ببیەوە کە ئەم بەردەی دەهاوم.

**(٣) هەمان هاوێشتنی بەردەکە بکەنە فرۆشتن‌و بڵێ:** گەر بەردم گرتە ئەم جل‌و بەرگەیە بەم نرخەیە بە تۆ فرۆشرابێت. (تەواو).

## فرۆشتنی پەڕینی نێری ئاژەڵ (عسب الفحل):

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (نهی رسول الله (ﷺ) عن عسب الفحل)[2]. واتە: (پێغەمبەر (ﷺ) فرۆشتنی پەڕینی نێری ئاژەڵی قەدەغە کردووە).

**(٢) فرۆشتنی شتێ کە بە دەست خۆیەوە نییە:** (حکیم بن حزام) گێڕاویەوە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا: پیاوێ سەودای فرۆشتنی شتێکم لێ دەکات لەلام نییە، ئایا بیفرۆشم؟ فەرموی: (لا تبع ما لیس عندك)[3]. واتە: شتێك مەفرۆشە لەلات نییە.

**(٣) فرۆشتنی کاڵا بەر لەوەرگرتنی دا:** (ابن عباس) لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (هەر کەسێ خواردنێکی کڕی با نەیفرۆشێتەوە تا دێتە دەستی یەوە). (ابن عباس) وتی: (وابزانم هەمو شتێ وەکو خواردن وایە)[4]. (الطاوس) لە جەنابی (ابن عباس)و ئەویش لە حەزرەتی پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (هەرکەسێ خواردنەکی کڕی تا دەیپێوێ با نەیفرۆشێ، لە (ابن

---

(١)رابرد/ل: ٣٣٢.

(٢) صحیح (مختصر م/٩٣٩) خ(٤/٤٦١/٢٢٨٤).

(٣) صحیح (الأرواء: ١٢٩٢) جە (٢/٧٣٧/٢١٨٧).

(٤) متفق علیه: (م ١٥٢٥/٣٠، ٣/١١٦٠) خ(٤/٣٤٩/٢١٣٥).

عباس)م پرسی بۆچی؟ وتی: ئەی نابینی ئەوانەی کڕین‌و فرۆشتن دەکەن بە زێڕو خواردن بە دواخستن)[١].

**(٤) کڕین‌و فرۆشتن بە سەر کڕین‌و فرۆشتنی براکەیدا: پێغەمبەر (ﷺ)** فەرمویەتی: (با کەس کڕین‌و فرۆشتن بەسەر کڕین‌و فرۆشتنی براکەی دا نەکات)[٢]. هەروەها دەفەرموێ: (نابێ مرۆڤی موسڵمان کڕین‌و فرۆشتن بەسەر کڕین‌و فرۆشتنی (السوم)ی براکەی دابکات)[٣].

**(٥) کڕین‌و فرۆشتنی عەینی (بیع العینە):** ئەو کڕین‌و فرۆشتنەیە کە پیاوێ کاڵایەك بە پارەیەکی دیاری کراوی وەرنەگیراوە دەفرۆشێ پاشان بە نرخەکی داشکاو لەو پارەیەی پێی فرۆشتووە دەیکڕێتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر بە عەینە کڕین‌و فرۆشتنتان کردو کلکی مانگاتان تاودایەو بە کشتوکاڵ رازی بون‌و دەست‌و لەخەبات هەڵگرت خوا سەرشۆڕتان دەکات‌و لەسەرتان لا نابات تاوەکو بۆ سەر ئایینی خۆتان نەگەڕێنەوە)[٤].

**(٦) فرۆشتنی بە (قیست ـ التقسیط):** لەم چاخەدا فرۆشتنی بە قیست زۆر بووە، کە تاکاتەکی دیاری کراو بەپارەیەکی زیاتر کاڵاکە دەفرۆشرێت، کە بەفرۆشتنی بە قیست ناسراوە، زانراویشە فرۆشتنی کاڵاکان بە قیست لەگەڵ ئەو زیادەیەدا لەبەرامبەر دواخستنی نرخ دانەکەیە، وەکو بۆ نمونە کاڵاکە (السلعە) بە هەزار دینار بێ‌و بە قیست بە هەزارو دوو سەد بێت، ئەم کڕین‌و فرۆشتنە قەدەغە کراوە.

(ابو هریرة) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ (من باع بیعتین فی بیعة فله اوکسهما او الربا)[٥]. واتە: هەر کەسێ دوو فرۆشتن بکات لەفرۆشتنێدا، ئەوە بۆ ئەو هەیە نرخی هەرە کەمەکەیان یاخود (الربا) سوود.

---

(١) متفق علیه: (م ٣١/١٥٢٥، ٣/١١٦٠) خ(٤/٣٤٧/٢١٢).
(٢) متفق علیه: (خ ٤/٣٧٣/٢١٦٥) م(٣/١١٥٤/١٤١٢).
(٣) صحیح (الأرواء/١٢٩٨) م(٣/١١٥٤/١٥١٥).
(٤) صحیح (ص.ج ٤٢٣) د(٩/٣٣٥/٣٤٤٥).
(٥) حسن: د(ص.ج ٦١١٦) سلسلة الأحادیث الصحیحة للألباني ٢٣٢٦.

## ئەو کاڵاو شتانەی فرۆشتنیان دروست نییە :

**(١) شەراب و سەرخۆشکەرەکان:** (عائیشە) گێڕاویەوە: کاتێ ئایەتەکانی سورەتی بەقەرە دابەزی لەکۆتایی یەکەی دا پێغەمبەر (ﷺ) چووە دەر فەرموی: (حُرِّمت تجارة الخمر) [1]. واتە: بازرگانی شەراب و مەی حەرام کرا.

**(٢) فرۆشتنی گیانداری مردارو بەرازو بت و سەنەم:**

(جابر بن عبدالله) لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە کە کاتێ مەککەی رزگار کرد گوێی لێ بو فەرموی: (ان الله ورسوله حرم بيع الخمر والميته والخنزير والأصنام). واتە: خواو پێغەمبەرەکەی فرۆشتنی شەراب و مرداربووەوەو بەرازو بت و سەنەمی حەرام کردووە. نەفەرێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی پێوو بەزی گیانداری مردار کە کەشتی پێ چەور دەکرێ، یان پێستەکانی پێ چەور دەکرێت و خەڵکی چرای پێ دادەگیرسێنن؟ فەرموی: (نەء، ئەوە حەرامە). پاشان فەرموی: (خوا نەفرین لەو جولەکانە بکات کاتێ خوا (بەز) پێوەکەی حەرام کرد پیوەکەیان تواندەوەو دەریان هێناو پاشان فرۆشتیان و پارەکەیان خوارد) [2].

**(٣) سەگ:** (ابی مسعود الأنصاري) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) پارەی سەگ و مارەیی لەش فرۆش (البغي) و سەرقەڵەمانەی کاهین (حلوان الكاهن)ی حەرام کردووە) [3].

**(٤) دروست کردنی وێنەی ئەو شتانەی گیانلەبەرن:**

(سعيد بن ابی الحسن) گێڕاویەوە: (لای ـ ابن عباس ـ بووم، پیاوێ هاتە لای وتی: ئەی (ابن عباس) من پیاوێکم بژێوی ژیانم بەم دوو دەستانەی خۆمە، من ئەم وێنانە دروست دەکەم، (ابن عباس) وتی: ئەوەی پێتی دەڵێم لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە: (هەر کەسێ وێنەیێ دروست بکات تا گیانی بەبەردا نەکات، خوا هەر سزای دەدات و هەرگیز ناتوانێ گیانی بەبەردا

---

(١) متفق عليه: خ(٤/٤١٧/٢٢٢٦) م(٣/١٢٠٦/١٥٨٠).

(٢) متفق عليه:خ(٤/٤٢٤/٢٢٣٦) م(٣/١٢٠٧/١٥٨١).

(٣) متفق عليه: خ(٤/٤٢٦/٢٢٣٧) م(٣/١١٩٨/١٥٦٧).

بکات. پیاوەکە زۆر توڕەبوو رووی زەرد هەڵگەڕا. ئەنجا پێی فەرمو: هاوار بۆ تۆ، گەر هەر وێنە دروست دەکەی، وێنەی ئەم درەختە دروست بکەو هەر شتێ کە گیانی لەبەر دا نییە) [١].

**(٥) فرۆشتنی میوە بەر لەهەراش بوونو گەیشتندا (الثمر قبل بدو صلاحه):**

(أنس بن مالك) لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاودتەوە: (ئەو فرۆشتنی بەرو بومی بەر لەپێگەیشتنی یاندا قەدەغەکردووە، لەخورماش هەتا پێ دەگات، نەفەرێ وتی: چۆنە پێ گەیشتن؟ فەرموی: سوور دەبێ یان زەرد دەبێت) [٢].

هەر ئەو گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە بەرو میوەجات بەر لەهەراش بوونو پێ گەیشتن بە فەریکەیی بفرۆشرێن تا پێ دەگەن. نەفەرێ وتی: چۆنە پێ گەیشتن (الزهو)؟ فەرموی: تا سوور دەبن. ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئەی ئەگەر خوا بەرەکەی نەبەخشیو قەدەغەی کرد، بەچی ماڵەکە لەبرایەکەی وەردەگرێت) [٣].

**(٦) کشتوکاڵ (الزرع) بەر لەدانکردنی دا:**

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) رێگەی نەداوە خورما بەر لەکامڵ بونی بفروشرێ، وە گوڵەکان (السنبل) تا سپی هەڵدەگەڕێنو لەبەلا بێ باك دەبن، کڕینو فرۆشتن یاساغ کردون) [٤].

---

(١) متفق عليه: خ(٤/٤١٦/٢٢٢٥) م(٣/١٦٧٠/٢١١٠). تێبینی: دیارە لەقورئاندا باسی ئەوە کراوە کە لەسەردەمی سولەیماندا (ﷺ) وێنەو پەیکەر دروست کراوە ﴿وَتَمَاثِيلَ﴾ (السبأ/١٣). (الضحاك) دەڵێ: (الصور)/تفسير الطبري/ج٢٢/ل:٨٥) دیارە سەرەتای ئیسلام وێنەو پەیکەر تاشی حەرام بووە چونکە خەڵکی لەبت پەرستی نزیك بوون، بەڵام کاتێ خەڵکی بە تەواوی لەسەر بڕوا بوون بەخوا بڕوایان دامەزراو لەبت پەرستی حاڵی بوون ئەم توندییە لەسەر حەرامییەکەی کەم بۆوە، وەکو فەرمایشتی (الا رقما في ثوب) متفق عليه.

(٢) صحيح (خ ٤/٣٩٧/٢١٩٧).

(٣) متفق علية: خ(٤/٣٩٨/٢١٩٨) م(٣/١١٩٠/١٥٥٥).

(٤) صحيح (مختصر م/٩١٧) م(٣/١١٦٥/١٥٣٥).

# سەرپشکی لەوەرگرتن و پەشیمان بوونەوەدا (الخیار)

پێناسەکردنی (الخیار): واتە: سەرپشکی لەپەسەندکردن و پەشیمان بونەوەدا. بەشەکانی:

**(١) پەشێمان بوونەوە لەدانیشتندا (خیار المجلس):**

کڕیارو فرۆشیار تا ئەو کاتە فرۆشتنیان و کڕینیان دادەمەزرێ کە رێك دەکەون تا لەیەکتری خوا حافیزی دەکەن و دادەبڕێن، مادام کڕین و فرۆشتنەکەیان لەسەر مەرجی پەشیمان نەبوونەوە کردووە، یان هەردووکیان لەکڕیارو فرۆشیارەکە پەشیمان دەبنەوە، یان یەکێ لەوانە پەشیمان دەبیتەوە، ئەو کاتە مافی یەکێکیان دەکەوێت و مافی ئەوەی تریان دەمێنێتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر دوو کەس کڕین و فرۆشتنیان کرد هەریەکەیان سەرپشکە لەپەشیمان بوونەوە تا پێکەوە بمێننەوەو جیانەبوبنەوە، یان یەکێ لەوانە ئەویتر سەرپشك نەکات، گەر یەکێ ئەویتر بکاتە سەر پشك و کڕینەکە دامەزرا ئەو کاتە کڕینەکە تەواو دەبێت، گەر دوای کڕینەکە لێکتر جیابونەوەو هیچ کامێ کڕین و فرۆشتنەکەی بەجێ نەهێشت ئەوە کڕین و فرۆشتنەکە دادەمەزرێت) [١].

حەرامە دانیشتنی کڕین و فرۆشتن لەترسی پەشیمان بوونەوەو دانەوەی کالاکە بەجێ بهێلرێت:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کڕیارو فرۆشیار هەردووکیان سەرپشکن مادام لەیەکتری جیا نەبوونەوە، مەگەر لێرەدا رێك وتنی پەشیمان بوونەوەی هاورێکەی خۆی دوور بخاتەوەو بڕوات) [٢].

**(٢) سەرپشکی بە مەرج (خیار الشرط):**

ئەوەیە مەرج دابنێن و یان یەکێکیان بۆ ماوەیەکی دیاری کراو مەرج دابنێ، ئەم مامەڵەیە

---

(١) متفق علیه: خ(٤/٣٣٢/٢١١٢) م(١٥٣١ ـ ٣/١١٦٣/٤٤).

(٢) متفق علیه: (خ ٢١٥١/٤/٣٦٨) م(٣/١١٥٨/١٥٢٤).

دروست دەبێ گەر ماوەکەش درێژ بێت. (ﷺ) فەرموویەتی: (کڕیارو فرۆشیار هەردوو سەرپشکن لەکڕینو فرۆشتندا مادام جیانەبوونەوە یان فرۆشتنەکە سەرپشکی (الخیار)ی تێ یە)[١].

**(٣) پەشیمان بوونەوە لەسەر نەنگی (العیب):**

رابردوو ئاماژەمان بە شاردنەوەی نەنگییەکان کرد کە حەرامە (من غشنا فلیس منا)، گەر پیاوێ کالاًیەکی کڕی نەنگی هەبوو، بەم نەنگی یەی نەدەزانی تا جیادەبێتەوە، ئەوە دەتوانێ کالاًکە بۆ فرۆشیارەکە بگێڕێتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێکی مەڕێکی کڕی نەدۆشرا بوو (تا بڵێن شیری زۆرە ـ المصراة)و دۆشی گەر رازی بوو ئەوە لای خۆی دەیهێڵێتەوە، گەر نارازی بوو ئەوە دەتوانێ لەجیاتی شیرەکە ربە خورمایەك لەگەڵی دا بداتەوە).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (وشترو مەڕو ماڵات نەکەن نەیان دۆشن ـ تا کڕیار وابزانێ شیریان زۆرە ـ هەر کەسێ بیانکڕێ دوای دۆشینی سەرپشکە لەرازی بوونو دانەوەی لەگەڵ ربە خورمایەکدا)[٢].

* * *

---

(١) صحیح : (ص.ج ٧٣٤٧/ خ(٢١٤٨/٣٦١/٤).

(٢) صحیح (خ ٢١٤٨/٣٦١/٤) د(٣٤٢٦/٣١٠/٩).

# (ســوو) (ريـبــا ـ الربــا)

## پێناسە:

(الربا) بە ئەلفی (المقصورة) لە(ربـا ـ يربـو) هـاتووەو بـە (الألـف)يـش دەنوسـرێ. واتـە: (زيادە)، ئەنجا زيادەكە لەيەك شتدا بێ وەكو خودا دەفەرمووێ ﴿وَرَبَتْ﴾[1]. واتـە: زيـادی كـرد. يان لەبەرامبەر درهەمێ دابێ بە دوو درهەم.

حوكمەكەی: (سوو) بە دەقی قورئانو سوننەتو يەك دەنگی ئوممەت حەرامە. خوای گـەورە فەرمويەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ*فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ﴾[2].

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە تەقوای خوا بكەنو واز لەو پاشماوەيـە بێـنن كـە لـە(سـوو) دا مـاوە گـەر راسـت دەكـەن بـڕوادارن، گـەر وانەكـەن جـاڕ بـدەن بـە جـەنگێ لەگـەڵ خـواداو پێغەمبەرەكەی!!، گەر تۆبە بكەن ئەوە سەرمايەكە هی خۆتانە كە ستەم ناكـەنو سـتەمتان لـێ ناكرێت.

خوای گەورە فەرمويـەتی: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ﴾[3]. واتە: ئەوانەی (سوو) دەخۆن وەكو ئەو كەسە هەڵدەستنەوە كـە شـەيتان دەستی لێ دەوەشێنێو شێتی دەكات.

﴿يَمْحَقُ اللّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ﴾[4]. واتـە: خـوا (سـوو) تـەفروتونا دەكـات بەرەكـەتی ناهێڵێو خێرو چاكەكان پڕ بەرەكەت دەكات.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمويەتی: (خۆتان لەحـەوت لەناوبەرەكـە (الموبقـات) بپـارێزن، وتيـان

(١) الحج/٥.

(٢) البقرة:٢٧٨/٢٧٩.

(٣) البقرة٢٧٥.

(٤) البقرە: ٢٧٦.

ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرموی: هاوبەشی پەیدا کردن بۆ خودا، جادوو و کوشتنی بە ناحەق کە خوا حەرامی کردووەو، خواردنی (سوو)، خواردنی ماڵی هەتیوو راکردن لەغەزاداو بوختان کردن بە داوێن پاکانی بڕواداری بێ ئاگا) [١].

(جابر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی کردووە لەو کەسەی کە (سوو) دەخوات و ئەوەی دەبێتە وەکیلی و نووسەرەکەی و شاهیدەکانی و وتی: هەموویان وەکو یەك وان) [٢].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ریبا حەفتاو سێ بەشە (الباب)ە هەرەکەمەکەیان وەکو ئەوەی وایە پیاو زینا لەگەڵ دایکی خۆیدا بکات) [٣].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (یەك درهەمی سود کە پیاو دەیخوات و پێ ی دەزانێ لەسی و شەش زینا گەورەترە) [٤].

وە پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): (ئەو کەسەی لەهەموو کەسێ پتر (سو) بخوات چارەنوسی ئەوە سەر بۆ کەمی و نەبوونی دەکێشێت) [٥].

## بەشەکانی (سو):

سوو دوو بەشە: (سوو)ی دواخستن (النسیئة)و سووی زیادە (ربا الفضل). سووی دواخستن (نەسیئە) ئەو زیادە بە مەرجەیە قەرزدەر (الدائن) لەقەرز وەرگر (المدین) وەری دەگرێ لەبەرامبەر دواخستنی (التأجیل) دا. ئەم جۆرە قەرزە بە قورئان و سوننەت و کۆی دەنگی ئوممەت حەرامە.

(سوو)ی زیادە (ربا الفضل): فرۆشتنی دراوە بە دراو (النقود بالنقود) یان خۆراکە بە خۆراك لەگەڵ زیادەدا. ئەمەش بە دەقی سوننەت و کۆی زانایان، چونکە سەر دەکێشێ بۆ (سوو)ی دواخستن.

---

(١) متفق علیه/خ (٢٧٦٦/٣٩٣/٠) م (١/٩٢/٨٩).

(٢) صحیح : (مختصر م ٩٥٥) م(٣/١٢١٩/١٥٩٨).

(٣) صحیح (ص.ج ٣٥٣٩).

(٤) صحیح (ص.ج ٣٣٧٥) أ(١٥/٦٩/٢٣٠).

(٥) صحیح (ص.ج ٥٥١٨) جە(٢/٧٦٥/٢٢٧٩).

**ئەوانەی ( سوو ) یان تیٚ دا حەرامە :**

(سوو) تەنیا لەم شەش رەگەزانەدایە کە ئەم فەرمودە کۆی کردوونەوە: (زێڕ بە زێڕ، زیو بە زیو، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خورما بە خورما، خویٚ بە خویٚ، دەبیٚ وەکو یەك بن‌و سەر بەسەر بن، دەست بە دەست بن، گەر ئەو رەگەزانە جیا بوون گەر دەست بە دەست بو چۆنتان دەویٚ ئاوا بیان فرۆشن) [1]. گەر رەگەزیٚ (الصنف) لەوانە وەکو زێڕ بە زێڕ، یان خورما بە خورما فرۆشرا زیادەو دواخستن حەرامە، پێویستە لەکێشانەو پێوانەدا سەر بە سەر بن، سەرباری چاکی‌و خراپییان‌و پێویستە لەدانیشتنەکەدا وەربگیرێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن گەر وەکو یەك نەبن‌و زیو بو زیو مەفرۆشن گەر وەکو یەکتری نەبن، هیچیان بەسەر ئەوی تردا زیاد مەکەن‌و ئەوەی لەبەر دەستاندا نییە لەوانە بەوەی مەفرۆشن کە لەبەر دەستاندایە) [2].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (زێڕ بە زێڕ سووە مەگەر بلیٚ ی: هاو ئەویش بلیٚ: ها، گەنم بە گەنم سووە، گەر بلیٚ ی: هاو ئەویش بلیٚ: ها، جۆ بە جۆ بە سووە، مەگەر بلیٚ ی: هاو ئەویش بلیٚ: ها، خورما بە خورما سووە، مەگەر بلیٚ ی هاو ئەویش بلیٚ: ها، خورما بە خورما سووە مەگەر بلیٚ ی: هاو ئەویش بلیٚ: ها) [3].

(ابی سعید) گێڕاویەوە: (لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خورماو قەسپی تێکەڵو پێکەڵی خراپمان پیٚ دەدرا (لەدەستکەوتی جەنگ لەخەیبەردا) دو ربەمان دەفرۆشت بە ربەیەك (الصاع)، کاتیٚ هەواڵ بە گویٚ ی پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەیشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (لا صاعي تمر بصاع، ولا صاعي حنطة بصاع، ولا درهم بدرهمين) [4]. واتە: نابیٚ دوو ربە خورما بە ربەیەك بفرۆشریٚ، نە دوو ربە گەنم بە ربەیەك، نە دیرهەمیٚ بە دوو دیرهەمێك.

گەر رەگەزیٚ لەم شەشانە بە غەیری رەگەزی خۆیان بفرۆشرێن وەکو زێڕ بە زیو یان گەنم بە

---

(١) صحيح (مختصر م٩٤٩) (م ١٥٨٧ ـ ٣/١٢١١/٨١).

(٢)متفق عليه/ خ(٤/٣٤٧/٢١٣٤) م(١٢٠٩:٣/٢٥٨٦)

(٣) متفق عليه: (خ ٤/٣٧٩/٢١٧٧) م(٣/١٢٠٨/١٥٨٤).

(٤) متفق عليه: م(٣/١٢١٦/١٥٩٥) خ(٤/٣١١/٢٠٨٠)..

جۆ زیادە دروستە مادام وەرگرتنەکە لەو دانیشتنەدا بێت.

لەفەرموودەی رابردو بینیمان: (گەر ئەم رەگەزانە (الأصناف) لەیەکتری جیاواز بوون چۆنتان بوێت ئاوا بیفرۆشن مادام دەست بە دەستو نەختی بێت). دیسان (عبادە) گێڕاویەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (فرۆشتنی زێڕ بە زیو قەیدی نییە، گەر زیوەکەش پتر بێ، مادام دەست بە دەست بێ، بەڵام بە دواخستن (النسیئە) نابێ، فرۆشتنی گەنم بە جۆ قەیدی نییە، هەتا گەر جۆیەکە پتریش بێ مادام دەست بە دەست بێ، بەڵام دواخستن نەخێر) [1].

گەر لەرەگەزی ئەم شتانە بەرەگەزی تر بفرۆشرێ، دیسان لەهۆدا وەکو یەك نەبن وەکو زێڕ بە گەنمو زیو بە خوێ ئەوە زیادەیی‌و دواخستن دروستە. عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێ خواردەمەنی لەجولەکەیێ کڕی بۆ ماوەیەكو زرێ یەکەی بە بارمتە (الرهن) لا دانا) [2]. (میری سەنعانی) لە(سبل السلام/٣/٣٨) دا نوسیویەتی: (زانایان کۆکن لەسەر کڕینو فرۆشتنی ریبایی بە ریبایی کە لەرەگەزدا چونیەك نەبن بە دواخستنو زیادەتر وەکو فرۆشتنی زێڕ بە گەنمو زیو بە جۆو هی تر لەپێوانەکان).

دروست نی یە خورمای تەڕ (الرطب) بە خورمای وشك (قەسپ) تەنیا بۆ خەڵکی (العرایا) نەبێ، کە ئەو خەڵکانەن هەژارنو دار خورمایان نییە، ئەوانە دەتوانن لەخاوەن دار خورماکان بە تەڕی بیکڕنو بە قەسپ (التمر) بقەرسێنرێتو بیخۆن.

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) مامەڵەی (المزابنە)ی قەدەغە کردووە. (المزابنە واتە: فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشك(قەسپ) بە پێوانەو فرۆشتنی ترێ بە مێوژ بە پێوانە) [3]. (زید بن ثابت) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) رێگای دا بەو هەژارانەی دار خورمایان نییە (صاحب العریة) کە بە قرساندن بە قەسپ بیفرۆشن) [4]. لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ)

---

(١) صحيح (الأرواء/١٩٥/٥) (د: ٩/١٩٨/٣٣٣٣).

(٢) صحيح (الأرواء ١٣٩٣) خ(٤/٣٩٩/٢٢٠٠).

(٣) متفق عليه: (خ ٤/٣٨٤/٢١٨٥) م(٣/١١٧١/١٥٤٢).

(٤) متفق عليه: م(١٥٣٩ ـ ٣/١١٦٩/٦٠).

قەدەغەی کردووە کە خورما بە قەسپ بفرۆشرێ چونکە گەر خورما بوو بە قەسپ وشك بوو کەم دەکات: (سعد بن ابی وقاص) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەراست خورما بە قەسپ فرۆشتن پرسیاری لێ کرا؟ فەرموی: ئایا گەر خورما وشك بوو کەم دەکات؟ وتیان بەڵێ، ئەنجا قەدەغەی کرد) [1].

دروست نییە زیادەیی لەیەك رەگەزەکاندا بکرێ، هەتا گەریەکێ لەو دووانە یان هەردووکیان شتی لەغەیری رەگەزی خۆشیان لەگەڵدا بێت: (فضالة بن عبید) گێڕاویەوە: (لەخەیبەردا ملوانکەیەکم بە دوانزە دینار کڕیو زێڕو مورووی تێ دا بوو، لێکم کردەوە بینیم دوانزە دیناری پتر تێ دایە، ئەوەم لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسکرد، ئەویش فەرموی (لا تباع حتی تفصل)[2]. واتە: تا لێك جیا نەکرێتەوە نافرۆشرێت.

(١) صحيح (الأرواء ١٣٥٢) د(٩/٢١١/٣٣٤٣).

(٢) صحيح (الأرواء/١٣٥٦) م(١٥٩١ ـ ١٢١٣٣/٩٠).

# کشتیاری (المزارعة)[(١)]

پێناسەی: کشتیاری (المزارعه) بریتی یە لەسەودا کردن لەسەر چاندنی زەوی کەسێك بە نیوە کاری یان زیاتر، یان لەم شێوانە، واتە: بەرهەمەکە بەش دەکەن.

ڕێگا پێ درانی: (ابن عمر) گێڕاویەوە کە(پێغەمبەر (ﷺ) زەوییەکانی دایەوە خەڵکی خەیبەر کە نیوەی میوەو کشتوکاڵەکە بۆ ئەوان بێت)[(٢)].

(البخاری) گێڕاویەوە: لە(ابی جعفر)ەوە: (هەموو ماڵێکی کۆچکردو بۆ مەدینە بە سێ یەكو چوار یەك کشتوکاڵیان دەکرد.

پێشەوا عەلی (ﷺ)و (سعد بن مالك)و (ابن مسعود)و (عمر بن عبدالعزیز)و (القاسم)و (عروە)و خێزانی ئەبوبەکرو خێزانی عومەرو خێزانی عەلیو (ابن سیرین) هەمو ئەوانە زەویو زاریان کردووە بە (المزارعة).

بنە تۆو لەسەر کێیە؟ قەیدی نییە بنە تۆوەکە لەسەر خاوەن زەوی یەکە بێ یان لەسەر کەشتیارەکە بێ، یان لەسەر هەردووکیان بێت:

(البخاری) گێڕاویەوە[(٣)]: (عومەر بەم ڕەنگە کەشتیاری دەکرد گەر بنە تۆو لەسەر عومەر بێ ئەوە نیوەی دەکەوێ، گەر ئەوان بنە تۆو بێنن ئەوان ئەوەندەیان دەکەوێت. (الحسن) بڕوای وایە گەر زەوی موڵکی یەکێکیشیان بێو هەردووك خەرجی بکەنو بەرهەمەکەیان پێکەوە بێ قەیدی نییە. وە (الزهری) یش هەمان باوەڕی هەیە.

دروست نییە لەزەوی دا چاندنی خەڵکی دا (المزارعة) ئەم زەوییە پارچەیەکی هی خاوەن

---

(١) تێبینی: لای رافعیو نەوەوی لەموزارەعەدا بنەتۆو لەسەر خاوەن زەوییە. بەڵام لە(المخابرە) دا بنەتۆو لەسەر کرێکارو کشتیارەکەیە. وە(احمد)و (مالکی)و (شافعی)و (حنفی) ئەم گێڕانەوەیە: (نهی عن المزارعه) رواه مسلم بەراست نازانن. (کفایە الأخیار/ل:٣٨٤). وەرگێڕ.

(٢) صحیح (خ: ١٠/٥)

(٣) صحیح: (خ: ١٠/٥).

زەوی بیّو پارچەکەی تر هی کشتیارەکە بیّ، دیسان دروست نییە خاوەن زەوی بلّیّ ئەوەندە تەنەکەو پیّوانەیە بۆ خۆم.

(رافع بن خدیج) گیّراویەوە: (مامەکانم بۆیان گیّراومەوە کە ئەوان لەسەردەمی پیّغەمبەردا(ﷺ) زەوییان بە کریّ دەدا بەوەی لەسەر جۆگاکان دەرِویّ یان بە هەندیّ لەبەرهەمەکانی زەوییەکە بۆ خاوەن زەوی یەکە، پیّغەمبەر (ﷺ) ئەمەی قەدەغە کرد، بە رافیعم وت: ئەی زەوی بە کریّ دان بە دینارو دیرهەم؟ رافیع وتی: بە دینارو دیرهەم قەیدی نییە. (اللیث) وتی: ئەوەی لیّرەدا قەدەغەکراوە گەر کەسیّکی شارەزا لەحەلاّلّو حەرام سەرەنجی بداتیّ بە دروستی نازانیّ چونکە بە فەتارەت چونی تیّ دایە)[1].

(حنظلة) دەلّیّ: (لەراست زەوی بە کریّ دان (کراء الأرض) لە(رافع بن خدیج)م بە زیّرو زیو پرسیار کرد؟ وتی: قەیدی نییە. خەلّکی لەسەردەمی پیّغەمبەردا (ﷺ) زەوییان بەو بەرهەمە بە کریّ دەدا کە لەسەر روبارەکان (الماذیانات)و پیّشەوەی جۆگەکان دەرِویّ، یان لەسەر هەندیّ کشتوکالّ، جار هەبو ئەوەیان لەناو دەچوو بەشەکەی تر دەهاتە بەرهەمو جار هەبو ئەوە دەهاتە بەرهەمو بەشەکەی تر لەناو دەچوو، خەلّکیش کریّکەیان تەنیا ئەمە بوو، بۆیە پیّغەمبەر (ﷺ) ریّگری لیّ کرد، بەلاّم بەرامبەر کریّیەکی دیاری کراوو زامن کراو قەیدی نییە)[2].

* * *

(١) صحیح (الأرواء ٢٩٩/٥) خ(٢٣٤٦، ٥/٢٥/٢٣٤٧)..

(٢) صحیح (الأرواء: ٥/٢٠٣) م(١٥٤٧ ـ ٣/١١٨٣/١١٦).

تێبینی: بەلاّم (زید بن ثابت) رەتی ئەم قسەیەی (رافع بن خدیج) دەداتەوە گوایە پیّغەمبەر (ﷺ) کەشتیاری (المزارعە)ی قەدەغەی کردووەو رای گەیاندووە کە قەدەغەکردنەکە بۆ ناکۆکی یەك بووە، وەکو (ابو داود) گیّراویەوە. هەروەها (ابن عباس) فەرمویەتی قەدەغەکردنەکە بۆ شتەکی باشتر بووە: (من کانت لە ارض فلیزرعها او یمنحها اخاە، فان ابی فلیمسك ارضە) متفق علیە. واتە: کیّ زەوی یەکی هەبو با دایچیّنیّ یان با بیداتە کەسیّ بیکات بە کشتوکالّ، گەر نا با زەوی یەکە رابگریّت. (وەرگیّر).

## ئاودێری کردن (المساقاة)

پێناسە: ئاودێری، یان باغەوانی بریتی یە: لەسپاردنی باغ یان باخچەیەك بە کەسێ کە خزمەتی بکاتو ئەویش لەقازانجی بەرهەمەکەی بەشدار بکات، وەکو نیوەو چارەكو هتد.

### رێ پێ درانی:

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) زەویەکانی دایەوە خەڵکی خەیبەر بە بەشێ لەداهاتوو بەرەکەی یان کشتوکاڵەکەی)[1].

(ابو هريره) گێڕاویەوە: (ئەنصارەکان بە پێغەمبەریان (ﷺ) فەرموو: دارخورماکان لەنێوان خۆمانو براکانماندا دابەش بکە. فەرموی: نەء. ئەنجا وتیان ئەوەندەمان لەسەرە خزمەتی باخچەکان بکەینو ئێوەش لەبەرهەمەکەی بەشدار بکەین، وتیان: گوێڕایەڵینو لەخزمەتداین)[2].

* * *

(١) متفق عليه: باسكرا.

(٢) متفق عليه: (الأرواء: ١٤٧١) خ(٥/٨/٢٣٢٥).

# چاك كردنی زەوی (احیاء الموات)

(چاك كردنی زەوی یان هەمواركردن مەبەست لەم خاكەیە مردووەو ئاوەدان نەكراوەتەوە، لێرەدا ئاوەدانكردنەوە بەژیان چوێنراوەو ناهەمواریەكەشی بە مردوو چوێنراوە: كە ئەگەر كەسێ بچێ زەوی یەك چاك بكاتو ئاوی بداتو كشتوكاڵو دارو درەختی تێ دا بروێنێو بچێنێو بینای لەسەر بنیات بنێ ئەوە دەبێ بە موڵكی ئەو) [1].

## بانگێشە كردنی ئیسلام بۆی:

لەعائیشەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر كەسێ زەوییەك ئاوەدان بكاتەوەو هی كەس نەبێ بۆ ئەو لەپێشترە ببێتە موڵكی ئەو) [2].

(عروة) دەڵێ: عومەر لەخەلافەتی خۆیدا كاری بەمە كرد.

(جابر) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (من احیا ارضا میتة فهي لـه) [3]. واتە: كێ زەوی یەكی مردوو زیندو بكاتەوە ئەوە بۆ ئەوە. هەر لەئەم گەڕاوەتەوە پێغەمبەر ﷺ) فەرمویەتی: (من احاط حائطا علی ارض فهي له) [4]. واتە: كێ دیواری بنیات بنێ لەسەر زەوی یەك ئەوە هی خۆیەتی.

* * *

(١) فتح الباري (٥/١٨).

(٢) صحیح (ص.ج ٦٠٥٧) (خ: ٥/١٨/٢٣٤).

(٣) صحیح (ص.ج ٥٩٥٧)، ت(٢/٤١٩/١٣٩٥).

(٤) صحیح (ص.ج ٥٩٥٢)، (٨/٣٣٠/٣٠٦١).

# به کرێ دان (الإجارة)

## پێناسەی[١]:

(الإجارة) به واتای (الإثابة) دێ، دەڵێ ی (آجرته ـ أجرته). بەو پێیە (الإجارە) بە مانای پاداشت پێ دان دێت. لەزاراوەدا سوودگەیاندنە بە کەسێك لەبەرامبەر کارێکدا.

رێگا پێ درانی: خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾[٢]. واتە: گەر شیریان دا بە منداڵەکانتان کرێیان پێ بدەن. ﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾[٣].(کچی شوعەیب پێغەمبەر وتی) ئەی باوکە (موسا) بە کرێ بگرە (بۆ شوانی) باشترین کەسە بۆ بەکرێ گرتن، بەهێزەو ئەمینە.

خودا لەراست موساو خدر دەفەرمێ: ﴿فَوَجَدَا فِيهَا جِدَاراً يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْراً﴾[٤].

واتە: ئەو دووانە بینیان دیوارێك خەریکە دەڕوخێ، ئەویش (خدر) راستی کردەوە، (موسا) وتی: گەر ویستبات لەسەر ئەمە کرێت وەردەگرت).

عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکر پیاوێکیان لەبەنی ئەددەیل بەکرێ گرت، پاشان پیاوێکیان لەبەنی عەدی بە کرێ گرت کە بۆ رێگا پیشاندان شارەزابوو) [٥].

## ئەوەی دروستە بەکرێ بدرێت:

هەموو شتەکی سوودی لێ بینرێت مادام سەرچاوەکەی بمێنێتەوە، دروستە بە کرێ بدرێ،

(١) فتح الباري(٤/٤٣٩).

(٢) الطلاق/٦.

(٣) القصص/٢٦.

(٤) الكهف/٧٧.

(٥) صحيح الأرواء ١٤٨٩) خ(٤/٤٤٢/٢٢٦٣).

مادام ڕێگرەکی شەرعی نەبێت.

مەرجە ئەو شتەی بەکرێ دەدرێ ناسراو بێ‌و کرێکەی زانراو بێ‌و ماوەی بە کرێ دان‌و جۆری کارەکەشی ئاشکرا بێت.

خوای گەورە لەراست هاوڕێی موسا گێڕاویەوە (شوعەیب): ﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْراً فَمِنْ عندك﴾[1]. واتە: من دەمەوێ یەکێ لەم دوو کچانەم بکەمە هاوسەرت بەو مەرجەی هەشت ساڵ کارم بۆ بکەیت، گەر بیکەی بە دە ساڵ ئەوە خۆت سەر پشك ببە.

(حنظلة بن قیس) دەڵێ: (لەراست بە کرێ دانی زەوی بە زێڕو زیو لە(رافع بن خدیج)م پرسی؟ وتی: قەیدی نییە، خەڵکی لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) خەڵکی زەوییان بەو بەرهەمە بە کرێ دەدا کە لەسەر روبارەکان‌و پێشەوەی جۆگەکان دەڕواو یان لەسەر هەندێ کشتوکاڵ). وەکو باسکرا.

## کرێ‌و موچەی کرێ گرتەکان:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کرێ بە کرێکارەکە بدەن بەر لەوەی ئارەقەی وشك بێتەوە)[2].

## تاوانی ئەو کەسەی کرێ ی کرێکاران یان موچەیان نادات:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (خوای گەورە فەرمویەتی: سێ کەس هەیە من لەپەسلاندا دوژمنیانم: یەکێ پەیمان بە ناوی من دەدات پاشان ناپاکی دەکات، پیاوێ کەسێکی ئازاد دەفرۆشێ‌و پارەکەی دەخوات، پیاوێ کرێکارێ بە کرێ دەگرێ کارەکەی بۆ تەواو دەکات‌و کرێیەکەی پێ نادات)[3].

---

(١) القصص/٢٧.

(٢) صحیح (ص.جه ١٩٨٠) جه(٢/٨١٧/٢٤٤٣).

(٣) الأرواء/١٤٨٩) (خ: ٢٢٢٧/٤١٧/٤).

## هەندێ لەو شتانەی کرێ وەرگرتنیان دروست نییە:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(١).

واته: کچانی خۆتان ناچار مەکەن بۆ زینا مادام دەیانەوێ داوێن پاك بن، بۆ ئەوەی کالآی ژیانی دنیا داخواز بکەن، هەر کەسێ ناچاریان بکات ئەوە خودا دوای ناچارکردنیان لێ بوردەو بە بەزەیی یە.

(جابر) فەرمویەتی: ((عبدالله بن ابی ابن سلول) دوو کەنیزەی هەبوو بە ناوی (مسیکه)و (أمیمه) ناچاری دەکردن زینا بکەن، ئەوانیش لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) سکالآیان کرد، خوای گەوره ئایەتی: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(٢). دابەزاند.

(ابي مسعود الأنصاري - ر -) گێڕاویەوە: (ان رسول الله (ﷺ) نهى عن ثمن الكلب، ومهر البغي، وحلوان الكاهن). وەکو باسکرا.

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (نهى رسول الله عن عسب النحل). باسکراوە.

## کرێ ی قورئان خوێندن:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (قورئان بخوێنن، پارووی نان بە هۆی قورئان خوێندن مەخۆن، کالآی دنیای پێ زۆر مەکەن، لەخوێندنی دوور مەکەونەوەو زیادە رەوی تێ دا مەکەن (لەروی ماناوە)(٣).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (قورئان بخوێنن هەر هەموی جوانە، داهاتو چەند کۆمەلانێ دێن (وشەکانی) راست دەکەنەوە چۆن تیر راست دەکرێتەوە بۆ دنیا داوای بە پەلە پاداشتی پێ

---

(١) النور: ٣٣. تێبینی: زانایان دەڵێن: ئەم فەرمودەیە کە باس لەفرۆشتنی مرۆڤی ئازاد دەکات شیربایش دەگرێتەوە، کە فرۆشتنی کچە بە پارە). وەرگێڕ.

(٢) صحیح (مختصر م ٢١٥٥) م(٣٠٢٩ - ٢٧/٣٢٢٠/٤).

(٣) صحیح: ص، ج ١١٦٨، أ/١٥/١٢٥/٣٩٨

ئەکەن نەك داوای پاداشتی پەسلاّن بکەن)[١].

هەروەها فەرمویەتی: (فێری قورئان بن، بە هۆی قورئانەوە داوای بەهەشت لەخوا بکەن، بەر لەوەی خەڵکانێ پەیدا بن، بە هۆی قورئان داوای دنیا بکەن، قورئان سێ کەس فێری دەبن: پیاوێ تا خۆی پێ هەڵکێشێت، پیاوێ تا نانی پێ بخوات، پیاوێ بۆ خودا فێری دەبێ دەیخوێنێت)[٢].

❊ ❊ ❊

(١) صحيح (الصحيحة ٢٥٩) د(٨١٥/٥٨/٣).

(٢) صحيح (الصحيحة/٤٦٣) رواه ابن نصر في قيام الليل (ص ٧٤).

# هاوبەشی (الشراكة)

پێناسەی: هاوبەشی (الشراكە) واتە: تێکەڵاوی کردن (الإختلاط).

لەروی شەرعەوە: (بریتی یە لەتێکەڵاوکردنی دو سامان یان پتر بەسەر پشکی بۆ بەدەست هێنانی دەستکەوت. جار هەیە بێ مەبەست بە دەست دێ وەکو میرات) [١].

ڕێگە پێ درانی: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِنَّ كَثِيراً مِّنْ الْخُلَطَاء لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ إِلَّا الَّذِينَ آمنوا﴾[٢].

واتە: زۆرێ لەهاوبەشان ستەم دەرحەق بە یەکتری دەکەن، تەنیا ئەوانە نەبێ کە بڕوایان هێناوە.

پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ﴾[٣].

لێرەدا (شركاء في الثلث) واتە: لەسێ یەکدا هاوبەشن.

(السائب) بە پێغەمبەری (ﷺ) فەرموو: (تۆ لەسەردەمی نەزانی دا هاوبەشی من بوویتو باشترین هاوبەش بوویت، دەستت نە دەگرتم لەخەرج کردنو فێڵت لێم نەدەکرد) [٤].

## هاوبەشی شەرعی:

(الشوكاني) لە(السيل الجرار)دا (٣/٢٤٦)و (٣/٢٤٨) دا نوسیویەتی: (هاوبەشی شەرعیو یاسایی کاتێ دروست دەبێ کە هاوبەشەکان دوو بن یان پتر رازی بن بە دانی بڕێك لەدارایی یان تا دەستکەوتو قازانج بە دەست بێننو هەر یەکەیان بە پێ ی بڕی دارایی یەکەی کە خستویە

(١) فتح الباري (٥/١٢٩).
(٢) ص/٢٤.
(٣) النساء/١١٢.
(٤) صحيح (ص.جه ١٨٥٣) جه(٢/٧٦٨/٢٢٨٧).

گەڕ قازانج وەربگرێ. ئەگەر لەسەر ئەوە رێك کەوتن قازانجیان وەکو یەکتری بێ با بڕی دارایی یەکەش وەکو یەك نەبێ ئەوە دروستە، با دارایی یەکێکیان زۆر بێو هی ئەویتر کەمتر بێت، لەشەریعەتدا ئەمە کێشە نییە، ئەمە بازرگانی یەکە لەسەر رازی بوونو دڵ لێ بوونەوە دادەمەزرێت).

* * *

# پارە پێدان بۆ بازرگانیو قازانجی هاوبەش
# (المضاربة = القراض)

## پێناسەی[1]:

(المضاربة) بۆ سەفەری بازرگانی هاتووە: ﴿وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ﴾[2]. واتە: ئەوانی تر سەفەری بازرگانی دەکەن بۆ بە دەست هێنانی رۆزی لەچاکەی خواوە.

پێشی دەوترێ (المقارضة) لەوشەی (القرض)ەوە هاتووە، واتە: (القطع ـ پارچە) چونکە خاوەندار برێ پارەی جیا کردۆتەوە تا بازرگانی پێ بکاتو پارچەیەك قازانج بە دەست بێنێت.

مەبەست لێرەدا هاوبەشی دوو کەسە رێك دەکەون یەکێکیان پارە بدات بە ئەوەی تر بە مەبەستی بازرگانی پێوە کردنیو قازانجیان پێکەوە بێ لەسەر ئەو برەی لەسەری رێك کەوتون).

## رێگە پێدرانی:

**(ابن المنذر) لە(الإجماع) دا (ل: ١٢٤) دا دەنووسێ:**

(زانایان کۆکن لەسەر ئەوە کە پارە پێ دان بۆ بازرگانیو قازانج کردن (القراض) دروستە. لەسەر ئەوە کۆکن کە کرێکارەکە دەتوانێ مەرج دابنێ وەکو داواکردنی سێ یەك یان نیوەی قازانج یان هەرچۆنێ رێك بکەون، دوای ئەوەی روون دەکرێتەوە چەندە دەبێت لەو قازانجەیە). ئەم کارە یارانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کردویانە. (زید بن اسلم) لەباوکی گێراویەوە: ((عبدالله)و (عبیدالله)ی کورانی عومەری خەتتاب لەگەڵ سوپایەکدا رۆیشتن کە بەرەو عێراق دەچوو، پاش گەڕانەوەی بە لای (ابو موسی الأشعري) دا رەت بوون، ئەو کاتە سەرۆك هەرێمی (والی) عێراق بوو، زۆر بەخێر هاتنی کردنو، پاشان وتی: گەر بمتوانیبایە حەزم دەکرد قازانجەکم پێ گەیاندبان، پاشان وتی: بەڵێ لێرە هەندێ ماڵی خوا هەیە، دەمەوێ بۆ عومەری میری موسڵمانان رەوانە

---

(١) فقه السنة(٣/٢١٢).

(٢) المزمل: ٢٠.

بکەم، بە قەرز دەیدەمە دەست ئێوە هەندێ کالآی عێراقی پێ بکڕنو پاشان لەمەدینەدا بیفرۆشنەوە، مایەکە بدەنەوە عومەرو قازانجەکەش بۆ خۆتان بێت، وتیان: ئەوەمان پێ خۆشە، چون وایان کرد. نامەی بۆ عومەر نارد کە ئەو برە دارایی یە یان لێ وەربگرێت. کاتێ چوونەوە قازانجیان کرد، کاتێ دایانەوە عومەر، ئەو وتی: ئایا ئەو قەرزەی وەکو ئێوە بە هەموو سوپایەکەی داوە؟ وتیان: نەء. عومەر وتی: کوڕانی میری موسڵمانان! ئەوە بە قەرزی پێ داون! ئەو ماڵە بە قەرزەوە بیگێڕنەوە، (عبداللە) دەنگی نەکرد، هەرچی (عبیداللە) بو وتی: ئەمە بۆ میری موسڵمانان دەست نادات! گەر ئەو ماڵە کەمی کردبایە ئێمە دابینمان دەکردو زامنی دەبوین. عومەر وتی: بیدەنەوە. (عبداللە) دەنگی نەکردو (عبیداللە) گەڕایەوە. پیاوێ لەو دانیشتنەدا هەڵی دایەو وتی: بۆ نایکەی بە (قیراض)؟ ئەنجا عومەر وتی: ئەوە کردمە (قیراض). عومەر مایەو نیوەی قازانجەکەی هەڵگرتەوە، (عبداللە)و (عبیداللە)ش کوڕانی عومەر نیوەکەی تری قازانجیان برد)[1].

**پێویستە فەرمانبەر (العامل)ەکە دەست پاك بێت :**

ئەم جۆرە هاوبەشی یە (القراض) بە رەهایيو مەرجەوە دروستەو فەرمانبەرەکە بە سنوور بەزێنیو نایاسایی یەك نەبێ (المخالفه) زامن نابێت.

(ابن المنذر) دەڵێ: (گەر خاوەن ماڵەکە فەرمانبەرەکەی یاساغ کرد بە دواخستن کڕینو فرۆشتن بکاتو ئەویش لەقسەی دەرچوو ئەو زامنەو کۆی زانایان لەسەر ئەم رایەن)[2]. (حکیم بن حزام) کە یەکێکە لەسەحابیەکان ئەم مەرجانەی بۆ فەرمانبەرەکەی دا دەنا (گەر بە نیازی ـ المقارضة ـ پارەی دایە دەست قسەی لەگەڵدا دەکرد: نەکەی ماڵاتی پێ بکڕی، یان لەرێگای دەریا بیگوازیەوە، نەکەی بەناو لافاودا بیبەیت، گەر هەر کامێ لەم کارانەت کرد ئەوە زامنی دارایی منت لەسەرە)[3].

❊ ❊ ❊

---

(١) صحيح (الأرواء/٢٩١/٥) هق(٦/١١٠).

(٢) الإجماع/١٢٥.

(٣)صحيح الإسناد/(الأرواء/٢٩٣/٥) هق(٦/١١١).

# سەلەم (السلم ـ السلف)

سەلەم پڕ بە پێستی خۆی واتە (السلف). ڕاستی یەکەی لەشەریعەتدا: فرۆشتنی شتەکی وەسف کراوە لەعۆدەی خۆیدا بە پارەو نرخەکی بە پەلە[١].

## ڕێگا پێ درانی:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ﴾[٢]. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە گەر قەرزێکتان کرد بۆ کاتەکی دیاری کراو بینووسن.

(ابن عباس) دەڵێ: (گەواهی دەدەم کە سەلەمی زامنکراو بۆ کاتەکی دیاری کراو خوا لەکتێبی خۆیدا حەلاڵی کردووەو ڕێگای پێ داوە، پاشان ئەم ئایەتەی ڕابردوی خوێندەوە...)[٣].

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) چووە مەدینە بینی خەڵکی مەدینە دوو ساڵو سێ ساڵ سەلەم دەکەن، ئەویش فەرمووی: (من اسلف في شيء ففي كيل معلوم ووزن معلوم الى اجل معلوم)[٤]. واتە: کێ سەلەم لەشتەکی دا دەکات با پێوانەو کێشی دیاری کراو بێو کاتەکەشی دیاری کراو بێت.

## سەلەم کردن لەگەڵ کەسێکدا کالاو بنەڕەتەکەی بە دەستەوە نییە:

مەرج نییە ئەو شتەی سەلەمی تێ دا دەکرێ موڵکی سەلەم کراوەکە یان فرۆشیارەکە بێت: (محمد بن ابی المجالد) گێڕاویەوە: (عبدالله بن شداد)و (ابو بردة) ڕەوانەی لای (عبدالله بن ابی اوفی)

---

(١) فقه السنة (٣/١٧١).

(٢) البقرة/٢٨٢.

(٣)صحيح (الأرواء/١٣٦٩) هق(٦/١٨).

(٤) متفق عليه: خ(٢٢٤٠/٤٢٩/٤) م(١٦٠٤/١٢٢٦/٣).

`یان کردم، وتیان: پرسیاری لیّ بکەن: ئایا یـارانی پێغەمبــەر (ﷺ) لەسـەردەمی پێغەمبـەردا (ﷺ) سەلەمی گەنمیان دەکرد؟ (عبدالله) وتی: لەگەڵ خەڵکانی غەیرە عەرەبدا (النبیط) لەشـامدا سـەلەمی گەنمو جۆو مێوژمان دەکرد بە پێوانەیەکی زانراو بۆ کاتەکی دیاری کراو.

وتم: ئەی بۆ کەسیّ کە شتە بنەڕەتەکەی لایە؟ وتی: ئێمە پرسیاری ئەوەمان نەدەکرد. پاشان ڕەوانەی لای (عبدالرحمن بن ابزی) کردمو لێم پرسیو وتی: یارانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسـەردەمی ئەودا سەلەمیان دەکردو لێمان نە دەپرسین ئایا کێڵگەیان هەیە یان نە»[1].

❊ ❊ ❊

(١) صحیح (الأرواء/١٣٧٠) خ(٢٢٤٤/٤٣٠/٤).

# قەرز ( القرض ـ الدين )

## گەورەیی یەکەی[١] :

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ دەروویەك لەموسڵمانێ بکاتەوە خـوا لەپەسـڵان (قیامەت)دا دەروویەکی لێ دەکاتەوە، هەر کەسێ یارمەتی هەژارێ بداتو دەوڵەمەنـدی بکـات خوا لەدنیاو قیامەتدا یارمەتی دەداتو دەوڵەمەندی دەکات، خوا یارمەتی بەندەی خـۆی دەدات تا ئەو کاتەی لەخزمەت یارمەتی براکەی خۆی دا دەبێت)[٢].(ﷺ) فەرمویەتی: (هـەر کەسـێ دوو جار قەرز بداتە براکەی خۆی وەکو ئەوە وایە جارێك خێری پێ کردبێت)[٣].

## توندی کردن لەقەرزدا :

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ گیانی لەلاشە جیـابۆوە لەسـێ شـت دوور بـوو، ئـەوە دەڕواتـە بەهەشـتەوە: لەخۆبـەزلزانیو دزیـنی دەسـتکەوتی جـەنگ (الغلـول)و قـەرز)[٤]. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (دەروونی بـڕوادار بـە قەرزەکەیـەوە بەسـتراوەتەوە تـا قـەرزی بـۆ دەدرێتەوە)[٥]. وپێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): (هەر کەسـێ بمـرێو دینـارێ یـان دو درهـەمی لەسەر بێ لەچاکەکانی ئەو دەدرێتەوە، لەوێ دا دینارو درهەم نییە)[٦].

(ابی قتادە) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوانیاندا هەڵسا پێو ئامۆژگـاری کـردن کـە

---

(١) خوا دەربارەی قەرز فەرمویەتی: ﴿وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً﴾ المزمل:٢٠. واتە: قەرزی باش بدەن لەبەر خودا. یان ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً﴾ البقرة/٢٤٥..

(٢) صحيح (مختصر م ١٨٨٨) م(٤/٢٠٧٤/٢٦٩٩).

(٣) حسن (الأرواء/١٣٨٩) جه(٢/٨١٢/٢٤٣).

(٤) (ص.جه ١٩٥٦) جه(٢/٨٠٦/٢٤١٢).

(٥)صحيح (ص.ج ٦٧٧٩) ت(٢/٢٧٠/١٠٨٤).

(٦) صحيح (ص.جه ١٩٥٨) جه(٢/٨٠٧/٢٤١٤).

خەبات لەپێناوی خواداو بڕوابون بە خوا باشترین کردەوەیە، ئەنجا پیاوێ راست بۆوەو وتی: باشە گەر لەپێناو خوادا کوژرام تاوانەکانم چاوپۆشی یان لێ دەکرێت؟ فەرموی: (بەڵێ، گەر تۆ لەرێگای خوادا شەهید بوویتو خۆ ڕاگر بوویو نیازت بە خوا بوو، رووەو شەڕ بووی نەك راکردو بوویت. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی چۆن قسەکەت کرد؟ وتی: ئایا گەر لەپێناو خوادا شەهید بوم لەگوناهەکانم پاك دەبمەوە؟ (ﷺ) پێغەمبەر : بەڵێ گەر لەپێناو خوادا کوژرایو تۆ خۆراگر بویو نیازت بەو بۆ، رووت لەشەڕ بوو نەك پشت هەڵکردو، تەنیا قەرز نەبێ، جبریل (س) ئەمەی پێ وتم) [١].

## ئەو کەسەی بە نیازی دانەوەو نەدانەوەی پارە لەخەڵکی وەردەگرێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ ماڵی خەڵکی بە نیازی دانەوەی وەربگرێ خوا لەبریتی ئەو دەیداتەوە، هەر کەسێ بە نیازی نەدانەوەی وەری بگرێ ئەوە خودا بە فەتارەتی دەدات ـ خۆی یان ماڵی ـ) [٢].

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ بە نیازی ئەوەی قەرز وەربگرێ کە نەیداتەوە بە دز بە ژوانی خوا دەگاتەوە) [٣].

## فەرمان کردن بە دانەوەی قەرز:

﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا...﴾[٤]. واتە: خوا فەرمانتان پێ دەکات راسپاردەکان بدەنەوە خاوەنەکانی خۆیان...).

## باش دانەوەی قەرز:

(ابو هريرة) گێڕاویەوە:

---

(١) صحيح (الأرواء ١١٩٧) م(١٨٨٥/١٥٠١/٣).

(٢) صحيح (ص.ج ٥٩٨) خ(٢٣٨٧/٥٣/٥).

(٣) حسن صحيح (ص.جه ١٩٥٤) جه(٢٤١٠/٨٠٥/٢).

(٤) النساء/٥٨.

(پێغەمبەر (ﷺ) وشترەکی کابرایەکی لابوو کە بە قەرز لێ ی وەرگرتبوو، هات داوای کردەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بیدەنەوە. بە شوێن وشترەکی لەو تەمەنەدا گەڕان نەیان دۆزییەوە، تەنیا ئەو وشترانە هەبون کە لەسەرووی تەمەنی ئەوەوەبون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەوەی بدەنێ. کابرا وتی: بە تەواوی قەرزەکەت دامەوە خواش بە تەواوی پاداشتت بداتەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ان خیارکم احسنکم قضاء) [1]. واتە: باشترین کەستان ئەو کەسەیە لەهەموو کەس باشتر قەرز دەداتەوە.

(جابر بن عبدالله) دەفەرمووێ: (هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەو لەمزگەوتدا بو (مسعر) وتی: (وابزانم وتی: چێشتەنگاو بوو) وتی: دوو رکەعەت نوێژ بکە، قەرزی منی لا هەبوو، ئەنجا بە زیادەوە قەرزەکەی دامەوە) [2].

(عبدالله بن ابي ربيعة المخزومي) لەباوکی ئەویش لەباوکی خۆی گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی غەزای حونەیندا سی تا چل هەزاری لێ قەرز دەکات، کاتێ هاتەوە قەرزەکەی دایەوە. پاشان پیغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (خوا فەر بخاتە ماڵو منداڵت، بێگومان پاداشتی دانەوەی قەرزو سوپاسە) [3].

## باش داواکردنەوەی قەرز:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من طالب حقا فليطلبه في عفاف واف او غير واف) [4].
واتە: هەر کەسێ داوای حەقێکی خۆی بکاتەوە با پاکیو حەڵاڵی داوای بکاتەوە، گەر ئەو حەقەی تەواو بو یان ناتەواو بوو.

---

(١) صحيح (الأرواء/٥/٢٢٥)(خ٢٣٩٣/٥٤/٤) م(١٦٠١/١٢٢٥/٣).
(٢) صحيح (خ٢٣٩٣/٥٩/٥).
(٣) حسن (ص.جه ١٩٦٨) جه (٢٤٢٤/٨٠٩/٢) نس(٣١٤/٧).
(٤) صحيح (ص.جه ١٩٦٥) جه(٢٤٢١/٨٠٩/٢).

## چاوەڕێ کردنی دەست کورتو مۆڵەت دانی:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[1].

واتە: گەر کابرا دەست کورت بوو، مۆڵەتی بدەن تا دەوڵەمەند دەبێ، گەر گەردەنی ئازاد بکەن بزانن ئەوە بۆ ئێوە باشترە.

(حذيفة) گێڕاویەوە لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست فەرموی: (پیاوێ مرد، پێ ی وترا چیت کرد؟ وتی: من کڕینو فرۆشتنم لەگەڵ خەڵکی دا دەکرد، لەگەڵ دەوڵەمەندا چاوپۆشیم هەبوو لەگەڵ نەداردا بار قورسیم لەسەر سوك دەکرد، ئەنجا خوا لێ ی خۆش بوو)[2].

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (کێ پێ ی خۆشە خوا بیخاتە ژێر نسێ ی خۆیەوە، با ماوەی نەدار بدات (لەقەرزدا) یان لێ ی خۆش بێت)[3].

## دواخستنی قەرز دانەوە لەلایەن دەوڵەمەندەوە ستەمە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (مَطل الغني ظلم)[4]. واتە: دواخستنی قەرز دانەوە ستەمێکە.

## گرتنی ئەو کەسەی دەتوانێ قەرز بداتەوە بەڵام نایداتەوە:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لي الواجد يُحل عرضه وعقوبته)[5]. واتە: (ئەو کەسەی دانەوەی قەرز دوا دەخاتو هەبوویشە، ڕەوایە بۆ خاوەن قەرزەکە بە ستەمکارو قەرز کوێر وەسفی بکاتو سزا بدرێ (بە بەندیخانەو تەمبێ کردن).

---

(١) البقرة/٢٨٠.

(٢) صحيح (ص.جه ١٩٦٣) خ(٥/٥٨/٢٣٩١).

(٣) صحيح (ص.جه ١٩٦٣) جه(٢/٨٠٨/٢٤١٩).

(٤) متفق عليه: (خ٥/٦١/٢٤٠٠) م(٣/١١٩٧/١٥٦٤).

(٥)حسن/خ تعليقا/٥٢/٦٢/ (ص. نس ٤٣٧٣) نس(٧/٣١٧).

## هەر قەرزێك ( قازا نجێك ) رابكێشێ ( سووە ) :

(ابي بردة) گێڕاویەوە: (چوومە مەدینەو تووشی (عبدالله بن سلام) هاتم، وتی: بڕۆ لەگەڵم دا بۆماڵەوە، لەو دۆلکەیە پێت دەنۆشم کە پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی نۆشیوە، لەو مزگەوتەدا نوێژ دەکەی کە ئەو نوێژی تێ دا کردووە، منیش لەگەڵی دا چوم، ئەنجا ئارد (السویق)[1] و خورمای پێ دامو لەمزگەوتی ئەودا نوێژم کرد، وتی: تۆ لەخاکێکدایت سووی تێ بڵاوبۆتەوە، بەشێ لەسوو ئەوەیە کە یەکێ لەئێوە تا ماوەیەك قەرزێ وەردەگرێ، کاتێ ماوەکە هات دەیهێنێو سەبەتەیەکی پێ یە دیاری تێ دا هەیە، خۆت لەو سەبەتەیەو ئەوەی ناوی بپارێزە)[2].

(١) وشەی (السویق) واتە: ئاردی زۆر وردی گەنمو جۆو ئاردە ساوەر. (وەرگێڕ).

(٢) صحیح (الأرواء ٥/٢٣٥) خ(٣٤٢/٣٨١٤) هق(٥/٣٤٩).

# بارمتە (الرهن)

پێناسە: لەزماندا واتە: گلدانەوە (الاحتباس). یان واتە: دەوام کردنو جێگیری، وەکو دەوترێ: (رهن الشيء، اذا دام وثبت). خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾[1]. هەر کەسێ پەیوەستە بەو کارانەی کردوونی.

لەشەریعەتدا: دانانی سامانێکە وەکو بڕوانامەیەك بۆ قەرزەکە، تا گەر کاتێ نەیتوانی بیداتەوە ئەو شتەی بۆ خۆی بێت.

## ڕێگا پێ درانی:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِباً فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ﴾[2]. واتە: گەر لەسەفەردا بوونو نووسەرێکتان دەست نەکەوت بۆ نووسینی قەرزەکە بارمتەیەك بدەنە دەستەوە.

هەر چەندە بارمتە بە سەفەرەوە بەستراوەتەوە لەبەر زۆرینەیە، بەڵکو بە پێ ی ئەم فەرمودەیە لەماڵەوەشدا دروستە. عائیشە گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێ خۆراکی لەجولەیەك کڕی بۆ ماوەیەك، زرێکەی بە بارمتە لا دانا)[3].

## سوود وەرگرتن لەبارمتە:

دروست نییە سوو لەبارمتە وەربگیرێت، وەکو رابردو باسمان کرد هەر قەرزێ قازانج رابکێشێت ئەوە سو(ربا) . مەگەر بارمتەکە وڵاخێکی سواری بێ یان شیردەر بێت، ئەو کاتە دروستە وڵاخەکە سوار ببیو، ئاژەڵە شیردەرەکە گەر ئالیکی بداتێ دروستە شیرەکەی بدۆشیت.

(ابو هريرە) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر وڵاخەکە هی سواری بوو بارمتە

---

(١)المدثر/٣٨.

(٢) البقرة/٢٨٣.

(٣) متفق عليه. باس کراوە.

کرابوو، دەتوانرێ لەبەرامبەر ئالیك پێ دانی سواری بـبن، گـەر وڵاخەکـە شـیردەر بـێ دەتـوانرێ لەبەرامبەر ئالیك‌و خەرجی دا مادام بارمتە کرابێ شـیرەکەی بخورێتـەوە، ئـەو کەسـەی سـواری دەبێ‌و شیری دەخوات خەرجی لەسەرە) [١].

* * *

(١) صحيح (ص.ج ٣٩٦٢) خ(٥/١٤٣/٢٥١٢).

# حەواڵە (الحوالة)

**پێناسە:**

وشەی (الحوالە) لە(تحويل) یان (الحول)ەوە هاتووە، واتە گواستنەوە. وەکو دەڵێ ی (حال عن العهد). بەڵام لای فەقیهەکان گواستنەوەی قەرزە لەعۆدەی کەسێکەوە بۆ ملی کەسێکی تر.

گەر کەسێك قەرزی لەسەر هەبوو، ئەویش کەسێکی تر قەرزی ئەوی لەلا هەبوو دەوڵەمەندیش بوو، دەتوانێ بۆ قەرزدانەوەی خۆی خاوەن قەرزەکە رەوانەی لای ئەو بکات، تا قەرزەکەی ئەو لەجیاتی ئەو بداتەوە. وەکو لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: (مطل الغني ظلم، فاذا اتبع احدكم على مليّ فليتبع)[1]. واتە: دواخستنی قەرز لەلایەن هەبووەوە ستەمێکە، گەر یەکێ لەئێوە حەواڵەی سەر دەوڵەمەندێ کرا، با حەواڵەکە قبوڵ بکات.

❊ ❊ ❊

(١) صحيح (ص.ج ٥٨٧٦) جە(٢٤٠٤) أ(٧١/٢).

# راسپاردە (الوديعة ـ الأمانة)

پێناسەی: (الوديعة) لە(ودع)وە هاتووە واتە: لێ گەڕان‌و واز لـێ هێنـان. بۆیـە بـە دانـانی شتێ لای کەسێك بە راسپاردە دەوترێ (الوديعة) چونکە لای کابرا بە جێ دەهێڵرێت.

## حوکم و یاساکەی:

گەر برایەك راسپاردەیەکی لای برایەکی خۆی دانـا سـوننەتە وەری بگـرێ، مـادام دەزانـێ دەتوانێ بیپارێزێ، چونکە ئەمە لەبابەتی یارمەتی یەکتری دانە بـۆ سـەر تـەقوا. پێویـستە ئـەو کەسەی کە راسپاردەی لەلا دادەنرێ لەکاتێ دا خاوەنەکەی داوای دەکاتـەوە تەسـلیمی بکاتـەوە. وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا ﴾[١]. واتـە: خـوا فەرمانتان پێ دەکات راسپاردەکان بدەنەوە دەستی خاوەنیان.

لەفەرمودەدا هاتووە: (اد الأمانة الى من ائتمنـك...) [٢]. واتە: راسپاردە بەو کەسە بدەوە، کە تۆی بە دەست پاك داناوە.

## گرنتی یەتی (زەمانەتی):

ئـەو کەسـەی راسـپاردەی لـەلادادەنرێ گـرنتی یـان زەمانـەتی لەسـەر نییـە، مەگـەر کەمتەرخەمی تێ دا کردبێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من اودع وديعة فلا ضـمان عليـه) [٣]. واتە: کێ راسپاردەیەك دابنێ گرنتی لەسـەر نییـە. وە دەفـەرمووێ(ﷺ): (لا ضـمان علـى المؤتمن) [٤]. واتە: گرنتی لەسەر ئەو کەسە نییە بە دەست پاك دانراوەو ئەمانەتی لادانراوە!.

---

(١) النساء:٥٨.

(٢) صحيح (ص.ج ٢٤٠) ت(٢/٣٦٨/١٢٨٢).

(٣) حسن (ص.ج ١٩٤٥) جه (٢/٨٠٢/٢٤٠١) (الأرواء: ١٥٤٧).

(٤)حسن (ص.ج ٧٥١٨) قط(٣/٤١/١٦٧) هق(٦/٢٨٩)

(انس بن مالك) دەڵێ: (عومەری خەتتاب راسپاردەیەکی لا دادەنێو لەناو ماڵی ئەودا دەدزرێ، ئەویش زەمانەتی دەخاتە سەر واتە پێی بژارد!)[1].

(البيهقي) دەڵێ: رەنگە کەمتەرخەمی کردبێ، بۆیە دانەوەی زیانەکەی خستبێتە سەر[2].

* * *

(١)حسن (ص.ج ٧٥١٨) هق(٦/٢٨٩).

(٢) هق (٦/٢٨٩).

## داخوازی کردن ( خواستن ـ العارية )

پێناسەکردنی: فەقیهەکان دەڵێن: دروستە خاوەن ماڵ موڵکی خۆی بداتە دەست کەسێ سوودی لێ وەربگرێ بەبێ وەرگرتنی هیچ نرخو بەرامبەرێك.

**یاساو ڕێسای:**

ئەمە سوننەتە وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾[1]. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (خوا یارمەتی بەندە دەدات مادام ئەو لەخزمەت یارمەتی دانی براکەی دایە) [2].

خودا ئەوانەی سەر کۆنە کردوون خواستنو یارمەتی قەدەغە دەکەن: ﴿وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ﴾[3]. واتە: (هاوار) بۆ ئەو کەسانەی کۆمەکیو یارمەتی قەدەغە دەکەن.

پێویستی گێڕانەوەی بۆ خاوەنەکەی: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾[4]. وەکو باسکرا.

**گرنتیو زەمانەتی:**

ئەو کەسەی کاڵایەك داخواز دەکات بە دەستپاك دانراوەو گرنتی لەسەر نییە مەگەر کەم تەرخەمی کردبێ، یان ئەو کەسەی کاڵاکەی لێ خوازراوە ئەو مەرجە دابنێت. (صفوان بن يعلى) لەباوکی گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەمنی فەرموو: کاتێ پەیامنێری منت هاتە لا، سی زرێو سی وشتری بدە دەست، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە خوازراوەکی زامنکراون، یان

---

(١) المائدة/٢.

(٢) صحيح (ص.ج ٦٥٧٧) أ(٢/٤٠٧) ت(٢٦٤٦/٢٨/٥).

(٣) الماعون/٧.

(٤) النساء/٥٨.

خوازراوێکی پێ دراون؟ فەرموی: بەڵکو خوازراوێکی پێ دراون) [1].

(الصنعانی) لە(سبل السلام٣/٦٩)دا نوسیویەتی:

**زامنکراو (مضمونة):** واتە: گەر لەناو بچێ دەبێ تۆڵەی بدرێت.

**پێ دراو(المؤداة):** واتە: پێویستە خوازراوەکە بدرێ‌و سەرچاوەکەی بهێڵرێتەوەو گەر لەدەست بچێ تۆڵەکەی نادرێت.

وتویەتی: ئەمە بەڵگەیەکە بە دەست ئەوانەوە کە دەڵێن: شتی خوازراو زامنی لەسەر نییە مەگەر زامنی بخرێتە سەر. ئەمە روون ترینی قسەکانە. (تەواو).

❊ ❊ ❊

(١) صحيح (ص.د ٣٠٤٥) الصحيحة (٦٣٠) د :٣٥٤٩/٤٧٩/٩).

# ماڵی هەڵگیراوە ( اللقط )و ئاژەڵی ون بوو ( الضالة )

پێناسەی : ئەو دارایی یەیە کە دۆزراوەتەوەو خەریك بووە ون ببێ هەڵگیراوەو خاوەنەکەی ناناسرێت. زۆربەی جار بەو شتانە دەوترێ کە گیاندار نین، هەرچی ئاژەڵ بێ پێ ی دەوترێ بزربوو(الضالة).

## ئەو کەسەی ماڵێ هەڵدەگرێتەوە دەبێ چی بکات؟

پێویستە بەر لەهەمو شتێ نیشانەکانی دیاربکات کە چی یەو ژمارەی چەندە، پاشان کەسێکی دادوەر بکاتە شاهید بە سەریەوە، پاشان هەڵی بگرێو یەك ساڵی رەبەق بیناسێنێ، گەر خاوەنی پەیدابوو نیشانەکانی پێ وت گەر دوای ساڵەکیش بێ دەبێ بیداتەوە، دواتر دەتوانێ سودی لێ وەربگرێت.

(ابی بن کعب) گێڕاویەوە: (تورەکەیەکم دۆزییەوە سەد دیناری تێ دا بوو، هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، فەرموی: ساڵێك بیناسێنە، ئەوەبو ساڵێ ناساندم، کەسێکم نەبینی بیناسێتەوە، ئەنجا هاتمەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ساڵێ بیناسێنە، ئەنجا ساڵێکم ناساندو خاوەنەکەم نەدۆزیەوە. پاشان بۆ جاری سێ یەم هاتمە خزمەتیو فەرموی: (تورەکەکەو ژمارەکەیو بەنی دەمبەستەکە دەرخ بکە، گەر خاوەنەکەی هات ئەوە باشە، گەر نا سوودی لێ وەربگرە، دوای ئەوە لەمەککەی خاوەنەکەم دۆزییەوە نازانم وتی دوای سێ ساڵ، یان ساڵێکی بەسەر دا تێ پەڕی)[(١)].

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی: (هەر کەسێ شتەکی هەڵگرتەوەو دۆزییەوە کەسێ یان دوو کەس بکاتە شاهید، پاشان نەکا بیگۆڕێو بیشارێتەوە، گەر خاوەنەکەی هات ئەوە ماڵی ئەوە،

(١) متنفق عليه: (خ: ٥/٧٨/٢٤٢٦) م(٣٣/١٣٥٠/١٧٢٣).

گەر نا ئەوە ماڵی خوایە بە هەرکەسێ مەبەستی بێ دەیدات بە ئەو) [(١)].

## وشترو مەڕو ماڵاتی ون بوو (الضالة):

هەر کەسێ مەڕو بزنەکی دۆزییەوە دەیباتەوەو دەیناسێنێ، گەر ناسراوە گەر نا مولکی خۆیەتی، هەر کەسێ وشترەکی دۆزییەوە نابێ بیباتەوە چونکە مەترسی تیاچوونی لێ ناکرێت:

(زید بن خالد الجهنی) گێڕاویەوە: (عەرەبەکی دەشتەکی (رەسەن) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، لەراست شت دۆزینەوە پرسیاری لێ کرد، ئەویش فەرموی: یەك ساڵ بیناسێنەوەو باسی بکە، دوایی تورەکەکەو دەم بەستەکەی لەبەر بکە، گەر کەسێ پێ وە هات ئەوە باشە، گەرنا خەرجی بکە. وتی: باشە ئەی پێغەمبەری خوا ئەی مەڕی ون بوو؟ پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) ئەوە ماڵی خاوەنەکەیەتی یان هی تۆیە یان هی گورگە، وتی: ئەی وشتری ون بوو؟ پێغەمبەر (ﷺ) سوور داگەڕاو فەرمووی: چیت لەوشتر داوە پێڵاوو کوندەی(السقاء) خۆی پێ یە دێتە سەر ئاوو گژوگیا دەخوات) [(٢)].

## حوکمی ئەو شتانەی دەخورێ‌و شتی کەم:

هەر کەسێ خواردنێکی لەرێگادا بدۆزێتەوە، بۆی هەیە بیخوات، کێ شتەکی کەم بدۆزێتەوە، کە کەس دڵی پێوە نەبێ، بۆی هەیە هەڵی گرێتەوە.

(انس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەراست دەنکە خورمایەکدا رەت بو بە رێگاداو فەرموی: گەر لەوە نەترسابام ماڵی زەکاتە دەم خوارد) [(٣)].

## هەڵگیراوەی مەککەو مەدینە (حەرەم):

نابێ لەو ناوچە حەڕەمانە شت هەڵبگیرێتەوە مەگەر بۆ ناساندنەوە نەبێ‌و دوای ساڵی وەکو

---

(١)صحيح: (ص.جه ٢٠٣٢) جه (٢/٨٣٧/٢٥٠٥).

(٢) متفق عليه: خ(٥/٨٠/٢٤٢٧) م(١٧٢٢ ـ٢/١٣٤٨/٣).

(٣) متفق عليه: خ(٥/٨٦/٢٤٣١) م(٢/٧٥٢/١٠٧١).

هی ناوچەی تر نابێ بە موڵکی کەس، (ابن عباس ـ ر ـ) گێڕاویەوە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (خوای گەورە مەککەی کردووە بە حەڕەم، بۆ کەس بەر لەمن حەڵاڵ نەبووەو دوای منیش بۆ کەس حەڵاڵ نابێ، تەنیا سەعاتێ لەرۆژدا بۆ من حەڵاڵ بوو، داری تەڕی نابڕدرێ، درەختی نابڕدرێ، ڕاو قەدەغەیە و شتی ون بووی هەڵناگیرێتەوە مەگەر بۆ ناساندنەوە نەبێت)[1].

* * *

(١) صحيح (ص.ج ١٧٥١) (الأرواء/١٠٥٧) خ(٤/٤٦/١٨٣٣).

## هەڵگرتنەوەو دۆزینەوەی منداڵی ون بوو فڕێ دراو ( اللقیط )

**پێناسەکردنی:**

هەڵگرتنەوەی منداڵ (اللقیط) ئەو منداڵەیە لەجادەو رێگاو باندا دەدۆزرێتەوەو نازانرێ منداڵی کێ یە.

**حوکمەکەی:**

فەرزی کیفایەیە وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾[1].

**موسڵمان بوون و ئازادی بیرو بڕوای و خەرج کێشانی:**

گەر لەسنووری ئیسلامدا دۆزرایەوە، حوکمی موسڵمان بوونی بۆ بڕیاردەدرێ و لەهەر کوێ بدۆزرێتەوە شوناسنامەی ئایینی ئەوێ ی بۆ دادەنرێ و ئازادی پێ دەدرێ، چونکە ئازادی ئادەمیزاد بنەمایەکە، گەر منداڵەکە سامانی لەگەڵدا بوو ئەوە لەو سامانە بۆ ی خەرج دەکرێ، گەر نا لەگەنجینەی دەوڵەت (بیت المال)خەرجی بۆ دابین دەکرێت.

(سُنین ابن جمیلە) کە لەهۆزی (بنی سلیم) بوو گێڕاویەوە: (منداڵەکم دۆزییەوەو هێنامە لای عومەری کوڕی خەتتاب. هاوڕێکەم وتی: ئەی میری موسڵمانان ئەمە پیاوێکی باشە، عومەر وتی : ئایا ئەو وایە؟ وتی: بەڵێ، ئەنجا وتی: بیبە ئەو ئازادە، تۆ سەرپەرشتیاری ئەوی و خەرجی لەسەر خۆمانە)[2].

---

(١) المائدة/٢.

(٢) صحیح (الأرواء/١٥٧٣) هق(٦/٢٠١) ما(١٤١٥/٥٢٤).

## میراتی منداڵی دۆزراوە:

گەر منداڵی دۆزراوە مردو میراتی لەدوای خۆی بەجێ هێشتو میراتگری نەبوو، میراتەکەی بۆ گەنجینەی دەوڵەتە، هەروەها گەر کەسێکی کوشت خوێنەکەی لەسەر گەنجینەی دەوڵەتە (بیت المال).

## رەگەزو شوناسنامەی:

هەر کەسێك لەنێرو مێ بڵێ ئەوە منداڵی منە، ئەوە دەبێ بە هی ئەو، گەر چەند کەسێ ئەم داوایان کرد ئەو کاتە بەڵگەی کێ بەهێز بێ رەگەزی منداڵەکە دەدرێتە پاڵ ئەوەوە، گەر بەڵگە نەبوو پیشانی سەرناس (القافە) دەدرێ کە بە وێچون رەگەزەکان دەناسنەوە، حوکم بۆ کێدا بدا ئەوە دەبێ بەهی ئەو.

عائیشە گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) بەرووی خۆشەوە هاتە ژوورو فەرموی: نەتزانیوە، کە (مجزر المدلجی) ئێستا سەیری زەیدو ئوسامەی کرد لەژێر پەتۆ(لێفە) دا سەریان داپۆشرابوو، تەنیا قاچیان بە دەرەوە بوو، ئەو وتی: ئەم پێیانە لەیەك رەگەزن) [1].

گەر سەرناسەکە وتی: ئەمە منداڵی دوو کەسە ئەوە هی هەردووکیان دەبێت: (سلیمان بن یسار) گێڕاویەوە: (ژنێ دوو کەس کاری جووت بونیان لەگەڵدا کردبوو لەپاکەتی دا، سەرناسەکە وتی: ئەمە هەردووکیان تێ ی دا بەشدارن، عومەریش بەشی کرد لەنێوانیاندا) [2].

* * *

(١) متفق علیه: خ(١٢/٥٦/٦٧٧١) م(٢/١٠٨١/١٤٥٩).

(٢) صحیح الأرواء (١٥٧٨) هق (١٠/٢٦٣).

# دیاریی (الهبة)

پێناسەی (الهبة): واتە: دیاری، واتە: بەخشینی شتێ لەخاوەنماڵەوە بە کەسێك بە بێ نرخ و بەرامبەرێك.

## هاندان بۆ ئەم کارە:

پێغەمبەر (ﷺ) بە ژنەکانی فەرموو: (با هیچ دراوسێ یەك بۆ دراوسێکەی سمی کاوڕێکیش (فرسن الشاة) بە کەم نەزانێت (کە بۆی ببات) [1]. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (تهادوا تحابوا)[2]. واتە: دیاری بۆ یەکتری ببەن لای یەکتری خۆشەویستر دەبن.

## وەرگرتنی دیاری با کەمیش بێت:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر بۆ قۆڵێ (الذراع) یان قولە پێ یەك (الكراع) داوەت بکرێم دەچم، گەر قۆڵێ یان قولە پێ یەکم ـ لەگۆشت ـ بۆ بنێردرێ وەری دەگرم) [3].

## ئەو دیارییانەی ڕەت ناکرێنەوە:

لەعەزرەی کوڕی ثابتی ئەنسارییەوە دەڵێ (ثمامة بن عبدالله) گێڕاویەوە: (چوومە لای ئەنەس بۆنەکی خۆشی دامێ و وتی: ئەنەس بۆنی خۆشی (الطيب) ڕەت نەدەکردەوە، وتی: ئەنەس وتی: پێغەمبەر (ﷺ) بۆنی خۆشی ڕەت نەدەکردەوە) [4].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (سێ شت ڕەت ناکرێنەوە: سەرین (الوسائد) و چەوری و شیر) [5].

---

(١) متفق عليه: خ(٢٥٦٦/١٩٧/٥) م(١٠٣٠/٧١٤/٢).

(٢) حسن (الأرواء/ ١٦٠١) هق (٦/١٦).

(٣) صحيح (ص.ج ٥٢٦٨) خ(٢٥٦٨/١٩٩/٥).

(٤) صحيح (ص.ت ٢٢٤٠) خ(٢٥٨٢/٢٠٩/٥).

(٥) حسن (ص.ت ٢٢٤١) ت(٢٩٤٢/١٩٩/٤).

**پاداشت دانەوەی دیاریی:**

(عائیشە) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) دیاری وەردەگرتو پاداشتی لەسەر دەدایەوە) [١].

**کێ لەهەموان لە پێشترە بۆ دیاری؟**

(عائیشە) گێڕاویەوە: (وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو دراوسێمان هەیە، دیاری بۆ کامەیان ببەم؟ فەرموی: بۆ کامەیان لەهەمووان نزیکترە) [٢].

(کُریب) خزمەتکاری (ابن عباس) گێڕاویەوە: (میمونة بنت الحارث) بۆی گێڕاوەتەوە: ئەو کەنیزەیەکی ئازاد دەکات، بێ ئەوەی پرس بە پێغەمبەر (ﷺ) بکات، کاتێ سەرەی دێ پێغەمبەر (ﷺ) بێتە لای پێ ی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا کەنیزەکەم ئازاد کردووە تۆ زانیوتە؟ فەرموی: ئەم کارەت کردووە؟ وتی: بەڵێ. فەرموی: گەر بە خاڵۆکانت بەخشیبایە خێرت پتر دەبوو) [٣].

**حەرامی فەرز کردنی هەندێ منداڵ بەسەر هەندێ منداڵدا لەدیاریی بەخشیندا:**

(نعمان بن بشير) دەڵێ: (باوکم هەندێ ماڵی پێ بەخشیم، دایکم (عمره بنت رواحه) وتی: رازی نابم تا نەچیە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ئەو نەکەی بە شاهید. باوکم چووە خزمەتی تا لەراست بەخشینەکەی لەراست مندا بیکاتە شاهید، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (باشە ئەم کارەت لەگەڵ هەمو منداڵەکانت کردووە)؟ وتی: نەء. فەرموی: (اتقوا الله واعدلوا في اولادكم). واتە: لەخوا بترسنو دادوەری لەنێوان منداڵەکانتان بکەن. ئەنجا باوکم دیارییەکەی گێڕایەوە).

لەگێڕانەوەی تردا هاتووە: (کەواتە من مەکەن بە شاهید، من شاهیدی لەسەر ستەمکاری نادەم). لەگێڕانەوەی تر هاتووە: (ئایا پێت خۆشە لەچاکە وەکو یەك بن؟ وتی: بەڵێ. فەرموی:

---

(١) صحيح (خ ٢٥٨٥/٢١٠/٥) د(٩/٤٥١/٣٥١٩).

(٢) صحيح (خ: ٢٥٩٥/٢١٩/٥) د(١٤/٦٣/٥١٣٣).

(٣) متفق عليه: خ(٢٥٩٢/٢١٧/٥) م(٢/٦٩٤/٩٩٩).

کەواتە: نەخێر) [١].

## بۆ کەس ڕەوا نییە لەبەڵێنی دیارییەکەی پەشیمان بێتەوە یان بیکڕێتەوە:

(ابن عباس) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

(نمونەی خراپ بۆ ئێمە نییە، ئەو کەسەی لەدیاری یەکەی پەشیمان دەبێتەوە وەکو ئەو سەگەیە ڕشانەوەی خۆی دەخوات) [٢].

(عمر ابن خطاب) گێڕاویەوە: (کەسێکم لەخەباتگێڕان لەپێناوی خوادا سواری ئەسپەکی خۆم کرد کە ئەسپی نەبوو پێم بەخشی، خاوەنەکەی خزمەتی پێویستی نەدەکرد، منیش وامزانی ئەسپەکەی هەرزان فرۆش کردووە، بۆیە ویستم لیٚ ی بکڕمەوە، لەراست ئەوە لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) پرسیار کردو ئەویش فەرموی: (گەر بەیەك درهەم بتداتەوە لێی مەکڕەوە، ئەو کەسەی لەچاکەو دیاری خۆی پەشیمان دەبێتەوە وەکو سەگێ وایە کە دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەی خۆی) [٣].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ڕەوا نی یە بۆ پیاو دیاری ببەخشیٚو دوایی پەشیمان بێتەوە، تەنیا باوك نەبیٚ ئەوە دەتوانیٚ لەدیاری دانی بە منداڵەکەی پەشیمان بێتەوە) [٤].

## گەر ئەو کەسەی دیاری دەنێریٚو دیاریەکەی بۆ دەگێڕدرێتەوە ئەم وەرگرتنەوە قەیدی نییە:

(عائیشە) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەپەشتەماڵەکی نیشانەداردا، جاریٚ سەیری نیشانەکانی کرد، کاتیٚ نوێژی تەواو کرد فەرموی: ئەم پەشتەماڵەی من ببە بۆ لای (ابی جهم)و بەرگە ئەستورەکەی (الإنبجانیە)ی (ابي جهم)م بۆ بێنن، ئەم نیشانانە منیان لەنوێژەکەمدا

(١) متفق علیە: خ(٥/٢١١/٢٥٨٧) م(٣/١٢٤١/١٦٢٣).
(٢) متفق علیە: خ(٥/٢٣٤/٢٦٢٢) م(٣/١٢٤٠/١٦٢٢).
(٣) متفق علیە: خ(٣/٣٥٣/١٤٩٠) م(٣/١٢٣٩/١٦٢٠).
(٤) صحیح (ص.ج ٧٦٥٥) د(٩/٤٥٥/٣٥٢٢).

سەرقاڵ کرد)[١].

(الصعب بن جثامة الليثي) کە یارەکی پێغەمبەر (ﷺ) بو: کەرە کێوییەکی بۆ ئەو نارد کە لە(الأبواء) یان (الودان) بو ئەو لەئیحرام دابوو، پێغەمبەر (ﷺ) رەتی کردەوە. (الصعب) دەڵێ: کاتێ ئەو زانی لەروخسار پێ ناخۆش بوون دیارە کە دیارییەکەی رەت کردومەوە، فەرموی: ئێمە رەتمان نەدەکردەوە، بەڵام لەئیحرام داین)[٢].

## کێ خێرێك بکاتو پاشان بە میراتی بگرێت:

(عبدالله بن بریدە) گێڕاویەوە: (ژنێ هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کەنیزەیەکم دا بوو بە دایکمو دایکیشم مردووە، فەرموی: خوا پاداشتت بداتەوەو بە میرات بۆت گەڕاوەتەوە)[٣].

## دیاری فەرمانبەران دزیو تالانە( غلول ):

پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێکی لە(الأزد) کردە فەرمانبەر (العامل) بەسەر زەکاتەوە بە ناوی (ابن اللتبیە)، کاتێ هاتەوە وتی: ئەمە بۆ ئێوەو ئەمە دیارییەکە بۆ من، پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسا سەر مینبەرو سوپاسو ستایشی خوای کردو پاشان فەرموی: بۆچی گەر کەسێکمان بە فەرمانبەر نارد کاتێ دەگەڕێتەوە دەڵێ: ئەمە بۆ ئێوەو ئەمە بۆ من، ئایا ئەو لەماڵی باوكو دایکی دانیشتووەو بڕوانێ ئایا ئەمە دیارییە بۆ ئەو یان نەء؟ سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، هەر شتەکی بۆ خۆی ببات رۆژی قیامەت دەیهێنێتەوەو لەسەر ملی داناوە، گەر وشتر بێ دەنگی دێو گەر مانگا بێ هۆڕە (الخوار)ی دێو گەر کاوڕ بێ ماعەی (التیعر) دێ، پاشان هەر دوو دەستی بەرز کردەوە تا بن هەنگڵمان بینیو سێ جاران فەرموی: (ئایا رام نەگەیاند)[٤].

* * *

---

(١) صحيح (متفق عليه: خ(١/٤٨٢/٣٧٣) م(١/٣٩١/٥٥٦).

(٢) متفق عليه: خ(٤/٣١/١٨٢٥) م(٢/٨٥٠/١١٩٣).

(٣) صحيح (ص.ت ٥٣٥) م(٢/٨٠٥/١١٤٩) ت(٢/٨٩/٦٦٢).

(٤) متفق عليه: خ(١٣/١٦٤/٧١٧٤) م(٣/١٤٦٣/١٨٣٢).

# دیاری تا مردن! (العمري ـ الرقبي)

**پێناسەیان:** (العمری) لە(العمر)ەوە هاتووە واتە: تەمەن.

(الرقبی) لە(المراقبه)ەوە هاتووە. ئەم جۆرە کارەیان لەسەر دەمی نەزانی دا دەکرد، واتە: دیاری پێ دان بۆ ماوەیەك کە ژیانە:

پیاو هەبوو خانویەکی دەبەخشی یەکەسێو پێ ی دەوت لەگەڵ تەمەنتدا بۆ تۆیە، گەر مردی بۆ خۆم دەگەڕێتەوەو دەیان وت (عمري ـ رقيي)! چونکە چاوەڕێیان تێ دایە تا ئەو کەسە دەمرێو بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ئەم نەریتەی هەڵوەشاندەوە، کە کات دیاری کردنی تێ دایە، دیاریی کردە هەمیشەیی بۆ ئەو کەسە، دەبێ بەماڵی میرات گرانیو جارەکی تر بۆ بەخشەرەکە ناگەڕێتەوە.

(جابر) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (دیاری (العمری) دروستە، بەخشینی، (الرقيي) چاودێری دروستە بۆ خاوەنەکەی)[1].

هەروەها (جابر) گێڕاویەوە لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە: (هەر کەسێ دیاری (العمری) ببەخشێ بۆ کەسێك و بۆنەوەکەی، ئەوە حەقی خۆی تێ دا لەم قسەیەی دا نەهیشتۆتەوە، ئەوە بۆ ئەو کەسەیە دیاریەکەی پێ دراوە ئەنجا بۆ وەچەکەیەتی)[2].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ماڵی خۆتان توند بگرنو گەندەڵی مەکەن، هەر کەسێ (العمری) بە کەسێکی ببەخشێ ئەوە بۆ ئەو کەسەیە پێ ی بەخشراوە زیندوو بێ یان مردوو بێو بۆ وەچەکەیەتی)[3].

* * *

---

(١) صحيح (ص.جه / ١٩٣٠) جه(٢/٧٩٧/٢٣٨٣).

(٢) صحيح (ص.جه ١٩٢٧) م(٣/١٢٤٥/١٢/١٦٢٥) جه(٢/٧٩٦/٢٣٨٠).

(٣) صحيح (ص.ج ١٣٨٨) م(١٦٢٥ـ ٣/١٢٤٦/٢٦).

## زەوت کردن ( داگیر کردن = الغصب )

پێناسە کردنی: دەست بەسەر داگرتنی مافی کەسانی تر بە ناحەق.

حوکمەکەی: کارێکی ستەمەو ستەمیش تاریکاییە لەپەسلاندا خودای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ* مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لاَ يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاء﴾[١].

واتە: وامەزانن خوا بێ ئاگایە لەو کارەی ستەمکاران دەیکەن، ئەوان بۆ رۆژێ دوا دەخات کە چاوان دە قۆچ دەمێنن. رادەکەن‌و سەریان بەرز کردۆتەوەو چاو ناترۆکێنن‌و دڵیان هیچی تێدا نییە!

وە خوا فەرمویەتی: ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ﴾[٢]. واتە: ماڵ‌و سامانتان لەناو خۆتاندا بە نارەوایی مەخۆن.

پێغەمبەر (ﷺ) لەحەجی ماڵ ئاوایی دا فەرمووی: (خوێنتان‌و ماڵتان‌و ناموس‌و ئابڕوتان لەسەر یەکتریتان حەرامە، وەکو حەرامی ئەم رۆژەتان لەم مانگەتاندا لەم شارەتاندا) [٣].

(أبو هريرة) لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (پیاوی زیناکار کاتێ زینا دەکات بڕوادار نییە، شەڕاب خۆر کاتێ دەیخواتەوە بڕوادار نییە، دز کاتێ دزی دەکات بڕوادار نییە، وە لەکاتی تالانبردندا کە خەڵکی چاوی لێ یەتی بڕوادار نییە) [٤].

---

(١) ابراهيم (٤٢ ـ ٤٣).

(٢) البقرة/١٨٨.

(٣) صحيح (ص.ج ٢٠٦٨).

(٤) متفق عليه.

**حەرامی سوود وەرگرتن لەشتی زەوت کراو:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی[1]: (با کەس کالآی برای خۆی نە بە گەمەو نە بەراستی هەڵنەگرێ، هەر کەسێ گۆچانو دار عەسایەکی برای خۆی بردووە با بیداتەوە).

پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): (هەر کەسێ شتەکی زەوتکراوی برای خۆی لای خۆی گلداوەتەوە: با گەردەنی خۆی ئەو رۆژە پێ ئازاد بکات، بەر لەوەی ئەو رۆژە بێ دینارو درهەم نییە، گەر کاری باشی هەبێ بە ئەندازەی شت زەوت کردنەکەی کردەوە چاکەکانی لێ دەسەنرێن، گەر چاکەی نەبوون بەشی لەخراپەکانی خاوەنەکەی هەڵدەگیرێن دەخرێنە سەر کابراکە)[2].

**کێ لە پێناو بەرگری لەسامانەکەی دا بکوژرێ شەهیدە:**

دروستە مرۆڤ، گەر کەسێ ویستی بیکوژێ یان دارایی یەکەی ببات بەرگری لەخۆیو ساماناکەی بکات، ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە:

(پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و وتی: گەر پیاوێ هات ویستی ماڵەکەم زەوت بکات چی بکەم؟ فەرموی: ماڵەکەتی مەدەیە. وتی: ئەی گەر شەڕی لەگەڵدا کردم؟ فەرموی: لەگەڵی دا بجەنگە. وتی: ئەی گەر منی کوشت؟ فەرموی: تۆ شەهیدی. وتی: ئەی گەر من ئەوم کوشت؟ فەرموی: لەدۆزەخدایە)[3].

**زەوت کردنو داگیرکردنی خاك (غصب الأرض):**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من ظلم من الأرض شيئا طوقه من سبع ارضين)[4]. واتە: کێ زەوی کەسێك زەوت بکات خوا لەحەوت زەوی تۆقی دەکات. وە پێغەمبەر دەفەرموێ(ﷺ):

---

(١) حسن (ص.ج ٧٥٧٨) ت(٤٩٨٢/٣٤٦/١٣). تێبینی: زەوت کردن لەقورئانیشدا هاتووە وەکو: ﴿وَكَانَ وَرَاءهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْباً﴾ (الكهف/٧٩). وەرگێر.

(٢) صحيح (ص.ج ٦٥١١) خ(٢٤٤٩/١٠١/٥).

(٣) صحيح (مختصر م ١٠٨٦) م(١٤٠/١٢٤/١).

(٤) متفق عليه: خ(٢٤٥٢/١٠٣/٥). (م ١٦١٠/١٢٣٠/٣).

(کێ شتێ لەزەوی زەوت بکات بە ناحەق لەدوارۆژدا بە حەوت زەوی دا رۆ دەچوێنرێت) [١].

هەر کەسێ زەوی یەك زەوت بکات نەمامی تێدا بچێنێ یان خانوی تێ دا دروست بکات پێویستە نەمامەکان هەڵکەنرێن و خانوەکە بروخێنرێت: (ﷺ) فەرمویەتی: (لیس لعرق ظالم حق) [٢]. واتە: بۆ ئەو کەسەی درەختێك لەزەوییەکدا دەچێنێ بەستەم، زەوییەکە کەسێ بەر لەو زیندووی کردۆتەوە ئەوە هیچ مافێکی نییە.

وە ئەگەر کردبویە کشتوکاڵ ئەوە خەرجەکەی بۆ قەرەبۆ دەکرێتەوەو کشتوکاڵەکە بۆ خاوەن زەوییەکەیە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ کشتوکاڵ لەخاکی کەسێکدا بکات بەبێ روخسەتی ئەوان ئەو کشتوکاڵە بۆ ئەو نییە، تەنیا خەرجەکەی بۆ رەت دەکرێتەوە) [٣].

❊ ❊ ❊

---

(١)صحيح: (ص.ج ٦٣٨٥) خ(٢٤٥٤/١٣٠/٥).

(٢) صحيح: (ص.ت ١١١٣) (ت ١٣٩٤/٤١٩/٢).

(٣) صحيح: (ص.ج ٦٢٧٢) ت(١٣٧٨/٤١٠/٢) جه (٢٤٦٦/٨٢٤/٢).

# هەڵگرتنەوە (الشُفعة)

وشەی (الشفعە) لە(الشفع)ەوە هاتووە، واتە: جووت. لەشەرعدا: واتە: هەڵگرتنەوەی بەشی هاوبەشێ (شەریك) لەلایەن هاوبەشەکی ترەوە، لەکاتێ دا خەریکە کەسێکی بێگانە هەڵی گرێتەوە، بەو نرخەی باسی کراوە.

## هەڵگرتنەوە لەچی دادەبێت:

(جابر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) هەڵگرتنەوەی لەو شتانەدا بڕیاردراوە کە دابەش ناکرێن، بەڵام گەر سنوور دانراو ڕێگاکان دیاری کران، هەڵگرتنەوەی پێوە نامێنێت)[1].

هەر کەسێ هاوبەشی هەبێ لەخاکێ دا یان بیناو خانوێکدا یاخود بێستانو باغێکدا، ئەوە نابێت بفرۆشرێن تا پێشنیازی هاوبەشەکەی نەکرێ، گەر بیفرۆشێ بەر لەوەی پێشنیازی ئەوی بکات، ئەو کاتە ئەو لەپێشترە پێ ی بفرۆشرێت:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ خورما یان خاکەکی هەبێ نابێ بیفرۆشێ تا پێشنیازی هاوبەشەکەی نەکات) [2].

پێغەمبەر فەرمویەتی(ﷺ): (الشريك احق بسبقه ما كان) [3].

هەڵگرتنەوە بە هۆی دراوسێ یی یەوە گەر مافەکی هاوبەشیان لەنێواندا هەبوو:

گەر لەنێوان دوو هاوسێ دا مافەکی هاوبەش هەبوو لەڕێگادا یان لەئاودا کە هەڵگرتنەوەی تێ دا دەکرێ بۆ هەردوو لایان، نابێ بەبێ پرسی هاوسێ یی هیچیان ئەو موڵکەیە بفرۆشن، گەر بەبێ پرسی هاوسێ فرۆشتی ئەوکاتە ئەویان لەپێشترە بۆ پێ فرۆشتنی: پێغەمبەر (ﷺ)

---

(١) صحيح (ص.جه ٢٠٢٨) خ(٤/٤٣٦/٢٢٥٨).

(٢) صحيح (ص. جه ٢٠٢١) جه(٢/٨٣٣/٢٤٩٢).

(٣) صحيح (ص.جه ٢٠٢٧) جه (٢/٨٣٤/٢٤٩٨).

فەرمویەتی: (الجار احق بشفعة جاره ينتظر بها وان كان غائبا اذا كان طريقهما واحد) [١].

واتە: هاوسێ لەپێشترە موڵکی هاوسێ کەی هەڵگرێتەوە گەر لەوێ نەبوو چاوەڕێ دەکات، گەر ڕێگایان یەك بوو. (ابی رافع) گێڕاویەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الجار احق بسبقه) [٢]. واتە: دراوسێ بۆ کڕینەوەی موڵکی دراوسێ یەکەی لەهەموو کەس لەپێشترە.

* * *

(١) صحيح (ص.جه ٢٠٢٣) (جه ٢/٨٣٤/٢٤٩٤).

(٢) حسن صحيح (ص.جه ٢٠٢٤) خ(٤/٤٣٧/٢٢٥٨) جه(٢/٨٣٣/٢٤٩٥).

# بریکاری (الوكالة)

(الوكالة) واتە: (التفويض والحفظ) واتە: (پێ سپاردنو پاراستن).

**لەشەرعدا:** دانانی کەسێکە لەشوێنی خۆتدا بەرەهایی یان بەستنەوە.

**رێگا درانی:** ئەم کردارە بە قورئانو سوننەتو رای کۆی ئوممەت رەوایە:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءلُوا بَيْنَهُمْ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَـٰذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَاماً فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَداً﴾[1]. واتە: یارانی ئەشکەوتمان زیندوو کردنەوە تا لەناو خۆیاندا بپرسن، نەفەرێ لەوانە وتی: چەندە ماونەوە؟ وتیان: رۆژێ یان چەند رۆژێ دەبێ ماوینەوە، وتیان: پەروەردگارتان دەزانێ چەندە ماونەوە، ئەنجا کەسێکتان بەو پارەتان بنێرن بۆ شار با سەیر بکات کێ لەهەموان پتر خواردنی پاکە لێ ی بکرێو بیهێنێ، با وریا بێو وانەکات کەس پێتان بزانێت.

(ابی رافع) گێراویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) بە حەلاڵی مەیمونەی هێناو بە حەلاڵی گواستیەوە، خۆم قاسید (پەیامنێر)ی نێوانیان بووم[2]، وە ئەو لەدانەوەی قەرز بریکارو نوێنەری گرتووە[3]، وە لەداری حەد لێداندا بریکاری گرتووە، لەشتی تریشدا).

موسڵمانان بریکاری بە سوننەتو دروست دەزانن، چونکە جۆرێکە لەیارمەتی یەکتری دان بۆ سەر چاکەو تەقوا، لەبەر ئەوەی هەموو کەس ناتوانێ راستەوخۆ هەمو کارێك بۆ خۆی بکات، بۆیە پێویستی بە کەسی ترە کە لەجیاتی ئەو ئەرکەکانی رابپەڕێنێت.

---

(١) الكهف/١٩.

(٢) صحيح الإسناد(الأرواء ١٦/٢٥٢) اخرجه احمد (٣٩٢/٦ ـ ٣٩٣).

(٣) بڕوانە گێڕانەوەی (ابوهريرة) لە(حسن القضاء) باش دانەوەی قەرز.

## ئەو شتانەی بریکاری تیٚ دا دروستە:

هەر شتیٚ دروست بیٚ هەڵس‌و کەوتی تیٚ بکەیت دروستە بریکاری بۆ دابنریٚت.

## بریکار دەست پاکەو ئەمیندارە:

بریکار لەوەی وەری دەگریٚو دەیکات ئەمیندارەو بە سنوور بەزیٚنیٚ نەبیٚ بەر پرسیار نابیٚت: پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا ضمان على المؤتمن) [1]. واتە: ئەو کەسەی بە ئەمین دا دەنریٚ زەمانەتی لەسەر نییە.

* * *

(١) حسن (ص.ج ٧٥١٨).

# باسی سوێندو لەخۆگرتنەکان (كتاب الأيمان والنذور)

**مەبەست لە(الأيمان ـ سوێند):**

لەوشەی (اليمين) هاتووە، واتە: دەست (اليد)، بۆیە بە مانای سوێند هاتووە چونکە گەر سوێندیان دەخوارد هەریەکە دەستی دەنایە ناو دەستی هاوڕێکەیەوە. لەشەرعدا سوێند خواردنە بە خوا یان بە یەکێ لەسیفەتەکانی.

**سوێند بە چی دادەمەزرێت:**

سوێند تەنیا بە خواو یان ناوێك لەناوەکانی یان سیفەتێ لەسیفەتەکانی ئەو دادەمەزرێت. (عبدالله بن عمر) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) تووشی عومەری کوڕی خەتتاب بوو سوێندی بە باوکی دەخوارد، ئەویش فەرموی: (خوا قەدەغەتان دەکات سوێند بە بابو باپیرانتان بخۆن، کێ سوێند دەخوات با بەخودا بیخوات گەر نا با دەنگ نەکات). (الا ان الله ينهاكم ان تحلفوا بآباءكم من كان حالفا بالله فليحلف بالله او ليصمت) [1] چونکە باوکی عومەر بت پەرست بووە (انس بن مالك) گێڕاویەوە: (لا تزال جهنم تقول هل من مزيد حتى يضع رب العزة فيها قدمه، فتقول :، قط قط وعزتك ويزوي بعضها الى بعض) [2] واتە: (بەردەوام دۆزەخ دەڵێ (هل من مزيد ـ ئایا زیاتر خەڵکی تر هەیە) تا خوا قاچی قودرەتی خۆی دەخاتە ناوی دۆزەخ: دەڵێ: بەس بەس بە گەورەیی تۆ، ئەنجا دۆزەخ وێك دێتەوە)

**سوێند بە غەیری خوا شیرکە:**

(ابن عمر) گێڕاویەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (من حلف بغير الله فقد كفر او اشرك) [3] واتە: هەر کەسێ سوێند بە غەیری خودا بخوات ئەوە کوفری کردووە، یان هاوبەشی پەیدا کردووە.

---

(١) متفق عليه: (خ: ٦٦٤٦/١١/٥٣٠) م(٣/١٢٦٧/١٦٤٦).

(٢) متفق عليه: (خ ٦٦٦١/١١/٥٤٥) م(٤/٢١٨٧/٢٨٤٨).

(٣) صحيح (ص.ج ٦٢٠٤) ت(٣/٤٥/١٥٧٤).

پێغەمبەر فەرمویەتی(ﷺ): (کێ سوێندی خواردو وتی: (بە لات‌و عوزا) با بڵێ: (لا الـه الا الله)، کێ وتی: هەر کەسێ بە هاوڕێیەکەی وت: وەرە قومار بکەین با خێرێ بکات) [١].

## گومانێك‌و وەڵام دانەوەی:

هەندێ کەس ئەم پاساوە دێننەوە لەترسی درۆ سوێند بە غەیری خوا دەخۆن، کەچی خوا فەرمویەتی: ﴿وَلاَ تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ﴾[٢].

وەڵام: (عبدالله) وتویەتی: (گەر سوێند بە خوا بخۆم بە درۆ، پێم خۆشترە لەوەی سوێند بە غەیری خوا بخۆم بە راست) [٣].

مەبەست لەم ئایەتە وەکو (ابن کثیر) گێڕاویەوە خوا مەکەن بە کۆسپ لەبەردەم کردنی کاری چاکداو کەفارەتی سوێندەکە بدەو چاکەکە بکە. (ابن کثیر) دەڵێ: (مسروق‌و الشعبی‌و ابراهیم النخعی‌و مجاهدو سعید بن جبیرو عطاءو عکرمەو مکحول‌و الزهری‌و الحسن‌و قتادەو مقاتل بن حیان‌و الربیع بن انس‌و الضحاك‌و عطاء الخراسانی‌و السدی ـ ر ـ ئاوا مانایان کردووە)[٤].

## ئەو کەسەی سوێند بە ئایینەکی غەیری ئیسلام بخوات:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ سوێند بە ئاینەکی غەیری ئیسلام بخوات بە درۆو بە ئەنقەست چی گوتووە ئاوایە) [٥].

وپێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (کێ وتی: من لەئیسلام بەرۆکم دادڕی وەو بەریم، گەر درۆ بکات هەر وایەو، گەر راست بکات بە ساغی بۆ ئیسلام ناگەڕێتەوە) [٦].

---

(١) متفق علیه: م(١٦٤٧/١٢٦٧/٣) خ(٦٦٥٠/٥٣٦/١١).

(٢) البقرة/٢٢٤.

(٣) الطبراني في الكبير (٨٩٠٢/٢٠٥/٩).

(٤) تفسیر ابن کثیر(٢٦٦/١).

(٥) متفق علیه: م(١١٠/١٧٧، ١٠٥/١) خ(٦٦٥٢/٥٣٧/١١). گەر بڵێی : گەروابکەم جولەکەبم. وەرگێڕ.

(٦) صحیح (الأرواء ٢٥٧٦) د(٣٢٤١/٨٥/٩).

## کێ سوێندی بە خوا بۆ خورا با رازی بێت:

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) گوێ ی لەکابرایەك بوو سوێندی بە باوکی دەخوارد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بە باب‌و باپیرانتان مەخۆن، کێ سوێندی پێ خوارد با خێرێ بکات، کێ سوێندی بۆ بەخوا خورا با رازی بێ، کێ قایل نەبێ بە خوا ئەوە لەخوا نزیك نییە) [1].

(ابو هريرة) گێڕاویەوە: (عیسای کوڕی مەریەم (ﷺ) پیاوێکی بینی دزی دەکات، فەرمووی: ئەوە دزی دەکەیت؟ وتی: نە بە خوای تاك‌و تەنیا، عیسا وتی: بڕوات بەخوا هێناو چاوەکانی من راستیان نەکرد!) [2].

## بەشەکانی سوێند:

(١) سوێندی سەر زارەکی (اللغو).

(٢) سوێندی لێ کەوتو (اليمين الغموس).

(٣) سوێندی بە راست (اليمين المنعقدة).

سوێندی سەر زارەکی‌و حوکمەکەی:

سوێندێکە مەبەست سوێند نەبێ، وەکو کاتێ کابرایەك دەڵێ: بە خوای خواردن دەخۆیت، یان دەخۆیەوەو مەبەستی سوێند نییە.

ئەم سوێندانە دانامەزرێن‌و سوێند خۆرەکە گوناهبار نابێت.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿لاَّ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِيَ أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾[3]. واتە: بە سوێندی سەر زارەکی ناتانگرێ بەڵکو بەوە دەتانگرێ............

پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَـكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ

---

(١) (ص.جه ٧٠٨) جه(١/٦٧٩/٢١٠١).

(٢) متفق عليه: خ(٦/٤٧٨/٣٤٤٤) م(٤/١٨٣٨/٢٣٦٨).

(٣) البقرة/٢٢٥.

الأَيْمَانَ﴾[١].

## سوێند بە پیٚ ی نیازو نیەت دا دەمەزرێت:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (انما الأعمال بالنيات)[٢]. واتە: کارەکان بە نیازەکانن.

هەر کەسیٚ سوێندیٚ بخواو مەبەستی شتەکی تر بیٚ ئەوە نیازەکە حیسابە نەك قسەی سەر زمان:

(سويد بن حنظلة) گێڕاویەوە: (دەرچووینو مەبەستمان گەیشتن بو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)و (وائل بن حجر)مان لەگەڵدا بوو، دوژمن بەدیلی گرت، خەڵکی بێزاری یان کرد لەوە سوێند بخۆن، من سوێندم خوارد برامەو بەریان داین: هاتینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و پێمان راگەیاند کە خەڵك بێزاریان کردین سوێند بخۆبن سوێندم خوارد ئەو کەسە برامە . فەرموی: (راستت کردووە موسڵمان برای موسڵمانە)[٣].

## سوێند لەسەر ئەم شێوەیە دادەنریٚ کە سوێندەو باوەڕ دەکات،

(ابو هريره) گێڕاویەوە: (انما اليمين على نية المستحلف)[٤]. واتە: سوێند لەسەر نیازی ئەو کەسە دادەمەزریٚ کە داوای سوێند دەکات. یان (يمينك على ما يصدقك به صاحبك)[٥]. واتە: سوێندەکەت لەسەر ئەو نیازە دادەمەزریٚ کە هاوڕێکەت باوەڕت پیٚ دەکات.

## لەکاتی بیر چوونەوەو هەڵەکردندا گوناهبار بوون نییە:

هەر کەسیٚ کاریٚ بکات لەیادی نەبیٚ یان بە هەڵە بیکاتو سوێندیشی لەنەکردنی خواردبو ئەوە گوناهبار نابێت:

---

(١) المائدة/٨٩.

(٢) رابرد.

(٣) صحيح (ص.جه ١٧٢٢) جه(١/٦٨٥/٢١١٩).

(٤) (ص.جه ١٧٢٣) جه(١/٦٨٥/٢١٢٠) م(١٦٥٣ ـ ٧٣/١٢٧٤/٢١).

(٥) صحيح (ص.جه ١٧٢٤) م(٣/١٢٧٤//١٦٥٣).

وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾[١]. لەفەرمودەدا هاتووە: خوای گەورە فەرمویەتی (نعم)[٢]. واتە: بەڵێ.

## جیاکردنەوە لەسوێنددا:

هەر کەسێ سوێند بخواو بڵێ: (انشاء الله) ئەوە جیاکاری (الإستثناء)ی تێ کردووەو گوناهبار نابێت:

ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ): (سولەیمان کوڕی داود پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئیمشەو دەچمە لای حەفتا ژن هەموویان کوڕێکیان پەیدا ببێ لەپێناوی خوادا بجەنگێ. هاوڕێکەی یان فریشتەکە وتی: بڵێ: (ان شاء الله) بەڵام نەیوتو لەیادی چوو، هیچیان منداڵیان نەبوو تەنیا ژنێ نەبێ کوڕەکی ناتەواوی هێنا!) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر وتبای (ان شاءالله) سوێندی نەدەکەوتو پێویستی ئەویان دەهێنایە دی)[٣].

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (هەر کەسێ سوێند بخواتو جیاکاری یەکی تێ بخات (الإستثناء) گەر بیەوێ دەتوانێ بگەڕێتەوەو دەتوانێ وازی لێ بێنێو گوناهبار نابێت)[٤].

## هەر کەسێ سوێندی لەشتێ خواردو بینی کارەکی تر لەو خێرترە:

(ابو هريرە) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ سوێندی خوارد، بینی کارێکی تر لەو باشترە، با کارە چاکە کەبکاتو کەفارەتی سوێندەکەی بدات)[٥].

---

(١) البقرة:٢٨٦

(٢) صحيح (ص.نس ٣٥٨٨) م(١/١١٥/١٢٥).

(٣) متفق عليه: م(١٦٥٤.٢٣/ ٣/١٢٧٠) خ(١١/٥٣٤/٦٦٣٩). تێبینی: هەرچەندە لەقورئاندا تەنیا باس لەیەك ژنكراوە كە سولەیمان هێناویەتی كە شاژنی سەبەئە..

(٤) صحيح (ص.جه ١٧١١) جه(١/٦٨٠/٢١٠٥).

(٥) صحيح (الأرواء ٢٠٨٤) م(١٦٥٠ ـ ٣/١٢٧٢/١٣).

## ڕێگرتن لەسووربون لەسەر سوێند:

﴿وَلاَ تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصْلِحُواْ بَيْنَ النَّاسِ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[١]. واتە: خوا مەكەن بە بەر پەرچ لەسوێندەكانتاندا بۆ ئەوەی چاكە بكەنو تەقوا بكەنو چاكە بكەن لەنێوان خەڵكی دا، خوا بیسەرو زانایە.

(ابن عباس) گێڕاویەوە:

(سوێند بەخوا مەكە بەرپەرچ كە چاكە نەكەیت، بەڵكو كەفارەتی سوێندەكە بدەو چاكە بكە)[٢].

ئەبو هورەیرە لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (بەخوا گەر یەكێ لەئێوە پێ داگرتووبێ لەسەر سوێند لەناو خێزانی دا گوناهبارترە لای خودا لەوە كە ئەو كەفارەتەی بدات كە خوا لەسەری فەرز كردووە)[٣].

## كەفارەتی (باجی) سوێند:

هەر كەسێ سوێندی لێ بكەوێ، دەبێ بە یەكێ لەم سیفەتانە كەفارەتی سوێندەكەی بدات:

(١) خۆراك دان بە (١٠) هەژار لەو خواردنە مام ناوەندەی دەیدەنە خێزانیان.

(٢) یان پۆشاك بۆ كردنیان.

(٣) یان ئازاد كردنی كۆیلەیێك.

(٤) گەر نەتوانرا دەبێ سێ رۆژ بە رۆژو بێ، بەڵام گەر توانای هەبوو سێ سیفەتەكانی تر ئەنجام بدات، بەرۆژبوونی سێ رۆژەكەی بۆ دروست نابێت.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَـكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ

---

(١) البقرة/٢٢٤.

(٢) رابرد.

(٣) متفق عليه: (خ ٦٦٢٥/٥١٧/١١) م(١٦٥٥/١٢٧٦/٣). واتە: زیان گەیاندن بە هۆی سوێند لێ كەوتن گەورەترە لەزیان دان لەخێزان، وەكو (النووی) باسی كردووە.

فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[١].

واتە: خوا بە سوێندی سەرزارەکی ناتانگرێ، بەڵکو بە سوێندی بە مەبەست دەتانگرێ، کەفارەتەکەشی خۆراکدانە بە دەهەژار لەناوەڕاستی خواردەمەنیەکانتان کە دەیدەنە خانەوادەکەتان، یان بەرگ کردنیانە، یان ئازادکردنی کۆیلەییەکە، گەر کەسێ دەستی نەکەوت سێ ڕۆژ بەرۆژوو دەبێ، ئەمە کەفارەتی سوێندەکانتانە).

## سوێند خواردن بە حەرام:

گەر کەسێ وتی: خواردنم لێ حەرام بێ، یان چوونە ماڵی فلان کەسم لێ حەرام بێ‌و شتی تر، ئەمانە حەرام نابن، گەر وای کرد کەفارەتی سوێندی دەکەوێتە سەر. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ*قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ﴾[٢].

واتە: ئەی پێغەمبەر بۆچی شتێ لەخۆت حەرام دەکەی کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت، ڕازی بوونی ژنەکانت دەوێ، خوا لێ بوردەو بە بەزەیی یە. خوا شکاندنی سوێندەکانی بۆ ڕەوا کردوون.

(عائیشە) گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەنگوینی لای زەینەبی کچی جەحش خوارد، من‌و حەفصەش پلانمان دانا کە هەر یەکە پێغەمبەری چووە لا (ﷺ) پێ ی بڵێ (مەغافیرت) خواردووە؟ بۆنی مەغافیرت لێ دێ. پێغەمبەریش (ﷺ) لەوەڵامدا دەفەرمێ: نەخێر لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردووە، بەڵام قەت ناچمەوە لای‌و سوێندم خواردووە، ئەمە لای کەس باس مەکە)[٣].

(ابن عباس) گێڕاویەوە لەحەڕامدا کەفارەت دەدرێ ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[٤].

* * *

---

(١) المائدة/٨٩.

(٢) التحريم/١.

(٣) صحيح (ص.نس ٣٥٥٣) خ(٤٩١٢/٦٥٦/٨).

(٤) رابرد.

# لەخۆگرتن (النذور)

وشەی (النذور) کۆی (النذر)ە لە(الإنـذار)ەوە هاتووە، واتە (ترساندن). لای (الراغب) واتـە: واجب کردنی شتێ لەسەر خۆت کە واجب نییە بە هۆی رووداوێ.

رێگا پێ درانی: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ﴾[1].

واتە: هیچ خەرجێکتان نەکێشاوەو هەرشتێکتان نەزر نەکردووەو لەخۆ نەگرتووە خـودا پێـی دەزانێت.

پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾[2].

واتە: (پاشان چڵکو پیسایی لەسەر خۆیان لادەبەنو نەزرەکـەیان ئـەنجام دەدەنو بەبـەیتی کۆنـدا دەخولێنەوە). وە خودا ستایشی ئەوانە دەکات نەزر بەجێ دێنن: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْماً كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيراً﴾[3].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ نەزری کرد گوێڕایـەڵی خـوا بکـات بـا بیکـات، کـێ نەزری کرد گوێڕایەڵی خوا نەکات با سەرپێچی نەکات)[4].

## قەدەغەکردنی نەزری پەیوەستکراو:

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) نەزری قەدەغـە کـردووەو فەرمویـەتی ئـەو هـیچ ناگێڕێتەوە، بەڵکو ماڵێکە لەدەستی رژد دەچێتە دەرەوە)[5]. (سـعید بـن الحـارث) گێڕاویـەوە:

---

(١) البقرة/٢٧.

(٢) الحج: ٢٩

(٣)الإنسان/٧. ئەم نەزرە فاتیمەو عەلی (س) دەیکەنو ئەنجامی دەدەن، ئەنجا خوا لەشانی ئەوان ئایەت دادەبەزێنێت وەکو لەتەفسیرەکاندا هاتووە، وەکو (الکشاف/للزمخشري) صحيح(ص.ج ٦٥٦٥) (خ ١١/٥٨١/٦٦٩٦).

(٤) متفق عليه: (خ ١١/٥٧٦/٦٦٩٣) م(٣٠/٢٦٠/١٦٣٩).

(٥) متفق عليه: (خ ١١/٥٧٦/٦٦٩٣) م(٣/٢٦٠/١٦٣٩).

(ئەو لە(ابن عمر)ی بیستووە بۆ دەست لەنەزر هەڵناگرن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: نەزر هیچ شتێ پێش‌و پاش ناخات بەڵکو تەنیا دەرچوونی ماڵە لەکەسی ڕژد) [١].

## کەی نەزر دروستەو کەی دروست نابێت؟

کاتێ نەزر دروستە کە مەبەست نزیك بوونەوە بێ لەخوای گەورەو پێویستە جێبە جێ بکرێت، وەکو لەفەرمودەی رابردوی عائیشە دا هاتبوو: (من نذر ان یطیع الله فلیطعه). دروست نییە بۆ سەرپێچی نەزر بکرێ، بەڵکو دەبێت کەفارەت بدرێ. وەکو لەفەرمودەدا هاتووە: (لا نذر في معصیة وکفارته کفارة یمین) [٢]. واتە: نەرز لەسەر پێچی خوادا نییەو کەفارەتەکەی وەکو کەفارەتی نوێژە). بەڵام نەزری دروست بۆ نمونە نەزر بکەیت بە پیادە بچیە حەج، یان لەبەر هەتاو بوەستی، ئەو نەزرە دانامەزرێت‌و واجب نابێ: (ابو هریرة) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) پیرەمێردێکی بینی دوو لەکوڕەکانی شانیان داوەتە بەرو دەڕۆیشت، فەرمووی: ئەوە چی یەتی؟ کوڕەکانی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەزری لەسەر بوو. فەرموی: ئەی کاکی پێرەمێرد سواربە خوا پێویستی بە تۆو نەزرەکەت نییە) [٣].

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) بە تەنیشت پیاوێکدا رەت بوو بە مەککەدا لەبەر هەتاو وەستا بوو فەرموی: ئەمە چییە؟ وتییان: ئەمە نەزری کردووە بەرۆژوو بێ‌و تا شەو نەچێتە بەر نسیێ‌و قسە نەکات. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: با قسە بکات‌و بڕواتە بەر سێبەرو با دابنیشێ‌و رۆژووەکەی تەواو بکات) [٤].

## کێ نەزری کردو نەیتوانی ئەنجامی بدات:

کێ نەزری کردو نەیتوانی ئەنجامی بدات، کەفارەتی سوێندی لەسەرە: پێغەمبەر (ﷺ)

(١) متفق علیه: (خ ٦٦٩٢/٥٧٥/١١) م(١٦٣٩-٣/١٢٦١/٣). بەبێ قسەی ابن عمر.
(٢) صحیح (الأرواء ٢٥٩٠) (د: ٣٢٦٧/١١٥/٩).
(٣) صحیح (مختصر م ١٠٠٥) م(١٦٤٣/١٢٦٤/٣).
(٤) صحیح (الأرواء ٢٥٩١) خ(٢٧٦/٤) د(٣٣٠٠).

فەرمویەتی: (کەفارەتی نەزر کەفارەتی سوێندە)[(١)].

## کێ نەزری کردو مرد:

هەر کەسێ نەزری کردو مرد با سەرپەرشتیاریو خزمانی بۆی ببەنە سەر: (ابن عباس) گێڕاویەوە (سعد بن عبادە) لەراست نەزری دایکی پرسیاری لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد، کە دوای نەزرەکەی مردووەو ئەنجامی نەداوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (فاقضە عنها)[(٢)]. واتە: لەجیاتی ئەو نەزرەکە ئەنجام بدە.

❊ ❊ ❊

(١) صحيح (ص.ج ٤٤٨٨) م(١٦٤٥/١٢٦٥/٣) نس(٢/٢٦).

(٢) متفق عليه: م(١٦٣٨/١٢٦٠/٣) خ(٦٦٩٨/٥٨٣/١١).

# باسی خۆراکەکان (كتاب الأطعمة)

(الأطعمة) خۆراکەکان: (کۆی خۆراك (الطعـام)ە، بریتییـه لـەو ڕۆزییـەی مـرۆڤ دەیخـوات‌و بژێوی ئەوەو هەروەها شتی تریش. لەبنەڕەتدا حەڵاڵی تێ دایە. ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّباً﴾[1]. واتە: ئەی خەڵکینە بخۆن لەوەی لەزەوی دایە بە حەڵاڵی‌و پاکژی.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ* قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾[2]. واتە: بخۆن‌و بخۆنەوەو زیـادە ڕەوی مەکـەن، ئەو زیادڕەوانی خۆش ناوێ. بڵێ: کێ جوانی‌و قەشەنگی یـەکانی خـوای حـەرام کـردووە کـە بـۆ بەندەکانی دەری هێناون‌و ڕۆزییە پاکژەکان.

تەنیا ئەو خواردنانە حەرامن کـە خـوا لەقورئانـدا حـەرامی کـردون یـان لەسـەر زمـانی پێغەمبەرەکەی، حەرام کردنی شتێ کە خوا حەرامی نەکردبێ بوختانە بـە زمـان خـوداوە: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَاماً وَحَلاَلاً قُلْ آللّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللّهِ تَفْتَرُونَ وماظن الذين يفترون على الله الكذب يوم القيامة﴾[3].

واتە: بڵێ: ئایا بینیتان ئەوەی خوا بۆی باراندون لەڕۆزی، ئێـوە خۆتـان هەنـدێکتان حـەرام کردووە، هەندێکتان حەڵاڵ کردووە، بڵێ: ئایا خوا ڕێگای پـێ داون یـان بوختـان بـە دەم خـواوە دەکەن.

﴿وَلاَ تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَـذَا حَلاَلٌ وَهَـذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ لاَ يُفْلِحُونَ* مَتَاعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[4]. واتە: ئێـوە مـەڵێن کاتێ زمانی ئێوە درۆ بە زمانی خواوەوە دەکات ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، تا درۆ بەدەم خواوە

(١) البقرة/١٦٨.
(٢) الأعراف/٣١/٣٢.
(٣) یونس ٥٩/٦٠.
(٤) النحل/١١٦ـ١١٧.

بکەن، ئەوانەی درۆ بە دەم خواوە دەکەن سەرناکەون. خۆشیەکی کەمەو سزایەکی توندیان بۆ هەیە.

## ئەو خواردنانەی حەرامن:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ﴾[1]. واتە: حەرامکراوە لەسەرتان مرداربوو خوێنو گۆشتی بەرازو ئەوانەی لەکاتی سەبڕین ناوی غەیری خوایان لێ دەهێنرێتو ئەوانەی دەخنکێنرێنو لێ دراوو کەوتووە خوارو قۆچ لێ دراوو ئەوەی دڕەندە خواردبی مەگەر ئەوانە نەبێ بەر لەمردنیان سەریان دەبڕن، ئەو ئاژەڵانەی لەسەر بت کوژراونەوەو بەشکردن بە هۆی ئەزلام ئەمانە هەموی لەدین دەرچونە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾[2]. واتە: ئەو شتانە مەخۆن کە ناوی خوای لێ نەهاتووە ئەوە لەدین دەرچوونە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَّسْفُوحاً أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقاً أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ﴾[3]. واتە: بڵێ: من نابینم هیچ خواردنێ حەرام بێ کە کەسێ دەیخوات مەگەر خوێنەکی ڕژاوبێ، یان گۆشتی بەراز بێ، ئەوە پیسە یا لەرێگای تاوانەوەیە لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵێ دا کە ناوی غەیری خوای لەسەر گوتراوە. ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُماً﴾[4]. واتە: حەرام کراوە لەسەرتان ڕاوی وشکانی تاوەکو لەئیحرام دەبن.

---

(١) المائدة: ٣.

(٢) الأنعام/١٢١.

(٣) الأنعام/١٢٥.

(٤) المائدة/٩٦.

### ئەوەی حیسابی لەگەڵ مردارە بوودایە:

هەر پارچە گۆشتێ لەئاژەڵ جیابکرێتەوە لەکاتی زیندوبوونی دا ئەوە مردارە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر پارچە گۆشتێ لەئاژەڵێ جیابکرێتەوەو زیندو بێ ئەوە مردارە) [1].

ئەوەی لەمردارەبوو خوێن جیادەکرێتەوە:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (دوو شتی مردوو دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراوە: دوو مردووەکان ماسیو کوللەیە، دوو خوێنەکان جگەرو سپڵە) [2].

### حەرام کردنی کەری ماڵی (گوێ درێژ):

(انس بن مالك) گێڕاویەوە: (کەسێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دا گۆشتی کەریان خواردووە، پاشان هاتووەکی تر هات وتی: گۆشتی کەر خوراوە، پاشان هاتووەکی تر هات وتی: کەر نەمان، بانگکەرێ بانگێشەی کرد لەناو خەڵکی دا: خواو پێغەمبەرەکەی لەگۆشتی کەر قەدەغەتان دەکاتو پیسە، مەنجەڵەکان رژێنران کە گۆشتیان لەناودا هەڵدەچوو) [3].

خواردنی ئەو درِندانە حەرامە کە کەڵبەیان هەیەو لەباڵندەکانیش ئەوانە حەرامن کە چرِنوکیان هەیە:

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (نهی رسول الله عن كل ذي ناب من السباع وعن كل ذي مخلب من الطير) [4]. واتە: پێغەمبەر (ﷺ) هەمو گیانداریکی درِندەی حەرام کرد کە کەڵبەی هەبێو هەموو باڵندەیەکی حەرام کرد کە چرِنوکی هەبێت.

### حەرام کردنی گیاندارانی پیسایی خۆر (الجلالة):

(الجلالة) ئەو گیاندارانەن زۆربەی ئالیکیان پیسایی یە، ئەوانە خواردنی گۆشتیانو خواردنەوەی شیرەکەیان سواربونیان حەرامە:

---

(١) صحيح (ص.جه ٢٦٠٦) جه(٢/١٠٧٢/٣٢١٦).

(٢) صحيح (.ج) ٢١٠).

(٣) متفق عليه: خ(٩/٦٥٣/٥٥٢٨) م(١٩٤٠ـ٣٥/١٥٤٠/٣).

(٤) صحيح (مختصر م ١٣٣٢) م(٣/١٥٣٤/١٩٣٤).

(نهى رسول الله (ﷺ) عـن لحوم الجلالـة والبانهـا) [١]. واتـه: پێغەمبـەر (ﷺ) گۆشـتی پیسایی خۆرو شیرەکەی قەدەغە کردووە.

گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە ئەو وشترەی پیسایی دەخـوا سـواری بـبنو شیرەکەی بخۆن) [٢].

## کەی گۆشتی ئاژەڵی پیسایی خۆر ڕەوا دەبێت؟

گەر ئاژەڵەکە یان پەلەوەرەکـە سـێ ڕۆژ دابەسـترێ بـە ئالیـكو خـواردنی پاکـژ، دروسـتە کوشتنەوەو خواردنی یـان. (ابـن عمـر) گێڕاویـەوە: (ئـەو سـێ ڕۆژ مریـشکی پیـسایی خـۆری دادەبەست) [٣].

## خواردنی خۆراکە حەرامەکان لەکاتی ناچاری دا:

خوای گەورە فەرمویـەتی: ﴿فَمَـنِ اضْـطُرَّ غَيْـرَ بَـاغٍ وَلاَ عَـادٍ فَـلا إِثْـمَ عَلَيْـهِ إِنَّ اللّـهَ غَفُـورٌ رَّحِيمٌ﴾[٤]. واتە: کێ ناچار بووبێ سنوور نەبەزێنێو زیادەڕەوی نەکات، ئەوە تاوانی لەسەر نییـە، خوا لێ بوردەو بە بەزەیی یە. ﴿فَمَـنِ اضْـطُرَّ فِـي مَخْمَـصَةٍ غَيْـرَ مُتَجَـانِفٍ لِّـإِثْمٍ فَـإِنَّ اللّـهَ غَفُـورٌ رَّحِيمٌ﴾[٥]. واتە: ناچاربوو لەبرسـێتی دا زیـادەڕەوی نـەکات گوناهبـار نـابێو خـوا لـێ بـوردەو بەبەزەییيە. [٦].

(ابن کثیر ـ ر ـ) (٢\١١٤) دەڵێ: هەر کەسێ پێویستی بە خواردنی هەنـدێ شـت بـوو لـەو حەرام کراوانە کە خوای گەورە باسی کردون لەبەر ناچاری، بۆی هەیە بیانخواتو خوا لـێ بـوردەو

(١) صحيح (ص.جه ٢٥٨٢) جه(٣١٨٩/١٠٦٤/٢).

(٢) حسن صحيح (ص.د ٣٢١٧) د(٣٧٦٩/٢٦٠/١٠)..

(٣) صحيح (الأرواء/٢٥٠٤) (ابن ابي شيبة ٤٦٦٠/١٤٧/٨).

(٤) البقرة/١٧٣.

(٥) المائدة/٣.

(٦) صحيح (ص.ج/١٨٨٦) أ(٢/١٠٨).

بەبەزەیی یە، چونکە خوا دەزانێ ئەو بەندەیە ناچارەو پێویستی پێ یەتی‌و لێ ی دەبورێ، لە(المسند)و (صحيح ابن حبان) دا لەپێغەمبەر (ﷺ) بە (المرفوع)ی گەڕاوتەوە: (ان الله يحب ان تؤتى رخصه، كما يكره ان تؤتى معصيته)(١). واتە: خوا پێ ی خۆشە ئەو شتەی ڕێگای پێ دراوەوەربگیرێ، وەکو چۆن پێ ی ناخۆشە سەرپێچی ئەو بکرێت.

بۆیە هەندێ شەرعزانان وتویانە هەندێ جار خواردنی مردارەبووەوە واجبە، مادام لەمەترسی مەرگ بترسیێ‌و هیچی تری لەلا نەبێت، هەندێ جار سوننەت دەبێ‌و هەندێ جار ڕەوا دەبێ بە پێی بارودۆخەکان.

ناکۆکن کە ئایا ئەو بڕەیە بخوات کە برسێتی یەتەکەی دەشکێنێ یان نەء، یان تێر بخوات‌و بیکاتە توێشو؟ ئەمە چەند فتوایەکی لەسەرە وەکو لەکتێبی ئەحکامەکاندا هاتووە.

مەرج نییە سێ ڕۆژ خواردنت دەست نەکەوێ ئەو جا بۆت دروست دەبێ، وەکو هەندێ خەڵکی ڕەشۆکی بڕوای وایە، بەڵکو هەر کاتێ ناچار بوو بۆی دروست دەبێت. تەواو.

* * *

(١) صحيح (ص.ج ١٨٨٦) أ(١٠٨/٢).

# کوشتنەوەی شەرعی (الذكاة الشرعي)

پێناسەکردنی: (الذكاة) لەبنەڕەتدا (التطيب)ە وەکو (رائحة ذكية) (اي طيبة) واتە: بۆنـەکی خۆش. بە کوشتنـەوەی دەگوترێ (الذكاة) چونکە ڕێگا پێ دانی شەرعی حەڵاڵو خاوێنی دەکات.

مەبەست لێرەدا: کوشتنەوەو سەربڕینی (الذبح والنحر)ی ئەو ئاژەڵەیە خواردنی حەڵاڵەو بـە کوشتنەوە نەبێ حەڵاڵ نابێت، جگە لەماسیو کولله نەبێت.

## کوشتنەوەی دەستی کێ ڕەوایە:

کوشتنەوەی ئـەهلی کیتـابو موسـڵمان ڕەوایـە، نێـر بـێ یـان مـێ بـێ، خـوای گـەورە فەرمویەتی: ﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَـابَ حِلٌّ لَّكُمْ﴾[1]. (ابـن عبـاس) دەڵـێ وەکـو بوخـاری گێڕاویەوە مەبەست لەکوشتنەوەی ئەوانە[2].

(كعب بن مالك) گێڕاویەوە: (ژنێ کاوڕێ بە بەردێ دەکوژێتەوە، لەراست ئەمە لەپێغەمبەر (ﷺ) پرسیارکراو ئەویش فەرمانی بە خواردنی کرد)[3].

## ئامێری کوشتنەوە:

هەرشتەکی توانای بریندارکردنی هەبێ دروستە گیانداری پـێ بکوژرێتـەوە جگـە لـەددانو نینۆك نەبێت:

(عبايه بن رفاعه) لەباپیرەی گێڕاویەوە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: (ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە کێرد(مُدى)مان نییە، فەرموی: (هەرچی خوێن برژێنێو ناوی خوای لەسـەر بـرا بیخـۆ

---

(١) المائدة/٥.

(٢) صحيح الأرواء/٢٥٢٨) خ(٩/٦٣٦).

(٣) صحيح (الأرواء/٢٥٢٧) خ(٩/٦٣٢/٥٥٠٤).

جگە لەنینۆكو ددان نەبێ، نینۆك كێرد(چەقۆ)ی حەبەشەیەو ددان ئێسقانە) [١].

(شداد بن اوس) گێڕاویەوە: دوو شتم لەپێغەمبەر (ﷺ) چاك دەرخ كردووەو فەرمویەتی: (خوا چاكەی لەسەر هەموو شتێ نوسیوە، ئێوە لەكوشتندا چاكە بكەن، لەكوشتنەوەتاندا باش كوشتنەوە بكەن، با یەكێ لەئێوە چاك كێردەكەی بسوێو تیژی بكاتو كوشتەكەی زوو رزگار بكات) [٢].

## سیفەتی كوشتنەوە:

ئاژەڵ دوو بەشە: هەیە دەتوانرێ دەستی بگەیێنرێتیو بكوژرێتەوەو هەیە دەستی پێ راناگات. ئەوەی بتوانرێ بكوژرێتەوە گەرووی دەبڕدرێت، كێ نەیتوانی بیكوژێتەوە كوشتن سەر بڕینیەتی. (ابن عباس) گێڕاویەوە: (الذكاة في الحلق واللبة). واتە: كوشتنەوە هەڵبڕینی گەروو گەردنیەتی. (ابن عباس)و (ابن عمر)و (انس) گێڕاویانەوە: سەر بڕینی تەواوی ئاژەڵ قەیدی نییە.

(رافع بن خدیج) گێڕاویەوە: بە پێغەمبەری خوام (ﷺ) وت: ئێمە سبەی بەرەو رووی دوژمن دەبینەوە، چەقۆمان پێ نییە. ئەو فەرموی: (خێرا شتێك بێنە خوێن بڕێژێو ناوی خوای لێ بێنە، ئەنجا بخۆ، بەڵام نەك ددانو نینۆك، چونكە (السن) ددان ئێسقانەو (الظفر) واتە نینۆك چەقۆی حەبەشەیە).

ئێمە دەسكەوتی جەنگمان دەست كەوت لەوشترو مەڕو ماڵات، لەوانە وشترە هەتڵە (ند) بوو، پیاوێ تیرەكی گرتیو وەستاندی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئەم وشترە وەكو دڕندەكان هەتڵەو راكردنی هەیە گەر توشی شتەكی ئاوا هاتن ئاوای لێ بكەن) [٣]. واتە: بەتیر لێی بدەن، دواتر گەورووی ببڕن، یابیكوژن ئینجا بیخون.

---

(١) متفق علیه: (خ٥٥٠٣/٦٣١/٩) (م: ١٩٨٦/١٥٥٨/٣).

(٢) صحیح (الأرواء: ٢٥٤٠) م(١٩٥٥/١٥٤٨/٣).

(٣) متفق علیه: (خ ٢٤٨٨، ٥٥٠٣) م(١٩٨٦).

## کوشتنەوەی کۆرپەلە (ذکاة الجنین):

گەر کۆرپەکە لەسکی دایکی دەرچوو زیندوو بوو، پێویستە بکوژرێتەوە، گەر بە مردوویی دەرچوو ئەوە کوشتنەوەی دایکی کوشتنەوەی ئەوە!. (ابی سعید) گێڕاویەوە: لەراست کۆرپەلەی ئاژەڵ لەپێغەمبەرمان(ﷺ) پرسی فەرموی: (گەر ویستتان بیخۆن کوشتنەوەی دایکی کوشتنەوەی ئەوە) [١].

## (بسم الله) کردن لەسەر کوشتنەوە:

گوتنی (بسم الله...) لەسەر کوشتنەوە مەرجێکە بۆ حەڵاڵ بوون، هەرکەسێ بەئەنقەست وازی لێ بێنێ کوشتنەوەکەی حەڵاڵ نابێت. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ﴾[٢]. واتە: بخۆ لەو گۆشتەی ناوی خوای لەسەر دەهێنرێ گەر راست دەکەن بڕوادارن. ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ...﴾[٣]. واتە: لەوشتە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهاتووە ئەوە تاوانە.پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەوەی خوێنی لێ هەڵدەرێژرێ‌و ناوی خوای لەسەر دێنرێ لێی بخۆ) [٤].

## رووتکردنی ئاژەڵ‌و پەلەوەر لەقیبلە:

سوننەتە کوژراوەکە بەرەو قیبلە درێژ بکرێ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی بگوترێ (جابر گێڕاویەوە: (لەقوربانی دا پێغەمبەر (ﷺ) دوو بەرانی شاخداری بەڵەك (املحین)ی خەساو (موجئین)ی کوشتەوە، کاتێ رووی تێ کردن فەرموی: (اني وجهت وجهي للذي فطر السماوات والأرض وما انا من المشركين، ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين. لا شريك له

---

(١) صحيح (ص.د ٢٤٥١) د(٢٨١١/٢٦/٨).

(٢) الأنعام/١١٨.

(٣) الأنعام/١٢١.

(٤) تێبینی: لەمەزهەبی حەنەفی دا (بسم الله) واجبە بەڵام لای شافیعی (بسم الله)و رووکردنی لەقیبلە سوننەتە، گەر واجب بووایە خواردنی ئەهلی کیتاب حەرام دەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (اسم الله فی قلب کل مسلم) رواه البيهقي والدارقطني.

وبذلك امرت وانا من المسلمين. اللهم منك ولك عن محمد وامته، بسم الله والله اكبر) پاشان کوشتی یەوە) [(١)].

## نێچیر (الصید):

﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُواْ﴾[(٢)]. واتە: ئەگەر ئیحرامتان شکاند راو بکەن. ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللّهُ فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُواْ اسْمَ اللّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾[(٣)]. واتە: لێت دەپرسن چییان بۆ حەڵاڵە، بڵێ: ئەوانەی پاکن بۆتان حەڵاڵە، هەروەها نێچیری ئەو سەگو تاژییانەی راتان هێناون لەوەی خوا فێری کردون، دە بخۆن لەو نێچیرەی بۆتان دەگرنو ناوی خوای لەسەر بێنن.

راو لەدەریا لەهەموو کاتێ دروستە، دیسان راو لەوشکانی تەنیا لەکاتی ئیحرام دا نەبێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعاً لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُماً وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِيَ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾[(٤)]. واتە: حەڵاڵ کراوە بۆتان راوی دەریاو خواردنەکەی بۆ سوودی ئێوەو سەفەرچی یەکان، وە راوی وشکانی حەرام کراوە تا لەئیحرام دابن.

### ئەو کەسەی راوی حەڵاڵە:

ئەو کەسەی کوژراوەی دەستی رەوا بێ نێچیرەکەشی حەڵاڵە.

### ئامێری راو:

راوچی یەتی هەندێ جار بە چەکی بریندارکەر دەبێ، وەکو تیرو کەوانو شمشێرو چەقۆو رم، هەندێ جار بە گیاندارانی راو دەبێت:

(١) صحيح (ص.د ٢٤٢٥) د(٤/٤٩٦/٢٧٧٨).
(٢) المائدة/٢.
(٣) المائدة/٤.
(٤) المائدة/٩٦.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللّهُ بِشَيْءٍ مِّنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ﴾(١). واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خوا تاقیتان دەکاتەوە بەشتێ لەنێچیر کە بەدەستو رمەکانتان دەستکەوتی دەکەن.

﴿وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللّهُ فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ﴾(٢). باسکرا. مەرجە لەراوی بە چەك کە لەشی نێچیرەکە ببڕێو پێ یدا رەت ببێت. لەراوی سەگو تاژیو بازو شتی تردا مەرجە راهێنرابنو نابێ لەنێچیرەکە بخۆنو سەگو تاژی تری لەگەڵدا نانێردرێت. (بسم الله) کردن مەرجە لەکاتی هاوێشتنی تیرو ناردنی سەگو تاژی دا بۆ حەلاڵ کردنی.

(عدي) لەپانە تیرەك (المعراض) لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) پرسی؟ فەرموی: (گەر بە لای تیژت ئەنگاوت ئەوە بیخۆ، گەر بە لای پانت لێ دا مرد (الموقوذة)یەکەو بە لێدان مردووەو مەیخۆ). وتی: سەگی دەنێرم. فەرموی: (گەر سەگت ناردو ناوی خوات برد بخۆ). وتم: گەر سەگەکە لێ ی خوارد؟ فەرموی: مەیخۆ، ئەوە بۆ تۆی نەگرتووەو بۆ خۆی گرتووە! وتم: گەر سەگم ناردو سەگەکی تری لەگەڵدا بوو؟ فەرموی: مەیخۆ، تۆ بۆ سەگی خۆت ناوی خوات بردووە نەك بۆ سەگی تر). ئەم فەرمودەیەش (متفق عليه)یە.

## ڕاوکردن بە سەگێ کە سەگی راو نەبێت:

گەر سەگی رانەهاتوو نێچیرەکی گرت گەر بە زیندویی فریای نەکەویو نەکوژرێتەوەو رەوا نییە.

(ابي ثعلبة الخشني) گێڕاویەوە: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە لەخاکی ئەهلی کیتابدا دەژین، ئایا لەقاپو قازاغی ئەوانـدا بخۆین؟ وە لەخاکەکی راوو شکاردام بە کەوانو سەگەکەم راو دەکەم کە رانەهێنراوە، وە بەسەگی مەشق پێ کراوم، چی بۆمن باشە؟ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی لەراست ئەهلی کیتابت گوت، گەر قاپی ترت دەست کەوت لەناویاندا مەخۆ، گەر

(١) المائدة/٩٤.

(٢) المائدة: ٤.

دەستت نەکەوت قاپەکە بشۆو تێ یدا بخۆ. گەر نێچیرت بە کەوان کوشت ناوی خـوای لـێ بێنـەو بیخۆ، ئەوەی بەسەگی راو گرتت دوای ناوی خوا بیخۆ، گەر بەسەگی رانەهێنراو گرتت گەر فریای کەوتی بیکوژەوەو بیخۆ) [1].

## گەر نێچیرەکە کەوتە ناو ئاوەوە:

گەر نێچیرەکە کەوتە ناو ئاو، خواردنی حەرام دەبێ، پێغەمبەر (ﷺ) بە (عـدي بن حاتم)ی فەرموو: (کاتێ تیرەکەت هاوێشت ناوی خوا بێنە، گەر بینیت کوژراوە بیخۆ، مەگەر کەوتبۆ نـاو ئاوەوە، ئەو کاتە نازانی ئاوەکە کوشتویەتی یان تیرەکەت) [2].

## گەر نێچیرەکە دوو سێ رۆژ ون بوو پاشان دۆزییەوە:

هەر کەسێ تیری هاوێشتو ئەنگاوتی، پاشان دوو سێ رۆژ بزر بوو دوایـی دۆزییـەوە، گـەر بۆگەن نەبوبێ بۆی هەیە بیخوات.

بە(عدی بن حاتم)ی فەرموی (ﷺ): (گـەر تـیرت گرتـە نێـچیرەکەتو دوای رۆژێ دوو رۆژ دۆزیتەوە بیخۆ، مادام شوێنی تیرەکەتی پێوە دیاربێت) [3]. (ابي ثعلبة) گێڕاویەوە: (گـەر تـیرت هاوێشتو نێچیرەکەت ون بوو، دوایی دۆزیتەوە بیخۆ مادام بۆن گەنیو نەبوبێت) [4].

---

(١) متفق عليه.

(٢) صحيح (الأرواء/٢٥٥٦) م(١٩٢٩ـ٧/١٥٣١/٣).

(٣) صحيح (مختصر م١٢٣٩) خ(٥٤٨٤/٦١٠/٩).

(٤) صحيح (مختصر م ١٢٤٢) م(١٩٣١ـ١٠/١٥٣٢/٣).

# قوربانی (الأضحية)

## پێناسەکردنی:

بریتی یە لەسەربڕینی مەڕو بزنو ڕەشە وڵاخ لەرۆژی قوربانیو رۆژانی تەشریقدا بۆ نزیک بوونەوە لەخودا.

## حوکمەکەی:

لەسەر دەوڵەمەند واجبە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من لە سعة ولم یضح فلا یقربن مصلانا)[1]. واتە: کێ دەستی بڕواو قوربانی نەکات بانەیەتە مزگەوتەکانمان!

(لێرەدا بەڵگەهێنانەوە بەمە ئەوە دەخوازێ گەر کەسی دەوڵەمەند قوربانی نەکات، هاموشۆی شوێنی نوێژ نەکات!، کەواتە واجبێکی واز لێ هێناوە، ئەو کاتە نزیک کەوتنەوە لەخوا بە نوێژ بۆ بەندە سوودی نابێ، چونکە واجبەکی نەکردووە).

(مخفف بن سلیم) گێڕاویەوە: (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لەعەرەفە وەستابووین فەرموی: (هەموو خاوەن خێزانێ ساڵانە قوربانیو ڕەجەبی یە(العتیرە)ی لەسەرە). وتیان: (العتیرة) چی یە؟ فەرموی: ئەوەی خەڵکی پێی دەڵێن ڕەجەبی یە)[2]. بەڵام قوربانی ڕەجەبی یە بەم فەرمودەیە نەسخ بۆوە: (لا فرع ولا عتیرە)[3]. بەڵام قوربانی مایەوە. (جندب بن سفیان البجلی) گێڕاویەوە: (لەرۆژی قوربانی دا پێغەمبەرم (ﷺ) بینی، فەرموی: (هەر کەسێ بەر لەنوێژی جەژن قوربانی کرد با قوربانیەکی تر بکات، کێ قوربانی نەکردووە با بیکات)[4]. ئەمە

---

(١) حسن (ص.جه ٢٥٣٥) جه(٢/١٠٤٤/٣١٢٣).

(٢) حسن (ص.جه ٢٥٣٣). جه(٢/١٠٤٥/٣١٢٥).

(٣) متفق علیه: (خ ٥٤٧٣/٥٩٦/٩) م(٣/١٥٦٤/١٩٧٦).

(٤) متفق علیه: خ(٥٥٦٢/٢٠/١٠) م(٣/١٥٥١/١٩٦٠).

فەرمانی واجبی یە لەگەڵ فەرمانکردن بە دووبارە کردنەوەی دا[١].

## قوربانی لەچی دادەبێت:

لەرەشە وڵاخو وشترو مەڕو بزندا دەبێت، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكاً لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾[٢]. واتە: بۆ هەمو گەلان مەنسەکێکمان داناوە تا ناوی خوا بێنن لەورۆزییەی خوا پێی داون لەئاژەڵان.

## وشترو مانگا بۆ چەند کەس قوربانی دەبێت؟

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (لەسەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بووین، ئامادەی قوربانی بوو، لەوشتردا دە کەس بەشدار بووینو لەرەشە وڵاخدا حەوت کەس)[٣].

## یەك کاوڕ بۆ پیاوێكوماڵەوەیان دروست دەبێت:

(عطاء بن یسار) دەڵێ لەئەبو ئەییوبی ئەنصاریم (رضي الله عنه) پرسی لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) قوربانی چۆن بوو لەناوتاندا، فەرموی: (لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) پیاو کاوڕێکی دەکردە قوربانی لەجیاتی خۆیو ئەندامانی خێزانەکەیو خۆراکیان دەبەخشی، پاشان خەڵکی تووشی بەرز روانین بوو، وەکو خۆت دەیبینی ئاوای لێ هاتووە)[٤].

## ئەو گیاندارنەی بۆ قوربانی ناشێن:

(عبید بن فیروز) دەڵێ: لە(براء بن عازب)م لەراست ئەوە پرسیارم کرد، لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کام ئاژەڵە بۆ قوربانی قەدەغە کرا یان پێی پەسەند نەبوو. دەڵێ: پێغەمبەر

(١) السيل الجرار (٧٤، ٧٥/٤)
(٢) الحج/٣٤.
(٣) صحيح (ص.جه ٢٥٣٦) جه(٢/١٠٤٧/٣١٣١).
(٤) صحيح (ص.جه ٢٥٤٦) جه(٢/١٠٥١/٣١٤٧).

(ﷺ) ئاوا بە دەست ئاماژەی کرد کە دەستی مـن لـەهی ئـەو کـورتترە: (چـواریان بۆقوربـانی ناشێن: (کوێر کە کوێریەکەی دیار بێ، نەخۆش کە نەخۆشیەکەی دیار بێت، شەل کە شـەلیەکەی دیار بێت، کز لەبەر کزی هزری نەمابێت). وتی: من پێم خۆش نییە گوێی ناتـەواو بـێ، ئـەوەی پێت باش نییە لێی بگەڕێو لەکەسیش حەرامی مەکە) [(١)].

**لەقوربانی دا لەبزندا (الجزع ـ یەك ساڵەیی) دروست نییە :**

(البراء بن عازب) گێڕاویەوە: (خاڵەکم بـە نـاوی (ابـو بـردە) بـەر لەنوێـژ قوربـانی کـرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: کاوڕی تۆ بۆ گۆشتە!. وتی: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) یـەك (الجـزع ـ یەك ساڵەیی)م هەیە لەماڵەوەدا، فەرموی: بیکوژەوە بەڵام بۆ تۆ نـەبێ بـۆ کەسـی تـر ناشـێت، پاشان فەرموی: هەر کەسێ بەر لەنوێژ قوربانی بکات ئەوە بۆخـۆی دەیکوژێتـەوە، هـەر کەسـێ دوای نوێژ قوربانی بکات ئەوە قوربانیەکەی تەواوەو سوننەتی موسڵمانانی پێکاوە) [(٢)].

* * *

---

(١) صحيح (ص.جه ٢٥٤٥) جه(٣١٤٤/١٠٥٠/٢).

(٢)متفق عليه: (خ ٥٥٥٦/١٢/١٠) م(١٩٦١/١٥٥٢/٣).

## مەڕە منداڵ (هۆزەبانە) - (العقیقة)

### پێناسەکەی:

مەڕە منداڵ یان هۆزەبانە (العقیقة) ئەو قوربانیەیە بۆ منداڵی تازە لەدایك بوو دەکوژرێتەوە.

حوکمەکەی: مەڕە منداڵ واجبە لەسەر باوك کە بۆ کوڕ دوو کاوڕو بۆ کچ کاوڕێ بکاتە قوربانی، بۆ لەدایك بوونی ئەم منداڵە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (مع الغلام عقیقة، فاهریقوا دما وامیطوا عنه الأذی)[١].

واتە: مەڕە منداڵ لەگەڵ منداڵ دا هەیە، خوێن بڕێژن و ئازاری لێ دووربخەنەوە.

(عائیشە) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردوین بۆ کوڕ دوو کاوڕو بۆ کچ کاوڕێ بکەینە مەڕە منداڵ)[٢].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەموو منداڵێ وابەستەیە بە مەڕە منداڵەکەیەوە، لەحەوت ڕۆژەدا بۆی دەکرێ و سەری دەتاشرێ و ناوی لێ دەنرێت)[٣].

### کاتەکەی:

سوننەتە لەڕۆژی حەفتەم مەڕەمنداڵی بۆ بکرێ، گەر نا چواردەمین ڕۆژی، گەر نا بیست و یەکەم ڕۆژی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (مەڕە منداڵ حەفتەم یان چواردەم ڕۆژیەتی یان بیست و یەکەم ڕۆژیەتی)[٤].

---

(١) صحیح (ص.جه ٢٥٦٢) خ(٥٤٧٣/٥٩٠/٩).

(٢) صحیح (ص.جه ٣١٦٣/١٠٥٦/٢).

(٣) (ص.ج ٢٥٦٣) جه(٣١٦٥/١٠٥٦/٢).

(٤) صحیح (ص.ج ٤١٣٢) هق(٣٠٣/٩).

**ئەوەی سوننەتە لەراست منداڵی تازە بوو دابکرێ:**

(١) دەم شیرین کردن (التحنيك): (ابی موسی) گێڕاویەوە: (کوڕەکم پەیدا بوو، هێنامە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نا ئیبراهیمو بە خورمایەك دەمی شیرین کردو دوعای فەڕو بەرەکەتی بۆ کردو دایەوە من، ئەو گەورە کوڕی ئەبو موسا بوو)[١].

(٢) سەرتاشینی (سەر سفرکردن) لەحەفتانەداو خێرکردنی زیو پڕ بەکێشی مووەکانی بۆی:
پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەمو منداڵی بە مەڕە منداڵیەوە بەستراوەتەوە، هەفتەی یەکەم مەڕەمنداڵی بۆ دەکرێو سەری دەتاشرێو ناوی لێ دەنرێت)[٢].
پێغەمبەر (ﷺ) بە (فاطمة (علیها السلام) فەرمو کاتێ حەسەنی (علیه السلام) پەیدابو: (سەری بتاشەو بەئەندازەی کێشی مووەکانی بکە خێر بۆ هەژاران)[٣]

(٣) سوننەت کردن لەهەفتانەدا: (الطبراني) لە(المعجم الكبير)دا لە(جابر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) مەڕە منداڵی بۆ حەسەنو حوسێن کرد، سەلامی خوایان لێ بێوڕۆژی حەوتەم سوننەتی کردن)[٤]. لە(الأوسط)دا لە(ابن عباس) گێڕاویەوە: (حەوت شت بۆ منداڵ لەحەفتانەدا سوننەتن: ناودەنرێ، سوننەت دەکرێو ئازاری لێ لادەبرێ، گوێچکەی دەسوەرێن (کون دەکرێن)، مەڕە منداڵی بۆ دەکرێو، سەری دەتاشرێ، خوێنی مەڕە منداڵەکەی تێوە هەڵدەسوەرێو، بە ئەندازەی توکی سەری زیو یان زێڕ خێری بۆ دەکرێت)[٥]

---

(١) متفق عليه: خ(٩/٥٨٧/٥٤٦٧) م(٣/١٦٩٠/٢١٤٥).
(٢) رابرد.
(٣) حسن (الأرواء ١١٧٥) أ(٦/٣٩٠) هق(٩/٣٠٤).
(٤) طغ (٢/١٢٢/٨٩١) هق(٨/٣٢٤).
(٥) طس(١/٣٣٤/٥٦١).

# باسی راسپاردە (كتاب الوصية)

**پێناسەی (الوصية):**

واتە راسپاردن (وصيت الشيء اوصيه اي اذا اوصلته) یان پـێ گەیانـدن. (الموصـى) واتـە: راسپێرەر، کە شتێ بۆ دوای مردنی خۆی رادەسپێرێت.

لەشەریعەتدا: ئەوەیە کە مرۆڤ شتەکی عەینی یان قەرزێ یان سوودێ بداتـە کەسـێکی تـر، کە ئەو کەسەی راسپاردەی پێ راسپێراوە (الموصى له) دوای مردنی راسـپێرەر (الموصـى) پـێ ی بدرێت.

**حوکمەکەی:**

**لەسەر هەموو کەسێ گەر ماڵی هەبێ واجبە وەسیەت بکات تێ یدا:**

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾[1]. واتە: فەرز کراوە لەسەرتان گەر یەکێ لـەئێوە کەوتە سەرە مەرگەوە، کە سامانەکی بەجێ هێشتبێ راسپاردەکە بۆ باوانو خزمانـە بـە چـاکە، حەقێکە لەسەر تەقواکاران.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (یەکێ لەمافەکان بەسەر موسڵمانەوە ئەوەیـە گـەر شـتەکی هەبوو وەسیەتێ بکات لەعەبدوڵلا کوڕی عومەر (رض) دەڵێ: ، نـابێ دوو شـەو بەسـەریدا تـێ بپەرێت بێ وەسیەت بێنێتەوە)[2].

## ئەو بڕە ماڵەی سوننەتە راسپاردەو وەسیەتی تێ بکرێت.

(سەعد بن ابی وقاص (رضي الله عنه)) گێڕاویەوە:

---

(١) البقرة: ١٨٠.

(٢) متفق عليه: (خ ٧٣٨٢/٣٥٥/٥) م(١٦٢٧/١٢٤٩/٣).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە لام سەردانم بکاتو خۆم لەمەککەدا بووم، نەخۆش بووم، ئەو پێ ی خۆش نەبوو لەخاکێ دا بمرێ کۆچی لێوە کردووە، فەرموی: رەحمەتی خوا لەکوڕی عەفراء. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماڵم هەمووی بکەم بە وەسیەت، فەرموی: نەء. وتم: ئەی نیوە؟ فەرموی: نەء. وتم: سێ یەك؟ فەرموی: سێ یەك زۆرە، تۆ خانەوادەکەت بە هەبووی بەجێ بێڵی باشترە، نەك هەژار بنو بار بن بەسەر خەڵکەوە. تۆ چەندە ببەخشیت، تا ئەو پارووەی دەیخەیتە ناو دەمی ژنەکەتەوە خێرە، بەڵکو خوا بەرزت بکاتەوە کەسانی سوودت لێ وەربگرنو کەسانێ زیانت لەدەست ببینن، ئەم رۆژە تاقە کچێکی هەبوو) [1].

## راسپاردە بۆ میراتگر نییە:

پێغەمبەر (ﷺ) لەوتاری ماڵ ئاوایی دا فەرموی: (خوا هەموو هەقێکی بە خاوەن حەق داوەو، راسپاردە بۆ میراتگر ـ الوارث ـ نییە) [2].

## ئەوەی لەسەرەتای وەسیەتەکەدا دەنووسرێتەوە:

لە(ئەنەس)ەوە (ﷺ) دەڵێ: لەسەرەتای وەسیەتەکانیان بەم بوم جۆرەیان دەنووسی:

(بسم الله الرحمن الرحيم. من ئەمە رادەسپێرمە فلانی کوڕی فیسار: گەواهی بدات ـ ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، وان محمدا عبده ورسوله، وان الساعة آتية لاريب فيه وان الله يبعث من في القبور) وە خوا مردوان زیندو دەکاتەوە، وە وەسیەت بکات بۆ خانەوادەکەی کە ماونەوە تەقوای خوا بکەنو نێوانی خۆیان باش بکەنو بە گوێ ی خواو پێغەمبەر (ﷺ) بکەن گەر خۆیان بە بڕوادار دەزانن، وەسیەت بکات بە وەسیەتی ئیبراهیم بۆ کوڕانیو یەعقوب ﴿يَا بَنِيَّ إِنَّ للّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾البقرە: ١٣٢ [3].

---

(١) صحيح (ص.جه ٢١٩٤) جه (٢/٩٠٥/٢٧١٣).

(٢) صحيح (الارواء ١٦٤٧) هق(٦/٢٨٧).

(٣) حسن (ص.جه ٢١٩٥) (الارواء ١٦٦٧) جه (٢/٩٠٦/٢٧١٥).

## کەی وەسیەت جێ بەجێ دەکرێت:

دوای مردنی وەسیەتکەرو دانەوەی قەرزەکانی میراتەکە بۆ وەسیەت بۆکراو جێبەجێ دەکرێ، کاتێ قەرزەکە تەواوی میراتەکەی برد، ئەوە وەسیەت بۆ کراو بێ بەش دەبێت.

پێشەوا عەلی (علیە السلام) گێڕاویەوە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڕیاری داوە بەر لەقەرزدانەوە وەسیەتەکە جێبەجێ بکرێ، وە ئێوە ئەمە دەخوێننەوە﴿ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾(النساء: ١١)[١].

## ئاگاداری: (١)

(بەزۆری خەڵکی ئیمڕۆ شتی تازە دادێنن لەئاییندا، بە تایبەتی لەمەسەلەی جەنازەکاندا، پێویستە مرۆڤ وەسیەت بکات لەسەر سوننەت ئامادەبکرێو بنێژرێ، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[٢]. یارانی پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتیان بەمە کردووەو گێڕانەوەو بەسەر هات زۆرە لەوانەوە، (عامر) دەڵێ (سعد بن ابی وقاص)ی باوکی لەو نەخۆشیەی دا کە تێ ی وەفاتی کرد فەرمویی: (گۆڕم بۆ هەڵکەنن خشتەم لەسەر دابنێن، وەکو وا لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کرا) [٣].

## ئاگاداری: (٢)

گەر مردوو میراتگری هەبوون مردبوون لەژیانی دا، ئەوکاتە واجب دەبێ لەسەری بۆ منداڵەکانی ئەو لقە راسپاردە بکات، بەو بڕەیەی بۆ مردووەکە دەیکاتە وەسیەت، یان بەشتێ لەو داراییەی کە لەسنوری سێ یەکدا بێ، سێ یەکیش زۆرە، گەر مردو وەسیەتی بۆ منداڵەکانی نەکرد، دەبێ وەسیەتی بۆ بکرێ چونکە وەکو قەرزێ لەسەریەتی، گەر مردوو نەینوسی بێت ئەم قەرزە لاناچێ، لەدادگاکانی ئیمڕۆدا کار بەمە دەکرێت).

* * *

(١) حسن (ص.جه ٢١٩٥) (الارواء ١٦٦٧) (جه ٢/٩٠٦/٢٧١٥).

(٢) التحريم.: ٦.

(٣) احكام الجنائز (الالباني)، ص٨

# باسی میرات (كتاب الفرائض)

## پێناسە[١]:

(الفرائض) كۆی (الفريضة)یە لە(الفرض) وەرگیراوە واتە: (التقدير). واتە: قەرساندن، یان خەملاندن، یان دیاری كردن.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾[٢] اي قدرتم.

لەشەرعدا (الفرض): ئەو بڕە سامانەیە بۆ میراتگر دیاری دەكرێت.

## وشیاری دان لەناڕەوایی كردن لەمیراتەكاندا:

عەرەب بەر لەئیسلام میراتیان تەنیا بۆ پیاوان دادەنا نەك بۆ ئافرەتان، ئەنجا بۆ گەورەكان نەك بۆ بچوكەكان، كاتێ ئیسلام هات ناوی نا ﴿ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ﴾[٣]و ﴿وَصِيَّةً مِّنَ اللّهِ﴾[٤]، ئەنجا دوای ئەمە گەڤی گەورەی پڕ مەترسی داوەتە ئەو كەسانەی پێچەوانەی شەریعەتی خوا مامەڵە لەگەڵ میراتدا دەكەن، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ*وَمَن يَعْصِ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾[٥].

واتە: ئەمە سنووری خودایە، كێ بە گوێ ی خواو پێغەمبەرەكەی بكات، دەیخاتە ناو بەهەشتانی بەژێری یاندا چەند روبارێ دەڕوات نەمر دەبن لەوێ، ئەوەش سەركەوتە گەورەكەیە. كێ سەرپێچی خواو پێغەمبەرەكەی بكاتو سنوورەكەی ببەزێنێ دەیخاتە ناو ئاگرێ لەوێدا نەمر

---

(١) فقه السنة: (٣/٤٢٤).

(٢) البقرة: ٢٣٧.

(٣) النساء: ١١.

(٤) النساء: ١٢.

(٥) النساء: ١٣ ـ ١٤.

دەبیٚو سزایەکی ریسواکەری هەیە.

## ئەوەی لەماڵی مردوو بە میرات دەگیرێت:

گەر مرۆڤ مرد لەو سامانەی بەجیٚ ی هیٚشتووە کفنو شاردنەوەی ئەوی پیٚ ئامادە دەکریٚ، پاشان قەرزەکەی بۆ دەدریٚتەوە، دوایی وەسیەتەکەی جیٚبەجیٚ دەکریٚ، گەر شتیٚ مایەوە بەسەر میراتگرانی دا دابەش دەکریٚت، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ﴾(النساء: ١٢). ئیمام عەلی (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرمویەتی: (پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) بڕیاری قەرزدانەوەی داوە بەر لەوەسیەتدا) [١].

## هۆیەکانی میرات:

**هۆیەکانی میرات گرتن سیٚ جۆرە:**

(١) پشت، خوای گەورە فەرموەیتی: ﴿وَأُوْلُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ﴾[٢]. واتە: خزمان هەندیٚ لەهەندیٚکیان لەپیٚشترەوەن.

(٢) گەورەی کۆیلەی ئازادکراو (الولاء) وەکو پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الولاء لحمة كلحمة النسب) [٣]. واتە: گەورەی ئازادکەری کۆیلە وەکو گۆشتی پشتە.

(٣) مارەبڕین. وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ﴾[٤].

واتە: بۆ ئیٚوە نیوەی میرات کە ژنەکانتان بەجیٚ ی هیٚشتووە.

## ئەو هۆکارانەی میرات قەدەغە دەکەن:

(١)**کوشتن:** لەفەرمودەدا هاتووە: (القاتل لا يرث) [٥]. واتە: بکوژ میرات ناگریٚت.

(٢) **جیاوازی ئاینی:** لەئوسامەیکوڕی زەید (رض) دەڵیٚ (پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

---

(١) رابرد.

(٢) الأحزاب: ٦.

(٣) صحيح (ص.ج ٧١٥٧) (هق ١٠/٢٩٢).

(٤) النساء: ١٢.

(٥) صحيح (ص.ج ٤٤٣٦) (الارواء ١٦٧٢) ت(٣/٢٨٨/٢١٩٢).

(موسڵمان میرات لەبێ بڕوا ناگرێ، بێ بروا میرات لەبڕوادار ناگرێت)[١].

**(٣) کۆییلە:** چونکە کۆییلە خۆیو سامانی هی ئاغاکەیەتی، گەر خزمانی میراتی بۆ بەجێ بێڵن ئەوە بۆ ئاغاکەی دەبێت[٢].

## میرات گران لە پیاو:

**میرات گران لەپیاوان (١٠) کەسن:**

(١) :کوڕو کوڕی کوڕ تا بۆ خوارەوە دەڕوات، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾(النساء: ١١).

واتە: خوا راتان دەسپێرێ نێرەوەزی کوڕتان وەکو دوو بەشی مێ یە وەزی کچەکانتان بەشە میراتی هەیە.

(٣ ـ ٤): باوكو باوکی ئەو بۆ سەرەوەتر، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ﴾(النساء: ١١). باپیرەش باوکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (انا ابن عبدالمطلب)[٣]. من کوڕی (عبدالمطلب)م.

(٥ ـ ٦): براو کوڕی ئەو تا دێتە خوار، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ﴾(النساء: ١٧٦). واتە: ئەو میرات دەبات گەر منداڵی نەبوو.

(٧ ـ ٨): مامو کوڕی تا دوور دەکەوێتەوە، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الحقوا الفرائض باهلها، فما بقی فهو لأولی رجل ذکر)[٤].

واتە: میراتەکان بە خاوەنەکانیانەوە بگەێنن، ئەوەی مایەوە ئەوە بۆ یەکەم پیاوی لەپێشترە.

٩: مێرد: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ﴾(النساء: ١٢). ماناکراوە.

---

(١) متفق علیه: (خ ٦٧٦٤/ ١٢/٥٠) م(١٦١٤/١٢٣٣/٣).

(٢) تێبینی: لێرەدا بۆ میرات نەگرتنی کۆییلە هیچ بەڵگەیێ نییە

(٣) متفق علیه: خ(٤٣١٥/٢٧/٨) م(١٧٧٦/١٤٠٠/٣).

(٤) متفق علیه: خ(٦٧٣٢/١١/١٢) م(١٦١٥/١٢٣٣/٣).

(١٠): ئاغای ئازادکەری کۆییلە: لەفەرمودەدا هاتووە: (الولاء لمن اعتق) [1].

واتە: ویلایەتو سەرپەرشتی بۆ کەسێکە کۆییلەی ئازاد کراوە.

## میراتگران لەئافرەتان:

**میرات گران لەئافرەتان حەوت کەسن:**

(١ ـ ٢): کچو کچی کوڕ تا باوکیان دێتە خوارەوە: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ﴾. ماناکراوە.

(٣ ـ ٤): دایكو نەنك ﴿وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ﴾. بۆ باوان هەریەکەیان شەش یەك هەیە.

(٥) خوشك: ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾.

واتە: گەر کەسێ مردو منداڵی نەبوو خوشکی هەبوو ئەوە نیوەی میراتی هەیە.

(٦) ژن: ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ﴾. واتە: بۆ ژنان هەیە چارەکی میراتی ئێوە.

(٧) ژنە ئاغای ئازادکەری کۆییلە (المولاة المعتقة): لەفەرمودەدا هاتووە: (الولاء لمن اعتق).

## ئەوانەی بەشیان میرات هەیە:

ئەوانە سێ گرووپن: خاوەن بەشەکان (ذوا الفرض)و ئەوانەی بەشیان دیاری نەکراوە (عەسەبە = العصبة)و خزمانی لەپێش (ذوي الأرحام).

**ئەو بڕە بەشەی لەقورئاندا دیاری کراون شەش جۆرە:**

(نیوە، چارەكو هەشتیەكو دو سێ یەكو سێ یەكو شەش یەك).

(١) مێرد: گەر ژنەکەی منداڵی نەبن. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ﴾. واتە: نیوەی میراتتان هەیە کە لەژنانتان بەجێ ماوە مادام منداڵی نەبن.

---

(١) متفق عليه: خ(٦٧٣٢/١١/١٢) م(١٦١٥/١٢٣٣/٣).

(٢) کچ: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾. واتە: گەر یەك کچ بوو نیوەی میرات دەبات.

(٣) کچی کوڕ: چونکە بە کۆی زانایان جێگای کچ دەگرێتەوە: (ابن المنذر) دەڵێ: زانایان کۆکن کە کوڕانی کوڕو کچانی کوڕ جێگای کوڕان کچانی دەگرنەوەو نێرینە وەکو نێرەکانن‌و کچانیان وەکو کچانیان وایە، مادام مردوەکە کوڕی پشتێ ی نەبێت[1].

(٤ ـ ٥): خوشکی راستی‌و خوشکی زڕ لەباوکی: ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾. ماناکراوە.

## ٤\١١ چارەك: بەشی دووکەسانە:

(١) مێرد گەر ژنەکەی منداڵی هەبوو: ﴿فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ﴾. واتە: گەر ژنەکان منداڵیان هەبوو میراتی ئەوان چارەکە.

(٢) ژن گەر مێردەکەی منداڵی نەبوو: ﴿ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ﴾. واتە: ژنان چارەکیان هەیە لەمیرات کە جێتان هێشتووە گەر ئێوە نەبوو.

هەشت یەك (٨\١): تەنیا میراتی ژنە، گەر مێرد منداڵی لەدوا بە جێما بێ: ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم﴾. واتە: ئەگەر ئێوە منداڵتان هەبوو ژنانی ئێوە هەشتیەکیان لەو میراتە بەجێماوەتان بەردەکەوێت.

## دوو لەسەر سێ (٣\٢): بەشی چوار کەسانە:

(١ ـ٢): دوو کچ‌و دوو کچی کوڕ: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾. واتە: گەر ژنەکان لەدوو پتر بوون دوو سێیان هەیە لەمیراتەکە.

(٣ ـ ٤): دوو خوشکی راستی‌و دوو خوشکی زڕ لەباوکی: ﴿فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾.

---

(١) الإجماع (٧٩).

**سێ یەك (١\٣) بەشی دوو کەسە:**

(١) دایك: مادام کەسێ نەبێ لێ ی کەم بکاتەوە:خودا دەفەرمووێ ﴿ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ﴾. واتە: گەر مردووەکە منداڵی نەبوو باوانی بەجێ مابوو دایکی سێ یەکی دەگرێت.

(٢): دوو یان پتر لەزۆر براو زۆر خوشك لەدایکی یەوە: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ﴾[1]. واتە: گەر پیاوێ مرد منداڵو باوانی نەبوو خزمانی دووری میراتگری بوون، یان ژنێ بو منداڵو باوانی نەبوو برایان خوشکەکیان هەبوو هەریەکە شەشیەکیان هەیە، گەر لەمە پتر بوون لەسێ یەکدا بەشدارن.

**شەش یەك (١\٦) میراتی حەوت کەسانە:**

(١) دایك لەگەڵ کوڕدا یان برادا: پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ﴾. واتە: بۆ باوانی هەریەکەیان شەش یەك هەیە لەمیرات گەر منداڵی هەبوو، گەر منداڵی نەبوو باوانی میرات گر بوون ئەوە دایکی سێ یەکی هەیە، گەر برای هەبوون دایکی شەش یەکی هەیە.

(٢) نەنك لەکاتی نەبوونی دایکدا: (ابن المنذر) دەڵێ: زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی گەر مردوو دایکی نەبوو نەنکی شەش یەك میرات دەگرێت[2].

(٣) کەسێ لەمنداڵانی دایك نێر بی یان مێ بینە: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ﴾. وەکو ماناکرا.

(٤) کچی کوڕ لەگەڵ کچی راستدا: (هزيل بن شرحبيل) دەڵێ: لە(ابو موسى) لەراست کچو کچی کوڕو خوشك پرسیار کرا، ئەو وتی: کچەکە نیوەی دەگرێو خوشکەکەش نیوەی دەگرێت،

---

(١) تیبینی: وشەی (الكلالة) لاي (ابن عباس) وەکو لە(الدر المنثور)و (مفردات الراغب) دا هاتووە: (هو اسم لمن عدا الولد).

(٢) الإجماع (٨٤).

بچۆ لای (ابن مسعود) ئەویش قسەی من دەکات. پرسیاری لە(ابن مسعود) کردو قسەی (ابی موسی)ی بۆ گەڕایەوە، فەرموی: گەر بە قسەی ئەو بکەم کەواتە گومڕامو ڕێگای راستم نەپێکاوە، من وەکو پێغەمبەر (ﷺ) بڕیارەکە دەدەم، کچەکە نیوەی دەگرێو کچی کچ شەش یەك دەگرێو، تەواو کەری دوو لەسەر سێ ٣/٢، ئەوەی مایەوە بۆ خوشکە. ئەنجا گەڕاینەوە لای (ابو موسی)و قسەی (ابن مسعود)مان بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: (تا ئەو زانایە (الحبر) لەناوتاندا بێ پرسیار لەمن مەکەن) [1].

(٥) خوشکی باوکیو خوشکی خۆی (الشقيقة): بۆ تەواو کردنی دو سێ یەك وەکو قیاسێ لەسەر کچی کوڕ لەگەڵ کچی پشتدا.

(٦) باوك لەگەڵ کوڕدا: خودا دەفرموێ ﴿وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ﴾. واتە: باوان هەر یەکەیان شەش یەکی هەیە لەمیرات گەر مندالّی هەبوو.

(٧) باپیرە لەکاتی نەبوونی باوکدا: (ابن المنذر) دەڵێ: بەکۆی دەنگی زانایان باپیرە لەجێگای باوکە [2].

## خزمی پشت (العصبة) [3]:

پێناسەیان: (العصبة) کۆی (العاصب)ە وەکو (الطالب ـ طلبة) کە کوڕانی پیاوەکەو خزمانی پشتی باوکی ئەون.

مەبەستیان لێرەدا ئەوانەن کە دوای ئەوەی خاوەن بەشەکان میرات دەگرن ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ ئەوانە، گەر هیچ نەمایەوە هیچ ناگرن مەگەر پشتەکە کوڕ بێ، ئەوە لەهیچ باراندا بێبەش ناکرێت.

دیسان پشت (العصبە) ئەوانەن کە خاوەن بەشەکان (اصحاب الفروض) نەبوون، ئەوان

---

(١) (صحيح الارواء ١٦٨٣) (خ ٢/١٧/٦٧٣٦). تێبینی: بێگومان ئەسحاب هەیە لەئەویتر زاناتربووە، زاناترینیان عەلی (رضي الله عنه) بووە، ئەنجا (ابن عباس) کە قوتابی ئەو بووە، دوایی (ابن مسعود). لەمیراتدا لەدوای عەلیو ئیبن عەبباسو ئیبن مەسعود (زيد بن ثابت) لەهەموان زاناتربووە.

(٢) الإجماع/٨٤).

(٣) فقه السنة(٣/٤٣٧).

شایانن بۆ تەواوی میراتەکە: (ابـن عبـاس) گێڕاویـەوە: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: (الحقـوا الفرائض باهلها، فما بقي فهو لأولى رجـل ذكـر). واتـە: بەشـەکان بـە خاوەنـەکانیان بگـەێنن، ئەوەی مایەوە ئەوە بۆ یەکەم پیاوی نێرینەیە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ﴾. واتە: ئەو مـیرات دەگـرێ گـەر منداڵی نەبوو. گەر برا بەتەنیابوو میرات دەبات، پـشتەکانی تـریش (العـصبات) بـۆ سـەر ئـەم قیاس دەکرێو پێك دەگیرێن.

## بەشەکانی:

پشتەکان (العصبە) دو بەشن: پشتی نەژادی (عصبة نسبية)و پشتی هۆکاری (عصبة سببية).

پشتی هۆکاری ئەوەیە هۆکارەکەی ئـازادکردن بـێ، وەکـو پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: (الولاء لمن اعتق). یان (الولاء لحمة كلحمة النـسب). وەکو باسکرا. ئاغای ئازادکەر کاتێ مـیرات دەگرێ گەر عەسەبەکانی نەسەب لەئارادا نەبوون. جیاوازی نییە ئاغاکە نێرینە بێ یان مێ بینە.

(عبدالله بن شداد) کە کچی حەمزە (ﷺ) گێڕاویەوە:

(ئاغاکەم مرد کە ژن بوو کچەکی لەدوای خـۆی بـەجێ هێـشت، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دارایی یەکەی لەنێوان منو ئەودا دابەش کرد نیوەی بۆ منو نیوەی بۆ ئەو دانا) [1].

## بەڵام میراتگرانی پشت سێ بەشن:

(١): میراتگرانی پشتی بە خۆیان (عصبة بنفسة): کە میراتگرانن لەپیاوان مێردو منداڵانی دایکی لێ دەرچێت.

(٢): میرات گرانی پشتێ بە کەسانی تر (عـصبة بغـيرة): کـچانو کـچانی کـوڕو خوشـکی راستی (الشقيقة)و زڕ خوشکانن لەباوك، هەر یەکە لەوانە لەبرایاندا بەهۆی ئەوان دەبنـە پـشتو نیوە دەگرن. وەکو دەفرمووێ ﴿وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾.

(٣): میراتگرانی پشتێ لەگەڵ کەسانی تردا (عـصبة مع غيرة): خوشکانن لەگـەڵ کـچاندا، وەکو لەگێڕانەوەی (ابن مسعود) دا هاتووە: (وما بقي فللأخت). وەکو باسکرا.

---

(١) حسن (ص.جه ٢٢١٠) جه (٢/٩١٣/٢٧٣٤).

# قەدەغەکردن و بێ بەش کردن (الحجب والحرمان)

**پێناسەیان:** (الحجب) واتە: (المنع) واتە: قەدەغەکردنی کەسێکی دیاری کراو لەهەمو میرات یان بەشێکی میرات لەبەر هەبوونی کەسێکی تر.

(الحرمان) واتە: بێ بەش کردنی کەسێکی دیاری کراو لەمیراتی خۆی بەهۆی ڕێگرێکی میرات وەکو کوشتن و هی تر.

## بەشەکانی قەدەغەکردن:

(١) قەدەغەکردنی تەواو.

(٢) قەدەغەکردنی ناتەواو (لێ کەم کردنەوە).

قەدەغەکردنی ناتەواو (حجب النقصان): کەم کردنەوەی بەشە میراتی میراتگرێکە لەبەر هەبونی کەسێکی ترو ئەمەش بۆ پێنج کەسانە:

(١): مێرد لەنیوەوە بۆ چارەکێ لەکاتی بوونی منداڵدا.

(٢): ژن لەچارەکێکەوە بۆ هەشت یەکی لێ کەم دەکرێتەوە لەکاتی بوونی منداڵدا.

(٣): دایك لەکاتی هەبونی منداڵداو لقی میراتگراندا لەسێ یەکەوە لێ ی کەم دەکرێتەوە شەش یەك.

(٤): کچی کوڕ.

(٥): خوشکی لەباوکی (زڕ خوشك).

بەڵام قەدەغەکردنی تەواوو بێ بەش کردن قەدەغەکردنە لەهەمو میرات لەکاتی بوونی کەسی تردا، وەکو بێ بەش بونی برا لەکاتی بوونی کوڕدا، ئەو جۆرانە لەگەڵ بوونی ئەم شەش کەسانەدا میرات ناگرن، هەر چەندە دەشێ بە کەمکردنەوە قەدەغەبکرێن کە ئەوانەن:

(١ ـ ٢): باوان (دایكو باوك).

(٣ ـ ٤): کوڕو کچ.

(٥ ـ ٦): ژنو مێرد هاوسەران. جگە لەمانە میرات گرانی تر دوچاری قەدەغەو بێ بەش بوون دەبن.

**بێ بەش بوونی تەواو (حجب الحرمان) لەسەر دو پایە دادەمەزرێت:**

(١) هەر کەسێ بە هۆی کەسێکی ترەوە بگاتەوە پشتی مردوو لەگەڵ بوونی ئەو کەسەدا میرات ناگرێ، وەکو کوڕی کوڕ لەگەڵ بوونی کوڕدا ناگرێت.

جگە لەمنداڵانی دایك نەبێ لەگەڵ بوونی کوڕی دا دەگرن، کەچی بەهۆی ئەو بە مردوو دەگەن.

(٢) پشتی نزیك پێش پشتی دوور دەخرێت، کوڕ کوڕی برا بێ بەش دەکات، گەر لەپلەدا وەکو یەك بوون ئەوە لەهێزی نزیکی لەپێشتر دادەنرێ وەکو برای راستی (الشقیق) برای باوکی (زڕ برا) بێ بەش دەکات.

❊ ❊ ❊

# باسی سزایەکان (كتاب الحدود)

(**الحدود**): کۆی (الحد) واتە: بەربەستێ لەنێوان دوو شتدا. لەزماندا واتە: نەهێشتن (المنع) [١].

لەزاراوەدا واتە: (ئەو سزایانەی لەشەریعەتدا دیاری کراون بۆ تاوانەکان تا ئەو تاوانانە روو نەدەن) [٢].

## ئەو تاوانانەی سزای (الحدود) یان دەکەوێتە سەر کە لەقورئان و سوننەتدا هاتووە:

(زینا، بوختان (القذف)، دزی، مەستیو سەرخۆشی، چەتەییو رێگری (المحاربة)و هەڵگەڕانەوە (الردة)و ستەمکاری (البغي) [٣].

گەورەیی پیادەکردنی: ئەبو هورەیرە گێڕاویەوە:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (حد يُعَمل به في الأرض، خير لأهل الأرض ان يمطروا اربعين صباحا) [٤]. واتە: یەك حەد کە لەزەوی دا کاری پێ بکرێ، باشترە بۆ خەڵکی زەوی لەچل رۆژ کە خوا بارانیان بەسەردا ببارێنێت.

## پێویستی پیادەکردنی بەسەر نزیكو دوورو کەسی چاكو خراپداو کەسی بەدەسەڵاتو بێ دەسەڵاتدا:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بۆ کەسانی نزیكو دوور (حەد) پیادە بکەن، با سەرزنشتی لۆمەتکار نەتان گرێت) [٥].

عائیشە گێڕاویەوە: (ئوسامە لەراست ژنێکدا قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کرد،

(١) فقه السنة(٢/٣٢).

(٢) منار السبيل(٢/٣٦٠).

(٣) فقه السنة: (٢/٣٠٢).

(٤) حسن (ص.جه ٢٠٥٧) جه (٢/٨٤٨/٢٥٣٨).

(٥) حسن (ص. جه ٢٠٥٨) جه (٢/٨٤٩/٢٥٤٠).

ئەویش فەرموی: (خەڵکی بەر لەئێوە بەوە لەناو چوون حەدیان لەکەسانی بێ دەسەڵات پیادە دەکرد، بەڵام کەسانی بە دەسەڵاتو ناودار لێ دەگەڕان، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر فاتیمە ئەو کارەبکات دەستی دەبڕم) [١].

## ناپەسەندی تکاکاریو پاڕانەوە لەحەددێکدا گەر بەرەو فەرمانڕەوا بەرز کرایەوە:

(عائیشە) گێڕاویەوە: (قوڕەیشی یەکان ئەو ژنە مەخزومی یەی دزی کرد زۆریان خەم بوو. وتیان: کێ لەراست ئەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) قسە دەکات؟ کێ ئەو بوێریە دەکات ئوسامە نەبێ کە پێغەمبەر (ﷺ) خۆشی ویستووە؟[٢] ئەویش قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کرد، ئەویش فەرموی: ئایا لەحەددێ لەحەددەکانی خوا تکاکاری دەکەیت؟ پاشان هەڵساو وتارەکی داو فەرموی: (ئەی خەڵکینە، خەڵکی پێش ئێوە بەوە لەناوچو، کاتێ کەسێ دزی دەکردو دەسەڵات دارو ناودار بو لێ ی دەگەڕان، گەر کەسێکی بێ دەسەڵات بایە حەدیان لەسەر پیادە دەکرد، سوێند بەخودا گەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات دەستی دەبڕم) [٣].

## سوننەتە مرۆڤی بڕوادار برای بڕواداری خۆی داپۆشێو نهێنی ئاشکرا نەکات:

ئەبوهورەیرە گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ نهێنی موسڵمانێ هەڵنەماڵێ خوا لەدنیاو قیامەتدانهێنی هەڵناماڵێت) [٤].

دیسان پێویستە بەندە گوناهی خۆی بشارێتەوەو جاڕی نەدات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەمو ئوممەتی من چاوپۆشی لێ دەکرێ، تەنیا ئەوانە نەبێ تاوان ئاشکرا دەکەن، یەکێ لەو گوناهە ئاشکرایانە ئەوەیە کە پیاو بەشەو کارێ دەکات، پاشان بەیانی دادێو خوا بۆی شاردۆتەوە، ئەنجا دەڵێ: ئەی فیسار کەس دوێنێ فلان کارەم کردووە، پەروەردگارەکەی

---

(١) خ (١٢/٨٦/٦٨٨٧).

(٢) تێبینی: ئەو کاتە، ئوسامە منداڵ دەبێ، لەماڵی پێغەمبەر دا (ﷺ) گەورە دەبێو کوڕی زەیدی شەهیدە، خزمەتکاری پێغەمبەری خودا ﷺ. وەرگێڕ.

(٣) متفق علیه: خ(١٢/٨٧/٦٧٨٨) م(٣/١٣١٥/١٦٨٨).

(٤) صحیح (مختصر م ١٨٨٨) م(٤/٢٠٧٤/٢٦٩٩).

داپۆشیوە، بەڵام ئەو پەردە خوایی یەی لەسەر خۆی هەڵدەماڵێ) [١].

## تۆڵەکان ( الحدود ) ڕەش کەرەوەی گوناهەکانن ( کەفارەتن ):

(عبادة بن صامت (ﷺ)) دەڵێ: لەتەك پێغەمبەردا(ﷺ) بووین لەدانیشتنێ دا، فەرمووی: بەیعەتم بدەنێ هاوبەش بەهیچ شێوەیێ بۆ خوا پەیدا نەکەن، دزی نەکەن، زینا نەکەنو هەمو ئەو ئایەتەی خوێندەوە: (فمن وفى منكم فأجره على الله، ومن اصاب من ذلك شيئا فعوقب به فهو كفارته، ومن اصاب من ذلك شيئا فستره الله عليه فهو الى الله، ان شاء غفر له، وان شاء عقبه)[٢]. واتە: کێ ئەم پەیمانو بەیعەتەی هێنا دی پاداشتی لەلایەن خواوەیە، کێ هەر کارەکی کرد لەوانە ئەوە سزای لەسەر دەدرێو دەبێ بە کەفارەتی، کێ هەر کامێ لەو گوناهانەی کردو شاردییەوە ئەوە بۆ خوای لێ گەڕێ، گەر ویستی لێ ی دەبووورێو گەر ویستی سزای دەدات).

## کێ بە سزای ( الحد ) هەڵدەستێت؟[٣]

دادوەر(الإمام) نەبێ یان جێگرەکەی کەس بە سزای ئەمە هەڵناستێ ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لەژیانی خۆیدا بە سزاکانی (الحد) هەڵساوە، ئەنجا خەلیفەکانی دوای ئەو، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی کەسی تری بە وەکیل داناوە کە بەم حەد لێ دەکردنە هەڵسێو فەرمویەتی: (واغد يا انيس الى امرأة هذا، فإن اعترفت فارجمها). واتە: سبەی بچۆ لای ئەو ژنە گەر دانی پیانا ڕەجمی بکە.

ئاغای کۆیلە بۆی هەیە حەد لەکۆییلەو کەنیزەکانی دەربکات، لەفەرمودەدا هاتووە: (کاتێ کەنیزەیەك زینای کرد با حەددی لێ دەربکاتو تانەو تەشەری لەسەر نییە، پاشان گەر زینای کردەوە با حەددی لێ دەربکاتو تانەو تەشەری لەسەر نییە، گەر جاری سێ یەم زینای کردەوە با بیفرۆشێ گەر بە گوریسێك بێت) [٤].

---

(١) متفق عليه: خ(٦٠٦٩/٤٨٦/١٠) م(٢٩٩٠/٢٢٩١/٤).

(٢) متفق عليه: خ(١٨/٦٤/١) م(١٧٠٩/١٣٣٣/٣).

(٣) منار السبيل/٣٦١/٢.

(٤) متفق عليه: (خ ٦٨٣٩/١٦٥/١٢) م(١٧٠٣/١٣٢٨/٣).

# (زينا ـ الزنا)

زينا حەرامەو گەورەترين تاوانە: خوای گەورە فەرموويەتی: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً﴾[1]. واتە: توخنی زيناو داوێن پيسی مەکەون، ئەوە گوناهەکی گەورەيەو رێگايەکی خراپە.

(ابن مسعود) دەڵێ: (لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسی: کام گوناهە لەتەواوی گوناهەکان گەورەترە؟ فەرمووی: هاوبەشی پەيداکردن بۆ خودا، فەرمووی: کە هاوتا بۆ خودا پەيدابکەی ئەو دروستکەری تۆيە. وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: گەر منداڵەکەت بکوژی لەترسی ئەوەی خواردنت لەگەڵدا بخوات. وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: گەر زينا لەگەڵ ژنی دراوسێ يەکەت بکەيت)[2].

خوای گەورە فەرموويەتی: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا*يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا*إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[3]. واتە: ئەوانەی لەگەڵ خوادا خوای تر بانگێشە ناکەنو ئەو نەفسە ناکوژن کە خوا حەرامی کردووە بە حەق نەبێو زينا ناکەن، کێ ئەوە بکات توشی سزا دەبێت. لەقيامەتيشدا سزای چەند قاتی ئەوە دەبێ بە ريسوايی لەناوی دا نەمر دەبێ، مەگەر کەسێ تۆبە بکاتو بڕوا بێنێو کاری چاك بکات، ئەوە خوا خراپەکانيان بۆ دەگۆڕێ بە چاکەکان.

لەگێڕانەوەی (سمرە بن جندب)دا لەخەونە درێژەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی: (ئەنجا رۆيشتين، گەيشتينە سەر شتەکی وەکو تەنوور، وتی: وابزانم فەرمووی: غەڵبەو هەرای تێدا دەهات، فەرمووی: لێمان روانی، ژنو پياوی بە رووتی لەناودا بوون، ئەوانە لەژێرەوە بڵێسەيان بۆ دەهاتو هاواريان کرد؟ فەرمووی: بەم دوانەم وت: ئەمانە کێن؟

(١) الإسراء: ٣٢.

(٢) متفق عليه: خ(٦٨١١/١١٤/١٢) م(٨٦/٩٠/١).

(٣) الفرقان: ٦٨ ـ ٧٠.

وتیان: ئەم ژنو پیاوەی لەو تەنوورەدا بون زیناکارانی ژنو پیاو بوون لەئوممەتی تۆ) [١].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بەندەی زیناکار کاتێ زینا دەکات بڕوادار نییە، لەکاتێ دا دزی دەکات بڕوادار نییە، لەکاتێ دا ماددەی سەرخۆشکەر دەخواتەوە بڕوادار نییە، کاتێ مرۆڤێ دەکوژێ بڕوادار نییە).

(عکرمە) وتی: بە (ابن عباس)م وت: چۆن بڕوای لێ دادەڕنەرێ؟ قامکەکانی تێکەڵکێش کردو لێکی دەرهێنانو وتی: ئاوەها، گەر تۆبەی کرد ئاوەها دەگەڕێتەوەو قامکەکانی تێك وەرهێنانەوە) [٢].

## بەشەکانی زیناکاران:

زیناکار یان رەبەنە بە هاوسەری هەیە، گەر کەسێك ئازاد بێو هاوسەری هەبێتو زینا بکات، سزایەکەی بەردبارانە تا مردن: (جابر بن عبدالله الأنصاري) گێڕاویەوە: (پیاوێ موسڵمان بووەو دێتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دەگێڕێتەوە ئەو زینای کردووە، ئەنجا چوار شاهێدی لەسەر خۆی دا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دا رەجم بکرێ، ئەنجا کرا، ئەو ژنی هێنا بوو) [٣].

(ابن عباس) گێڕاویەوە: رۆژێکیان عومەر کوڕی خەتتاب وتاری بۆ خەڵکی داو وتی: (خوا موحەممەدی بە حەق نارد، قورئانی ناردە سەروو، یەکێ لەوانە ئایەتی رەجم بوو، ئێمە خوێندمانەوەو تێ ی گەیشتین، پێغەمبەر (ﷺ) رەجمی کردو ئێمەش دوای ئەو رەجممان کرد، من لەوە دەترسم رۆژگارەکی درێژ دوای ئێمە خەڵکی بڵێن: بەخوا ئێمە ئایەتی رەجممان لەکتێبی خوادا نەبینیوە، بە وازهێنان لەفەرزێیەك گومڕا بن، رەجم لەکتێبی خوادا حەقە لەسەر ئەو زیناکارانەی بە هاوسەر بون لەپیاوانو ژنان، گەر شاهید هەبوو یان دووگیانی یان دان پێدانان) [٤].

---

(١) صحيح (ص.ج ٣٤٦٢) خ(١٢/٤٣٨/٧٠٤٧).

(٢) صحيح (ص.د ٣٧٢٥) د(١٢/١١٢/٤٠٧).

(٣) صحيح (. د ٣٧٣٥) ت (٢/٤٤١/١٤٥٤)، (١٢/١١٢/٤٤٠٧)

(٤) متفق عليه: (خ ١٢/١٤٤/٦٨٣٠) م(٣/١٣١٧/١٦٩١).

**حەددی کۆیلەو کەنیزە:**

گەر کۆیلەیێ یان کەنیزەیەك زینای کرد رەجمی لەسەر نییە، بەڵکو (٥٠) داری لێ دەدرێت، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ (١). واتە: گەر هاوسەر داربوونو زینایان کرد نیوەی سزای هاوسەردارانیان لەسەرە.

(عبدالله بن عياش المخزومی) گێڕاویەوە: (عومەری کوڕی خەتتاب لەناو گەنجانەکی قورەیشدا فەرمانی پێ دام، چەند کەنیزەکی ناو ئیمارەمان پەنجا پەنجا لەزینادا دارمان لێ دان)(٢).

**ئەو کەسەی ناچار دەکرێ بۆ زینا حەددی لەسەر نییە:**

(ابی عبدالرحمن السلمی) گێڕاویەوە: (ژنەکیان هێنایە لای عومەری کوڕی خەتتاب کە تینووەتی زۆر ماندوی دەکاتو بە لای شوانێ دا رەت دەبێو داوای ئاو دەکات، ئەویش یاخی دەبێ بە بێ زینا ئاوی پێ بدات، ئەویش دەیکات، بۆیە راوێژی بە خەڵکی کرد لەراست ئەوەدا، پێشەوا عەلی فەرمووی: ئەم ژنە ناچار بووە من پێم وایە دەبێ لێی بگەڕێن، ئەویش وای کرد)(٣).

**حەددی کچ (کەنیشك ـ البکر) و کوڕی زیناکار:**

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾(٤).

واتە: ئافرەتی زیناکارو پیاوی زیناکار هەر یەکەیان سەد داریان لێ بدەن، لەئایینی خوادا بەزەیی نەتانگرێ پێیاندا، گەر باوەڕتان بە خواو رۆژی دوایی هەیە، با کۆمەڵێ لەبڕواداران

---

(١) النساء: ٢٥.

(٢) حسن (الارواء ٢٣٤٥) هق(٨/٢٤٢، ٨/٢٣٦).

(٣) صحيح (الارواء/٢٣١٣) خ(١٢/١٥٦/٦٨٣١).

(٤) النور: ٩.

سزاکەیان ببینن.

(زید بن خالد الجهني) گێڕاویەوە: (لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست، فەرمانی دەکرد ئەو کەسەی زینای کردووە نەچۆتە ناو بازنەی هاوسەرییەوە، سەد داری لێ بدرێو بۆ ماوەی ساڵێ شار بەدەر بکرێت) (١).

(عبادە بن الصامت) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لەمن وەربگرن، لەمن وەربگرن، خوا رێگای بۆ دانان، کچو کوڕ سەد دارو ساڵێ دوور خستنەوە، ژنو پیاوی هاوسەردار سەددارو رەجم)(٢).

## بەچی داری حەد دەچەسپێت؟

**بەدوو شت داری حەد دەچەسپێت: (دان پێداهێنان، یان شاهیدەکان) (٣).**

دان پێداهێنان وەکو پێغەمبەر (ﷺ) (ماعیز)و (غامدییە)ی بەهۆی دان پێداهێنانی خۆیان رەجمی کردن: (ابن عباس) گێڕاویەوە: (کاتێ ماعز بن مالیك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لعلك قبلت او غمزت او نظرت)؟ لەوانەیە ماچت کردبێ یان چاوت لێ نوقاندبێ، یان سەیرت کردبێت؟ وتی: نەئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). وتی: ئایا چوکت ون کرد؟ کینایەی بە کار نەهێنا، ئەو کاتە فەرمانی دا بە رەجم کردنی(٤)). موسلیم گێڕاویەوە.

(سلیمان بن بریدة) لەباوکی گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنەکی هاتە لا لە(غامد) لە(الازد)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پاکژم بکەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (هاوار بۆ تۆ بگەڕێوە داوای لێ بوردن لەخواو تۆبە بکە). وتی: من وادەبینم تۆ من دەگێڕیەوە وەکو چۆن (ماعز بن مالك)ت گێڕایەوە. فەرموی: ئەوە چییە؟ وتی. ئەم ژنە دوو گیانی یە لەزینا.

---

(١) صحيح (الارواء ٢٣٤٧) خ(١٢/١٥٦/٦٨٣١).

(٢) صحيح مختصر م(١٠٣٦) (م ٣/١٣١٦/١٦٩٠).

(٣) فقه السنة (٣/٣٥٢).

(٤) تێبینی: (١) هەندێ زانا پێیان وایە (آية الرجم) خوێندنەوەی نەسخ بۆتەوەو حوکمی ماوە وەکو باسمان کرد. (٢) هەندێ پێیان وایە داری حەد بۆ هاوسەردارو بێ هاوسەرانەو رەجم تەنیا بۆ تەمبێ کردنە.

فەرمووی: تۆ؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: (تا ئەو کاتەی منداڵت پەیدا دەبێت). وتی: پیاوەکی (انصار)ی گرتیە خۆی تا منداڵی پەیدا بوو. ئەنجا هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ژنە غامدیەکە منداڵی پەیدا بوو. فەرمووی: گەر وابێ رەجمی ناکەین منداڵە ساواکەی کەس نییە شیری پێ بدات. پیاوەکی (انصار)ی هەڵساو وتی: شیردانەکەی لەسەر من ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ). وتی: ئەنجا رەجمی کرد). ئەم فەرمودەیەش موسلیم گێڕاویەوە[1]. بەڵام گەر کەسەکە لەدان پێدانانی خۆی پەشیمان بۆوە وازی لێ دەهێنرێت، (نعیم بن هزال) گێڕاویەوە: (ماعز بن مالك) هەتیو بوو لەماڵی باوکم دابوو، لەگەڵ کەنیزەکی گەڕەکەدا زینای کرد... تا فەرمودەکە دەگاتە ئەوە فەرمانی پێ کرد رەجمی بکاتو ئەویش برایە (حرە)، کاتێ رەجم کراو بەردی بەرکەوتنو ترساو خۆی نەگرتو بەتوندی رایکرد، (عبداللە بن انیس) توشی هاتو یارانی پێ ی نەوەستانو ئەویش سمە وشترەکی تاودایەو تێ ی گرتو کوشتی، دوای ئەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و ئەوەی گێڕایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) بەسەر کۆنەوە فەرمووی: بۆ وازتان لێ نەدەهێنا لەوانە بوو تۆبەی کردبایەو خوا لێ ی خۆش بوایە)[2].

## حوکمی ئەو کەسەی بڵێ: ئەو لەگەڵ فلان کەسەدا زینای کردووە:

گەر خۆی دانی نا بە تاوانی خۆیدا زینای لەگەڵ فلان کردووە ئافرەت بێ یان پیاو حەدیان لێ دەردەکرێت، گەر نا نەء: (دوو پیاو هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) سکالایان لای کرد، یەکێکیان وتی: بە کتێبی خوا حوکمو دادگاییمان بکە، ئەوەی تر کە فەقیهتر بو وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا بە کتێبی خوا دادگاییمان بکە، رێگام پێ بدە قسە بکەم. فەرمووی بدوێ. وتی: ئەم کوڕەی من لای ئەمە کرێکار بووە، زینای لەگەڵ ژنی ئەودا کردووە، هەواڵ پێداوم کە رەجم لەسەر کوڕی من هەیە، من (١٠٠) مەڕو کەنیزەیەکم کردۆتە فیدیە بیکڕمەوە، پاشان لەهەندێ فەقیهەکانم پرسیوە وتویانە: کوڕی من سەد داری لەسەرەو لەگەڵ دورخستنەوەی دا بۆ ساڵێ. هەر ژنی ئەوە رەجمی لەسەرە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەوەی گیانی منی

---

(١) صحيح (مختصر م ١٠٣٩) م(١٦٩٥/١٣٢١/٣).

(٢) صحيح (ص.د ٣٧١٦) د(٤٣٩٦/٩٩/١٢).

بەدەستە بە کتێبی خودا دادگاییتان دەکەم، هەرچی مەڕو کەنیزەیە بۆ خۆت دەگەڕێتەوە، ئەنجا سەد داری لەکوڕەکەی داو بە (انیس الأسلمي) فەرمووی: ئەو ژنە بێنە گەر دانی پێداهێنا رەجمی بکە، ژنەکە دانی پیادا ناو ئەویش بەرد بارانی کرد) [١].

**سەلماندن و چەسپاندنی زینا لەرێگای شاهیدەکان:**

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[٢].

واتە: (ئەوانەی بوختان بە داوێن پاکان دەکەن و پاشان چوار شاهید ناهێنن، هەشتا داریان لێ بدەن و قەت شاهیدیان وەرناگیرێ و ئەوانە فاسقن).

گەر چوار کەس لەموسڵمانانی دادگەرو ئازاد هاتن شاهیدیان دا، کە ئەوان فلان کەسیان بینیوە، چوکی خستۆتە زێ ی فلان ژنە وەکو کل چوێوك لەکلداندانداو ستڵە لەبیردا، ژن و پیاوەکە رەجم دەکرێن.

گەر سێ کەس شاهیدی داو چوارەم کەس نەبوو ئەو کاتە حەددی بوختانیان لێ دەدرێت وەکو لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە: (قسامة بن زهير) گێڕاویەوە لەراست (ابي بكرة)و (مغيرة بن شعبة) کە تاوانباری دەکات بە زیناکارو بە چاوی خۆی بینیویەتی، عومەر داوای شاهیدی لە(ابی بکرە) کرد، ئەنجا بانگی شاهیدەکانی کرد، (ابي بكرة)و (شبل معبد)و (ابو عبدالله نافع) شاهیدیان دا کە (مغيرة) زینای کردووە، کاتێ ئەم سێ کەسانە لەم سەحابیانە شاهیدیان دا عومەر وتی: بارودۆخی ئەو بەلای عومەردا ئەستەمە، کاتێ زیاد گەڕایەوە وتی: تۆ (انشاءالله) شاهیدی بە حەق دەدەیت. (زیاد) وتی: من شاهیدی لەسەر زینا نادەم، بەڵام کارەکی ناشیرینم بینی. عومەر وتی: (الله اکبر) حەدی بوختان لەم سێ هاوەڵە بدەن. (ابو بکرە) دوای حەددی بوختان وتی: شاهیدی دەدەم ئەو زینای کرد. عومەر ویستی دووبارە داری لێ بداتەوە، بەڵام عەلی (کرم الله وجهه) نەیهێشت و رایگەیاند: گەر ئەو دار لێ بدەیەوە دەبێ هاوڕێکەشت رەجم

---

(١) متفق علية: خ(٢٧، ١٢/١٣٦/٦٨٢٨) م(٣/١٣٢٤/١٦٩٨/٩٧).

(٢) النور: ٤.

بکەیت، ئەنجا عومەر لیٚ ی گەڕاو داری لیٚ نەدا) [١].

حوکمی ئەو کەسەی لەگەڵ ئەو کەسانەدا زینادابکە پیٚ ی ناشیٚن (مەحرەمن):

هەر کەسیٚ زینا بکات لەگەڵ کەسانیٚ پیٚ ی ناشیٚن، حەددەکەی کوشتنە هاوسەر داربیٚ یان بیٚ هاوسەر، گەر مارەی بکات دەکوژریٚو ماڵەکەی دەبردریٚت:

(البراء) گیٚڕاویەوە: (توشی مامم هاتم ئاڵایەکی پیٚ بوو، وتم: بۆ کویٚ دەچی؟ وتی: پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) ناردومی بۆ لای پیاویٚ، زڕ دایکی دوای مردنی باوکی مارە کردۆتەوە، تا بیکوژمو ماڵی ببەم) [٢].

## حوکمی ئەوانەی دەچنە زگ ئاژەڵان:

لە(ابن عباس) گەڕاوەتەوە: (من وقع علی البهیمة فاقتلوه واقتلوا البهیمة) [٣]. واتە: کیٚ چووە لای ئاژەڵ ببۆ کاری نارەوا یکوژنو ئاژەڵەکەش بکوژن.

## حەددی نیٚربازی (اللواط):

هەر کەسیٚ سەری چوکی بخاتە کۆمی پیاویٚکەوە سزاکەی کوشتنە، هاوسەردار یان بیٚ هاوسەر بن(غیر محصنین): (ابن عباس) گیٚڕاویەوە: (ﷺ) فەرمویەتی: (من وجدتموه یعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به) [٤].

واتە: گەر کەسیٚکتان بینی نیٚر بازی کرد، بکەرو کار لەگەڵ کراوەکە بکوژن.

---

(١) اسناده صحیح (الارواء ٨/٢٩) هق (٨/٣٣٤). تیٚبینی: (ابن خلکان) بە دریٚژی لە(وفیات الأعیان) ئەم بەسەرهاتەی گیٚڕاوەتەوە. (وەرگیٚر).

(٢) صحیح (الارواء/٢٣٥١) (ص.جه ٢١١١) جه (٢/٨٦٩/٢٦٠٧).

(٣) حسن صحیح (ص.ت ١١٧٦) ت(٣/٨/١٤٧٩).

(٤) صحیح (ص.جه ٢٠٧٥) ت(٣/٨/١٤٨١).

# سزا ( حەد )ی بوختان ( حد القذف )

**( القذف ):** واتە: بوختان پێ کردن بە زینا، کە بڵێ ی: ئەی زیناکارو وشەی تر کە مانای ئەوە دەبەخشن ئەو زینای کردووە.

**حوکمەکەی:** لەگوناهە گەورەکانەو حەرامە: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(١).

واتە: ئەوانەی بوختان بە ژنی داوێن پاکی بێ ئاگاو بڕوادار دەکەن زینای کردووە، لەدنیاو دوا رۆژدا نەفرین لێ کراوەنو سزایەکی گەورەیان هەیە. (ابو هريرة) گێڕاویەوە (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: خۆتان لەحەوت شت بپارێزن کە لەناوبەرن: (هاوبەشی بۆ خوا، جادوو، کوشتنی بە ناحەق کە خوا حەرامی کردووە، خواردنی سوو، ماڵی هەتیو، راکردن لەجەنگدا، بوختانی زینا بەو ژنە بڕوادارانەی بێ ئاگان) (٢).

هەر کەسێ بوختان بە موسڵمانێ بکات هەشتا داری لێ دەدرێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾. ماناکراوە.

---

(١) النور: ٢٣.

(٢) متفق عليه،

# نەفرین لێك كردن (اللعان)

گەر پیاو دەستی تۆمەتی زینای دایە پاڵ ژنەكەیو ژنەكەش بەدرۆی خستەوە، ئەو كات حەددی دەكەوێتە سەر، مەگەر شاهیدی هەبێ یان نەفرین لێكتر بكەن: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاء إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ*وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ *ويدرؤا عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ *وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾[1].

واتە: ئەو مێردانەی زینا دەدەنە پاڵ ژنەكانیانو شاهیدیان نییە لەخۆیان زیاتر، شاهیدی هەریەكەیان چوار شاهیدییە بەخوا كە ئەو راست دەكات. پێنج جار (دەڵێ) گەر ئەو درۆ بكات نەفرینی خوای لەسەر بێت. (ژنەكە) سزای لێ لادەدرێ گەر شاهیدی دا بە خوا ئەو درۆ دەكات. پێنجەم جار (بڵێ) خەشمو رقی خوای لێ بێ گەر مێردەكەی راست بكات.

(ابن عباس) گێڕاویەوە: (هلال بن امیە) ژنەكەی بە زینا تاوانبار كرد لەگەڵ (شریك بن سمحاء)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (البینة او حد في ظهرك) دەبێ شاهید بێنی یان دار لەپشتت دەدرێت. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەر یەكێ لەئێمە ژنی خۆی بینی پیاوەكی لەسەرەو دەڕوا بەڵگەی دەوێت؟ ئەنجا دووبارە فەرموی: دەبێ شاهید بێنێ یان دارت لەپشت دەدرێ. (هلال) وتی: سوێند بەوەی تۆی رەوانە كردووە من راست دەكەمو خواش ئایەت دەنێری كە حەد لەسەر پشتم لا ببات. ئەنجا جبریل (علیە السلام) دابەزیو ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ﴾ی دابەزاند تا ﴿إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾. پێغەمبەر (ﷺ) بە دوای دا نارد، هیلال هاتو شاهیدی دا. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: خوا دەزانێ یەكێ لەئێوە درۆ دەكات، كەستان نییە تۆبەی بكات؟ پاشان ژنەكە هەڵساو شاهیدی دا، بۆ پێنجەمیان وەستاو وتمان: حەددی كەوتە

(١) النور: (٦- ٩)

سەر. (ابن عباس) دەڵێ: زمانی گرتو لکەی کردو کشایەوە تاوامان زانی دەگەڕێتەوە. پاشان وتی: هەمو ڕۆژێ ئابڕوی خەڵکی خۆم نابەم. ڕۆیشت. ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: چاوەڕێ بکەن (فإذا جاءت به اکحل العينين، سابغ الألیتين خدج الساقين، فهو لشريك بن سمحاء). واتە: گەر هاتوو منداڵەکەی پەیدای بوو، چاوی ڕەش بوو گەورە بوو سمتی خڕو پڕ بوو دەستو قاچی قەڵەو بوو سفت بوون ، ئەوە لە(شريك بن سمحا)ە. چۆنی فەرمووو ئاوا هاتە دی. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (گەر حوکمی کتێبی خوای بە سەردا تێ نەپەڕیبایە، مـن هەڵومەرجەکی ترم لەگەڵ ئەم ژنە دا دەبوو)[1].

## ئەو حوکمانەی بەسەر ئەو ژن و مێردە نەفرین لێك کەرەدا دێ:

گەر ژنو مێرد نەفرینیان لەیەکتری کرد، بەم نەفرینە ئەم یاساو حوکمانە دادەمەزرێن:

(١): لێك جیابوونەوە تەلاق: (ابن عمر) دەڵێ: (پێغەمبـەر (ﷺ) لـەنێوان ژنو مێردەکـی ئەنصاری دا مولاعەنەی کردو لێکی جیا کردنەوە)[2].

(٢): ئەم جیابونەوە تا سەرەو کۆتایی یە، (سهل بن سعد) دەڵێ: (سوننەت وا هـاتووە کـە ئەو دوو نەفرین لێك کەرە لێکتر جیا دەبنەوەو جارەکی تر نابنەوە بە هاوسەری یەکتری)[3].

(٣): مولاعەنە مارەیی شایانە؟ لەبەر گێڕانەوەی (سعيد بن جبير) وتـی: بـە (ابـن عمـر)م وت: پیاوێ ژنی خۆی بە زیناکار تاوانبار کردووە؟ وتی: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ژنو مێردەکـی (بەنی عەجلان)ی لەیەکتری جیاکردنەوەو فەرموی: (خوا ئاگادارە یەکێ لەئێوە ڕاست ناکات، کێ لەم دوانەتان تۆبەی دەکات؟ هەردوو یاخی بوون. فەرموی: (خوا ئاگـادارە یـەکێ لـەئێوە ڕاسـت ناکات، کێ لەو دوانەتان تۆبەی دەکات؟) یاخی بوون. ئەنجا سێ بـارە فـەرموی: (خـوا ئاگـادارە یەکێ لەئێوە ڕاست ناکات، کێ لەم دوانەتان تۆبەی دەکات؟ هـەر یـاخی بـوون. (ایـوب) وتـی: (عمرو بن دينار) پێ ی وتم: (لەفەرمودەکەدا شتێ هەیە وابزانم باسـی ناکـەیت. وتـی: پیاوەکـە

---

(١) صحيح (الارواء ٢٠٩٨) خ(٨/٤٤٩/٤٧٤٧).

(٢) متفق علية: خ(٩/٤٥٨/٥٣١٤) م(١٤٩٤ ـ ٢/١١٣٣/٩).

(٣) صحيح (الارواء ٢١٠) (٦/٣٣٧/٢٢٣٣) هق (٧/٤١٠)

وتی: ئەی دارایی‌و ماڵەکەم؟ وتی: وتراوە ماڵت بۆ نییە، ئەگەر تۆ راست بکەی تۆ چویە لای ئەو ژنە، گەر تۆ راست نەکەی ئەوە زۆر لەتۆ دوورترە) [١].

(٤): پەیوەست کردنی منداڵ بە مولاعەنەوە، (ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوان پیاوو ژنێکدا مولاعەنەی کرد کە منداڵەکەی بە هی خۆی نەزانی، پێغەمبەر (ﷺ) لێکی جیاکردنەوەو منداڵەکەی دایە دایکی)[٢].

(٥): دامەزراندنی میرات لەنێوانو مولاعەنەو منداڵی دا: (سهل بن سعد) گێڕاویەوە: (سوننەت وا بوو گەر ژن‌و مێردی مولاعەنە لێك جیا دەکرانەوەو دوو گیان دەبوو، منداڵەکە بۆ دایکەکەی بەجێ دەهێڵرا، پاشان سوننەت لەراست میراتی دا بەم رەنگە رۆیشت کە منداڵەکە میرات لەدایکی دەگری‌و دایکیشی لەمنداڵەکە دەگرێت) [٣].

❊ ❊ ❊

---

(١) متفق عليه: (٩/٤٥٦/٥٣١١) م(٢/١١٣٠/١٤٩٣)ز

(٢) متفق عليه: خ(٩/٤٦٠/٥٣١٥) م(٣/١١٣٢/١٤٩٤).

(٣) متفق عليه: (خ ٩/٤٥٢/٥٣٠٩) م(٢/١١٢٩/١٤٩٢).

## سزا( حد )ی مەستو سەرخۆشان ( حد السكر )

**حەرامی شەڕاب ( مەی ـ بادە ):**

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ*إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾[١].

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، بێگومان شەڕابو قومارو ئەنصابو ئەزلام پیسن کاری شەیتانن خۆیان لێ دووربگرن تاوەکو سەرکەوتوو بن. بێگومان شەیتان دەیەوێ دوژمنایەتیو رق بخاتە ناوتان بەهۆی شەڕابو قومارو لە یادی خوداو نوێژ بتانگێڕێتەوە، ئایا ئێوە (دوای ئەوە) وازیان لێ دێنن).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (زیناکار کاتێ زینا دەکات بڕوادار نییە، کاتێ شەڕاب دەخواتەوە بڕوادار نییە)[٢]. هەروەها دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ): (شەڕاب سەرچاوەی پیسی یەکانە، کێ بیخواتەوە چل رۆژ نوێژی قبولْ نابێ، گەر مردوو شەرابی لەسکدا بوو بە مردنەکی نەزانیی دەمرێت)[٣].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (شەڕاب سەرچاوەی خراپە زلەکانەو گەورەترین گوناهە، کێ بیخواتەوە دەچێتە زگ دایکیو پووری (خوشکی دایکیو باوکی)[٤].

وە پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): (شەڕاب خۆر وەکو بت پەرستێکە)[٥].

(ابی درداء) لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (ئەو کەسەی مودمینی شەڕابە ناڕواتە

---

(١) المائدة: ٩١ ـ ٩١.

(٢) صحيح (ص.ج ٧٧٠٧).

(٣) حسن (ص.ج ٣٣٤٤).

(٤) حسن (ص.ج ٣٣٤٥). طب(١١٣٧٢/١٦٤/١١).

(٥) حسن (ص. جه ٢٧٢٠) (جه ٣٣٧٥/١١٢٠/٢).

بەهەشتەوە) [(١)]. (ابن عمر) گێڕاویەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (شەڕاب لەدە رووەوە نەفرینی لێ کراوە: عەینی شەڕاب خۆیو گوشەرەکەیو ئەوەی بۆی دەگوشرێو فرۆشیاریو کڕیاریو هەڵگریو ئەو کەسەی بۆی هەڵدەگیرێو ئەوەی پارەکەی دەخواتو ئەوەی دەیخواتەوەو شەڕاب گێڕەکەی) [(٢)].

## شەڕاب چی یە؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كل مسكر خمر وكل خمر حرام) [(٣)]. واتە: هەموو سەرخۆش کەرێ شەڕابەو هەموو شەڕابی حەرامە.

عائیشە گێڕاویەوە: (لەراست شەڕابی هەنگوین (البتع) لەپێغەمبەر (ﷺ) پرسیارکرا کە خەڵکی یەمەن دەیانخواردەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (هەر شەڕابێ سەر خۆش بکات حەرامە) [(٤)].ڕۆژێکیان عومەر هەڵسایە سەر مینبەر وتی: (لەپاشاندا شەڕاب حەرام کرا کە لەپێنج شت دروست دەبێ:

ترێ، خورما، هەنگوین، گەنم، جۆ) (الخمر) ئەوەیە هزر دادەپۆشێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (شەڕاب لەگەنمە، شەڕاب لەجۆیە، شەڕاب لەمێوژە، شەڕاب لەخورماو قەسپە، شەڕاب لەهەنگوینە) [(٥)].

## جیاوازی نێوان زۆرو کەمی شەڕابو کەهول نییە:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كل مسكر حرام وما اسكر كثيره فقليله حرام) [(٦)]. واتە: هەمو سەرخۆشکەرو مەست کەرێ حەرامە، ئەوەی ڕێژەی زۆری سەر خۆشت بکات، ڕێژەیەکی

(١) صحيح (ص.جه ٢٧٢١) جه (٢/١١٢١/٣٣٧٦).
(٢) صحيح (ص.جه ٢٧٢٥) جه(٢/١١٢١/٣٣٨٠).
(٣) صحيح (م ٢٠٠٣/٧٥/١٥٨٨/٣).
(٤) متفق عليه: خ(١٠/٤١/٥٥٨٦) م(٢٠٠١/١٥٨٥/٣).
(٥) صحيح (ص.جه ٢٧٢٤) جه (٢/١١٢١/٣٣٧٩).
(٦) صحيح (ص.جه ٢٧٣٦) جه(٢/١١٢٤/٣٣٩٢).

کەمیشی حەرامە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە، هەر شتێ دۆڵکەیێ سەر خۆشت بکات، مشتەکیش لەوە هەر حەرامە) [1].

## سزا (حد)ی شەڕاب خۆر:

گەر کەی باڵغو پێ گەیشتوو کە ئەرکی خوای کەوتۆتە سەرو بە ئازادی خۆی شەڕاب بخواتەوە (چل داری) لێ دەدرێ، گەر بە پێویست زانرا دادوەری شەرعی دەیکاتە (هەشتا دار). (حصین بن منذر) گێڕاویەوە: (پێشەوا عەلی (س) چل داری لە(ولید بن عقبە)دا کە شەڕابی خواردبۆوە، پاشان فەرموی: پێغەمبەر (ﷺ) چل دارو ئەبوبەکر چل داری لەشەڕاب خۆر داوە، عومەر (٨٠) داری لێ داوە، هەمووی سوننەتە، بەڵام ئەمەم پێ باشترەو بە دڵمە) [2].

گەر هەر دووبارەی کردەوەو داری حەدی لێ درا، دادوەر دەتوانێ بڕیاری مردنی بۆ دەربکات: (ابو هریرە) گێڕاویەوە: پێغەمبەر ((ﷺ) فەرمویەتی: (گەر کەسێ سەرخۆش بوو داری لێ بدەن، گەر دووبارەی کردەوە داری لێ بدەن، گەر سێ بارەی کردەوە داری لێ بدەن، لەچوارەم جار فەرموی: (گەر گەڕایەوە بیکوژن) [3].

بەچی داری حەد دەچەسپێت؟

بە دوو هۆکار دەچەسپێت:

(١) پێ لێنانو دان پیاهێنان (الاقرار).

(٢) شاهیدیو گەواهی کەسی دادوەر.

## دوعا لەشەڕاب خۆر دروست نییە:

(عمر بن الخطاب) گێڕاویەوە: (پیاوێ لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دا ناوی (عبدالله) بوو

---

(١) صحيح (ص.ج ٤٥٥٢) ت(٣/١٩٤/١٩٢٨).

(٢) صحيح (مختصر م ١٠٤٧) م(٣/١٣٣٣/١٧٠٧).

(٣) حسن صحيح (ص.جه/ ٢٠٨٥) جه (٢/٨٥٩/٢٥٧٢).

نازناوی (حمار) بوو، پێغەمبەری (ﷺ) دەهێنایە پێکەنین، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشەرابدا دارکاری کرد، رۆژێکیان هێنرا فەرمانی دا دارکاری کرا، پیاوێ لەو خەڵکە وتی: (خوایە نەفرینی لێ بکەیت، چەندە زۆر دەهێنرێت! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (لا تلعنوه فوالله ما علمت انه يحب الله ورسوله)[1]. واتە: نەفرینی لێ مەکەن بە خوا زانیومە کە ئەو خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت.

(ابی هريره) گێڕاویەوە: (سەرخۆشەکیان هێنا خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا دارکاری بکرێ، هەبوو بە دەستی لێ ی دەدا، هەبوو بە نەعلی لێ ی دەدا، هەبوو بە پۆشاکەکەی لێ ی دەدا، کاتێ رۆیشت پیاوێ وتی: ئەوە چییەتی خوا سەر شۆڕی بکات! پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (یارمەتی دەری شەیتان مەبن بەسەر براکەتاندا)[2].

❊ ❊ ❊

(١) صحيح (المشكاة: ٢٦٢١) خ(١٢/٧٥/٦٧٨٠).

(٢) صحيح (ص.ج ٧٤٤٢) خ(١٢/٧٥/٦٧٨١).

# سزای دزی ( حد السرقة )

یەکێ لەو پێویستییانەی ئیسلام هێناویەتی پاراستنی دارایی‌و ئابوری یە لەگەندەڵی، ئیسلام فەرمانی کردووە بە حەڵاڵی بە دەست بێنرێ (بنەما لەشتەکاندا رێگا پێ درانە)و حەرامی کردووە دارایی لەرێگای حەرامەوە بەدەست بێنرێ‌و لایەنەکانی بەدەست هێنانی حەرامی راڤە کردووە ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾[1]. یەکێ لەو کارو کاسبییە حەرامانە کە ماڵ‌و دارایی لەرێگاوە بەدەست دەهێنرێت دزی یە: (بردنی ماڵ‌و دارایی خەڵکە بە دزی‌و پەنهانی یەوە)[2].

دزی گوناهەکی گەورەیەو سزاکەی بە قورئان‌و سوننەت‌و کۆی ئوممەت دامەزراوە: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[3]. واتە: پیاوو ژنی دز دەستەکانیان ببڕن وەکو سزایەك بۆ ئەو کارەی کردویانەو سزایەك لەلایەن خوداوە، خوا سەربڵندو کارزانە.

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) دەستی دزەکی بڕی لەمەتاڵێکدا (الترس) کە نرخەکەی سێ درهەم بوو)[4].

(ابن منذر) دەڵێ : (زانایان کۆکن لەسەر ئەمە گەر دوو شاهیدی دادگەر شاهیدییان لەسەر دزێ دا، دەستی دەبڕدرێت)[5].

کاتێ کەسێکی باڵغی ئازاد دزی کرد سزای لەسەر دادەمەزرێ، مادام خۆی دانی پیا نابێ یان دوو شاهیدی دادوەر هەبێت. مەرجە ماڵە دزراوەکە بگاتە رادەی خۆی‌و ئازاد بێت.

---

(١) الأنعام: ١١٩.

(٢) المغني (٨/٢٤٠).

(٣) المائدة: ٣٨.

(٤) متفق عليه: (خ ١٢/٩٦/٦٧٨٩) (م ١٦٨٦ /٣/١٣١٣).

(٥) الإجماع (١٤٠/٦٢١).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (گەر لەچارەکە دیناریٚ یان بەسەرەوە بێ کەمتر بیٚ دەستی دز نابڕدریٚت) [(١)].

(ابن منذر) دەڵیٚ: (زانایان کۆکن کە واجبە ئەو شتەی دەدزریٚ لەشوێنەکدا بیٚ پاریٚزرا بیٚت) [(٢)]. پاراستن (الحرز) ئەو شتەیە مالّی لەناودا هەڵدەگیریٚو دەپاریٚزریٚ وەکو خانوبەرەو گەنجینەو شوێنەکی داخراوو شتی تر. خاوەنی (الروضة الندية) (٢/٢٧٧) وتویەتی: (تاقەت کردن یان پاراستن (الحرز) ئەوەیە کە خەڵکی بە هەڵگرتنو تاقەت کردنی دابنێن بۆ ئەو ماڵە، کادین (المتبن) بۆ پاراستنی کایەو تەویلە شوێنی ئاژەلاّنە، هۆلّ شوێنی مەڕو بزنەو جەوالّو راوەكو خورجێن (الجرين) بۆ بەروبومەکانە).

(عبدالله بن عمرو بن العاص) لەپێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: لەراست خورمای بەدارەوە پرسیاری لیٚ کرا؟ فەرموی: هەر کەسیٚ لەبەر پێویستیو نەداری لیٚ ی بکاتەوەو مەبەستی خۆی بەدی بێنیٚو هیچی لیٚ نەخاتە ناو قولێنچکەکی پۆشاکیەوە هیچی لەسەر نییە، هەر کەسیٚ شتیٚ لەمە ببات پیٚ ژماردنی ئەوەندەی لەگەلّ سزاداندا، هەر کەسیٚ شتیٚ لەمە ببات و بدزیٚ دوای ئەوەی لەجەوالّو عەمباردا هەڵگیراوەو تاقەت کراوەو گەیشتە نرخی مەتالیٚ (قەڵغانیٚ) ئەوە دەست بڕینی دەکەوێتە سەر) [(٣)].

ئەو کەسەی دزی لیٚ کراوە بەر لەبەرزکردنەوەی سکالاّ بۆ لای دادوەر دەتوانیٚ لەدزەکە خۆش ببێت: (صفوان بن اميه) گێڕاویەوە: من لەمزگەوت دا لەسەر پۆشاکەکی خۆم خەوتبوم نرخی سی دەرهەم بوو، پیاویٚ هات لەمنی دزی، پیاوەکە گیراو برایە لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پیٚ درا دەستی ببڕدریٚ. وتی: فەرمووی: ئەی بۆ بەر لەوەی بیهێننە لای من (واتە: لیٚ ی نەدەبوورا) [(٤)].

بۆ سوود لیٚ وەرگرتن: خاوەنی (الروضة الندية/٢/٢٧٩) وتویەتی: زانایان لەسەر ئەوە یەك

---

(١) متفق عليه: خ(١٢/٩٦/٦٧٨٩) م(١٦٨٤ ـ٢/١٣١٢/٣).

(٢) الإجماع (١٣٩/٦١٥).

(٣) حسن (ص.د ٣٦٨٩) د(١٢/٥٦/٤٣٦٨.

(٤) صحيح (ص.د ٣٦٩٥) (د ٦٢/٤٣٧١و ١٢/٦٣).

دەنگن، گەر دز یەکەم جار دزی کرد دەستی راستی دەبڕدرێ، جاری دووەم گەر دزی کرد قاچی چەپی دەبڕدرێ، بەڵام بۆ سێ یەم جار ناکۆکی هەیە، زۆربەیان بۆ ئەوە دەچن دەستی چەپی دەبڕدرێت. مامۆستامان لە(التعليقات الرضية)دا (٢/٢٩٨) دادەڵێ: لای (البيهقی/٨/٢٨٤) راستەکە ئەبوبەکرو عومەر ئەمەیان کردووە. پاشان گەر دزی کرد قاچی راستی دەبڕدرێت، دوایی گەر دزی کردەوە تەمبێ دەکرێ‌و زیندانی دەکرێ).

❊ ❊ ❊

# چەتەیی (ڕێگری ـ الحرابة)

## پێناسەکردنی[1]:

چەتەیی‌و ڕێگری دەرچوونی گرووپەکی موسڵمانانە لەژێر دەسەڵاتی ئیسلام‌و موسڵماناندا بۆ نانەوەی ئاژاوەو بێ سەرەو بەری‌و خوێن ڕێژی‌و دەست بەسەر داگرتنی دارایی‌و شکاندنی ناموس‌و لەناوبردنی کشتوکاڵ‌و وەچە، بەمەش ململانێی ئاین‌و ڕەوشت‌و یاساو ڕێسا دەکات.

## حوکمەکەی:

چەتەیی لەگوناهە گەورەکان حیساب دەکرێ بۆیە سزاکەشی توندترین سزایە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾[2]. واتە: سزای ئەو کەسانەی جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دا دەکەن‌و خراپکاری لەزەوی دا دەکەن ئەوەیە کە دەکوژرێن یان لەخاچ دەدرێن، یان دەست‌و قاچیان دەبڕدرێ لەئەو لاو ئەو لاوە، یان شاربەدەر دەکرێن‌و لەوڵات دوور دەخرێنەوە، ئەمە سەر شۆڕییە بۆ ئەوان، لەژیانی دنیاداو لەپەسلاندا سزایەکی گەورەیان هەیە.

(انس) گێڕاویەوە: (کەسانێ لەعوکەل هێنرانە لای پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمان بوون‌و لەمەدینەدا تووشی داهێزران بوون بەهۆی برسێتی زۆرەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا وشتری زەکاتیان بۆ ببەن‌و میزو شیریان بخۆنەوە، ئەنجا وایان کردو کاتێ هۆشیان هاتە بەر هەڵگەڕانەوە حوشترەوانەکانیان کوشت‌و وشترەکانیان دا پێش خۆیان، پێغەمبەر (ﷺ) بە شوێنی دا ناردن، دەست‌و قاچی بڕین‌و چاوی کوێر کردن‌و لێیان نەگەڕان تا مردن)[3].

---

(١) فقه السنة (٣/٣٩٣). تێبینی: چەتەیی دەریایی بێ، یان چەتەیی وشکانی‌و شاخی.

(٢) المائدة: ٣٣.

(٣) متفق عليه.

تۆبەی ڕێگران بەر لەدەست ڕۆیشتن بەسەریاندا: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1]. واتە: تەنیا ئەوانە نەبێ بەر لەگرتنیان تۆبەیان کردووە، بزانە خوا لێ بوردەو بە بەزەیی یە.

* * *

(١) المائدة: ٣٤. تێبینی: هەیە پێ ی وایە (او) بۆ هەڵبژاردنە پێچەوانەی شافیعی، واتە: دادگا سەرپشکە لەهەڵبژاردنی هەریەکێ لەو سزایە توندانە وەکو لە(فقه السنة السید سابق) دا باسکراوە.

# باسی تاوانەکان (كتاب الجنايات)

**کورتکراوەی (فقه السنه) و (منار السبيل)ە.**

## پێناسەی (تاوانەکان = الجنايات)

(الجنايات) کۆی (الجناية)ەو چاوگی (جنى الذنب) واتە: رایدەکێشێ بەرەو تاوان. هەرچەندە چاوگ (مصدر)ەو کۆدەکرێتەوە، چونکە جۆری زۆرە، زۆر جار بۆ نەفسەو یان بۆ بەشەکانیەتی، تاوانی بە ئەنقەستو تاوانی بەخۆ هەیە) [1]. (لەشەریعەتدا دەست درێژی یە بۆ سەر جەستە کـە کوشتنەوەو بژاردنی ماڵ واجب دەکات) [2].

## بە گەورە دانانی قەدەغەکراوەکانی موسڵمانان:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا * وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللّهِ يَسِيرًا﴾[3].

واتە: خۆتان مەکوژن خوا لەگەڵتاندا بە بەزەیی یە، کێ وابکات بە دەست درێـژیو ستەم داهاتوو دەیخەینە ئاگرەوەو ئەوە لای خوا ئاسانە.

فەرمویەتی: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾[4]. واتە: هەر کەسێ بڕواداری بە ئەنقەست بکـوژێ سـزای ئـەو دۆزەخـە نەمرە لەناوی داو خوا خەشمی لێ گرتووەو نەفرینی لێ گرتووەو سزایەکی بـە چـێژی بـۆ ئامـادە کردووە.

فەرمویەتی: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ

---

(١) سبل السلام/٢٣١/٣).

(٢) منار السبيل (٢/٣١٥). .

(٣) النساء: ٢٩ ـ ٣٠.

(٤) النساء: ٩٣.

فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَاء تْهُمْ رُسُلُنَا بِالبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَلِكَ فِي الأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ﴾[١].

واتە: لەبەر ئەوە لەسەر جولەکە نووسیومانە هەر کەسێك مرۆڤێك بکوژێ بێ ئەوەی کەسێکی بە ناحەق کوشتبێ یان خراپکاری لەزەوی دا کردبێ (وەکو رێگری) وەکو ئەوە وایە هەمو خەڵکی کوشتبێ، هەر کەسێ نەفەرێ زیندوو بکاتەوە (لەمردن رزگاری بکات) وەکو ئەوە وایە هەموو خەڵکی زیندوو کردبێتەوە (رزگاری کردبێت). ئەبوهورەیرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (خۆتان لەحەوت شتی بە فەتاەرت بەر (الموبقات) بپارێزن، نەفەرێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە چین؟ فەرموی: هاوبەشی بۆ خودا، جادوو، کوشتنی کەسێ کە خوا حەرامی کردووە بە حەق نەبێ، خواردنی ماڵی هەتیو، خواردنی سوو، راکردن لەرۆژی جەنگدا، بوختان بە ژنانی داوێن پاکی بڕوادار) [٢].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لەناو چونی دنیا لای خوا کەمترە لەکوشتنی پیاوێکی بڕوادار) [٣]. هەروەها فەرمویەتی: (گەر دانیشتوانی ئاسمانو زەوی بەشداری بکەن لەکوشتنی کەسێکی بڕواداردا هەمویان دەخاتە ئاگرەوە) [٤]. وە فەرمویەتی (ﷺ): (یەکەم دادگایی کە لەنێوان خەڵکی دەکرێ لەخوێن دایە) [٥].

پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): پیاو دێ دەستی پیاوی گرتووە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەمە منی کوشتووە، خوا دەفەرمێ: بۆچی کوشتووتە؟ دەڵێ: بۆیە کوشتوومە تا سەربڵندی بۆ تۆ بێ، دەفەرمێ: ئەمەیان بۆ من. پیاو هەیە دەستی پیاوی گرتووەو دەڵێ: ئەمە منی کوشتووە، خوای گەورە دەفەرمێ: بۆچی کوشتووتە؟ دەڵێ: تا سەربڵندی بۆ فلان کەسە بێ! ئەنجا دەفەرموێ: ئەمە بۆ فیسار نییە، بە هۆی تاوانی، سزای خۆی وەردەگرێت) [٦].

---

(١) المائدة: ٣٢.
(٢) متفق عليه: خ(٥/٣٩٣/٢٧٦٦) م(١/٩٢/٨٩).
(٣) صحيح (ص.ج ٥٠٧٧) ت(٢/٤٢٦/١٤١٤).
(٤) صحيح (ص.ج ٥٢٤٧) ت(٢/٤٢٧/١٤١٩).
(٥) متفق عليه: (خ ١٢/١٨٧/٨٦٦٤) م(٣/١٣٠٤/١٦٧٤).
(٦) صحيح (ص. نس ٣٧٣٢) نس(٧/٨٤).

## حەرامە کەسێ خۆی بکوژێت:

ئەبو هورەیرە گێڕاویەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەسێ خۆی لەچیایەك هەڵداتە خوارەوەو خۆی کوشت، ئەوە لەدۆزەخدایەو لێژ دەکرێتەوە ناویو تا سەر لەناوی دا نەمر دەبێت. کێ ژەهرێ بخوات‌و خۆی بکوژێ ئەوە ژەهرەکەی بە دەستەوەیە لەدۆزەخدا تا بە هەتایە دەیخواتەوەو نەمر دەبێت. کێ خۆی بە ئاسنێ بکوژێ ئاسنەکەی بە دەستەوەیە لەناو دۆزەخدا لەسکی خۆی دەدات لەوێ دا بە هەمیشەیی‌و نەمری دەمێنێتەوە) [1].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کان فیمن قبلکم رجل به جرح فأخذ سکینا فحز به یده فما رقأ الدم حتی مات، قال الله تعالی: ﴿بادرني عبدي بنفسه حرمت علیه الجنة﴾ [2]. واتە: بەر لەئێوە پیاوێ بریندار بوو ئارامی لێ هەڵگرا، چەقۆیەکی هەڵگرت دەستی خۆی بڕی خوێنی نەگیرسایەوە تا مرد، خوای گەورە فەرموی: ﴿بەندەی من بەخودی خۆی پەلەی کرد بۆ لای من‌و منیش بەهەشتم لێ حەرام کرد).

(جابر) گێڕاویەوە: (طفیل بن عمرو الدوسي) هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پشتیوانت دەوێ بەرگریت لێ بکات (وتی: پشتیوانی بۆ دوس بووە لەجاهلی دا)، پێغەمبەر (ﷺ) قبولّی نەکرد چونکە خوا ئەو ڕێزەی بۆ ئەنصار هەڵبژاردبوو، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە (طفیل بن عمرو) کۆچی کرد بۆ لای ئەو، پیاوێ لەهۆزی خۆی لەگەڵ کەوت‌و نەچوونە ناو مەدینەوە نەخۆش کەوت‌و ئارامی نەگرت تیرەکی هێنا جومگەی قامکی بریندار کرد تا خوێنی بەربوو، دەستی نەزیف بوو تا مرد، (طفیل بن عمرو) لەخەونی دا بینی ڕووەکی خۆشی هەیەو دەستی داپۆشراوە، وتی: پەروەردگارت چی لەراست کردیت؟ وتی: بە هۆی کۆچ کردنم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) لێم خۆش بوو. وتی: ئەی بۆچی دەستت پێچراوە؟ وتی: پێم وتراوە ئەوەی خۆت بریندارت کردووە بۆت چاك ناکەینەوە. ئەم بەسەرهاتەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە، ئەویش فەرموی: (اللهم ولیدیه فاغفر) [3]. واتە: خوایە لەدەستەکانی خۆش ببیت.

---

(١) متفق علیه: (خ ١٠/٢٤٧/٥٧٧٨) م(١/١٠٣/١٠٩).

(٢) متفق علیه (خ ٦/٤٩٦/٣٤٦٣) م(١/١٠٧/١١٣).

(٣) صحیح (مختصر م ٩٧) م(١/١٠٨/١١٦).

## کوشتن لەچ کاتێ دا ڕێگای پێ دراوە:

خودای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا دەفرمووێ ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ﴾[1]. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (فەرمانم پێ کراوە بە جەنگ کردن لەگەڵ خەڵکی دا تا شاهیدی دەدەن خوا یەکەو هیچ خوای تر جگە لەو نییەو موحەممەدیش پێغەمبەری خوایەو نوێژ بکەنو زەکات بدەن، گەر وایان کرد خوێنو ماڵیان لەمن حەرامە بە حەقی خۆی نەبێو حیسابیان لەسەر خوایە)[2].

دیسان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم خوێنەی حەقە برێژرێ ڕوونی کردۆتەوە: (لا يحل دم امريء مسلم يشهد ان لا اله الا الله واني رسول الله الا باحدى ثلاث: النفس بالنفس والثيب الزاني، والمفارق لدينه التارك للجماعة)[3]. واتە: حەلاڵ نییە خوێنی هەر موسڵمانێ شاهیدی بدات بە (لا اله الا الله ـ محمد رسول الله) بەم سێ حالەتە نەبێت:کەسێ کەسێ بکوژێتو کەسێ هاوسەری هەبێ زینا بکاتو ئەو کەسەی واز لەدینی خۆی دێنێو لەکۆمەڵگای موسڵمان جیا دەبێتەوە.

## جۆرەکانی کوشتن:

**کوشتن سێ جۆری هەیە: (ئەنقەست ـ العمد)و (نیمچە ئەنقەست ـ شبە عمد)و بە هەڵە (الخطأ).**

**بە ئەنقەست:** ئەوەیە بە دڵ کەسێ بکوژی کە خوێنی ڕەوا نییە بە شتێ، کە چاك دەزانێ دەیکوژێت.

**نیمچە ئەنقەست:** وەکو لێدان لەکەسێ بە شتێ کە بە زۆری کوشندە نییەو دەمرێت.

**بە هەڵە:** ئەوەیە تۆ کارێ دەکەی حەلاڵە بۆت ئەنجامی بدەیت، بۆ نمونە وەکو تفەنگو تیرهاوێشتن لەنێچیرێ لەراودا مرۆڤێ دەهەنگێوێتو دەکوژرێت.

---

(1) الإسراء: ٣٣.

(2) متفق عليه (خ ١/٧٥/٢٥) م(١/٥٣/٢٢).

(3) متفق عليه خ(١٢/٢٠١/٦٨٧٨) م(٣/١٣٠٢/١٦٧٦). تێبینی: لێرەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (امرت ان اقاتل الناس...) مەبەستی لەجەنگی بەرگرییە وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ﴾(البقرە: ١٩٠)

**تۆڵەو سزاکانی کوشتن:**

**لەکوشتنی نیمچە ئەنقەستو بە هەڵەدا دوو سزا هەیە:**

**کەفارەت لەسەر بکوژو خوێن دان لەسەر خزمانی (العاقلة).**

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَئًا وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَن يَصَّدَّقُواْ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مْؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةً فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ اللّهِ وَكَانَ اللّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾[١].

واتە: بڕوادار بۆی نییە بڕواداری بکوژێ بە هەڵە نەبێ، هەر کەسێ بڕواداری بە هەڵە بکوژێ دەبێ کۆیلەیێ ئازاد بکاتو دەبێ خوێن بداتە خزمانی کوژراوەکە، مەگەر چاوی لێ بپۆشن، گەر لەکەسێکی دوژمن بوو بڕوادار بوو، دەبێ کۆیلەیێ ئازاد بکات، گەر لەگەڵ گەلێ دا پەیمانتان هەبوو لەنێواندا دەبێ خوێن بدەن بە خانەوادەکەیو کۆیلەیەکی بڕوادار ئازاد بکەن، گەر دەست نەکەوت دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژوو بن وەکو تۆبەیەك لەخودا، خوا زاناو کارزانە).

بەڵام کوشتنی بە ئەنقەست سەرپەرشتیار (الولي) ئازادە لەنێوان کوشتنەوەو چاوپۆشی کردن بە خوێنو پێ بژاردن (الدیە)، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[٢].

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە تۆڵەتان لەسەر فەرز کراوە لەکوشتندا ئازاد بە ئازاد کۆییلە بە کۆییلە، مێ بە مێ، هەرکەسێ لەشتێ لەمە لە براکەی خۆی خۆش ببێ، با بە چاکە پەیڕەوی لێ بکاتو بە چاکە تۆڵەکەی تەسلیم بکات. ئەمەش بارسووك کردنە لەلایەن پەروەردگارتانەوەو بەزەیی یەکە، کێ دوای ئەوە دەست درێژی بکات ئەوە سزایەکی توندی هەیە.

---

(١) النساء: ٩٢.

(٢) البقرة: ١٧٨.

(ابو هريره) دەڵێ: (من قُتل له قتيل فهو بخير النظيرين: اما ان يؤدي واما ان يقاد) [(١)].
واتە: کەسێ نەفەرەکی لێ بکوژرێ سەر پشکە لەم دووشتە کە هاوتای یەکترن: یان تۆڵەی دەدرێتی یان دەکوژرێتەوە).

ئەم خوێنە بە کوشتن واجب نابێ، بەڵکو لەجیاتی (القصاص)ە، بۆیە دەتوانن لەسەر غەیری قیصاصیش پێك بێنو ئاشتەوایی بکەن، گەر بە زیادەوەش بێت، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ بڕواداری بە ئەنقەست بکوژێ دەدرێتەوە دەست خزمانی کوژراوەکە، گەر بیانەوێ دەیکوژنەوە، گەر بیانەوێ تۆڵەی لێ وەردەگرن کە بریتی یە لە: سێ وشتری چوار ساڵی (الحقة)و سی (جذعة)و چل (خلفة). ئەوەی لەسەری ڕێك کەوتن ئەوە بۆ ئەوانە، ئەمەش لەبەر سزای تۆڵە) [(٢)]. بەڵام لێ بوردن باشترە وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَأَن تَعْفُواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ [(٣)]. وە لەبەر فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ): (وما زاد الله بعفو الا عزا) [(٤)]. واتە: خوا بە لێ بوردن بەندە هەر گەورەتر دەکات.

## مەرجەکانی واجببوونی (القصاص) تۆڵە:

**تۆڵە بەم مەرجانە دادەمەزرێت:**

(١) تەکلیفی بکوژ: تەکلیفو بەرپرسیاری لەسەر منداڵو شێتو نوستوو نییە: (رفع القلم عن ثلاث: عن الصبي حتى يحتلم، وعن المجنون حتى يفيق، وعن النائم حتى يستيقظ). وەکو ڕابردوو مانا کراوە.

(٢) نابێ ئەم هۆکارانە هەبن کە خوێنی کوژراو بە فیڕۆ دەدەن:

(لا يحل دم امريء مسلم الا بأحدى ثلاث...) وەکو باسکرا.

---

(١) متفق عليه: خ(٦٨٨٠/١٢/٢٠٥) م(١٣٥٥/٩٨٨/٢).

(٢) حسن (ص.ت ١١٢١) ت(١٤٠٦/٤٢٣/٢). تێبینی: لە(النهاية ابن الأثير) دا هاتووە (الجذعة) لەوشتردا پێنج ساڵەیە، مانگاو بزن دوو ساڵەیە. یان وتراوە لەمانگا سێ ساڵەیەو لەمەڕ یەك ساڵەیە. (خلفة) وشتر مێ یە.

(٣) البقرة: ٢٣٧.

(٤) (ص.ت ١٨٩٤) ت(٢٠٩٨/٢٥٤/٣) م(٢٥٨٨/٢٠٠١/٣).

(٣) نابێ کوژراو کوڕی بکوژ بێت، لەفەرمودەدا هاتووە: (لا يقتل الوالد بولده) . واتە: باوك بە کوشتنی منداڵی خۆی ناکوژرێتەوە.

(٤) نابێ کوژراوەکە کافر بێو بکوژەکە موسڵمان بێت (لا يقتل المسلم بكافر) [١].

(٥) نابێ کوژراوەکە کۆیلە بێو بکوژەکە ئازاد بێ، وەکو (حسن) دەڵێ: (لا يقتل العبد بحر) [٢].

## کۆمەڵێ بەیەك کەس دەکوژرێنەوە:

گەر گرۆپێ کۆببنەوە بۆ کوشتنی کەسێ، هەموویان دەکوژرێنەوە، (مالك) لە(سعيد بن المسيب) گێڕاویەوە: (عومەری کوڕی یان خەتتاب پێنج یا حەوت کەسی لەسەر کوشتنی یەك کەس کوشتنەوە، کە بە دزییەوە کەسێکیان کوشتبوو، وتی: گەر خەڵکی یەمەن دەستیان تیا هەبوایە هەموویانم دەکوشتنەوە) [٣].

## سەلماندنی قیصاص یان تۆڵە:

(١) دان پیا هێنان: (انس) گێڕاویەوە: جولەکەیێ سەری کەنیزەیەکی لەنێوان دوو بەردا هاڕی بوو، نەفەرێ پێی وت: کێ ئاوای بەسەر هێنایت؟ فلانو فیسار ئاوای لێ کردیت؟ تا ناوی جولەکەکەی بردو بەسەر ئاماژەی بۆی کرد، جولەکەکە هێنراو دانی پیادانا، ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا سەری بە بەرد شکێنرایەوە) [٤].

---

(١) صحيح (صحيح الارواء ٢٢١٤) ت(٢/٤٢٨/١٤٢٢). تێبینی: بەڵام لای (ابو حنيفة) گەر کافرەکە (ذمي) بێو لەوڵاتانی ئیسلامی دا بێ دەکوژرێتەوە. (فيض القدير/للمناوي) (ج٦/ل: ٥٨٦). وەرگێڕ.

(٢) صحيح مقطوع (ص.د ٣٧٨٧). تێبینی: بەڵام راویەکانی ئەم گێڕانەوەیە وەکو (جوير)و (الضحاك) لای (الدارقطني) بە (متروك)و (ضعيف) هاتوون. خوای گەورە جیاوازی ناکاتو دەفەرمووێ: ﴿ومن قتل مؤمنا...﴾. گەر پیاوێ ژنێ بکوژێ دەکوژرێتەوە وەکو (الشوكاني) لە(الدرر البهية) دا باسی کردووەو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (وان الرجل يقتل بامرأة) رواه النسائي.

(٣) (صحيح الارواء ٢٢٠١) هق(٨/٤١).

(٤) متفق عليه: (خ ١٢/١٩٨/٦٨٧٦) م(٣/١٢٩٩/١٦٧٢).

**(٢) بە شاهیدی دوو پیاوی دادوەر:** (رافع بن خدیج) گێڕاویەوە: (سپێدە بۆوەو پیاوەکی ئەنصاری لەخەیبەردا کوژرا بوو، خزمانی چوونە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) باسیان کرد، فەرمووی: ئێوە دوو شاهیدتان هەیە شاهیدی لەسەر کوشتنی هاوڕێکەتان بدات؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا لەوێ کەسی موسڵمانی لێ نییە، بەڵکو ئەوان جولەکەن‌و غیرەت دەیانگرێ لەمەش کەتنی گەورەتربکەن. فەرمووی: (پەنجا پیاویان لێ دیاری بکەن سوێندیان بدەن، ئەوانیش سوێندیان نەخوارد، پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەن خۆیەوە خوێنەکەی (الدیة) پێ ی دان وەکو تۆڵە)[١].

## مەرجەکانی داواکردنی وەرگرتنی تۆڵە (القصاص):

**بۆ ئەنجامدانی تۆڵە سێ مەرجی هەیە:**

(١) تەکلیفی ئەو کەسەی شایانیەتی‌و خاوەن مافە: گەر خاوەن مافەکە منداڵ بوو یان شێت بوو تاوانبارەکە زیندانی دەکرێ تا تەکلیفی دەکەوێتە سەر.

(٢) رێك کەوتنی خاوەن مافەکان لەسەر وەرگرتنی، گەر هەندێ لێ ی خۆش بوون تۆڵەکە (القصاص) لادەکەوێت. (زید بن وهب) گێڕاویەوە: پیاوێکیان هێنا لای ئیمامی عومەر کەسێکی کوشتبوو، خزمانی کوژراو ویستیان بیکوژنەوە، خوشکی کوژراوەکە وتی: کە ژنی بکوژەکە بوو من لەبەشی خۆم خۆش بووم لەمێردم، عومەر وتی: پیاوەکە لەکوشتن دەربازی بوو)[٢].

هەم لەو گەڕاوەتەوە: (پیاوێك نەفەرێکی لای ژنی خۆی بینی‌و ژنەکەی کوشت، ئەم سکالایە بۆ لای عومەری خەتتاب (ﷺ) بەرزکرایەوە، هەندێ برای ئەوی لەسەر بینین‌و بەشی خۆی پێ ی دان، ئەنجا فەرمانی دا کە هەموویان تۆڵەیان پێ بدرێت) [٣].

(٣) نابێ تاوانبار دەست بۆ کەسی تر ببات، گەر تۆڵە لەسەر ژنەکی دوو گیان چەسپا، نابێ بکوژرێتەوە تا منداڵی پەیدا دەبێ‌و شیری یان پرچك (اللبأ) پێ دەدات.

---

(١) صحیح لغیره (ص.د ٣٧٩٣) د(٤٥٠١/ ١٢/٢٥٠).

(٢) صحیح (الارواء ٢٢٢٢) عب(١٣/١٨١٨٨)١٠).

(٣) صحیح (الارواء ٢٢٢٥) هق (٨/٥٩).

(عبدالله بن بريده) لەباوکی گێڕاویەوە: (ژنەکی غامدی پرسیاری لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد وتی: من تاوانم کردووە (واتە زینا). فەرموی بگەڕێوە. ئەنجا گەڕایەوە. سبەی هاتەوەو وتی: لەوانەیە وەکو (ماعز بن مالك) بمگێڕیەوە؟ سوێند بەخوا من دوو گیانم. پێ ی فەرمو بڕۆوە، ئەنجا گەڕایەوە، دیسانەوە بەیانی هاتەوە، ئەنجا پێ ی فەرموو: بڕۆوە تا منداڵەکەت پەیدا دەبێ، ئەنجا ڕۆیشتەوە، کاتێ منداڵی پەیدا بوو بەخۆو بە منداڵەکە هاتەوەو وتی: ئەم منداڵەم پەیدابووە، ئەنجا فەرموی بگەڕێوە شیری بدەیە تا لەشیری دەکەیەوە، دوای لەشیرکردنەوەی هاتەوە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)و شتەك لەدەست منداڵەکە دا بو دەیخوارد، فەرمانی دا منداڵەکە بە پیاوەکی موسڵمان سپێرا، ئەنجا فەرموی: چاڵەك هەڵبکەنن، ئەنجا فەرمانی درا بەرد باران کرا. (خالید) یەکێ بو لەوانەی ڕەجمی دەکردو بەردەکی تێ گرت خوێنی بە دەمو چاوی دا هێنایە خوارو جنێوەکی پێ دا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: لەسەر خۆ خالید، سوێند بەوەی نەفسی منی بە دەستە تۆبەکی ئەوەندە بە دڵی کردووە، گەر بابای گومرگو باج ستێن (صاحب مکس) ئەو تۆبەیەی کردبایە خوا لێی خۆش دەبوو. ئەنجا فەرمانی دا نوێژی لەسەر کردو بە خاك سپێرا) [١].

## بەچی بکوژ دەکوژرێتەوە؟

بنەما لەکوشتنەوەدا ئەوەیە کە ئەو کەسەی چۆن کوشتووە ئاوا بکوژرێتەوە، چونکە مانای یەکسان دانانە، وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ [٢]. واتە: کێ دەست درێژی کردنە سەر، ئاوا دەست درێژییان بکەنەوە سەر. ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ﴾[٣].

واتە: گەر سزا دران چۆن سزادراون ئاوا سزایان بدەنەوە. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) چۆن

---

(١) صحيح (ص.د ٣٧٣٣) م(١٦٩٥/١٣٢١/٣) د(٤٤١٩/١٢٣/١٢) گێڕانەوەکە هی ئەوە.

(٢) البقرة: ١٩٤.

(٣) النحل: ١٢٦.

جولەکەیێ سەری ژنەکی بەبەردێ قەڵاشتبۆوە، ئاوا سەری بە بەردێ[١] .قەڵاشتەوە

## کوشتنەوە مافی دادوەرو کاربەدەستە:

(القرطبـــي) دەڵێ: (کوشتنەوە تەنیا دەبێ فەرمانڕەواو حکومەت پێوەی هەڵسێو سزادانو تۆڵە لەسەر شانی ئەوانە، هەروەها شتی تریش، چونکە خوای گـەورە داوا لەهـەمـوو موسـڵمانان دەکات بە تۆڵە سەندنەوە، پاشان ئەوە بۆ هەمو موسـڵمانان نارەخسێ بـۆ تۆڵەکردنـەوە، بۆیـە دەسەڵاتداریان لەشوێنی خۆیان داناوە بۆ تۆڵەو سزاو شتی تر) [٢].

هۆکاری ئەوە (الصاوی) لە(حاشیة)و پەراوێزەکـەی دا لەسـەر (الجلالـین)دا باسـی کـردووە: (کاتێ سەلما کە (کوشتن)ەکە بە ئەنقەست بـووە، لەسـەر دادوەری شـەرعی پێویـستە دەسـەڵات لەسەر پەرشتیاری کوژراو وەربگرێ ئەوەی سەرپەرشتیار دەیەوێ ئەو سزایە بۆ بکوژەکـە دابـنێ، یان چاوی لێ بپۆشێ، یان تۆڵەی لێ بستێنێ، نابێ سەرپەرشتیار بـێ روخـسەتی دادوەر دەسـت بەسەر بکوژەکە دابگرێ، چونکە بەرەڵایی‌و گەنـدەڵی‌و خراپـەکاری لـێ دەکەوێتـەوە، گـەر بـەر لەرێگا پێ دانی دادوەر بیکوژێتەوە، سزای تەمبێ کردنی بۆ دادەنرێت (التعزیر) [٣].

## تۆڵەو سزا بۆ غەیری کوشتن واتە بۆ ئەندامەکانی لەش:

چۆن تۆڵە بۆ کوشتن دانراوە بۆ غـەیری کوشـتن دانـراوە: وەکـو خـوای گـەورە فەرمویـەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾[٤].

واتە: لەسەرمان فەرز کردبون تێ ی دا کە تۆڵە نەفس بە نەفسەو چاو بە چـاوەو لـووت بـە لووتەو گوێ بە گوێ یەو ددان بە ددانەو برینەکانیش تۆڵەو قیساسی هەیە.

---

(١) متفق علیه (خ٦٨٧٦/١٩٨) (م ١٦٧٢/١٢٩٩/٣).

(٢) جامع الأحکام (٢٤٥/٢٤٦/٢).

(٣) فقه السنة (٢/٤٥٣).

(٤) المائدة: ٤٥.

ئەم حوکمە هەر چەند بەسەر گەلانی بەر لەئیسلام دا چەسپابوو، بەڵام نەسخ نەبوونەوەو بۆ ئێمەش بوونەوە بە شەریعەت، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بڕیاری لەسەر ئەمە داوە، (مسلم)و (البخاری) لە(انس) دەگێڕنەوە: (الربیع بنت النضر بن انس) ددانی کەنیزەیەکی شکاند، وتیان ئێمە بۆی دەژمێرین، بەڵام ئەوان لەتۆڵە زیاتر نەیان ویست، (انس بن النضر)ی برای هات وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ددانی (الربیع) دەشکێنرێتەوە! سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە نابێ ددانی ئەو بشکێنرێتەوە! پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: لەکتێبی خوادا قیصاص‌و تۆڵە هەیە). ئەنجا خەڵکە رازی بون‌و لێ ی خۆش بوون.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ان من عباد الله من لو اقسم علی لأبره) [1]. واتە: خوا بەندەی وای هەیە گەر سوێند لەسەر خوا بخوات سوێندی دێنێتە دی!.

## مەرجەکانی تۆڵە (القصاص) بێ لەکوشتن:

(١) ئەبێ تاوانبار باڵغ‌و پێ گەیشتوو بێت.

(٢) دەبێ تاوانەکە بەئەنقەست کرابێ، چونکە کوشتنەوە بۆ کوشتنی بە هەڵە دانامەزرێت، ئەی چۆن شتێ لەخوار ئەمەوە بێ دادەمەزرێت!.

(٣) دەبێ خوێنی ئەو کەسەی تاوانی لەگەڵ کراوە هاوشانی خوێنی تاوانبار بێت، تۆڵە لەموسڵمانێ ناستێنرێ بۆ کافرەکی (الذمي)و نە لەئازادێ کۆیلەیەکی بریندار کردبێ، نە لەباوك کە منداڵەکەی بریندار بکات.

## تۆڵەی پەلەکان (الأطراف):

**سێ مەرجی هەیە:**

(١) **توانینی تۆڵە وەرگرتنەوە بێ ستەم‌و زیادە:** وەکو بڕین کە لەجومگەوە بێ وەکو ئانیشك‌و مرك (الكوع) یان رادەیێ دەڕوات، وەکو نەرمایی لوت نەك کۆڵەکەی لوت (قصبه الأنف).

---

(١) صحيح (ص. ج ٢٢٢٨) خ(٢٧٠٣/٣٠٦/٥).

لەو برینەدا تۆڵە (القصاص) نییە کە (الجائفه) ناسراوە کە برینی کونەو دەڕواتە ناو سك یان سنگ، یان لەبڕینی هەندێ باسکدا، یان لەئیسقانی جگە لەددانداندا.

(٢) هاوچونیەنی لەناوو جێگادا: نابێ دەستی ڕاست بە چەپ یان چەپ بە ڕاست ببردرێتەوە، نە قامکی پەنجە توتە (الخنصر) بە برای پەنجە توتە (البنصر)و نە بە پێچەوانەوە ببڕێتەوە، چونکە ناویان وەکو یەك نییە.

(٣) دەبێ ئەو پەلو ئەندامەی تاوانبارو تاوان لەگەڵ کراودا وەك یەك بن لەساغیو تەواوی دا، نابێ ئەندامی ساغ بە ئەندامی گۆجو ئیفلیج وەربگیرێت، نە دەستی ڕاستو دروست بە دەستێ قامکی ناتەواو بنو پێچەوانە دروستە.

## تۆڵە (القصاص) لەبرینی بە ئەنقەست(العمد):

هەرچی برینی بە ئەنقەستە گەر نەتوانرا تۆڵە دانامەزرێ، واتە: دەبێ برینی ئەو لەگەڵ برینی تاوان لەگەڵ کراودا وەکو یەك بێ بێکەمو زیادی، گەر چونیەکیو یەکسانی نەهاتەدیو دەبێ زیادەڕەوی بکرێو زیانو مەترسی پەیدا بکات، ئەو کاتە تۆڵە (القصاص) نایەتە دیو خوێن وەرگرتن (الدیة) واجب دەبێت.

# خوێن وەرگرتن (الدية)

پێناسە: خوێن (الدية) ئەو ماڵو سامانەیە بەهۆی تاوان واجب دەبیٚو دەدرێتە تاوان لەگەڵ کراوو سەرپەرشتیارەکەی. ئەوەی تۆڵەی تیٚ دایە یان تێدا نییە رێك دەخات. ئەم خوێنە (الدية) بە (العقل) دەناسرێت، واتە: بەستنەوە وەکو گەر کەسیٚ نەفەرێکی کوشت خوێنەکە کۆدەکرێتەوە لەوشتر لەحەوشەی ماڵی خوێن ستێن دەبەسترێنەوە، واتە: بەجڵەوەکەیانی بەستونەوە تا تەسلیم بە ئەویان بکات.

دەوترێ(عقلت عن فلان) واتە: خوێنی تاوانەکەم پیٚ ژمارد. بنەماکەی بۆ ئەم ئایەتە دەگەرێتەوە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَئًا وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَن يَصَّدَّقُواْ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مْؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةً فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ اللّهِ وَكَانَ اللّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾[1]. وەکو ماناکراوە. (عمرو بن شعيب) لەباوکی ئەویش لەباوکی خۆی گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فتوای دا هەر کەسیٚ نەفەریٚ بە هەڵەو نە بەخۆیی (الخطأ) بکوژیٚ، خوێنەکەی سەد وشترە، سی وشتر پیٚ ی لەدوو ساڵی نابیٚ (بنت مخاض) بنو سی یان سیٚ ساڵی بن (بنت لبون) بنو سیٚ یان چوار ساڵی (حقة) بنو دەیان نێرەی دوو ساڵی (بنی لبون) بن)[2].

هەرلەئەمەوە هاتووە: (نرخی خوێن لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەشت سەد دینار یان هەشت هەزار درهەم بووە، خوێنی ئەهلی کیتاب نیوەی ئەمە بووە. ئەمە تا سەردەمی خەلافەتی عومەر ئاوا بوو، هەڵسا وتاری داو وتی: وشتر گران بووە، وتی: عومەر لەسەر خاوەن زێڕەکانی هەزار دینار دانا، لەسەر خاوەن زیوەکان دوانزە هەزار درهەمی دانا، لەسەر خاوەن

(١) النساء: ٩٢.

(٢) حسن (ص.جه ٢١٢٨) جه(٢/٨٧٨/٢٦٣٠).

مانگا دوو سەد مانگای دانا، لەسەر مەڕداران دوو هەزار سەری دانا، لەسەر خاوەن پۆشاکەکان (الحلل) دو سەد پۆشاکی دانا. بەڵام خوێنی ئەهلی کیتاب لیٚ گەڕاو بەرزی نەکردەوە) [١].

## ئەو کوشتنەی خوێنی تێدا واجب دەبێت:

زاناکان هاودەنگن کە خوێن دان (الدية) لەکوشتنی بە نەخۆیی بەهەڵە (الخطأ)و نیمچە بە نەخۆیی (شبه العمد)دا واجبە، دیسان لەو کوشتنە بەئەنقەستەشدا کە مەرجەکانی تەکلیفو ئەرکی تێدا نییە، وەکو بچوکیو شێتیو لەو ئەنقەستەدا کە ڕێزی کوژراو کەمترە لەڕێزی بکوژ، گەر ئازادیٚ کۆیلەیەکی کوشت[٢]، دیسان لەسەر ئەو کەسەی واجبە کە خەوتووە لەخەودا بەسەر کەسێکی دا کەوتووەو مردووە، یان کەسێك بەسەر کەسێکدا دەکەوێتە خوارو دەمرێت، ئەوە خوێنی دەکەوێتە سەر.

## جۆرەکانی خوێن دان (الدية): (خوێنی ئەستوور/ خوێنی سووك):

خوێن دوو جۆرە، خوێنی گرانو خوێنی سووك هەیە، خوێنی سووك فیەتو نرخی کوشتنی نەبەخۆیە، خوێنی گرانو قورس فیاتو نرخی بە نیمچە ئەنقەستە، هەرچی خوێنی ئەو بکوژەیە کە بە ئەنقەست کەسیٚ دەکوژیٚو بەخۆی بووەو خزمانی لیٚ ی بوراون ئەوەیە کە (عمرو بن شعیب) گێڕاویەوە لەباوکیو ئەویش لەباپیرەی: (هەر کەسیٚ کەسیٚ بکوژیٚ بە ئەنقەست دەدرێتەوە دەست خزمانی کوژراوو خوێن گرانی، گەر ویستیان دەیکوژنەوە، گەر ویستیان خوێنی وەردەگرنەوە، کە سی وشترە پیٚ ی لەچوار ساڵانە(الحقة) نابیٚ، سی وشتری پیٚ ی لەپێنج ساڵە نابیٚ (الجذعة)، چل وشتری ئاوس (الخلفة)، ئەوەی لەسەری ڕێك کەوتن بۆ ئەوانە، ئەمەش لەبەر توندی خوێن (العقل).

---

(١) حسن (الارواء/٢٢٤٨) د(٤٥١٩/٢٨٤/١٢).

(٢) تێبینی: بەلاَم لای خوا ئازادو کۆیلە لەرێزدا وەکو یەکن ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾، پێغەمبەر (ﷺ) گەر کەسێکی ئازاد کەسێکی کۆیلەی کوشتبیٚ کوشتویەوە. وەکو باسکرا. بڕوانە: (بداية المجتهد ونهاية المقتصد/ج٢/بابەت: القتل). وەرگێڕ.

### خوێنی ئەستورو گران (الديه الغليظة):

سەد وشترە، چلیان ئاوس بن، وەکو لەفەرموده دا هاتووە: (بێگومان خوێنی نیمچە نە بەخۆیی کە بە قامچیو گۆچانو دار مرد بن سەد وشترە، چل لەوانە ئاوسە)[1]. ئەمە لەماڵی تاوانبارداییە بە تەنیا.

بەڵام خوێنی نەبەخۆیی (قتل الخطأ) لەسەر خزمانیەتی (العاقلة) کە خوێنی بۆ بژمێرن، نێرەوەزەکانی لە باوکی یەوە، کە دەوڵەمەندو هەبوونو ژیرن. کوێرو، پیرو بەساڵاچوانیش دەگرێتەوە مادام دەوڵەمەندبن، ژنو هەژارو شێتو غەیرە دین، ئەمانە لەم جوغزەدا نین.

بنەمای واجبی خوێن لەسەر خزمان (العاقلة) ئەم گێڕانەوەیەی (ابوهريرة)یە : (دوو ژنی ـ الهذيل ـ بەشەڕدێن یەکێکیان بەردێك دەگرێتە ئەویترو دەیکوژێو کۆرپەلەی سکی لەگەڵیدا دەمرێت، پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری دا تۆڵەی کۆرپەلە کۆیلەیەکە یان جارییەك، خوێنی ژنەکەشی خستیە سەر خزمانی)[2] .

### خوێن دانی ئەندامەکانی لەش (دية الاعضاء):

لەلەشییدا ئەندامێ هەیە یەك ئەندامە وەکو: (لووتو زمانو چوك)، هەیە دوو ئەندامە وەکو: (چاوو گوێو دەست)، هەیە لەمە پترە. گەر مرۆڤ یەکێ لەو ئەندامانەی دانەی هەیە، یان دوانی کەسێ لەناو ببات دەبێ خوێنی تەواو بدات، گەر یەك ئەندام بوو لەوانەی دووی هەیە نیوەی خوێن دەدات.

لووتو دوو چاو خوێنی تەواوەو یەك چاو نیوەی خوێنە، دوو پێڵوی چاوێ نیوەی خوێنەو، یەك پێڵوی چاوێ چارەکیەتی. قامکی دەستو قاچ خوێنی تەواوە، هەر قامکە پەنجەیەك (١٠) وشترە. گشت ددانەکان خوێنی تەواوەو هەر ددانە پێنج وشترە خوێنی.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لووت خوێنی تەواوی هەیە، گەر هەمووی بڕا سەد وشتر خوێنیەتی، دەست پەنجای هەیە، پێ پەنجای هەیە، چاو پەنجای هەیە، ئەو برینەی گەیشتۆتە

---

(١) صحيح (ص.جه ٢١٢٦) جه(٢/٨٧٧/٢٦٢٧).

(٢) متفق عليه (خ ٦٧٤٠/١٢/٢٤) م(٣/١٣٠٩/١٦٨١).

پەردەی مێشك (الآمة) سێ یەكی خوێنی هەیە، برینی هەناو (الجائفة) سێ یەكی خوێنی كوشتنی هەیە، گەر ئێسقانی لەسەریەك لابردبێ (المنقلة) پانزە وشتری خوێنە، ئەو برینەی گەیشتبێ بە ئێسقان (الموضحة) پێنج وشتری خوێنە، ددان پێنج وشتری خوێنە، هەر پەنجەیەك دە وشتری خوێنە)[1] .

(ابي بكر بن محمد بن عمرو بن حزم) لەباوكی ئەویش لەباپیرەی گێڕاویەوە: ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) (نامەی بۆ خەڵكی یەمەن نارد كە میراتو یاساو خوێنەكانی تێدا بوو، هاتبوو خوێنی نەفەر سەد وشترە، لووتی بڕاو خوێنێ تەواوی هەیە، زمان خوێنی تەواوی هەیە، دوو لێوەكان خوێنیان هەیە، دو وەتەكان خوێنیان هەیە، چووك (الذكر) خوێنی هەیە، پشت خوێنی هەیە، چاوەكان خوێنیان هەیە، یەك پێ نیوەی خوێنی هەیە، ئەو برینەی گەیشتبێ بە پەردەی مێشك (المأمومة) سێ یەكی خوێنی هەیە، ئەو برینەی چوبێتە ناو هەناو (الجائفة) سێ یەكی خوێنی هەیە، ئەو برینەی ئێسقانی لەسەریەكتری لادەبات (المنقلة) پانزە وشتری خوێنە، هەر قامكەكی دەستو قاچ دە وشتری خوێنە، ددان پێنج وشترەو برینێ بگاتە ئێسقان پێنج وشتری خوێنە)[2] .

## خوێنی ئەو ئەندامانەی سوودبەخشن بە مرۆڤ:

گەر كەسێ لە كەسێكی داو زەبرەكی وای تێ وەشاند، هزرو عەقڵی یان هەستێ لە هەستەكانی لەناوبرد، وەكو هەستی (بینینو بیستنو بۆنو چێژو قسەكردن) لە هەموو ئەوانەدا خوێنی تەواو هەیە.

لە (عوف) هاتووە بەر لە ئاژاوەگێڕی (ابن اشعث) لە پیرەمێردیكم بیست وەسفی خۆی كرد وتیان ئەوە (ابوالمهلب)ە مامی (أبي قلابة)، وتیان: (بەردەكی بەسەری كەسێكدا كێشا بیستنو زمانو هزرو چوكی لەدەستداو توخنی ژنان نەدەكەوت، (ابن عمر) چارەكی خوێنەكانی

---

(١) صحيح بشواهده (ص ن ٤٥١٣).

(٢) صحيح بشواهده (الارواء/٢٢٧٥) نس (٤٥١٣).

بڕیاردا)[١] .

گەر چاوی ساغی کوێرەکی یەك چاو کوێرکرا تەواوی خوێنی دەگرێ، (عمر)و (ابن عمر)و (عەلی کوڕی ئەبوتالّب) فتوای ئەوەیان داوە.

(قتادة) دەڵێ: لە (أبامجلز)م بیست لە (ابن عمر)م پرسیار کرد لەڕاست کوێرەکی یەك چاو (الأعور) کە چاوی کوێر دەکرێ. (عبدالله بن صفوان) وتی: عومەر خوێنی تەواوی بڕیارداوە. وتم: لە (ابن عمر) دەپرسم؟ وتی: ئەی نالێ عومەر وای کردووە)[٢] . (قتادة) لە (خلاس) ئەویش لە پێشەوا عەلی (کرم الله وجهە) گێڕاویەوە: ئەو لەڕاست کوێری یەك چاو باسی دەکرد گەر چاوی کوێرکرا، گەر ویستی هەمو خوێنەکەی یان دەبێت نیوەی خوێن دەستێنێ، چاوەکی ئەو کەسە کوێر دەکات کە چاوەکەی کوێر کردووە)[٣] .

## خوێنی برینی سەرو روخسار (دية الشجاج):

(الشجاج) شکانی سەرو دەمو چاوە، کە (١٠) جۆری هەیە:

(١) (الخارصة): ڕوشاندنی پێستو بریندار نەبوونی.

(٢) (الدامية): بریندارکردن.

(٣) (الباضعة): گۆشت قلّیشاندن بە گەورەیی.

(٤) (المتلاحمة): ئەو برینە دەڕواتە ناو گۆشت

(٥) (السمحاق): گەیشتنە پەردەی ئێسقان.

ئەوانەی سەرەوە، تۆڵەکردنەوەیان (القصاص) تێدا نییە، چونکە ناکرێ وەکو ئەوەی لێ بکرێتەوە، نە بەپێ ژماردنەکی دیاری کراو بڕیار بدرێ، بەڵکو حوکم کردنی تێدایە.

(٦) (الموضحة): برینێ گەیشتبێتە ئێسقان، پێنج وشترە.

(٧) (الهاشمة): ئێسك هاڕەر، واتە بیشکێنێت. دە وشتری هەیە.

---

(١) حسن (الارواء/٢٢٧٩) ش(٩/١٦٧/٦٩٤٣).

(٢) صحيح الاسناد (الارواء ٢٢٧٠).

(٣) ش (٩/١٩٧/٧٠٦٢) هق (٨/٩٤).

(٨) (المنقلة): ئێسقانێکن لە جێی خۆ هەلا کەوتبن، پێنج وشترە خوێنی.

(٩) (المأمومة ـ الآمـة): ئەو برینە کە گەیشتبێ بـە پـەردەی مێـشك، ئەمـە سـێ یـەکی خوێنی هەیە.

(١٠) (الدامغة): ئەو برینەیە گەیشتۆتە مێشك سێ یەکی خوێنی هەیە.

## خوێنی برینی ناوەوەو هەناو (الجائفة):

ئەو برینەیە دەگاتە ناو هەناوو بۆشایی لەش وەکو: سكو پشتو سنگو گـەروو میزلـدان. سێ یەکی خوێنی هەیە وەکو لە نوسراوی (عمرو بن حزم)دا هاتووە: (وفي الجائفة ثلث الدية).

خوێنی ئافرەت:

گەر ژنێ بە نەبەخۆیی‌و هەڵە لەدەست کوژرا، نیوەی خوێنی پیاوی هەیـە، دیـسان خـوێنی یەكو برینەکانی نیوەی خوێنی پیاوە. لە (شریح) گەڕاوەتـەوە: (عـروة البـارقي) لـەلای عومـەر هاتە لام وتی برینی پیاوانو ژنان لە ددانو ئەو برینەی گەیشتۆتە ئێسقان (الموضحة) وەکو یەکە، جگە لەمە خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە)[1].

## خوێنی ئەهلی کیتاب:

خوێنی ئەهلی کیتاب گەر بەنابەخۆیی کوژران، نیوەی خـوێنی موسـڵمانە، خـوێنی پیـاوان نیوەی خوێنی پیاوی موسڵمانەو خوێنی ژنیان نیوەی خوێنی ژنی موسڵمانە. (عـمرو بـن شـعیب) لەباوکی‌و ئەویش لەباپیرەی گێڕاویەوە: (پێغەمبـەر (ﷺ) بڕیـاری دا خـوێنی ئـەهلی کیتـاب، جولەکەو مەسیحی نیوەی خوێنی موسڵمانانە)[2].

## خوێنی کۆرپەلە (الجنین):

گەر ژنێ بەهۆی تاوانەکی بەئەنقەست یان بەنەخۆیی، منداڵەکەی ناو سـکی مـردو دایکـی نەمرد، ئەوە کۆیلەیەکی لەسەرە (الغرة)، چ لەدایکی جیابێتەوە بەمردوویی‌و لەبارچـێ، یـان لـە

---

(١) اسناده صحيح (الارواء ٧/٣٠٧) ش(٧٥٤٦/٣٠٠٠/٩).

(٢) (حسن/ الارواء/٢٢٥١) ت(١٤٣٤/٤٣٣/٢).

سکی دا بمرێت، نێر بێ یان مێیە، گەر ژنەکەش مرد خوێنی خۆی هەیە.

ئەبوهورەیرە گێڕاویەوە: (دوو ژنی (الهذیل) بەشەڕهاتن یەکێکیان ئەوی تری بە بەردێ کوشتو کۆرپەلەکەشی لەگەڵیدا مرد، لای پێغەمبەر (ﷺ) سکاڵایان کرد، بڕیاری دا خوێنەکەی کۆیلەیەکەیان کەنیزەیەك، خوێنی ژنەکەی بە خزمانی سپارد، منداڵەکانیو ئەوانی گەڵی میراتیان لێ گرت)[1] . بەڵام گەر بەزیندویی هاتەدەرو پاشان مرد هەموو خوێن دەگرێ، گەر نێربێ سەد وشترە، گەر مێ بوو پەنجا وشترە، چونکە دڵنیایی بە تاوان مردووەو بە کۆرپەلە ناچێت.

* * *

---

(١) متفق علیه. تێبینی: لەڕاست نیوە خوێنی ژن لەڕاست خوێنی پیاودا (الاصم)و (ابن علیة) جیاوازی ناکەن لەنێوان خوێنی ژنو پیاوداو وەکو یەکی دادەنێن (نیل الاوطار/ج٢/ ل: ١٥١٦).

## باسی قەزاو دادگایی (كتاب القضاء)

### ڕێگا پێ درانی:

قەزاو دادگایی بە قورئانو سوننەتو کۆی دەنگی ئوممەت ڕێگای پـێ دراوە: خـوای گـەورە فەرمویەتی: ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّـهُ﴾[١]. واتـە: حوکمیـان لەنێوانـدا بکـە بـەوەی خـوا دایبەزاندووە. هەروەها فەرمویەتی: ﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ﴾[٢] . واتە: ئەی داود تۆمان کردووە بە خەلیفەو جێنشین لـە زەوی، دا حـوکمو دەسـەڵات بگێڕە لەناو خەڵکی دا بەڕاستو دروستی یەوە. لە عەمری کوڕی عاسەوە هـاتووە کـە ئـەو لـە پێغەمبەری (ﷺ) بیستووە: (گەر فەرمانڕەوا ئیجتیهادی کردو پێکای دوو پاداشتی هەیە، گـەر حوکمی دا ئیجتیهادی کـردو هەڵـەی کـرد پاداشـتەکی هەیـە)[٣] . هـەمو موسـڵمانان لەسـەر دروستی قەزاو دادگایی کۆکن.

### حوکمی:

فەرزی کیفایەیە، پێویستە سەرۆكو پێشەوای وڵات کەسی ناوبژو مافپـەروەرو قـازی لـەناو شارو وڵاتدا دەست نیشان بکات، ناوبژی بکەنو دادگایی ئەنجام بدەن، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) حوکمی لەناو خـەڵکی دا کـردووەو پێـشەوا عـەلی (كرم الله وجهـه)ی نـاردووە بـۆ (یەمـەن)و خەلیفەکانی ڕاشیدین دادگایی یان کردووەو دادگایان لە شارو وڵاتدا داناوە[٤] .

---

(١) المائدة/ ٤٩.

(٢) ص/٢٦.

(٣) متفق علیه. تێبینی: بەڵام دەبێ حاکمو فەرمانڕەواکە بە پلەی موجتەهید گەیشتبێت. بە مەرجەع لای ئوممەتو جەماوەری زانایان قبوڵ کرابێت. (وەرگێر).

(٤) منار السبیل (٢/٤٥٣).

## گەورەیی دادگایی و حوکم دان:

(ابن مسعود) ـ رـ فەرمویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا حسد الا في اثنتين: رجل آتاه الله مالا فسلطه على هلكته في الحق، ورجل آتاه الله حكمة فهو يقضي بها ويعلمها)[١].

واتە ئێرەیی لە دوو شتدا نەبێ نییە: خوا کەسێکی دەوڵەمەند کردووە لە حەق و راستی دا خەرجی دەکات، خوا کەسێکی سیاسی و زاناو دانا کردووە حوکم و دادوەری پێ دەکات لەنێو خەڵکی داو خەڵکی فێردەکات.

مەترسی یەکەی: (ابوهريرة) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ کرا بە قازی لەناو خەڵکی دا ئەوە بێ کێرد کوژراوەتەوە)[٢] . (أبوبريدة) لە پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە: (قازیەکان سێ کەسن: دوو لە دۆزەخدان و یەك لە بەهەشتدایە، پیاوێ فێری حەق بووەو کاری پێ کردووە لە بەهەشتدایە، پیاوێ بە نەزانی حوکمی لەناو خەڵکی دا کردووە ئەوە لە دۆزەخدایە، پیاوێ لە حوکم و ناوبژی دا لە حەق و ماف لایداوە ئەوە لە دۆزەخدایە)[٣] .

## ڕێگرتن لە داواکردنی قازیەتی:

(عبدالرحمن بن سمرة) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بە منی فەرموو: (ئەی (عبدالرحمن) داوای دەسەڵات و فەرمانڕەوایی مەکە، چونکە گەر لەسەر داواکاری خۆت پێت درا ئەوە بەخۆت دەسپێردرێ و بەفەتارەتت دەدا، بەڵام گەر بێ داواکاری پێت درا یارمەتیت دەدرێ بۆ ئەوە)[٤] .

## کەی قەزا لەسەر پیاو فەرز دەبێت؟

(الحافظ) لە (الفتح/١٣/١٤٦) وتویەتی:

(ابو علي الكرابيسي ـ کە مەزهەبی شافیعی یە لە کتێبی (آداب القضاء)دا کە هی خۆیەتی نوسیویەتی: من نەم بینیوە لەناو زانایانی پێشین لەوەدا ناکۆکی هەبێ کە ئەوکەسەی

---

(١) متفق عليه: خ(٣/٢٩٨/٧٣١٦) م(١/٥٥٩/٨١٦).

(٢) صحيح (ص. ج ٦١٩٠) د(٩/٤٨٦/٣٥٥٥).

(٣) صحيح (ص. ج ٤٤٤٦) د(٩/٤٨٧/٣٥٥٦).

(٤) متفق عليه (خ ١٣/١٢٣/٧١٤٦) م(٣/١٢٧٣/١٦٥٢).

شایانە بەوە قازی بێ، دەبێ ئەم سیفەتانەی تێدا بێت: (کەسێك کە چاکەو ڕێزو زانستو وەرعـی پێـوە دیاربـێو قورئـان خـوێن بـێو زۆربـەی ئەحکامـەکانی ئاگاداربـێ، ئاگـاداری زۆربـەی سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بێ، ئەنجا قـسەکانی ئەسـحاب، زانابـێ بـەو قـسانەی لەسـەری کۆکنو ناکۆکن، ئەنجا لـە ڕای تابیعینـەکان ئاگاداربـێ، ڕاسـتو دروسـتی شـارەزابێ، کـار بـە ئایەتەکانی قورئان بکات، گەر دەستی نەکەوت بە سوننەت، پاشان فتوای سەحابە گەورەکان کار پێ بکات، لەگەڵ زانایان زۆر لێکۆڵینەوەو سەعی بکاتو ڕاوێـژیان پـێ بکـات، لەگـەڵ فـەزڵو وەرعدا، دامێنو سكو زمانی بپارێزێت لە خراپەو حەرام، لە قسەی سکاڵاکاران تێ بگات، دەبێ ژیرو دووربێ لە هەواو هەوەس پەرستی، هەرچەندە ئێمە دەزانـین لەسـەر زەوی کـەس نییـە ئـەم هەمو سیفەتانەی تێدابن، بەڵام دەبێ کێ لە خەڵکی سەردەم لە هەمووان لەپێشترو چاکتربێ ئـەو دابنرێت).

## قازیەتی بە ژنان نادرێت:

(أبي بكرة) دەڵێ: خودا چاکەی لەگەڵ من کردووە تـا لـە جـەنگی جەمەلـدا بەشـدار نـەبم بەهۆی ئەم فەرمودەیە بوو، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) زانی کچی کیـسرای ئێـران بـووە بـە (شـا) فەرموی: (لن يفلح قوم ولو امرهم امرأة)[1] . ئەو گەلەی ژنی فەرمانڕەوابێ، قەت سەرناکەوێت.

## نەریتەکانی قازیو دادوەر:

پێویستە قازی دادوەربێ لە سەیرکردنو وشـەو دانیـشتنو چـوونەلادا. (أبـي المليـح الهـذلي) گێڕاویەوە: (عـمر بن الخطاب نامەی بۆ (ابو موسى الاشـعري) نـارد: لەپاشـاندا: قـەزاو دادگـایی فەریزەیەکی موحکەمەو دامەزراوە، سوننەتەکی پەیڕەو لێ کراوە، تێ بگە گەر ئـەم کـارە بـەتۆ سپێرا گەر قسەیەکی بە حەق کراو کەس نەبو جێبەجێی بکات سودی نابێ، بەیەکـسانی سـەیری خەڵکی بکە لەتەماشاکردنو کۆڕو دادوەری خۆت دا، با کەسی ناودارو گەورە تەماع نەکاتـە تـۆ لە ستەم کردنەکەتدا).

---

(١) صحيح (خ ٧٠٩٩/٥٣/١٣).

## بەرتیلو دیاری حەرام دەبێ لەسەری:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لعنة الله على الراشي والمرتشي)[١] . واتە: نەفرینی خوا لە بەرتیل دەرو بەرتیل وەرگربێت.

هەروەها فەرمویەتی: (هدايا العمال غلول)[٢] واتە: دیاری فەرمانبەرانو کارگێڕانی حکومی ناپاکی یە.

## حەرامە قازیو دادوەر لەکاتی توڕەبووندا بڕیارو فتوا بدەن:

(عبدالرحمن بن أبي بكرة) گێڕاویەوە: (ابوبكرة ـ نامەی بۆ کوڕەکەی نارد لە سجستان، لەکاتی توڕەیی دا دادگایی لەنێوان دوو کەس مەکە، لە پێغەمبەری خوام بیستووە (حوکم مەدەن لەنێوان دوو کەس دا کاتێك توڕەن)[٣] .

## بڕیاری دادوەر هیچ لەڕاستی ناگۆڕێت:

(ئوم سەلمە) دایکی بڕواداران (رچی اللع عنها) گێڕاویەوە، پێغەمبەر (ﷺ) لە دەرگای ژوورەکەی گوێی لە سکاڵای سکاڵاکران بوو، چووە لایانو فەرموی: (منیش مرۆڤێکم، کەسانی ناکۆك دێنە لام، ڕەنگە هەندێکیان قسەزانو زمان لووستربن وابزانم ڕاست دەکاتو بڕیار لەسەر قسەی ئەو بدەم، هەرکەسێ حەقی موسڵمانێکم پێدا ئەوە پارچە ئاگرێکە، با ئەویش وەری بگرێ یان لیّ ی بگەڕێت)[٤] .

## سکاڵاو داواو شاهیدو بەڵگەکان (الدعاوى والبينات):

داواکاری (الدعاوى)یەکان کۆی (الدعوى)یە واتە: (الطلب ـ داوا)، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾[٥] ـ تدعون ـ (أي يطلبون).

---

(١) صحيح (ص. جة ١٨٧١) جه(٢/٧٧٥/٢٣١٣).
(٢) صحيح(الارواء/ ٢٦٢٢) أ(٥/٤٢٤).
(٣) متفق عليه: خ ١٣/١٣٦/٧١٥٨) م(٣/١٣٤٢/١٧١٧).
(٤) متفق عليه: (خ ٥/١٠٧/٢٤٥٨) م(٣/١٣٤٢/١٧١٧).
(٥) فصلت/ ٣١.

لە شەریعەتدا: داواکردنی شتێکە کە بە هی خۆتی دەزانی لەدەستی کەسی تردایە یان لە ئەستۆی (الذمة) ئەودایە.

(المدعي) داواکار: ئەوکەسەیە داوای مافەکە دەکات، گەر وازی لێ بێنێ، ئەوە بێ دەنگەی لێ دەکرێت.

(المدعی علیه) داوا لێ کراو: ئەوکەسەیە داوای مافەکەی لێ دەکرێو گەر بێ دەنگەی لێ بکات، وازی لێ ناهێنرێت.

(البینات) بەڵگەو بەڵگەنامە: وەکو شاهیدو نیشانەو بەڵگەنامەو شتی تر.

بنەمای ئەمە لەم فەرمایشتەدا هاتووە کە (ابن عباس) گێڕاویەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەگەر خەڵکی بەهۆی داواکاریەکانیان شتیان پێ درابایە، کەسانێ دەبوون داوای خوێنی پیاوانێو ماڵی ئەوان بکەن، بەڵام سوێند لەسەر داوا لێ کراوە ـ المدعی علیه ـ)[1] . پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (البینة علی المدعي والیمین علی المدعی علیه)[2] . واتە: بەڵگەو شاهیدی لەسەر داواکەرو سکاڵاکارەو سوێند لەسەر ئەوکەسە سکاڵاو داوای لەسەر قەید کراوە.

## کێ بەدرۆ داواکاری یەك یان سکاڵایەك بەرز بکاتەوە:

(ئەبوذر) ـ رـ فەرمویەتی لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست: (من ادعی ما لیس له فلیس منا، ولیتبوأ مقعده من النار)[3] . واتە: هەرکەسێ داوای شتێ بکات کە هی ئەو نییە، با جێگای لە ئاگردا خۆش بکات.

تاوانی ئەوکەسەی سوێندی بەدرۆ دەخوات تا سامانی بەدەست بێنێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەسێ سوێندی بەدرۆ بخوات تا سامانی مرۆڤەکی موسڵمانی پێ بستێنێ، کاتێ بەدیداری خوا دەگاتەوە لێ ی تورەیە)[4] . پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): (کێ مافی

---

(١) متفق علیه م(١٧١١/١٣٣٦/٣) خ(٤٥٥١/٢١٣/٨).

(٢) صحیح (ص. ج ٢٨٩٦) ت(١٣٥٦/٣٩٩/٢).

(٣) صحیح (ص. جه ١٨٧٧) م(٦١/٧٩/١) جه(٢٣١٩/٧٧٧/٢).

(٤) متفق علیه (خ ٧٦، ٦٦٧٧/٥٥٨/١١) م (١٣٨/١٢٢/١).

موسڵمانێ بەهۆی سوێندی خۆی بستێنێ، خوا بەهەشتی لێ حەرام دەکات‌و ئاگری بۆ واجب دەکات. پیاوێ لەناو خەڵکەکە وتی: ئەگەر شتەکی کەمیش بێ؟ فەرموی: (وان کان سواکا من اراك)[١] . گەر سیواکەك بێ لە داری ئاراك.

## ڕێگاکانی سەلماندنی داواو سکاڵا:

ڕێگاکانی سەلماندنی سکاڵاو داواکان ئەوانەن: دان پیانان (الاقرار)، گەواهی دان (شاهیدی دان)، سوێند[٢] .

## دان پیانان (الاقرار):

دان پیادانانە بەڕاستی‌و حوکم پێ کردنی واجبە، مادام دان پیادانەر بالغ بێ‌و ئازاد بێت‌و سەرپشك بێت[٣] .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو لەباسی زینادا باسمان کرد (ماعز)و (الغامدیة)و (الجهنیة) بە دان پیادانانی خۆیانی ڕەجم کرد. وە فەرموی: (واغد یا أنیس الی امرأة هذا فان اعترفت فارجمها). وەکو باسکرا.

## گەواهی (شاهیدی):

شاهیدی‌و گەواهی لەڕاست مافی ئادەمیزادە فەرزی کیفایەیە، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ﴾[٤] . واتە: گەر شاهیدەکان بانگکران یاخی نابن.

دانی شاهیدی فەرزی عەینە وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن

(١) صحيح (ص. جه ١٨٨٢) جه(٢/٧٧٩/٢٣٢٤) م(١/١٣٢/١٣٧).

(٢) فقه السنة/٣/٣٢٨).

(٣) منار السبيل (٢/٥٠٥).

(٤) البقرة/ ٢٨٢.

يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾[١] . واتــە: شــاهیدی مەشــارنەوە كــێ شــاهیدی بــشارێتەوە ئــەوە بــەدڵ گوناهبارە.

پێویستە شاهیدی دەر گەر شاهیدیەكەی لەسەر خودی خۆشی بێ ڕاستی یەكان بڵـێ، وەكـو خوا فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيّاً أَوْ فَقَيراً فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُواْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً﴾[٢] . واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بـە دادگـەری هەڵسن‌و شاهیدی بۆ خوا بدەن گەر لەسەر خۆتان بێ یان باوانتان یـان خزمانتـان، دەوڵەمەنـدبێ یان هەژاربێ خوا لەپێشترە بۆیان، شوێن هەوەس مەكەون كە لابدەن، گەر بای بدەن یـان ڕوی لێ وەربگێڕن، خوا بەوەی دەیكەن ئاگادارە.

شــاهیدی بــەبێ ئاگــایی حەرامــە وەكــو خــوا فەرمویــەتی: ﴿إِلَّـا مَـن شَـهِدَ بِـالْحَقِّ وَهُـمْ يَعْلَمُونَ﴾[٣]. واتە: مەگەر كەسێ شاهیدی بەحەق بدات ئەوان دەزانن. شاهیدی بەدرۆ گوناهـەكی گەورەیە، وەكو (أبوهريرة) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست فەرموی: (ئایا پێتـان بڵـێم: تاوانە هەرە گـەورەكان كامانـەن؟ وتمـان: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا. فـەرموی: (هاوبەشـی پەیداكردن بۆ خوا، نەدانی مافی باوان) لەسەر پێ هەڵتوتەكابوو ئەنجا دانیشت‌و فەرموی: (وریـا بن قسەی درۆو ساختەو شاهیدی بەدرۆو ساختە). ئەوەندە دووبارەی كـردەوە وتمـان خۆزگـە بـێ دەنگەی لێ كردبایە)[٤] .

## ئەوكەسەی گەواهی‌و شاهیدی لێ وەردەگیرێت:

تەنیا شاهیدی لەموسڵمانی باڵغی دادوەری ژیر وەردەگیرێت. شاهیدی بێ بـڕوا وەرنـاگیرێ،

(١) البقرة/ ٢٨٣.

(٢) النساء/ ١٣٥.

(٣) الزخرف/ ٨٦.

(٤) متفق عليه: خ(٢٦٥٤/٢٦١/٥) م(١/٩١/٨٧).

گەر بۆ هاوشانانی خۆشی بێت:[١]. خودا دەفەرموێ ﴿ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾[٢] . واتە: دوو شاهیدی دادوەر لە خۆتان بکەن بە شاهید. ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ﴾[٣] . واتە: لەوانەی لێیان ڕازی دەبن لە شاهیدەکان. بێ بڕوا دادوەر نییەو نە مرۆڤ لێ ی ڕازی یەو نە لە خۆمانە[٤] . وە شاهیدی منداڵ وەرناگیرێ، خوا فەرمویەتی: ﴿واستشهدوا شهدين من رجالكم﴾[٥] . واتە: دوو کەسی دادوەر لە پیاوانی خۆتان بکەن بە دادوەر. منداڵ بەشێ نییە لە پیاوانی ئێمە.

شاهیدی گێلو شێتو ئەوانی تر پەسەند ناکرێ ئەوان لەسەر خۆیان شاهیدی وەرناگیرێ، ئەی چۆن لەسەر خەڵکی وەردەگیرێت!.

**شاهیدی خراپکار وەرناگیری ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾[٦] .**

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تجوز شهادة خائن ولا خائنة ولا زان ولا زانية ولا ذي غمر على اخيه)[٧] . واتە: شاهێدی ناپاك لە ژنو لە پیاو رقی بەرامبەر براکانی هەبێت ، وە نە شاهێدی پیاوو ژنی زیناکار، وەرناگیرێت.

## بەشەکانی شەهادە:

**مافەکان دوو بەشن: مافی خواو مافی ئادەمیزاد.**

**(١): بەشی یەکەم** تەنیا دوو شاهیدی نێرەوەزی دەوێ، کە مەسەلەی ماڵو دارایی تێدا مەبەست نییەو پیاوان بەسەری دا ئاگادارن، وەکو: هاوسەرگیریو تەڵاق. خوای گەورە

---

(١) تێبینی: بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) شاهیدی لە ئەهلی کیتاب وەرگرتووە، وەکو ڕابردوو لە گێڕانەوەی (نافع بن خريج)دا بینیمان لەڕاست کوژراوێ لە خەیبەردا کە فەرموی: (فاختاروا منهم خمسين فاستحلفوهم) رواه ابو داود صحيح. منداڵیش وەکو یارمەتی دەر لە شاهیدی دا گوێی بۆ دەگیرێت. وەرگێڕ.

(٢) الطلاق/ ٢.

(٣) البقرة/ ٢٨٢.

(٤) منار السبيل/ ١٨٣.

(٥) البقرة/ ٢٨٢.

(٦) منار السبيل/ ٢/٤٨٦.

(٧) حسن (ص. جە/١٩١٦) د(٣٥٨٤/١٠/١٠)، جە (٢/٧٩٢/٢٣٦٦).

فەرمویەتی: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾(١) . واتە: کاتێ گەیشتنە وەختی، خۆیان یان بەچاکی بیان هێڵنەوە یان بەچاکی دەستیان لێ بکەنەوەو دوو شاهیدی دادگەر لە خۆتان بگرن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا نكاح الا بولي وشاهدي عدل)(٢) . وتە: مارەکردن دانامەزرێ بەسەرپەرشتو دوو شاهیدی دادگەر نەبێت. لێرەدا شاهید بە وشەی نێرینە (الذكر) باسکراوە.

**٢. بەشی دووەم** دوو شاهیدی دەوێ، یان پیاوەكو دوو ژن، یان یەك شاهیدو سوێندەکی سکاڵاکار (المدعي):

ئەو شاهیدیانەن مەبەستی پێ لە سامانو دارایی یە، وەکو کڕینو فرۆشتنو بەکرێ دان (الاجارة)و بارمتە (الرهن)و هی تر. خوای گەورە فەرمویەتی لە سورەتی (البقرة/٢٢٨)دا: ﴿وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا﴾. واتە: دوو شاهید لە پیاوانی خۆتان بە شاهید بگرن، گەر دوو پیاو نەبون با پیاوێكو دوو ژن بن، کە لە شاهیدی دا پێیان ڕازین، تا ئەگەر یەکێ لەیادی چوبۆوە ئەویتر یادی بخاتەوە.

(ابن عباس ـ رـ) دەفەرمووێ: (ان رسول الله ـ ص ـ قضى باليمين مع الشاهد)(٣) . واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ بوونی شاهیددا حوکمی بە سوێندکرد.

٣ـ بەشێکیان دوو پیاو یان پیاوەكو دوو ژن، یان چوار ژن شاهیدیان لێ وەردەگیرێ، ئەمەش ئەم کارانەن کە پیاوان بەزۆری لەگەڵی دا ئاشنا نین وەکو: شیردانو منداڵ بوونو نەنگی یەکانی ناوەوەی ژنان.

هەرچی مافی خوایە شاهیدی ژنانی تێدا وەرناگیرێ، وەکو (الزهري) دەڵێ: (لايجلد في شيء من الحدود الا بشهادة رجلين). واتە: دار لە هیچ کەسێ نادرێ لە حدودەکان بە شاهیدی دوو پیاو

(١) الطلاق/ ٢.

(٢) ڕابرد.

(٣) صحيح (ص. جه ١٩٢٠) م(١٧١٢/ ٣/١٣٣٧). جه(٢/٧٩٣/٢٣٧٠).

نەبێت، ئەمانەش دەبن بە سێ بەشەوە:

١ـ بەشێکیان لە چوار شاهید کەمتر قبولْ نابێت، کە زینایە:

﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾(١) . وەکو باسکراوە.

٢ـ جگە لە زینا دوو شاهید قبولْە بۆ سزاو حدودەکانی تر وەکو (زەهری) باسی کردووە.

٣ـ بەشێکیان یەك شاهیدی گەرەکەو بەسیەتی کە مانگی یەك شەوەی ڕەمەزانە . (وەکو باسکرا لە باسی ڕۆژوودا).

## سوێند (اليمين):

گەر داواکار نەیتوانی بەڵگەو شاهید بێنێو داوا لەسەر قەیدکراویش (المدعی علیه) نکۆڵی کرد، ئەوکاتە داواکار (المدعي) یان سکاڵاکار(المشتکي) دەبێ داوا لەسەر قەیدکراو سوێند بدات، وەکو لە فەرمودەدا هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (البینة علی المدعي، والیمین علی المدعی علیه). واتە: بەڵگە لەسەر داواکەرەو سوێند لەسەر داواکراوە. وەکو ڕابرد.

(أشعث بن قیس الکندي) دەڵێ: (من و نەفەرێ کێشەمان هەبوو لەسەر بیرێ، سکاڵامان بردە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (دوو شاهید دێنی یان دەبێ سوێند بدرێ). وتم: ئاخر ئەو گوێی لێ نییە سوێند دەخوات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (من حلف علی یمین یستحق بها مالا وهو فیها فاجر لقي الله وهو علیه غضبان). (ڕابردو ماناکراوە). ئەنجا خوا بۆ ڕاستی ئەمە ئەم ئایەتەی نارد: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَناً قَلِيلاً اولئك لاخلاق لهم فی الاخره ولایکلمهم الله و لاینظر الیهم یوم القیامة ولایزکیهم ولهم عذاب الیهم﴾(٢)

(١) النور/ ٤.

(٢) آل عمران/ ٧٧.

# باسی خەباتو جەنگ (كتاب الجهاد)

## پێناسەی جیهاد:

وشەی (الجهاد) لە (الجهد)ەوە هاتووە واتە: (تواناو ماندوبوونو ڕەنجو خەبات). دەوترێ (جاهد يجاهد جهادا او مجاهدة) لەکاتێکدا توانای خۆی خستەگەڕ، ئەرکو ماندووبوونی خۆی تاودایە، بۆ جەنگ کردن لەگەڵ دوژمندا.

ئەم خەباتە ڕاستەقینە دەبێ، کاتێ یەکەم شت مەبەست خواو ڕاپەڕاندنی بەرپرسیاری ئەو بێت و بەرزکردنەوەی وشەی ئەوو ئاڵای ئەو بێو نەهێشتنی ناحەق بێو هەوڵدان بێ بۆ ڕازی کردنی خوا، بەڵام گەر مەبەستت تەنیا لە شانسی دنیایی بێو، ئەوە خەباتی ڕاستەقینە نییە!.

کێ بۆ پلەو پایەو تاڵانو دەرخستنی ئازاییو ناو دەرکردن بجەنگێو خەبات بکات ئەوە پاداشتی نییەو خێری پێ ناگات)[1] .

(أبي موسى) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: پیاو هەیە تەنیا بۆ تاڵانو دەستکەوت دەجەنگێ، پیاو هەیە بۆ ناوو ناوبانگ، پیاو هەیە بۆ پلەو پایە دەرکەوتن، کامیان لەپێناو خودایە؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): (من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله)[2] . کێ بجەنگێ تا وشەی خوا بەرزو بڵند بێ، ئەوە لەڕێگای خودایە.

## هاندان بۆ خەبات:

(أبوهريرة) گێڕاویەوە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (کێ بڕوای بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنێو نوێژ بکاتو ڕۆژوو بگرێ، حەقە بەسەر خواوە بیباتە بەهەشتەوە، لەڕێگای خوادا جەنگاوە، یان لە زێدیو نیشتمانی خۆیدا مردووە کە تێی دا لەدایك بووە).

(١) فقه السنة (٢٧، ٣/٤٠).

(٢) متفق عليه (خ ٦/٢٧/٢٨١٠) م(٣/١٥١٢/١٩٠٤).

وتیان: ئایا مژدە بەخەڵکی بدەین؟ پێغەمبەر فەرمووی: (لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە خوا بۆ خەباتگێڕانی ئامادە کردووە، نێوان هەردوو پلەیەك نێوان زەویو ئاسمانە، گەر داواتان کرد داوای فیردەوس بکەن، ناوەڕاستی بەهەشتەو لای سەرەوەی بەهەشتە، لەسەر ئەوەوە عەرشی خوا هەیە، لەوێوە ڕوبارەکان هەڵدەقوڵن)[١] .

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (نمونەی خەباتگێڕ لەڕێگای خوادا وەکو ئەو کەسەیە بەرۆژ بەڕۆژووەو بەشەو شەونوێژ دەکاتو گوێڕایەڵە بە ئایەتەکانی خوا، تا ئەو خەبات گێڕە لەڕێگای خوا دەگەڕێتەوە لە ڕۆژوو نوێژەکەی دانابڕێت)[٢].

هەر ئەو گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خوا وەلامی ئەو کەسەی داوەتەوە لەپێناو ئەودا دەرچووەو لەبەر بڕوابوون بە منو بەڕاست دانانی پێغەمبەری خوا دەرچووە، کە بەپاداشتو دەستکەوتەوە بیگێڕمەوە یان (بە شەهیدبوون) بیبەمە بەهەشتەوە)[٣] .

## گەورەیی شەهیدبوون:

(مسروق) دەڵێ: لەڕاست ئەم ئایەتە لە (ابن مسعود) پرسیارمان کرد ـ رـ ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾[٤] . فەرموی: ئێمە لەڕاست ئەوە لە پێغەمبەری خوامان (ﷺ) پرسیار کردو فەرموی: (ڕۆحی ئەوان لەناو باڵندەی سەوز دایە، چەند چرایەکیان هەیە لە دەوری عەرشدا هەڵواسراون بۆ کوێی مەبەست بێ بە بەهەشتدا دەڕوات، پاشان دەڕواتە دەوری ئەو چرایانە، پاشان پەروەردگار بە سەرنجەوە لێیان دەڕوانێو پێیان دەفەرموێ: ئارەزووی چی دەکەن؟ ئەوان دەڵێن: حەز لەچی بکەین، ئەوەتا بۆ خۆمان بەئارەزوی خۆمان بە هەمو شوێنەکی بەهەشتدا ڕەت دەبین، خوا سێ جار ئەمەیان لێ دووبارە دەکاتەوە، کاتێ زانییان خوا وازیان لێ ناهێنێ تا شتێ داوا نەکەن، دەڵێن: خوایە ڕۆحمان

(١) صحيح (ص. ج ٢١٢٦) خ(٦/١١/٢٧٩٠).

(٢) صحيح (ص. ج٢١٢٦) خ(٦/١١/٢٧٩٠).

(٣) متفق عليه/ خ(١/٩٢/٣٦) م(٣/١٤٩٥/١٨٧٦).

(٤) النساء/ ٦٩.

ڕەوانەی لاشەکانمان بکەوە، تا جارەکی تر لەپێناو تۆدا شەهید ببینەوە، کاتێ بینی پێویستی یان بەچی نییە لێیان دەگەڕێت)[١] .

(أنس) گێڕاویەوە لە (بنت البراء) کە (دایکی حارثة بن سراقة)یە، هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا لەڕاست (حارثة)دا قسەم لەگەڵدا ناکەیت، کە لە جەنگی بەدردا کوژراوەو تیرەکی وێڵی بەرکەوتو مرد، گەر بزانم لە بەهەشتە خۆم ڕادەگرم، گەر نا بۆی دەگرییم؟ فەرموی: (ئەی دایکی حاریسە ئەمە چەند باخچەیەکە لە بەهەشتدا، کوڕەکەت فیردەوسی باڵای دەست کەوتووە)[٢] .

(مقدام بن معد یکرب) گێڕاویەوە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: شەهید لای خوا شەش سیفەتو ڕەوشتی هەیە: لە یەکەم دڵۆپە خوێنی کە دەڕژێ، خوا لێ ی خۆش بووە، شوێنی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێ، لە سزای خوا لە گۆڕدا پارێزراوە ، لە ترسە گەورەکە بێ باك دەبێت، تاجی ڕێزی لەسەر سەری دادەنێن، یەك یاقوتی لە دنیاو هەرچی تێدایە باشترە، حەفتاو دوو حۆریو پەری زادی پێ دەدرێو شەفاعەت بۆ حەفتا کەسی خزمو کەسو کاری دەکات)[٣] .

ئەبوهورەیرە گێڕاویەوە: (شەهید ئازاری کوشتن هەست پێ ناکات، تەنیا بە ئەندازەی گەستنی زەردەوالەیەك زەردەواڵەیەك ـ القرصة ـ نەبێت)[٤] .

## ترساندن لە دەست کێشانەوە لە خەبات:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ* إِلاَّ تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً وَيَسْتَبْدِلْ قَوْماً غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئاً وَاللّهُ عَلَى كُلِّ

(١) صحيح (مختصر م ١٠٦٨) م(٣/١٥٠٢/١٨٨٧).

(٢) صحيح (ص. ج ٧٨٥٢) خ(٦/٢٥/٢٨٠٩).

(٣) (ص.جه ٢٢٥٧) ، ت (٣/١٠٦/١٧١٢).

(٤) حسن صحيح (ص. جه ٢٢٦٠) جه(٢/٩٣٥/٢٧٩٩).

شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[١] .

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بۆچی گەر جاڕدرا بۆتان ڕاپەڕن لەڕێگای خوادا لەش گرانی دەکەن، ئایا بە ژیانی دنیا ڕازی ترن نەوەك دواڕۆژ، خۆشی ژیانی دنیا لەچاو دواڕۆژ کەمێکە. گەر ڕانەپەڕن خوا سزایەکی توندتان دەداتو گەلێکی تر دێنێتە شوێنتان خوا زیانی لێ ناکەوێو خوا بەسەر هەمو شتێدا بەتوانایە).

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾[٢] .
واتە: لەپێناو خوادا (بۆ خەبات) سامانو دارایی ببەخشن، بەدەستی خۆتان خودی خۆتان بە فەتارەت مەدەن.

(ابن كثير) لە (أسلم بن عمران) گێڕاویەوە: (پیاوێ لە کۆچکەران بۆ قوستەنتینیە هەڵمەتی بردە سەر دوژمنو پۆلەکەی بڕین، (أبو أيوب الانصاري) لەوێ بو، کەسانێ وتیان بەدەستی خۆی نەفسەکەی بە فەتارەت دا، (أبوأيوب) وتی: ئێمە لە ئێوە لەڕاست ئەم ئایەتە شارەزاترین. ئەوە لەڕاست خۆمانەوە دابەزی. هاوڕێتی پێغەمبەرمان کرد (ﷺ) جەنگەکانمان بەشداری کردو سەرکەوتین، کاتێ ئیسلام پەرەی سەندو سەرکەوت وەکو خۆشەویستی لەگەڵ کۆمەڵەی ئەنصاردا کۆبوینەوەو وتمان: خوا بەیاوەری پێغەمبەر (ﷺ) سەرکەوتنی ڕێزی لێ ناین، تا ئیسلام بڵاوبۆوەو خەڵکی زۆربوو، ئێمە بەسەر خێزانوماڵو منداڵدا هەڵمانبژاردبوو، ئەنجا جەنگەکان وەستاونو دەچینەوە ناو ماڵو منداڵی خۆمان دادەنیشین، بۆیە لەوکاتەدا ئەم ئایەتە لەشانماندا هاتە خوار: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾. ئەم (التهلكة)یە لەڕاست دانیشتنو خانەنشینمان دابەزی لەناو ماڵو منداڵ داو دەستکردنەوەمان لە خەبات). (حاکم) بە (صحيح)ی داناوەو ئەبو داودو ترمذیو نەسائیو هی تر گێڕاویانەوە[٣] .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کاتێ کڕینو فرۆشتنتان بە عەینە کردو کلکی مانگاتان دەستدایەو بە کشتوکاڵ ڕازی بون، خەباتتان (الجهاد) واز لێ هێنا خوا ئەوەندەتان سەرشۆڕ

---

(١) التوبة/ ٣٨ـ ٣٩.
(٢) البقرة/١٩٥
(٣) صحيح (ص. د ٢١٨٧). تفسير ابن كثير(١/٢٢٨). (د: ٢٤٩٥/١٨٨/٧).

دەکات، لاینابات تا بۆ ئایینی خۆتان دەگەڕێنەوە)[١] .

**حوکمی الجهاد خەبات:**

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾[٢] . واتە: لەسەرتان فەرزکراوە جەنگ، هەر چەندە بۆ ئێوە دژوارە، لەوانەیە شتێ بۆ ئێوە حەز پێ کراو نەبێ ئەوە بۆ ئێوە باشتربێ‌و شتێ بۆ ئێوە حەز پێ کراوبێ بۆ ئێوە خراپ بێ‌و زیانی هەبێ خوا دەزانێ ئێوە نازانن). خەبات فەرزی کیفایەیە: ﴿لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُـلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْراً عَظِيماً﴾[٣] . واتە: ئەو بڕوادارانەی خانەنشین بون‌و نەخۆش‌و پەك کەوتەنین وەکو ئەوانە نین کە لەرێگای خوادا بە سامان‌و نەفس دەجەنگن، خوا ئەو خەباتگێڕانەی بە ماڵ‌و نەفس دەجەنگن بەرزی کردونەوە بەسەر خانەنشینەکان بە پلە یەك، هەمویان خوا بەڵێنی باشی پێ داون. لێرەدا خوا گەورەیی خەباتگێڕان باس دەکات، وە ئەو خانەنشینانە چاکەیان بۆ هەیە، گەر خانەنشینەکان فەرزەکی عەینیان تەرك کردبایە ئەو کاتە خراپەو زیانیان نەك چاکەیان بۆ دەبوو[٤] .

بزانە خەباتی زۆر سوننەتە ، وەکو لەزۆر ئایەت‌و فەرمودەدا هاتووە، بەلای کەمەوە ساڵی جارێ واجبە، چونکە هەر لەوکاتەوە فەرمانی پێ کراوە وازی لێ نەهێنراوە، چاو لێ کردنی ئەو واجبە چونکە فەرزێکە دووبارە دەبێتەوە لای کەمێ ساڵی جارێ واجبە وەکو ڕۆژوو زەکات، گەر زیاتر لە جارێ لەساڵێدا پێویست بوو ئەوە واجب دەبێت چونکە فەرزی کیفایەیەو بەپێی پێویست بوونە.

---

(١) صحيح (ص. ج ٤٢٣).

(٢) البقرة/ ٢١٦.

(٣) النساء/ ٩٤.

(٤) تفسير الطبري (٢/٣٤٥).

(بەلاَم پێویستە بزانینو خەڵکی هەموو بزانن کاتێ لە ئیسلام دا جەنگ دەست پێ دەکات بەر لەوە جاڕ بدرێو سەرپشك بکرێن لەنێوان: وەرگرتنی ئیسلام، یان دانی سەرانە، یان جەنگ، لەپێشدا ئەم پەیمانە پشت گوێ دەخرێ گەر لێرەدا پەیمانێ هەبێ ـ لە باری ترسان لە ناپاکی ـ دا، حوکمەکانی کۆتایی پەیمان بۆ ئەهلی زیمە دادەنێ کە ئاشتی لەگەڵ ئیسلام داو سەرانە قبوڵ دەکەن، تەنیا لەم بارەدا پەیمان دەبێ، مەگەر موسڵمانان لاوازبن، ئەوکاتە دەچنەوە حوکمی قۆناغی ڕابردوویان کە تێی دا بوون)[1] .

## نەریتەکانی جەنگ:

(بریدة) دەڵێ: (کاتێ پێغەمبەری(ﷺ) خوا کەسێکی دەکردە فەرماندە بەسەر سوپا یان سریەیەکەوە بەتایبەتی ڕایدەسپارد بە: تەقوای خواو چاك بوون لەگەڵ موسڵمانانی لەگەڵی دا، پاشان وتی: (غەزا بکە بەناوی خوداو لەڕێگای خوا لەگەڵ خەڵکانی بێ بڕوادا، غەزا بکەنو غلو مەکەنو ناپاکی مەکەو هەتك مەکەن، منداڵ مەکوژن، کاتێ دوژمن بەرەو یەخەت هات لە بت پەرستان، بۆ سێ سیفەت بانگیان بکەو لێیان وەربگرەو لێیان بگەڕێ، پاشان بانگیان بکە لە خانەی خۆیانەوە بەرەو خانەی کۆچکەران بێن، پێیان بڵێ: گەر وابکەن هەمان مافی کۆچکەرانیان دەبێتو هەمان ئەرکی ئەوانیان دەکەوێتە سەر، گەر یاخی بوون بەرەو خانەی کۆچکەران بێن ئەوە ئەوان وەکو ئەعرابەکانی موسڵمانانو حوکمی خوایان بەسەردا پیادە دەبێ، کە بەسەر موسڵماناندا پیادە دەبێ، تا غەزا نەکەن لەگەڵ موسڵماناندا هیچ دەستکەوتو تالاَنەکی جەنگی یان نییە. گەر ئەوەیان نەکرد داوای سەرانەیان لێ بکە، گەر پەسەندیان کرد لێیان وەربگرەو لێیان بگەڕێ، گەر یاخی بوون داوای یارمەتی لە خوا بکەو لەگەڵیاندا بجەنگە)[2] .

---

(١) في ظلال القرآن. تێبینی: (دریبر)ی زانا لە کتێبەکەیدا (المنازعة بين العلم والدين) دەڵێ: (موسڵمانان شتەکی زۆر کەم نەبێ باجیان لەو کەسانەیان وەرنەگرتووە کە کەوتونە ژێر دەستیانەوە، ناکرێ بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو باجەی دا حکومەتی نیشتمانی لێ ی سەندون). (وەرگێڕ).

(٢) صحيح (مختصر م ١١١١) م(١٧٣١/١٣٥٦/٣).

(ابن عمر) دەڵێ: (ژنەکی کوژراوم لە هەندێ لە غەزاکاندا بینی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەیکرد، پێغەمبەر (ﷺ) کوشتنی ژنو منداڵی قەدەغە کرد)[١] . پێغەمبەر (ﷺ) (مەعازی کوڕی جەبەلی) ناردە یەمەن وەکو مامۆستایەكو ڕاسپاردەکەی بۆ ئەو ئەوەبو: (تۆ دەچیە لای گەلێکی ئەهلی کیتاب، بانگیان بکە بۆ شەهادەی (لا اله الا الله)و (من ـ رسول الله ـ م) گەر بەگوێیان کردی فێریان بکە، خوا پێنج نوێژی لەسەر فەرزکردون لە شەوو ڕۆژێکدا، گەر بەگوێیان کردی لەمە فێریان بکە خوا زەکاتی لەسەر فەرزکردون دەدرێتەوە بە هەژارانیان، گەر لەوە بەگوێیان کردی نەکەی زەکات لە ماڵو سامانە هەرە باشو دانستەکەیان وەربگری، خۆت لە سکاڵاو دوعای ستەمدیدە بپارێزە، لەنێوان ئەوو خوادا پەردە نییە)[٢] .

## خەبات لەسەر کێ واجبە:

لەسەر هەموو موسڵمانێ پێویستە کە باڵغ بێو عاقڵ بێو ئازادبێو توانای جەنگی هەبێ، ئەوەندەی دەوڵەمەندبێ تا دێتەوە، ماڵو منداڵی پێی هەڵسوڕێت. لەسەر بێ بڕوایان واجب نییەو دیارە.

بەڵگە لەسەر واجب بونی لەسەر باڵغو پێ گەیشتو نەك منداڵ ئەم گێڕانەوەیەی (ابن عمر)ە: (لە جەنگی ئوحوددا خۆم نیشانی پێغەمبەر (ﷺ) دا ئەوکاتە چواردە ساڵان بووم ڕێگای پێ نەدام، پاشان خۆم لە خەندەکدا خۆم نیشاندا ئەوکاتە پانزە ساڵانە بووم ڕێگای پێ دام)[٣] .

بەڵام واجبەکەی لەسەر عاقڵو کەسانی تر، نەخێر لەبەر ئەم دەقە فەرمودەیەیە: (رفع القلم عن ثلاث). وەکو باسکرا. بەڵام واجبەکەی لەسەر ژنان نییە لەبەر ئەو گێڕانەوەی عائیشەیە (ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا غەزا لەسەر ژنان واجبە؟ فەرموی: جیهادێکە جەنگی تێدا

---

(١) متفق علیه (خ ٦/١٤٨/٣٠١٥) م(٣/١٣٦٤/١٧٤٤).

(٢) متفق علیه.

(٣) متفق علیه: خ(٥/٢٧٦/٢٦٦٤) م(٣/١٤٩٠/١٨٦٨).

نییە: حەجو عومرەیە)[١] .

واجب نەبوونی لەسەر نەخۆشو ئەوەی توانای نییە لە ئایەتی (٩١)ی سورەتی تەوبەدا هاتووە: ﴿لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلّهِ وَرَسُولِهِ..........﴾. واتە: لەسەر پەك کەوتەو بێ تواناکانو نەخۆشانو ئەوانەی توانای خەرجیان نییە تانەو گوناهیان لەسەر نییە کاتێ بۆ خواو پێغەمبەرەکەی چاکەخواز بن.

## کەی غەزاو خەبات دەبێتە فەرزی عەین؟

**خەبات لەم دوو کاتەدا دەبێتە فەرزی عەین:**

(١) کاتێ بابای بەرپرس (موکەللەف) لە ریزی جەنگدا ئامادەبوو. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُواْ﴾[٢] . واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە کاتێ توشی کۆمەڵێ هاتن سەقام گیری بکەن. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفاً فَلاَ تُوَلُّوهُمُ الأَدْبَارَ﴾[٣] . واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە کاتێ بۆ شەڕ توشی بێ بڕواکان هاتن پاشەکشێ مەکەن.

(٢) کاتێ دوژمن هاتە ناو خاکی ولاتەکی موسڵمان.

(٣) کاتێ فەرمانڕەوا یا کەسێ لە بەرپرسیارانی داوای لێ کرد ڕاپەڕێ، وەکو لە فەرمودەدا هاتووە: (لا هجرة بعد الفتح، ولكن جهاد ونية واذا استنفرتم فانفروا)[٤] . واتە: کۆچکردن نییە دوای ڕزگاری مەکە، بەڵکو خەباتو نیەتە، کاتێ داوای ڕاپەڕین کرا ڕاپەڕن .

## دیلەکانی جەنگ:

**دیلەکانی جەنگ لە ئیسلامدا دوو جۆرن:**

بەشێکیان دەبنە کۆیلە بە هەمان دیلیو یەخسیرییە کە ژنانو مندالانن، چونکە پێغەمبەر

(١) صحيح (ص. جه ٢٣٤٥) جه(٢/٩٦٨/٢٩٠١).

(٢) الانفال/ ٤٥.

(٣) الانفال/ ١٥.

(٤) متفق عليه (خ ٦/٣/٢٧٨٣) م(٢/٩٨٦/١٣٥٣).

(ﷺ) قەدەغەی کرد بوو (ژنانو منداڵان بکوژرێن)و بەسەر جەنگاوەراندا دابەش دەکران.

بەشی دووەم دیلی پیاوانە کە پێشەوا سەرپشکە لە ئازادکردنو کوشتنو بە کۆیلەکردنو خۆکڕینەوە بە پارە یان گۆڕینەوەی دیل، چۆن بەرژەوەندی تێدایە ئاوا دەکات. خوا فەرمویەتی: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ﴾[1] . واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بۆی نییە دیلی هەبێ، تا زەوی بە خوێن نەکات.

پێغەمبەر (ﷺ) کۆمەڵە کەسانێکی لە (بني قريظة) کوشتو (بني مصطلق)ی کردن بە کۆییلە.(أبي العاص بن الربيع)ی ئازادکرد بەپیاوەتیو (ثمامة بن اثال)ی بە هەمان شێوە، بە سامان دیلانی بەدری ئازادکرد، دوو پیاوی بتپەرستی دیلی گۆڕینەوە بە دوو دیلی موسڵمانان خوا فەرمویەتی: ﴿فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾[2] . وەکو باسکرا.

## تاڵانو دەسکەوت (السلب والغنيمة):

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: لە جەنگدا (من قتل قتيلا فله سلبه)[3] . واتە: کێ کەسێکی کوشت شتەکانی بۆ ئەوە.

تاڵانو دەستکەوت دوای ئەوە دابەش دەکرێت، چوار بەشی لە پێنج بەشی دەدرێ بەو جەنگاوەرانەی بەشدارییان کردووە، سوارەکان سێ بەشو پیادە بەشێکی هەیە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ﴾[4] .
واتە: بزانن ئەوەی دەستتان کەوتووە پێنج یەکی بۆ خواو پێغەمبەرە. (ابن عمر) دەڵێ: (بینیم پێنج یەك دەکرا بە پێنج بەش، پاشان بەش دەکرا ئەوەی هی پێغەمبەربوو (ﷺ) ئەوە هی ئەو

---

(١) الانفال/ ٦٧.

(٢) محمد/ ٤.

(٣) متفق عليه.

(٤) الانفال/ ٤١. تێبینی: ئەو (لذي القربى)یە ئالوبەیتی پێغەمبەرە (ﷺ) وەکو (المجاهد)و (ابن عباس)و (علي بن الحسين) باسیان کردووە، (ابن عباس) دەڵێ: (انا كناهم، فأبى ذلك علينا قومنا).

سەرپشك دەبوو). لەوەوە گەڕاوەتەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەشەڕی خەیبەردا بۆ سوارەکان سێ بەشی دانا ، ئەسپ دوو بەش‌و پیاو بەشێك)[1] .

(ابن عباس) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) سێ بەشیدا بەسوارو یەك بەشیدا بەپیادە)[2] .

ئەوەی ئەو بەشانەی پێ دەدرێت دەبێ پێنج مەرجی یان تێدابێ: موسڵمانەتی، بالغی‌و عەقڵ‌و ئازادی‌و نێرینەیی، گەر مەرجێ لەوانە نەبوو، بەشی نییە چونکە لەو کەسانە نییە خەباتی لەسەر واجب بێت.

(عمیر) خزمەتکاری (أبي اللحم) گێڕاویەوە: (لەگەڵ گەورەی خۆمدا کە من کۆییلە بووم لە خەیبەردا غەزام کرد، لە تالآن بەشم نەدرا، لە کالآی لاوەکی شتەکم پێ درا، شمشێرێ، کاتێ دەمکردە مل ڕام دەکێشا)[3] .

(ابن عباس ـ ر ـ) فەرمویەتی: (پێغەمبەر (ﷺ) غەزای بە ژنان کرد برینداریان تیمار دەکرد، بەدیاری شتێکیان لە تالآن بۆ دادەنرا، بەڵام بەشیان پێ نەدەدرا)[4] .

ئەوانەی ٥/١ی یان بۆ خەرج دەکرێت: پێنج یەك کە ماوەتەوە لەم پێنج بەشە بەشێکی بۆ پێغەمبەرە (ﷺ)، دوایی بۆ بەرژەوەندییەکانە، بەشێ بۆ خزمانی پێغەمبەرە (ﷺ) بەنو هاشم‌و بەنو عەبدولموتەللیب‌و، بەشێ بۆ هەتیوانە، بەشێ بۆ هەژارانەو، بەشێ بۆ ڕێبوارانە: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾[5] .

---

(١)صحيح (ص. جه ٢٣٠٣) جه(٢/٩٥٢/٢٨٥٤).

(٢)(صحيح/الارواء/١٢٢٧) هق(٦/٢٩٣).

(٣) حسن (ص. جه ٢٣٠٤) جه(٢/٩٥٢/٢٨٥٥).

(٤) صحيح (مختصر م ١١٥١) م(٣/١٤٤٤/١٨١٢).

(٥) الانفال/ ٤١.

# تالانی بێ شەڕ (الفيء)

**وشەی (الفيء):**

**پێناسەی:** (الفيء) لە (فاء) وەرگیراوە، واتە: (گەڕایەوە ـ رجع).

**لە شەرعدا:** ئەو ماڵەیە لە بێ باوەڕان دەست دەکەوێ بێ جەنگ، وەکو ئەو تفاقو سامانەی لە ترسی موسڵمانانو سەرانەو موڵکانە بەجێی دێڵن، ئەو ماڵەیە ئەهلی ذیمە بەجێی دێڵێو میرات گری نییە.

**پەیمانی ئەهلی (ذیمة):**

(الذمة) بەمانای پەیمانو بەڵێن دێ. (بەستنی ئەم پەیمانە) بەوە دادەمەزرێ: فەرمانڕەوا یان جێگیری ئەهلی کیتابو غەیری ئەوان لە غەیرە موسڵمانەکان بڕیار بدەن کە لەسەر بیرو بڕوای خۆیان بمێننەوە بە دوو مەرج: سەرانە بدەنو بەگشتی پابەندبن بە یاساکانی ئیسلامەوە[١] . بنەمای ئەم پەیمانە لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾[٢] . واتە: بجەنگن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی نییەو ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی حەرامی کردووە حەرامیان نەکردووەو ئایینی حەقیان پەیڕەو نەکردووە لە ئەهلی کیتاب تا سەرانە دەدەنو ملکەچی دەبن[٣] .

---

(١) فقه السنة (٣/٦٤).

(٢) التوبة/ ٢٩.

(٣) فقه السنة (٣/٦٥). تێبینی: هەندێ پێیان وایە (الغنيمة)و (الفيء) یەك مانایان هەیەو بە ئایەتی: ﴿وَمَا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ......﴾ نەسخ بۆتەوە. (تفسير الطبري/ ج١٠/ ل: ٥). وەرگێڕ.

**ئەوەی ئەم پەیمانە واجبی دەكات:**

كاتێ پەیمانەكە بەسترا جەنگ حەرام دەبێ لەگەڵیانداو دەبێ ماڵو ناموسیان پارێزراوبێو ئازادبنو ئازار نەدرێن. وەكو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كاتێ توشی دوژمن هاتی بۆ دوو مەرج داوایان بكە هەر كامیان وەرگرت لێیان وەربگرەو دەستیان لێ بكێشەوە: داوای ئیسلام بوونیان لێ بكە، گەر وەلامیان دایەوە لێیان بگەڕێ، گەر نەیان كرد داوای سەرانە بكە، گەر داوایان كرد لێیان بگەڕێ). وەكو باسكرا.

**ئەو حوكمانەی لەسەر ئەهلی ژیممە واجب دەبێت:**

ئەو یاسایانە بەسەریاندا فەرز دەبێ كە لەراست مافی مرۆڤدا هەیە، نەك مافەكانی خودا لە پەیمانو كڕینو فرۆشتن پێ ژماردنو تۆڵەی تاوانەكانو لەدەست چووەكانو حدودو سزایان لەسەر دەسەپێت[1] .

ئەنەس گێڕاویەوە وەكو باسمان كرد (ان یهودیا رض رأس جاریة بین الحجرین ......). واتە: جولەكەیێ سەری كەنیزەیەكی قەلاشتەوە لەنێوان دوو بەردا پێی وترا كێ وای لێ كردی، فلان، فیسار، تا ناوی جولەكەكەی داو بەسەری ئامـاژەی كردو جولەكەكەی گرتو دانی پێدانا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا سەری لەنێوان دوو بەردا قەلاشتەوە.

(ابن عمر) گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) دوو جولەكەی هێنا زینایان كردبوو دوای ئەوەی هاوسەرداربون ڕەجمی كردن)[2].

**كەی پەیمان دەشكێنرێ؟**

هەركەسێ لە ئەهلی پەیمان (ذیمە) پەشیمان بۆوە لە دانی سەرانەو نەیدا، یان پابەند نەبێ بە ئەحكامەكانی شەریعەتەوە ئەوە پەیمانی شكاندووە. پاشان پەیمانەكە بەوە دەشكێ كە جنێو

---

(١) منار السبیل (٢/٢٩٨).

(٢) صحیح الارواء (١٢٥٣). تێبینی: چونكە كوشتنو سزای مرۆڤ پێ شێل كردنی مافی مرۆڤە، زیناو داوێن پیسی نەخۆشی درمی وەكو فەرەنگیو سۆزەنەكو ئایدز دەگوازێتەوە كە وەكو تاعون وان. وەرگێڕ.

بە خواو پێغەمبەرەکەی بلێت. لە عومەر گەڕاوەتەوە(ﷺ): (سکالایەك بۆ عومەر بەرز کرایەوە کە پیاوێ ویستویەتی ژنەکی موسڵمان ناچار بکات بۆ زینا، عومەر وتی: ئێمە لەسەر ئەوە دانوستانمان لەگەڵدا نەکردوون، فەرمانی دا لە بەیتولمەقدەس دا لە دار درا)[١] .

لە عەلی گەڕاوەتەوە (کرم الله وجهه): (ژنەکی جولەکە جنێوی بە پێغەمبەر (ﷺ) دەداو قسەی سووکی دەرحەق دەکرد، پیاوێ خنکاندی، پێغەمبەر (ﷺ) خوێنەکەی بەتاڵ کردەوە)[٢].

## کاتێ پەیمان شکێنرا چی واجب دەبێت:

ئەم حوکمە حوکمی دیلە، گەر موسڵمان بو کوشتنی حەرام دەبێ، گەر موسڵمان نەبوو پێشەوا سەرپشکە لە کوشتنو پیاوەتیو ڕزگارانە لێ وەرگرتنی وەکو لە باسی (دیل)دا باسکرا.

## سەرانە لە کێ وەردەگیرێت؟

(نافع) لە (أسلم) گێڕاویەوە: (عومەر بۆ فەرمانڕەوای سەربازەکانی نووسی سەرانە مەخەنە سەر ژنانو منداڵان، مەیخە سەر ئەو کەسانە نەبێ کە تووکیان (موو) تاشیوە)[٣] .

## بڕی سەرانەو باج:

مەعاز گێڕاویەوە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ فەرمانی دایە بڕوات بەرەو یەمەن داوای لێ کرد لە هەمو باڵغێ دینارێ وەربگرێ، یان بەڕادەی دینارێ پۆشاکی مەعافیر (ی یەمەنی))[٤] . زیادەش دروستە وەکو لە گێڕانەوەی (أسلم)دا هاتووە: (عومەر سەرانەی لەسەر خاوەن زێڕەکان چوار دیناری دانابوو لەسەر خاوەن زیوەکان چل درهەم دانابوو، لەگەڵ ئەوەشدا

---

(١) حسن (الارواء/١٢٧٨) ابن أبي شيبة (١١/٨٠/٢).
(٢) صحيح الاسناد (الارواء ٩١/٥) د(١٢/١٧/٤٣٤٠).
(٣) صحيح (الارواء ١٢٥٥) هق (٩/١٩٥).
(٤) صحيح (الأرواء ١٢٦١) د(٨/٢٨٧/٣٠٢٢).

ئازوقەی موسڵمانانو (٣رۆژ) میوانداری موسڵمانان)[1] . خەلیفە چاودێری هەبوونیو نەبوونی دەکات وەکو (أبن أبی نجیح) گێڕاویەوە لە (مجاهد)م پرسی: (بۆچی خەڵکی شام چوار دینارو خەڵکی یەمەن یەك دیناری باج لەسەرە؟ وتی: ئەمە لەڕووی هەبوون کراوە)[2] .

* * *

(١) صحيح (الأرواء ١٢٦١) هق(٩/١٩٥).

(٢) صحيح (الأرواء ١٢٦٠) خ(٦/٢٥٧) به (تعليق)ي.

# باسی ئازادکردنی کۆیلەکان (کتاب العتق)

## پێناسە:

(العتق) واتە: ئازادکردنو لابردنی خاوەنداری. ئەمە لە وشەی ئازادکردنی ئەسپو بەرەڵاکردنی بێچوو هاتووە کاتێ دەفڕێ، کۆیلەش بە ئازادبوون ڕزگاری دەبێ بۆ کوێی بووێت دەڕوات[١] .

## هاندان بۆ ئازادکردنی کۆییلەکانو گەورەیی یەکەی:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ* وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ * فَكُّ رَقَبَةٍ﴾[٢] . واتە: نەچۆتە ناو کۆسپەوە، تۆ چوزانی کۆسپ چییە؟ ئازادکردنی گەردنێکە.

پێغەمبەر (ﷺ) (أيما رجل اعتق امرأ مسلما استنقذ الله بكل عضو منه عضوا منه من النار)[٣] . واتە: هەر پیاوێ مرۆڤەکی موسڵمان ئازاد بکات، لە بەرامبەر هەر ئەندامەکی لەشی، ئەو ئەندامەکی لەشی خۆی لە ئاگر ئازاد دەکات.

(أبي موسى الاشعري) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (سێ کەس دووجار پاداشت وەردەگرن: پیاوێ کە ئەهلی کیتابە بڕوای بە پێغەمبەرەکەی خۆی هێناوەو بەدیداری پێغەمبەر (ﷺ) شاد دەبێو بڕوابێنێ، شوێنێ کەوێو بەڕاستی دانا، دوو پاداشتی هەیە، کەسێ کۆیلەیە مافی گەورەکەیو خودای داوە دوو پاداشتی هەیە. پیاوێ کەنیزەیەکی هەیە باشترین خۆراکی پێ داوەو بەجوانترین شێوە پەروەردەی کردووەو بەجوانترین شێوە فێری کردووە، پاشان ئازادی کردووەو کردویە بە هاوسەری ژیانی، ئەوە دوو پاداشتیان هەیە)[٤] .

---

(١) فتح الباري (٥/١٤٦).

(٢) البلد (١١ـ ١٦).

(٣) متفق عليه: خ (٥/١٤٦/٢٥١٧) م(١٥٠٩ـ ٢٤/١١٤٨/٢).

(٤) متفق عليه: م(١/١٣٤/١٥٤) خ(١/١٩٠/٩٧).

## کام کەس لە هەموویان خێرترە ئازاد بکرێت:

ئەبوذەری غەففاری (ﷺ) دەفەرموێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) پرسی کام کار لە هەموو کارێ باشترە؟ فەرمووی: (بڕواهێنان بەخواو خەبات لە ڕێگای دا. وتم: ئەی کام کۆیلە باشە بۆ ئازادکردن؟ فەرمووی: کامەیان لای خاوەنەکەی بە نرخو گران بەهایە)[١] .

## کەی سوننەتە ئازادکردنی کۆییلە:

(أسماء) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی خۆرگیراندا ـ الکسوف ـ فەرمانی دەکرد کۆیلە ئازاد بکرێن)[٢] .

## هۆکارەکانی ئازادکردن:

ئازادکردن بەوە دەبێ کە ئاغاو خاوەنەکەی لە ڕاهی خوا ئازادی بکات، وەکو لە فەرمودەکانی ڕابردودا چاکەو گەورەیی ئەوەمان باسکرد.

بەخاوەندارەتی دێتەدی، هەرکەسێ ببێ بە خاوەنی کەسێ پێی نەشێو لێ ی حەرام بێ ئەوە ئازادە. لە فەرمودەدا هاتووە: (من ملك ذا رحم محرم فهو حر)[٣] . بەوە کۆیلە ئازاد دەبێ کاتێ هەندەکی ئازاد کرد، کاتێ کۆیلەکە موڵکی دو کەس بوو یەکێ ئازادی کرد، گەر هەبو بوو کۆییلەکە دەقرسێنرێ بە نرخی کەسێکی دادگەرو کۆیلەکە بەتەواوی ئازاد دەکرێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەسێ هاوبەشەکەی کۆیلەکەی ئازادکرد، سامانی هەبوو دەگەیشتە نرخی کۆییلە، کۆییلەکە بەقرساندنی کەسێکی دادگەر دەقرسێندرێ، هاوبەشەکان بەشی خۆیان دەدرێتێ کۆیلەکە ئازاد دەکرێ، گەر چەندەی ئازادکراوە لەوە ئازادە)[٤] .

واتە: ئەوکاتە گەر کابرا دەرامەتی نەبوو، دەبێ کۆیلەکە خۆی کار بکات، تا ئەو پارەیە

---

(١) متفق علیه: خ(٥/١٤٨/٢٥١٨) م(١/٨٩/٨٤).

(٢) باسکرا.

(٣) منار السبیل (٢/١١٠).

(٤) متفق علیه: خ(٥/١٥١/٢٥٢٢) م(٢/١١٣٩/١٥٠١).

کۆدەکاتەوە خۆی پێ بکڕێتەوە، یان بەو ڕادەیە کار بکات. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من اعتق نصيبا ـ أو شقيصا ـ في مملوك فخلاصه عليه في ماله ان كان له مال والا قوم عليه فاستسعى به غير مشقوق عليه)[١] . واتە: هەرکەسێ بەشەکی کۆیلە ئازاد بکات، ئازادکردنی لەماڵی خۆیدایە گەر هەیبوو، گەر نا دەقرسێنرێ، کاری پێ دەکرێ بێ ئەوەی زەحمەت بدرێت.

## (التدبير):

جۆرێکە لە ئازادکردن، بەستنەوەی ئازادی کۆیلەیە بە مردنەوە، وەك خاوەنەکەی بڵێ: گەر من مردم تۆ دوای مردنم ئازادی، گەر مرد ئازاد دەبێ، مادام لە سێ یەکی ماڵی پتر نەبێت. (عمران بن حصين) دەڵێ: (پیاوێ شەش کۆیلەی هەبوو جگە لەوە سامانی تری نەبوو، کاتی مردنی ئازادی کردن، پێغەمبەر (ﷺ) کردنی بە سێ بەش و پشکی لەنێواندا کردن، دوانی ئازادکردنو چوار مانەوەو قسەی توندی پێ وت)[٢] .

## (المدبر) دروستە ببەخشەرێ و بفرۆشرێت:

(جابر بن عبدالله) ـ ر ـ فەرمویەتی:

(پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ گەیشت پیاوێ لە یارانی خزمەتکارەکی بە (الدبر)ی ئازادکردووە، لەو کۆیلە زیاتری نەبووە، بە (٨٠٠ درهەمی فرۆشت، پاشان پارەکەی بۆ نارد)[٣].

## (الكتابه)[٤] :

**بەستنەوەی ئازادکردنی کۆیلەیە بە بڕەکی بەرامبەری دیاری کراودا.**

## حوکمەکەی:

کاتێ کۆییلە وتی: ئاغام یان گەورەم ئازادم بکە، ئەوە ئەرکەو واجبە لەسەری

---

(١) متفق عليه (خ ٢٥٢٧/١٥٦/٥) م(١٥٠٣/١١٤٠/٢).

(٢) صحيح (مختصر م ٨٩٥) م(١٦٦٨/١٢٨٨/٣).

(٣) متفق عليه: خ(٧١٨٦/١٧٩/١٣) م(٩٩٧/٦٩٢/٢).

(٤) فتح الباري (١٨٤/٥).

داواکاریەکەی وەڵام بداتەوە، مادام بزانێ ئەو کۆیلەیە توانای کارکردنی هەیە بۆ خۆکڕینەوە. وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً﴾[1] . واتە: ئەو کۆیلانەی دەیانەوێ خۆیان بکڕنەوە دەبێ ڕازی بن بە خۆکڕینەوەیان مادام زانیتان دەتوانن خۆیان بکڕنەوە.

(موسى بن أنس) گێڕاویەوە (سيرين) لە داوای خۆکڕینەوەی لە (أنس) کرد کە دەوڵەمەندبوو، نەیکرد، چووە لای عومەر ئەویش پێی وت ڕازیبە، ئەویش ڕازی نەبوو، عومەر دارکاری کردو وتی: (فكاتبوهم ان علمتم فيهم خيرا). ئەنجا ڕازی بوو بە خۆکڕینەوەی[2] .

## کەی ئازاد دەکرێت؟

کاتێ کۆیلەی خۆکڕەوە (المكاتب) ئەوەی دایە گەورەکەی کە لەسەریەتی یالێی خۆش بوو، ئەوە ئازاد دەبێ، تا بەتەواوی خۆی ئازاد نەکات هەر کۆیلەیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کۆیلەی خۆکڕەوە گەر یەك درهەمی لەسەر مابێ هەر کۆیلەیە)[3] .

## فرۆشتنی کۆیلەی خۆکڕەوە (المكاتب):

گەر کۆیلەی خۆکڕەوە ڕازی بوو دەتوانرێ بفرۆشرێت: (عمرة بنت عبدالرحمن) گێڕاویەوە: (بريرة) هات داوای یارمەتی لە عائیشەی دایکی موسڵمانان بکات (رضى الله عنها) وتی: گەر کەسوکارەکەت پێیان خۆش بێ بە یەك جار پارەیان بدەمێو ئازادت بکەم وام دەکرد. (بريرة) لای کەسوکارەکەی ئەمەی باسکرد، وتیان ڕازی نابین گەر سەرپەرشتی (الولاء) بۆ خۆمان نەگەڕێتەوە، (مالك) دەڵێ: (يحيى) وتی: (عمرة) وتی: عائیشە ئەمەی لای پێغەمبەر (ﷺ) باسکردو فەرموی: (بیکڕەوەو ئازادی بکە، سەرپەرشتیو ویلا بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات)[4].

---

(١) النور/ ٣٣.

(٢) صحيح الإسناد (الإرواء/١٧٦٠) خ(٥/١٨٤) تعليقا.

(٣) حسن (ص.د ٣٣٢٣) د(١٠/٤٢٧/٣٩٠٧).

(٤) متفق عليه: (خ ٥/١٩٤/٢٥٦٤) م(٢/١١٤١/١٥٠٤).

(ویلاء) مەبەست ئەوەیە واتە: ئاغای کۆیلە ئازادکەر دەتوانێ میرات لە کۆیلەی ئازادکراو ببات، لەکاتی نەبوونی پشتی میراتگردا.

وە(الولاء) نافرۆشرێو نابەخشرێ، وەکو (ابن عمر) گێڕاویەوە: (نهی النبي (ﷺ) عن بيع الولاء وهبته)[1] .

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لەفرۆشتنو بەخشینی کۆیلەی (الولاء)

❊❊❊❊❊❊

❊❊❊❊❊

❊❊

❊

## لەکۆتاییدا باشی کۆتایشمان لە خوا داوا دەکەین (حسن الخاتمة):

(عبدالعظیم) دەڵێ: ئەمە دوا شتە ویستم کۆی بکەمەوەو ڕێکی بخەم لەم کتێبە کورتەدا، گەر ڕاستیم پێکابێ ئەوە مەبەستمان بووە، گەر وانەبوو داوای لێ بووردن لە خوا دەکەم، ئازادکردنم خستە دوا بابەت، بەو ئومێدەی خوا گەردنمان ئازاد بکاتو بمانخاتە ژێر سایەی بەزەیی‌و لێ بووردنەوە. داواکارم خوا ئەم کتێبەم لێ قبوڵ بکاتو پاداشتم بۆ بنووسێو گوناهم لەسەر ڕەش بکاتەوەو بۆم بکات بە توێشوو ڕۆژێك خوا لەبارەی فەرموویەتی: ﴿يوم لا ينفع مال ولا بنون الا من أتى الله بقلب سليم﴾. دواقسەمان (الحمد لله رب العالمين).

(١) متفق عليه: (مختصر مسلم ٨٩٨) خ (٥/١٦٧/٢٥٣٥).

# سەرچاوەکان



| اسم الكتاب | الطبعة | المؤلف |
|---|---|---|
| ١- القرآن الكريم | | |
| ٢- أحكَامُ الجَنَائِزِ | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٨٦م | الألباني |
| ٣- آداب الزفاف | طبعة المكتبة الإسلامية سنة ١٤٠٩هـ | الألباني |
| ٤- الإجماع | طبعة دار طيبة سنة ١٩٨٢م | ابن المنذر |
| ٥- إحكام الأحكام | طبعة دار الكتب العلمية | ابن دقيق العيد |
| ٦- إرشاد الساري | | محمد إبراهيم شقرة |
| ٧- إرواء الغليل | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٨٥. | الألباني |
| ٨- الأم | طبعة دار المعرفة سنة ١٩٧٣م | الشافعي |
| ٩- بداية المجتهد | طبعة دار المعرفة سنة ١٩٨١م | ابن رشد القرطبي |
| ١٠- تحفة الأحوذي | طبعة دار الفكر سنة ١٩٧٩م | المباركفوري |
| ١١- تفسير القرآن العظيم | طبعة دار المعرفة سنة ١٩٨٣م | ابن كثير |
| ١٢- التقريب لفقه ابـن قيم الجوزية | | بكر أبو زيد |
| ١٣- تمام المنة | طبعة المكتبة الإسلامية سنة ١٤٠٨هـ | الألباني |
| ١٤- جامع البيان | طبعة دار الفكر سنة ١٩٨٤م | ابن جرير الطبري |
| ١٥- الروضة الندية | طبعة دار المعرفة سنة ١٩٧٨م | صديق حسن خان |

| اسم الكتاب | الطبعة | المؤلف |
|---|---|---|
| ١٦- زاد المعاد | طبعة مؤسسة الرسالة سنة ١٩٨٦م | ابن قيم الجوزية |
| ١٧- سبل السلام | طبعة مكتبة الرسالة الحديثة سنة ١٩٧١م | الأمير الصنعاني |
| ١٨- السلسلة الصحيحة | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٨٥م | الألباني |
| ١٩- سنن ابن ماجه | طبعة دار الفكر | ابن ماجه |
| ٢٠- سنن البيهقي | طبعة دار المعرفة | البيهقي |
| ٢١- سنن الترمذي | طبعة دار الفكر سنة ١٩٨٣م | الترمذي |
| ٢٢- سنن الدارقطني | طبعة دار المحاسن | الدارقطني |
| ٢٣- سنن الدارمي | طبعة حديث أكادمي باكستان سنة ١٩٨٤م | الدارمي |
| ٢٤- سنن النسائي | طبعة دار الفكر سنة ١٩٣٠م | النسائي |
| ٢٥- السيل الجرار | طبعة دار الكتب العلمية سنة ١٩٨٥م | الشوكاني |
| ٢٦- صحيح ابن خزيمة | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٧٥م | ابن خزيمة |
| ٢٧- صحيح الجامع | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٦٩م | الألباني |
| ٢٨- صحيح سنن ابن ماجه | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٨٦م | الألباني |
| ٢٩- صحيح سنن أبي داود | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٨٩م | الألباني |
| ٣٠- صحيح مسلم | طبعة دار الفكر سنة ١٩٨٣م | ترتيب محمد فؤاد عبد الباقي |
| ٣١- صحيح مسلم بشرح النووي | طبعة دار إحياء التراث العربي سنة ١٩٧٢م | النووي |

| اسم الكتاب | الطبعة | المؤلف |
| --- | --- | --- |
| ٤٦- المحلىٰ | طبعة دار الآفاق الجديدة | أبو محمد بن حزم |
| ٤٧- مختصر سنن أبي داود | طبعة مكتبة السنة المحمدية | المنذري |
| ٤٨- المستدرك | طبعة دار الكتب العلمية | الحاكم محمد بن عبد الله |
| ٤٩- مشكاة المصابيح | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٨٥م | الخطيب التبريزي. تحقيق الألباني |
| ٥٠- مصنف ابن أبي شيبة | طبعة الدار السلفية بالهند سنة ١٩٧٩م | ابن أبي شيبة |
| ٥١- المعجم الكبير | طبعة مكتبة ابن تيمية | الطبراني تحقيق حمدي السلفي |
| ٥٢- المغني | طبعة رئاسة إدارات البحوث العلمية والإفتاء سنة ١٩٨١م | ابن قدامة المقدسي |
| ٥٣- المقنع | طبعة المؤسسة السعيدية | ابن قدامة المقدسي |
| ٥٤- منار السبيل | طبعة المكتب الإسلامي سنة ١٩٨٤م | إبراهيم بن ضويان |
| ٥٥- موارد الظمآن إلىٰ زوائد ابن حبان | طبعة دار الكتب العلمية | نور الدين الهيثمي |
| ٥٦- الموافقات | طبعة دار المعرفة | أبو إسحاق الشاطبي |
| ٥٧- نيل الأوطار | طبعة دار الجيل سنة ١٩٧٣م | الشوكاني |

# ناوەرۆك




# الوَجيز

## في فِقهِ السُّنَّةِ والكِتابِ العَزيز

بێگومان فیقهی ئیسلامی بریتییە
لەو لێ حاڵیبوونەوەی فەقیهەکان
دوای خۆماندووکردن و سوراغ
بەدەستیان هێناوە.
لە دەقە قورئانییەکان و دەقە سوننەتەکان.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر

نرخی 10000 دینار